دیل کارنیجی

# هونەری هاوڕێگرتن

چۆن کاردەکەیتە سەر دڵی خەڵکیو
بەرەو بیرو باوەڕو بۆچونەکانت دەیانهێنیت

وەرگێڕان و لەسەرنووسینی
عمر تۆفیق الخطاط



نارین

| | |
|---|---|
| نــــــاوی کتێـــــب | هونەری هاوڕێگرتن |
| بابـــــــــــــەت | دەروونناسی |
| نووســـــــــــینی | دیل کارنیجی |
| وەرگێڕانو لەسەرنووسینی | عمر تۆفیق الخطاط |
| نەخـــشەسازی نـــاوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نـــۆرەو ســـاڵی چـــاپ | هەشتەم ٢٠١٢ ز |
| ژمـــــارەی ســــپاردن | ( ٤١٨) ساڵی (١٩٩٨) پێدراوە. |

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website:www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤

# هونەری هاوڕێگرتن

چۆن کاردەکەیتە سەر دڵی خەڵکی و
بەرەو بیرو باوەڕو بۆچونەکانت دەیانهێنیت


نووسینی

دیل کارنیجی

وەرگێڕان و لەسەرنووسینی

عمر تۆفیق الخطاط



نارین

## چەند پەیڤێك

## ڕای خوێنەرێك لەسەر ئەم کتێبە[1]:

خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـەم وەك‌و هـەر کتێبێکـی ئاسـایی دەروونناسـی دەبینـی، لەبەر ئەوە هاوشێوەی سـەرجەم پەرتووکـە دەروونییـەکانی تـر نـاوی خـوام لێهێنـاو دەستم بە خوێندنەوەی کرد، بەڵام هەرزوو تێڕوانینـە ئاساییەکەم بەرانبـەری گۆڕاو باری سـەرنجم ئاقارێکی تـری وەرگـرت، بەتایبـەت دوای دەرکـەوتنی (( شـوعلە ))ی لەسـەر نووسـینە پڕبـە پێـستەکەی (( وەرگێـڕ )) کەلـە ڕاسـتیدا وانـازانم هـیچ بانگخوازێکی موسڵمان لێی بێ (( ئیحتیـاج )) بێت، هـەروەها هـەوڵێکی شایستەی سوپاسـی وەرگێـڕ لەئاشـنا کردنـی موسـڵمان و نـا موسـڵمان بـە دەریـای بێ بنـی دەروونناسی ئیسلامی، کە لە ڕاستیدا سەرکەتوو بووە لە کارەکەیـدا، وەهـیچ زیـادە ڕەوییەکـەش نیـە لـەوەی کـە بەوپـەڕی شـانازی و دوور لەدەمارگیرییـەك بڵـێم لەسـەر نوسـینەکەی پـێش نووسـینەکەی (( دیـل )) کـەوتووە، چـونکە پـشت ئەسـتوورە بـە فەرموودەی  مشوور گێڕو خـاوەنی بەنـدەکان و هەڵبـژێراوە کـەی و پاشـان مێـژووی شوێن کەوتووانیان، وە لە کۆتایـدا ئـەڵێم(( هـیچ خوێنـەرێکی ئـەم پەرتووکـە توانـای خۆ قوتارکردنی نیە لە شەپۆلە کاریگەرکانی)).

---

[1] * ئەمە ڕای خوێنەرێکە لەسەر ئەم کتێبە و هەر ئەوکەسەشم تا ئێستا نە دیوە و ناشی ناسم سەر لەنوێ پیاچوونەوەی زمانەوانی کتێبەکەی کردووەو هەڵەکانی راست کردۆتەوە و زۆر سوپاسی ئەکەم: وەرگێڕ.

# پێشەکی چاپی هەشتەم

نازانم بە چ زمانێك سوپاسی ئەو خوایە بکەم کە ئابەوجۆرە دڵی خۆشکردمو ئەم نووسینەی کردووم بەجێگای ڕەزامەندی خوێنەران، ئەبیستم کە هەرکەسێك جارێ دەیخوێنێتەوە حەز دەکات جارێکی تریش دوبارەی بکاتەوە وەك خوێنەران خۆیان ئاگادارم ئەکەنەوە..

هەروەك خوێنەران لەڕێگەی تەلەفونەوە زۆر زۆر دڵخۆشم دەکەن و زیاتر هاندەرم دەبن کەلە نوسین نەوەستم و بەردەوام بنوسم و بۆیان بەتایبەت ئازیزانم لە گەرمیانی خۆشەویست، لەتەقتەق لە هەریر ونازەنین لە دەڤەرە دولبەرەکەی ڕانیەو پشدەر و قەڵادزەو لە هەردوو شاری مەزنی سلێمانی ڕازاوەو هەولێری دێرین و بەئەمەك..

قەزای سۆران و شەقلاوە.. سەیدصادەق و پێنجوێن و هەڵەبجەی تازەو دەربەندی هاوینە هەوارم..

شاری کەرکوکی کوردەواری و نەوتاویم.. چەمچەماڵ و کفری کەلار .. و شاری کۆیەی حاجی قادر و دوکانی فێنك و رازاوە.. کە هەموویان زێدی منن..

زێدی من تەنها هەڵبجەی قەڵای باوەڕ و کوردایەتی نی یە بەڵکو ئەوشارەی سەرەوە باقی شارەکانی تری ئەم کوردستانە مەزنە شاری منەو خەڵکی هەموویانم..

خوێنەرێك جارێك پێی ووتم..پاش ئەوەی زانی من نووسەری ئەم کتێبەم..ماموستا من کاتی خۆی کێشەم هەبوو نەمئەزانی چۆن چارە سەری بکەم، یان کێشەی بنەماڵەکەم بۆ چارەنەئەکرا.. زۆر خەفەتم ئەخوارد، بەڵام دوای ئەوەی ئەم کتێبەی جەنابتانم کڕی و خوێندمەوە ئێستا کێشەکانی خۆمم چارەکردو لەناو بنەماڵەکەشماندا بووم بەدەست ڕاس و هەرکێشەیەکی کۆمەڵایەتی ڕوویان تێ بکات هانا بۆ من دێنن و منیش.. خوا ئاگادارە لەژێر ڕۆشنایی ئەم کتێبەدا بۆیان چارەسەر ئەکەم و خۆم و خێزانم بەردەوام دۆعای چاکەت بۆ ئەکەین، ئەمە نمونەیەکی بچوکە لەهەموو تەلەفونانەی کە بۆم دەکرێت و ڕای خۆیان دەردەبڕن..

منیش خۆم کە کە وەرگێرو نوسەری ئەم کتێبەم هەرجارێ بزانم هەڵس و کەوتم بەشێوە نی یە کە شایستە بێ یەکسەر ئەزانم بنەمایەکی ئەو کتێبەم فەرامۆش کردوەو خێرا بەخۆما دەچمەوەو ئەو هەڵەیە چارەسەردەکەم.

لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانینم دەردەبڕم بۆ ئەو بەرێزەی کە وەك سەربازێکی نەناسراو خۆی تەرخانکرد بۆ هەڵەبڕکردنی ئەم کتێبە و لەپاش ماندوبونێکی زۆر هێنای بۆ هەڵەبجە بۆم نەشی ویست ناوەکەی بزانم و بیناسم نەوەك ببێ بەڕیا بۆیە منیش زۆر داوام لێنەکرد تا ببینم لێرەوە دەستەکانی دەگوشم و چاوی ماچ دەکەمو خوای گەورە لە بەهەشتدا پێکەوە کۆمان بکاتەوە.

((وەرگێڕ))

# پێشەکی و ڕێ خۆشکەر

## ووتەی وەرگێڕ :

**ئەم کتێبە چۆن و بۆچی دانرا؟**

ئـەم کتێبـە لەنوسـینە هـەرە بـەرزەکانی زانـای دەروونناسـی ئەمـەریکاو.. بەڕێوەبـەری پـەیمانگای پەیوەندییـە ئامادەییـەکان لـەنیویۆرك.. مامۆسـتا (دیـل کارنیجی)یە..

هۆی سەرەکی کە پاڵی نا بە (دیل)ەوە هەستێت بەدانانی ئەم کتێبە وەك خۆی دەڵێـت بـەس بۆئـەوەبوو کـە قوتابیـەکانی بیکـەن بەسەرچاوەیەکی کردەوەیـی و لەکاتی پێویستدا بگەڕێنەوە بۆ سەری و سوودی لێ وەربگرن..

وەهـەرگیز نـەهاتبوو بەخەیاڵیـدا کـە ئابـەوجۆرە جیهـان بگرێتـەوە!.. پاشـان لەسـەرداوای قوتابیـەکانی و بـۆ ئـەوەی خـەڵکێکی زیـاتر سـوودی لێ وەربگـرن.. فیروسیای کردو هەستا (٣٠)هەزار دانە لێ چاپ کرد.

بـەڵام شـتێکی زۆر سەرسـوڕهێنەر ڕویـدا، کـە هـەرگیز نەبەخـەیاڵی (دیـل)دا و نەبەخەیاڵی هیچ کەسدا هاتبوو کە لەڕۆژانی یەکەمدا هـەمووی فرۆشـراو یەکدانـەی لەبازاڕدا نەما!..

تـا بەتەلـەفوون و نامـەو بەدەمی لەهـەموو لایەکـەوە داوای لێکرا کەسـەر لـەنوێ چاپی بکاتـەوە ئـەمیش سـەرلەنوێ چاپـی کـردەوە!.. دیـسان تـەواوبوو!!.. بۆجـاری سێیەم و چوارەم هەتا گەیشتە (پەنجا و شەشەمین)جار کە چاپی بکاتەوە!!..

لـەماوەی (١٢)سـاڵدا هـەر لـەوێ و هـەر بـەئینگلیزی زیـاتر لـە (٣)ملیـۆن دانـەی لێ چاپ کرا!!..

تەنانەت ڕەخنەگرانی ئەمەریکی لەسەر ئەوەن کە ئەم نوسینەی (دیل)بڵاوتـرین و فـراوانترین کتێبـی چـاکە کـە تـا ئێـستا جیهـان بەخۆیـەوە دیبێتـی پـاش کتێبـە ئاسمانیەکان.

ئەم کتێبەی (دیل) هەربە سنووری ئەمەریکاوە نەوەستاو بـەس!! بـەڵکو شـوێن و وڵاتی خۆی بڕیو بەناو هەموو جیهاندا بڵاوبوویەوە!.. لەئەمەریکا یەکەم جار چۆن بەخەتێکی هەبوو.. لەهەموو وڵاتێکی تردا هەمان پێشوازی لێ دەکرا!..

ئەوەبوو تا ساڵی (١٩٥١) بۆ (٥٦) زمان وەرگێڕرا و لەهەر زمانێکدا دەیان جار چاپ کراوەتەوە..

بڵاوبوونەوەی ئا بەم چەشنە چاوەڕوان نەکراوەی ئەم کتێبە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گەلی ئەمەریکی جیاکردنەوە گەلانی جیهان بەگشتی تینوی ئەوەیانە کە ژیانێکی پڕ کامەرانی سەربەرزی و پڕ نرخی و پێشکەوتوویان دەست کەوێت..

**هۆی بڵاوبوونەوەی چی بوو؟..**

گومان دەبەم کەیەك هۆ ئەمەی ڕەخساند.. ئەویش ئەوەیە کە ئەم کتێبە لەسروشتی ئادەمیزاد دەکۆڵێتەوە.. وە شتێکی ئاشکرایە کە ئادەمیزاد چونکە لەیەك دایك و باوکن یەك سروشتیان هەیەو کە لەهەمووان‌دا شاراوەیە ئیتر با هەر تیرەو نەژاد و زمانێك بن..

چونکە تۆ حەزت لەچییەو چیت پێخۆشە هەربەو چەشنەش هاوڵاتییەکی (تبت) لە چین پێی خۆشەو حەزی ایێەتی.. تۆ بەچی دڵتەنگ دەبیت و پێت ناخۆشە هاوڵاتی یەکی (ئەسکیمۆیی) هەر بەوچەشنە پێی ناخۆشەو دڵتەنگ دەبێت...

ئەم کتێبە چەند ڕێگاو بنەمایەکی گرتۆتە ئەستۆ کە دەبنە هۆی ڕاکێشانی دڵی خەڵکی و کەمەند کێش کردنیان.. بێگومان ئەوکەسانەش یان خێزانمانن یان کوڕمانن یان هاوڕێ و کەس و کارمانن یان لێپرسراو یان ژێردەستەمانن..

دەتوانین کاریان تێبکەین و مەبەست و ئاواتەکانمانیان پێ بهێنینەدی.. بەبێ ئەوەی تۆزێك هەستیان بریندار بکەین و نارەحەتیان بکەین و دڵیان برەنجێنین..

دەپێم بڵێ کەس هەیە حەز نەکات ئەم هونەرە فێربێت؟..

ئەم کتێبە شتێکی نارەحەت و بیروباوەڕێکی تازەی نەهێناوە تا جێبەجێ نەکرێت و کاری پێ نەکرێت.. بەڵکو هەموو ڕێگاو وانەکانی کۆن و (هەربوون).. بەڵام ئای کە پێویستن هەمیشە لەیادماندا بن و.. بەردەوام کاریان پێ بکەین.. من

وادەزانم بەڵاو نەگبەتی خەڵك لەوەدا نییە كە هیچ نازانن.. بەڵكو لەوەدایە كەخۆیانی لێ گێل دەكەن..

(دیل كارنیجی) دەڵێت: لەوە دەچێت لێم بپرسن كە: ئایا چی پاڵی پێوە ناوم ئەم كتێبە لەم بارەیەوە بنووسم؟ یان ئایا شتێكی وای تێدایە كە زۆر بكەین لەخۆمان بۆ خوێندنەوەی؟ خوێنەری بەڕێز حەقی خۆتە كەوەڵامت بدەمەوە:

(جۆن ڕۆكفلر) ڕۆژێك ووتی (بەباشی و بەبیەی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ خەڵكی، شت و مەكێكە پێویستە هەروەك شەكرو شیر و شتی تر بكڕێت؟.. وە من ئامادەم كە لەگرانترین شت زیاتری پێبدەم)..

(زانكۆی شیكاگۆ) چەند پرسیارو وەڵامێكی ڕێك خست بۆ ئەوەی بزانێت ئادەمیزادی ئاسایی پێگەیشتوو حەزیان لەچییە زیاتر كە لەهەموو دڵێكیانەوە ئاواتیانە دەستیان بكەوێت..؟..

(١٦٥) پرسیاركرا لەكۆمەڵێ خەڵكی زۆر وەك: ئیشت چییە؟ ئاستی ڕۆشنبیریت ؟ كاتی بێئیشی چۆن بەسەر دەبەیت.؟ مووچەت چەندە؟ حەزو ئارەزووت لەچییە؟ حەز دەكەین چی فێربیت؟..هتد..

پاش ئەم پرسیارو وەڵامە ڕوون بوویەوە كە (تەندروستی) سەرەكی ترین و گرنگترین حەزی هەموانە.. پاش تەندروستی (خەڵكی) مەبەستیەتی.. كەچی بكات تالێی ڕازی بن و چۆن بە چاكی لەگەڵیان بژی وەچۆن خۆی خۆشەویست بكات لەلایان و ڕایان بكێشێت بۆلای بۆچوونەكانی خۆی و ڕازیان بكات بەوەرگرتنی بیروباوەڕو بەرنامەكەی؟.

من بەهۆی تاقیكردنەوەكانمەوە پێش زانكۆی شیكاگۆ گەشتمە ئەم ڕاستییە و پاشان زۆر هەوڵمدا كە بگەڕێم بەدوای كتێبێكدا لەم بارەیەوە بدوێت بەڵام دەستم نەكەوت..

بۆیە قۆڵم لێ هەڵماڵی و ویستم هەربە خۆم ئەم كەلێنە پڕ بكەمەوە.. ئەویش بەدانان و دامەزراندنی چەند ڕێگاو بنەمایەك بۆ هونەری هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ ئادەمیزادەكاندا..

وەبشبێتە سەرچاوەیەکی کردەوەیی بۆ قوتابیانی پەیمانگاکەم..

کتێبەکەش کە دامنا ئا ئەمەیە کە لەبەردەستتدایە.. هەموو هیواو ئاواتێکم ئەوەیە کە ببێتە جێگای ڕەزامەندیت.. بێگومان لەم ڕێیەشدا هەرشتێك باسی پەیوەندی ئادەمیزاد بەبراکەیەوە بکات من خۆم پێگەیاندووەو خوێندوومەتەوە..

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو وەك پیاوێکی کارامەی لێهاتوو (لەگەڕان و خوێندنەوەدا)م بۆ ئەم مەبەستەم تەرخان کرد.. ئەوەبوو ساڵ و نیوێکی تەواو هەرچی کتێبخانە هەبوو هەمووی گەڕام چی کەوتبووە بەرچاوم کە من نەم دیبێت لەو زانیاریانەی کەباسی پەیوەندی ئادەمیزاد بکات لەگەڵ یەکتر لەکۆنترین چەرخی مێژووییەوە تا ئەمڕۆ بێگومان هەموویم بۆ کۆکردەوە..

لەزانای دەروونناسی (ولیم جیمس) دەگێڕنەوە کەوتوویەتی:

ئەگەر بەووردی بەراوردێ بکەین لەنێوان دەروونی مرۆڤ خۆیداو نێوان ئەوەی کە پێویست دەکات چۆن بێت..

بۆمان دەردەکەوێت کە ئێمە نیوە زیندووین، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئێمە بەشێکی زۆر کەمی وزەی مێشك و لەشمان بەکار دەهێنین..

یان بە مانایەکی تر: هەرکەسێ لەئێمە لەسنوورێکی تەسکدا دەژی کە خۆی بۆخۆی دروست کردووە لەسروشتدا.. کەچی لەڕاستیدا زۆر هێزی زیاتری تێدایە.. بەڵام نایان خاتەکار جگە لەڕادەیەکی کەم کەڕاهاتووە بەکاریان بهێنێ).

ئەم کتێبە بۆیە دانرا کە بەپێی توانا ئەو هێزە کپ کراوە گەورەیە لەدەروونندا بخاتە کار و یارمەتی دەربێت لەسەر گەشەو پەرەپێدان و بەرەو پێشەوەبردنی..

کیف تكسب الأصدقاء و تؤثر في الناس

عبالمنعم محمد

ووتەی وەرگێڕە لەعەرەبییەوە

بێگومـان ئـەم کتێبـەم بـەئینگلیزی یەکـەی نەکەوتـە بەردەسـت هەرچـەندە گـەڕام بەدوایدا.. ئەمەش بۆ ئەوەی بەراوردێکی بکەم لەگەڵ وەرگێڕاوە عەرەبی یەکەیدا..

چـونکە شـتێکی ئاسـایی یـە کـە هـەموو وەرگێڕێـك بـەپێ ی نـەریت و زمـان و هەڵسوکەوتی ناوچەکەی خۆی وەری دەگێڕێت لەبەر ئەوە هەندێ گۆڕانی زۆریـان کەم دەخاتە نێوان نوسینەکەوە..

بەهـەر حاڵ من وەرگێڕاوە عەرەبیەکـەیم لەبەردەسـتایە کە مامۆسـتا (عبـدالمنعم محمـد الزیـادی) سـاڵی (١٩٤٦) لـەقاهیرە هەسـتاوە بـەوەرگێڕانی بـۆ سـەرزمانی عەرەبی..

بـەڵام وەك خـۆی دەڵێـت: (هـەر لەهەفتـەی یەکەمـدا هـەمووی تـەواوبوو فرۆشـراو ناچـار لـە مـاوەی پێـنج سـاڵدا واتـە تـا (١٩٥١) (١٦)جـار لەچاپم دایـەوە) دیـسان لـەبازاڕدا نـەما..) ئەمـە بێجگـە لەچـەندان چـاپ کردنـەوەی نایاسـایی و نـاڕەوا کـە بەدزیەوە کراوە..

ئەمەش وەك وتمان لەبەرئەوەیە کە خـەڵکی یـەك سروشـتیان هەیـەو یـەك شـتیان زۆر پێویستە ئەویش ئەوەیە کە چۆن خۆیان بەرنە دڵی خەڵکی و قسەیان بڕوات و خەڵی بکەنە خۆیان.

بـەکورتی هونـەری هـەڵس و کـەوت کـردن زۆر پێویـستە و هـەموو کـەس هـەوڵی دەست خستنی دەدات..

کێ هەیە حەز ناکات کە دایك و باوك و براو خوشك و خێزان و هـاوڕێ و خـەڵکی بەگشتی لێی ڕازی بن و خۆشیان بووێت؟.

کێ هەیە حەزنەکات کەهەر فەرمانێکی دەکرد بێ ملە جەڕێ بە پێخۆشـحاڵییەوە بە گوێی بکرێت.. هەرشتێکی قەدەغە کرد کەس نەیکات..؟

کـێ هەیـە حـەز نـەکات خـەڵکی ڕێـزی بگـرن و لەبـەری هەڵبـسن و باسـی چاکەی بکەن و هەرگیز باسی خراپەی نەکەن؟..

کێ هەیە حەز نەکات قازانج و سودی ماڵیی دەست بکەوێت. بەبێ ئەوەی بـەزۆر یان بەدزی و غەش لێیان بسەنێت؟.. بەڵکو بەخۆشی خۆیان و لەهەموو دڵێکیانـەوە

بیدەنیّ؟.. کێ هەیە حەز نەکات گرنگی پێ بدرێت و دەستخۆشیی و ئافەرین بکرێت و پیا هەڵدانی پاك و دڵسۆزانە ببینێت؟..

کێ هەیە حەز نەکات خەڵکی بێنێتە سەر ڕێگاو ڕێبازەکەی خۆیی و ببنە یارو کۆمەکی جێگیر کردنی ئەو بەرنامەیە لەناو کۆمەڵدا؟..

لەبەر ئەم هۆیانە و لەبەر چەندان هۆی تر ئەم کتێبە ئاوا ڕێزو پلەو پایەیەکی لەڕادە بەدەری دەست کەوت لەنێوان چینی (ڕۆشنبیرو سیاسی و پەروەردەکەران و پیاوانی سەروەت و سامان)دا؟..

## بۆچی ئەم کتێبەم کرد بەکوردی؟

کەوورد دەبومەوەو سەیرم دەکرد خەڵی دوو جۆرن:

١)زۆرجار دەمبینی خەڵکی بە گوێی کەسێ دەکەن و لەقسەی دەرناچن و خۆشیان دەوێت و بەراوبۆچوونەکانی ڕازین و پەسەندی دەکەن و بەبینینی دڵخۆش دەبن و و بەدیار نەبوونی دڵ تەنگ و نارەحەت دەبن!

٢)لە هەمان کاتدا دەمبینی خەڵکی بەگشتی(لەکەسێ) ناڕازین و بەقسەی ناکەن‌و خۆشیان ناوێت و پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی دەبن و هیچی پەسەند ناکەن.. بەدیار نەبوونی دڵخۆش و بەبینینی دڵتەنگ و قاڵسن!..

ئەم دوو هەڵوێستە زۆر کاریان تێدەکردم و لەخۆم دەپرسی: باشە هۆی چییەو دەبێ بۆ وابێت؟.. دەبێ چی وای کردبێ لەو خەڵکە کەبەگشتی دەچنە سەنگەری (ڕازی بوون) لەیەکێ و سەنگەری (نەیار) لەیەکێکی تر؟!.

خۆ بەزانست و پلەو پایە بێت هەندێ جار (دووەم) لە (یەکەم) بەرزترە!..

خۆ ئەگەر بەلەخواترسان و شەونوێژبێت هەندێ جار (دووەم) لە (یەکەم) زیاتری هەیە!..

کەواتە مەسەلەکە شتێکی ترەو لەسەروی ئەمانەو زۆرشتی تریشەوەیەو بەڵام لەلای زۆرێکی خەڵکی دەگمەنەو دەست ناکەوێت!.. ئەویش (هونەری جوان (هەڵسوکەوت) کردنە لەگەڵ خەڵکی!..).

سەیرم دەکرد کەسی یەکەم دڵی بۆ هەمووان کردۆتەوە.. ڕووی خۆشی پڕزەردەخەنەی وەك شەبەقە گوڵ بۆ خەڵکی دەکاتەوە.. بەوردی مەبەستیەتی و گوێ شل دەکات بۆ بیستنی گیروگرفتی خەڵکی.. گرنگی دەدات بەخەڵك.. بەهیچ شێوە نزیکی لۆمەکردن ناکەوێتەوەو ڕەخنەش لەکەس ناگرێت!..

بەڵام کەسی دووەم لەبەر سەرقاڵی و خەریك بوونی بە خۆیەوە بوو بەواری نیە بیر لەخەڵکی‌و گیروگرفتی خەڵکی بکاتەوە!. گرنگی بەڕاوبۆچوونی کەس نادات و بێجگە لەڕاوبۆچوونی خۆی ڕاوبۆچوونی کەس بە جوان و گونجاو نازانێت!!.. ئەگەر ڕەخنە و لۆمەکاری نەکات خۆی بۆ پێناگیرێت و خۆی بەسووك دەزانێت!!..

بۆیە زۆر بەپێویست و گونجاوم دەزانی کە خوێنەرانی کورد زمانم لەم بارەیەوە ئاشنا بکەم و شتێك بخەمە بەردەستیان بۆ ئەوەی بەجوانترین شێوەی هەڵس و کەوت لەگەڵ یەکدا بجوڵێنەوە.. دڵی یەکتر ڕاگی بکەن..

چونکە ئەمڕۆ کوردستان.. بەداخەوە دەڵێم.. کەچەندان بیر و بۆچوون و ڕێ ڕەوی سیاسی جیاجیای تێ فڕێ دراوەو میللەتی کورد پەرتەوازە و جیا جیا بۆتەوە.

هەر ڕێڕەوێکیش با لەسەر هەڵەش بێت خۆی بەتاکە ڵسۆزی گەل دەزانێت!!..

بمانەوێت و نەمانەوێت ئەمە شتێکی سەلبییەو ئەگەر کار وابڕوات دۆستان خەمێك نەخۆن دواڕۆژێکی لێك ترازان و دووبەرەکی و من منۆکێ چاوەڕوانی ئەم گەلە ماف خوراوە دەکات. کەساڵەهای ساڵە خوێن دەڕێژێت و هەوڵ دەدرێت بۆیەك خستن و ڕزگار کردنی.. وەك ئەمڕۆ دەیبینن..

کەواتە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەرزمانی کوردی هەنگاوێکە بۆ ڕۆشنبیرکردنی هەموو لایەك لەبارەی هونەری هەڵس و کەوت کردنی ڕاستەقینەوە لەگەڵ برا هاوڵاتیەکەیداو لەیەك نزیك بوونەوەیان و گرنگی دانیان بەیەك و دانەبارینە سەریەك و یەکتر نەشکاندن و نرخ و ڕێز بۆیەك دانان و گوێ بۆیەك گرتن درووست ببێت، ئەوکاتە هەمووکەس دەتوانێت بە خۆیدا بچێتەوەو بگوێزێتەوە بۆ ڕاست ترین و دروست ترین ڕێگا لەژیانیدا..

وە بۆ ئەوەی بە چاوی سووك کەس سەیری کەس نەکات و بێ نرخانە گوێ بۆیەك نەگرن و گەورەو فراوان بەچاوی بێ ڕێزەوە سەیری بچووك و خوارتر نەکات.. وە کۆن تازە بە خراپ و سووك نەزانێ و تازەیش کۆن پێشێل نەکات..

وە کەس خۆی واسەیر نەکات کە خۆی (ئەسڵە) و لەسەر هەقە.. خەڵکی هەموو (لق)و لەسەرناهەقە.. خۆی بە (ڕیشك) نەزانێ و خەڵکی (بەگەلا)..

ڕیوایەتی خۆی بە (بوخاری) نەزانێت و ڕیوایەتی خەڵك بە (دەیلەمی).. خۆی بەپیاو ماقووڵ و ژیری ناوچەو دڵسۆزی گەل و ئایین نەزانێت و خەڵکی تر هەمووی بەبێ سەرو گوێ و عەوام و بەکرێ گیراوو زیادە دابنێت..

وەکەس بەزۆری توڕە بوون و چاو سوور کردنەوە وشەق کەس نەقەمچێنێتەوە بۆ لای خۆی و حەزو بۆچوونەکانی خۆی..

وەکەس بەس خۆی لەبیر نەبێت بۆ خۆی تێ بکۆشێت.. ئیتر گوێ بەناوو ناوەڕۆکی کەسی تر نەدات و هەر نەشیان ناسێت و حەزیش ناکات بیان بینێت چ، جای لەگەڵیان دابنیشێت و ڕاگۆڕینەوە بکات..

لەبەر ئەمانەو.. لەبەر چەندان هۆی تریش ئەم نوسراوە جیهانیەم وەرگێڕایە سەر زمانە شیرین و پاراوەکەی (کوردی)..

## لەوانەیە لێم بپرسن ؟

**ووتەی وەرگێڕ :**

لەوانەیە هەندێك بپرسن: (ئێمەی موسڵمانی کورد خاوەنی گەورەترین بەرنامەین لەهـەموو جیهانـدا کـەئاییـنی پـیرۆزی ئیـسلامە.. ئـیتر چ پێویـستمان بەبەرهـەم و نوسراوی بێگانە هەیە لەبواری دەروونناسیدا؟!..

لەوەڵامـدا دەڵـێم گومـانی تێـدا نـی یـە کـە ئەگـەر بێـت و خـاڵ بـەخاڵ و ئایـەت بەئایەت خەڵکی قورئـان لـەژیانی خۆیانـدا جێبـەجێ بکـەن.. بەهـەموو دڵنیاییەکەوە دەڵێم کە ژیـانێکی بـەختیار و کامـەران و سـەرفرازی بـاڵ دەکێشێت بەسـەر هـەموو جیهاندا..

وەئەگـەر بـەووردی سـەیرێکی ئیـسلام بکـەین و بڕوانینـە فـەرمان و داواکـاری و قەدەغـەکراوەکانی.. بۆمـان دەردەکـەوێت کـە ئیـسلام پـێش زیـاتر لـە (١٤٠٠)سـاڵ لەمەوبەر گرنگی بە دەروون و دەروونناسی داوە..کەواتە هـەر شتێك و هـەر کەسێك لە مەیدانەدا شتێکی نوسیبێ ئێمە بۆمان هەیە کە لـە ژیانمانـدا بەکاریان بهێنین و سوودی لێ وەربگرین ئەگەر پێچەوانە نەبێت لەگەڵ ئیسلامدا..

وەئـەو ڕێگـاو تاقیکردنـەوە جوانانـەی (دیـل) وا دەزانم وەك ڕاڤـەو لێکدانەوەیـەك وان بۆ ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی (پێغەمبەر)ی خوا(ﷺ)..

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە.. ئیسلام پیرۆزبایی لە هەمو شتێکی جوان و چاك و سوود بەخش و کامەرانی هێنەرو دڵخۆشکەر دەکات و حـەز دەکات دەستی خۆیـانی بخـەن و ژێـر بـاری بخـەن بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان.. وەك (پێغەمبـەر)ی خـوا(ﷺ)دەفـەرموێت: (خـذوا الحکمـة مـن أي وعـاء خرجـت)..واتـە قسەی جـوان و شتی جوان وەربگرن و سوودی لێ وەربگرن ئیتر با لە هەر دەمێکەوە دەربچێت و لـە هەر جێگەیەکەوە بێت..

وەك لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامدا چەندان کتێبی چاك وەرگێڕڕایـە سـەر زمـانی عـەرەبی ، وەك کتـێبی(کلیلـەو دیمنـە)ی فەیلەسـوفی هنـدی(بیـدبا) کرابـە عـەرەبی و یەك زانای ئیسلام نارەزاییان دەرنەبڕی..

هەروەها وولاتانی ڕۆژئاوا هەموو شتێکی چاکی وولاتی ئیسلامیان برد و لەبەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێنا و کەڵکیان لێ وەر گرت وەك بواری پزیشکی و گەردوونی و فەلسەفی و..هتد...

بەلام بەپێچەوانەوە ڕۆڵەکانی بەناو موسڵمان نەڕۆیشتن چی شتێك چاکە و پڕ سوودە بۆ وولاتی ئیسلام لە ئەوروپاوە بیهێنن وەك پیشەسازی و تەقەمەنی و کشتوکاڵی و ئاسمانەوانی و..هتد..

بەڵکو-بەداخەوە-ڕۆیشتن چیان بۆ هێناینەوە؟!.

جۆری جل و بەرگ و مۆدێلی بەرگیان بۆ هێناین.. کە بەرهەمەکەی ڕووتی و بێ بەرگی ئافەرتان بوو..

جۆری داهێنان و بڕین و مێش کردنی قژیان بۆ هێناینەوە وەك بڵێی ئافرت پێویستی بە هیچ نییە بەوە نەبێت.. سەنتورو پیانۆو گۆرانی و سەمایان بۆ هێناین.. جۆرەکانی جومناستیك و مەلەی بێ بەرگ و بەناو وەرزشەوانیان بۆ هێناین.. فلیمی ڤیدیۆ و سینەمای ( هونەریی دابەزیویان) بۆ هێناین..هتد.

بەلام کەس نەیگوتووە و کەس ناڵێت لە وولاتانی جیهان هیچ وەرمەگرن بەڵکو شتێك کە کەڵکی هەبێت بۆ ژیانی ڕۆژانە و زیانیش لە بیروباوەڕی گەلی موسڵمان نەدا ئێمە بە پێویستی دەزانین کە میللەتەکەمانی پێ ئاشنا بکەین..

منیش دڵنیام کەوەرگێڕانی جۆرە نوسینێکی ئاوا چاك و پاك بۆ سەرزمانی کوردی ، کەڵکێکی باش بەهەموو چینەکانی گەل دەگەیەنێت ئیتر خوێندەوارو ڕۆشنبیر بن یان کاسب و دوکاندار بن..یان مامۆستا یان قوتابی بن.. یان پیاوانی سیاسەت و کارمەندی وولات بن.. یان پیاوانی سەرمایەدار و دەوڵەمەند و سامان داربن.. هەرهەموویان لە بواری خۆیاندا سوود لەم کتێبە وەردەگرن..

لەوەش دەچێت بپرسن: باشە وەرگێڕ چ پێویستی کردووە لەسەر زۆری لەبەشەکانی ئەم کتێبە ڕۆیشتوەو درێژەی پێ داوە؟.

لەوەڵامدا دەڵێم:

هەموو نوسراوو کتێبێك کە دادەنرێت نووسەرەکەی کارتێکردنی دەوروبەرو نەریت و باو و هەڵس و کەوتی تایبەتی خەڵکی ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژی وای لێ دەکات کە ناچار مۆرکی ئەو سەردەمەی پێدا بنێ.. هەندێ تایبەت مەندی بەکار دەهێنێ کە ئەو گەلەی خۆی نەبێت کەس بەو چەشنە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ناکات..

بۆیە وەرگێڕ ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە میللەتەکەی سوود و کەڵك لەو نوسینە وەرگرێت دەبێ ئەو جیاوازییەی لە نێوان میللەتی نووسەرو میللەتی وەرگێڕدا هەیە ڕەچاو بکات.یان هەندێ شت هەیە کە نووسەر لەکاتی خۆیدا بەپێویستی زانیوە کە گەلەکەی خۆی پێ ئاشنا بکات.. کەچی وەرگێڕ سەیری گەلەکەی خۆی دەکات هیچ پێویستیان بەوە نییە یان بە بە پێچەوانەوە هەندێ شت زۆر سوود بەخش و پێویستن بۆ گەلی وەرگێڕ.. کەچی چونکە لەکاتی خۆیدا نووسەر بەپێویستی نەزانیوە بۆ گەلەکەی و هەرباسیشی نەکردوە بۆیە من بە پێویستم زانی کە زیادەیەك لەسەر هەموو بەشێك بنووسم–ئەمەش نەك لەبەر ناتەواوی نووسینەکەی(دیل)بەڵکو وەك ووتم مرۆڤ چەند نموونەیەکی زیندوو لەسەر دەمەکەی خۆی باس بکات زیاتر کتێبەکە سوود بەخشتر دەبێت..

هەروەك ئەمە مافێکی ڕەوای وەرگێڕە و خۆی دەور دەبینێ و ئەتوانێت چەند ئەوەندە نووسەر درێژە بدات بە باسەکە بەمەرجێك بەجیا بینوسێت و تێکەڵ بە نووسینەکەی نووسەری نەکات..

وە من شتێکی تازەم نەکردووە بەڵکو وەك برایەك ئاگاداری کردم کە بەرێز(محمد غزالی)کارێکی ئا لەم چەشنەی کردووە و لەنوسنێکیدا لەسەر ئەم کتێبەی (دیل)ڕۆیشتووە بەڵام بەداخەوە زۆر گەڕام دەستم نەکەوت ووتیان پێم هەر لە عێراقیشدا دەست ناکەوێت مەگرێ بۆی..

**من لەم کارەمدا دوو مەبەستم هەبووە:**

**یەکـــەم**/بـەم کـارە(کەمـەم) و یـستوومە چـمکێکی کـەم لـەو دەروونناسـیەی کـە بەرنامـەی ئیـسلام هێناویـەتی و پـێش هـەموو زانایـانی دەرونناسـی باسـی ڕێگـاو بنەماکانی دەروونی خەڵکی کردووە و هەر یەکەو جۆرە هەڵس و کەوتێکی تایبـەتی بۆ داناوە..

وەدەرکـەوێت بـۆ هـەموان کـە ئیـسلام هەژارنییـە لـەم بوارەدا تـا پـەنا بەرینـە بـەر نووسـراوی بێگانـە و کـوردی موسـڵمان ڕقـی لەکـەس نییـەو نووسـینی کـەس ئەگـەر مەبەستی پاك بـووبێ بەبڤەو حەرام نـازانێ.. وە ئێمـە ڕقمـان لـە ئـەوروپا نیـە بـەڵکو ڕقمان لە بیروباوەڕو دور لەڕەوشتی ناپاکی و خۆپەرستییەکە یانە..

وەبۆ ڕۆڵەکانی(بەناو)موسڵمان دەرکـەوێت کـە ئـەو (ئـەوروپا)یـەی ئـەوان خـەونی پێوە دەبینن و بەمامۆستای خۆیانی دەزانن ئاگاو خەبـەری لـە دەروونناسـی(و هـیچ زانیارییـەکی تـر نـەبووە و کـورد واتـەنی(لـەگوێی گـادا خـەوتبوون). کـە سـەیری ئیـسلامی بێگـەر دەکـەی پـێش هـەزار و چوارسـەد سـاڵ بـەر لەئێـستا دڵ و مێـشکی مرۆڤایەتی کردەوە و هەموو ئەوانیش زانیاریەکی بەسودیان پەرەپێداوە).

**دووەم**/دەمبـینی هەنـدێ لـە موسـڵمانان لـەکاتی بـانگ کردنـی خەڵکیـدا بـۆلای ئیـسلام و شـیرین کردنـی بەرنامەکـەی پـەروەردگار لـەدڵ و دەروونـی خەڵکیـدا شکستیان خواردبوو چونکە لە بواری دەروونناسیدا لاواز بوون نەیان دەزانـی بـەچ هۆیەك زووتر و چاکتر بچنە دڵی خەڵك و ئیسلام بکەنەوە بەبەرنامەی ژیانیان..

(بانگ کردنـی خەڵك) زۆر نارەحەتـە و شتێکی ئاسان نییـە و دەبێت هونـەرێکی چاك بزانیت لەبواری هەڵس و کەوت کردندا.. چونکە ڕووی گرژ و مۆن و داخـراوی هەنـدێك و ڕەخنـەو لۆمـەو سەرزەنـشتی هەنـدێ تـرو.. گرنگـی بەخـەڵك نـەدانی هەنـدێکی تـرو هتـد..وایـان کـردووە کـە هەنـدێ کـەس چـونکە لـەم هونـەرەدا تێـك شـکاوون... دەبـینی بەقـسەی ڕەق خـەڵکی ئەوەنـدەی تـر لـەدین دووردەخەنـەوە.. یەکێ دەناسم: کەویستبووی خوشکێکی موسڵمانی نوێژکەرو ڕۆژووگر والێ بکات

کەسەرپۆش لەسەر بکات..پێی وتبوو: تۆ نەنوێژ و نەڕۆژووت دروستە مادەم سەرت ڕووتە!!

منیش جارێك ویستم، وابکەم لە کچێك سەرپۆش بکات کە زۆر دوور لە (حیجاب)بوو.. پێم ووت: خوشکی خۆم تۆ نوێژ کەریت و ڕۆژوو دەگریت ئای پاداشت زۆرە لای خوا..بەڵام خۆزگە لە هەموو شتێکدا ئاوا ڕێی پەروەردگارت بگرتایە.. ئەو ئافرەتە خۆی تێگەیشت و ووتی:إنشاءالله حیجابیش دەکەم..

هەندێکی تر تێکەڵی خەڵکی ناکەن و لە نزیکەوە خەڵکی ناناسن و هەر لەدوورەوە دوو قسەی وشك و سەرزارەکی لەگەڵ دەکات.؟. وەك: ئەوە ئەڵێی نوێژ ناکەی؟ ئەوە بۆ نایەی با پێکەوە دەرسێکی قورئان بخوێنین.. ئیتر نازانێت کە ئەم هەژارە دوژمنانی ئیسلام هەزار و یەك گومانیان بۆ دروست کردووە و ووشەی مزگەوت و قورئان و دەرسیان لەلا ناشیرین کردووە بێگومان لەوەلامدا دەڵێت: بۆم ناکرێت یان دەڵێت نوێژی چی و شتی چی؟..

نموونەیەکی تر کە موسڵمانانی ئەم ناوچەیەی خۆمان هەندێ تیرەو هۆز نزیکیانن(وەك هاواری)بۆ نمونە، کە نەئەوەیە بەرنامەیەکی وردو داڕێژراویان هەبێت وەنەئەوەیە کە بێنە ژێر بەیداخی ئیسلام.

زانا و تێگەیشتوانی ئیسلام و خەڵکی ناوچە هەر هەموویان جۆرە هەڵس و کەوتێکی وا نا نوێنن کە سەرنجیان بۆلای ئیسلام ڕابکێشن بەقسەی خۆش و تێکەڵی و دەم بە پێکەنین و بەهاناوە چوون و سەردان و هەواڵپرسین و ڕووی خۆش پێدانیان.. بە پێچەوانەوە -بەداخەوە دەڵێم-بە هیچ جۆرێ نزیکیان نابنەوەو ڕووی خۆشیان پێ نادەن و سڵاوی گەرمیان لێ ناکەن.. خۆ تێکەڵی کردن‌و نانخواردن لەگەڵیان و چوونەماڵەکانیان و گرنگی پێدانیان ئەوە هەرنییەو حەرامە و..

بگرە چەندان قسەی ڕەق و بێتامی هەندێ موسڵمانی(نەفام)ئەوەندەی کە لە (ئیسلام)دوریان دەخاتەوەو بگرە وایان لێدەکات کە بیر لە مسوڵمان بوون ناکەنەوە. وەك پێیان ئەوتن (کافر) (بێ دین).. سەگ دین.. گڵاو پیس.. خۆ

مەسەلەی (خشتە سورەکە و ئاو بەخۆدا کردنەکە) شتێکی بڵاوو بەڵگە نەویستە کە بەکورتییەکەی دەڵێت: (هاواری) موسڵمان نابێ و پاك نابێتەوە هەتا نەچێتە سەر خشتێك و ئەوەندە ئاو نەکات بەخۆیدا تا خشتەکەی ژێری دەتوێنێتەوە.. کە نەخواو نە (پێغەمبەر)(ﷺ) لە ئیسلامدا شتی وایان نەفەرمووە..

کەبەڕاستی من زۆر بەپەرۆشی ئەوەوەم کە ئەو جۆرە کەسانە وەك گوڵنین با دڕکیش نەبن..یان واز لە (بانگەواز کردن)بهێنن یان با بەڕاستی و بەتەواوی شوێن (پێغەمبەر)کەیان هەڵگرن و لەهونەری هەڵس و کەوت کردندا وەك ئەو وابن دڵ و گیانیان بۆ هەموان بکەنەوەو باوەشی نەرمیان بۆ هەموان کراوە بێت و بەدەم خۆشی و ناخۆشی هەموو کەسێکەوە بن!!.

لەبەر ئەمانە و لەبەر چەندان هۆی تر.. ئەم نووسینەم بەدرێژە پێدانەوە خستە بەردەستی خوشك و برا کوردە موسڵمانەکانم.. بەو هیوایەی کەبەوردی بیخوێننەوەو بەخۆیان بڵێن: بەڕاستی هەقە وابین و خۆ ئەڵێی لەگەڵ منیەتی!..

لەم وەرگێڕانەدا هیوام ڕەزامەندی تاقە خوایەو سوود وەرگرتنی خوێنەری بەڕێزە...

## پێش چوونە ناو باسەکان:

**ڕێگاکانی بەکارهێنانی ئەم کتێبە :**

١-ئەگەر دەتەوێت بەباشی سوود لەم کتێبە وەربگریت.. یەك داواکاری سەرەکی هەیە ئەویش ئەوەیە حەزێکی پڕ تاسە لەخۆتدا دروست بکە بۆ گەشەدان بە توانای هونەری جوان هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا) وە ئەگەر ئەم حەزەت تێدانەبوو ئیتر چ سوودی هەیە با هەزار شت لەبارەی پەیوەندییە ئادەمییەکانەوە بزانیت!..

ئەم حەزە لە خۆتدا چۆن دروست دەکەیت؟..

بەهەمیشەیی و گشت کات گرنگی و بەسوودی ڕێگاکانی ئەم کتێبە بخەرەوە بیری خۆت..!

شێوەکەی بێنە یادی خۆت کە چۆن سەرکەوتنی مادی و کۆمەڵایەتیت دەست دەکەوێت.. ئەگەر بێت و ڕێگاکانی جێبەجێ بکەیت!..

وە چەند جارو دووبارە بەخۆت بڵێ: (سەرکەوتنی مسۆگەر و کەسایەتی و بەختەوەریم لەسەر ئەوە وەستاوە کە لێزان بم لەهونەری هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا)!..

٢-هەموو بەشێکی ئەم کتێبە یەکجار بەپەلە بخوێنەرەوە.. بۆئەوەی فیکرەیەکی گشتی لەوبارەوە وەرگریت.. لەوەدەچێ ئەمە پاڵت پێوە بنێ بۆ خوێندنەوەی بەشەکانی تری.. نەکەی بڕۆیت بۆ بەشێکیتر!..

مەگەر بڵێی بۆ خۆشی دەیخوێنمەوە!!.. بەڵام ئەگەر بۆئەوەی دەخوێنیتەوەو مەبەستت ئەوەیە کە خۆت پەروەردە بکەیت لەسەر هەڵس و کەوتی کارامەو جوان لەگەڵ خەڵکیدا.. ئەوکاتە لەکوێوە دەستت پێکردووە بۆ جارێکیتر بگەڕێرەوە سەری.. دووبارە بیخوێنەرەوە بە ووردی و لەسەر خۆیی خەیاڵی بەرێ.. ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێت کە ئەم ڕێگایە کاتت بۆ دەگەڕێنێتەوەو باشترین ئەنجامیشت بۆ مسۆگەر دەکات؟..

٣-زۆر جار لەکاتی خوێندنەوەکەتدا بوەستەو.. ورد بەرەوە لەوەی کە خوێندووتەوە.. پاشان لەخۆت بپرسە: چۆن؟ و کەی دەتوانم بەکردەوە ئەم پێشنیارانە جێبەجێ بکەم؟.. ئائەم شێوازە خوێندنەوەیە کە بەهێمنی و وردی و لەسەر خۆیە باشترەو یاریدەدەرتە لەوەی کەبەپەلە بیخوێنیتەوەو ڕابکەیت.. (دوور لەتۆ) وەك چۆن سەگی ڕاوی بەدوای کەروێشکێکی جواندا بەپڕتاو ڕابکات!!..

٤-لەکاتی خوێندنەوەکەتدا با قەڵەمێکی سوریان ڕەشین بگری بەدەستتەوەو هەرکەگەیشتیتە پێشنیارێکی گرنگ کە سوودت پێ دەگەیەنێت لەشتێکدا.. خێرا خەت بهێنە بەژێریدا.. ئەگەر پێشنیارەکە هەمەلایەنە بوو.. لەیەکێ زیاتر بوو.. ئەوە بێجگە لە خەتەکەش نیشانەیەك لەبەردەم هەریەکەیاندا دابنێ کە لەوانی تری جیابکاتەوە وەك دانانی ئەم نیشانەیە زۆر یارمەتی دەرن بۆ کاتی پیاچوونەوەی لەکاتی پێویستیدا..

٤-پیاوێك دەناسم ماوەی (١٥)ساڵە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی (مسۆگەر کردنی ژیانە) (تأمين على الحياة) ئەم پیاوە مانگانە هەڵدەسا بەخوێندنەوەی هەموو(ئەو) عەقدو نوسراوانەی کە لەو مانگەدا جێبەجێ کرابوون.. بۆچی وای دەکرد؟..

چونکە تاقیکردنەوەی فێری کردبوو کە ئەمە باشترین هۆیە بۆ لەبیر نەچوونەوەی کاکڵەی ئەو نوسینانە لەمێشکیدا..

بۆماوەی دووساڵ خەریکی نوسینی کتێبێك بووم لەبارەی ووتاری گشتییەوە.. هەموو جارێ ناچار دەبووم بەخوێندنەوەو پێداچوونەوەی ئەوانەی کە نوسیبووم.. ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە زنجیرەی خەیاڵ و شێوازی نوسینی خۆمم لەبەرچاوبێت و لێی لانەدەم..

کەواتە ئەگەر دەتەوێت سودێکی باش و نەبڕاوەت لەم کتێبە دەست بکەوێت.. وانەزانی مەرج پەڕە هەڵدانەوەیەو بەس.. بەڵکو پێویستە هەرکە لەخوێندنەوەی بەشێك بوویتەوە.. مانگانە چەند کاژمێرێك تەرخان بکەیت بۆسەر لەنوێ پێداچوونەوەی..

کتێبەکە مەخەرە نێوان کتێبەکانی ترتەوە بەجۆرێ کە دیارنەبێت لەبەرچاو.. بەڵکو لەبەر چاوتدا دای بنێ و هەموو جارێ بەپەلە سەیرێکی بکەرەوە.. وەبائەوەت لەپێش چاوبێت کە جێبەجێکردنی بڕگەکانی ئەم کتێبە شتێکی هەڕەمەکی و ئاسان و ئاسایی نییە.. بەڵکو دەبێت باش پیاچوونەوەی بکرێت و .. هەردەم لەبیروهۆشدا بهێڵرێنەوە..

٦-جارێکیان (بەرنادشۆ) ئەم تێبینییەی دا (زانین و زانست هەر ئەوە نییە کە بەدەمی خەڵکی فێر بکرێت و بەس.) وە (شۆ) ڕاست دەکات چونکە زانستی فێرکردنی هیچ کەڵکێکی نییە ئەگەر نەچێتە مەیدانی جێبەجێ کردنەوە..

ئەگەر دەتەوێت ئەو ڕێگاو پێشنیارانەی لەم کتێبەدا هەیە بەجوانی فێریان ببیت و لە بیرت نەچنەوە دەبێت بەکردەوە جێبەجێیان بکەین..

هەمووکات و لەهەموو جێیەکدا جێبەجێیان بکە.. ئەگەر وانەکەیت بەخێرایی لەبیرت دەچنەوەو نامێنن لەبیرتدا.. هەندێ زانست هەیە هەمیشە لەمێشکماندا دەمێنێتەوە بۆ؟!

چونکە لەژیانی ڕۆژانەدا جێبەجێیان دەکەین..

لەوانەیە خۆشم (وەك تۆ) لەبەردەم جێبەجێ کردنی پێشنیارەکانی ئەم کتێبەدا ناڕەحەتی زۆرم بەسەر هاتبێت.. وەهەندێ جار بێزارو ناڕەحەت دەبم لەکاتی جێبەجێ کردندا..

بۆنموونە/ هەموو کەسێ واپێی خۆشە و لای ئاسانە کە ڕەخنە بگرێت و لۆمەی خەڵك بکات لەوەی کە هەوڵی تێگەیشتن و هەست کردن بدات.. یان بۆ هەڵەی خەڵکی بگەڕێت ئاسانترە تا بگەڕێت بۆلایەنی چاکەو پێداهەڵدانیان.. وە لەوبارەیەوە قسە بکات کە خۆی پێی خۆشەو حەزی لێیەتی نەك لەوەی کە خەڵکی پێیان خۆشەو حەزیان لێیەتی..

بەڵام بائەوەت لەیاد بێت کاتێ ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە بۆ زانیاری کۆکردنەوە نییەو بەس.. بەڵکو هەوڵ دەدەیت کەچەند هونەرێکی نوێ لەڕێگاکانی هەڵس و

کەوت کردن دەست بخەیت و چەند ڕەوشت و نەریتێکی تازەت دەست بکەوێت بۆ ژیان..

دەی ئەمەش زۆر پێویستی بەکات و خۆناڕەحەت کردن هەیە.. کەواتە تا دەتوانیت بەردەوام پەڕەکانی هەڵدەرەوەو ئەم کتێبە بکە بە سەرچاوەیەکی کردەوەیی لەهونەری پەیوەندییە ئادەمیەکان (فن العلاقات الإنسانیه).

ئەگەر هات و کۆسپ و تەگەرەی تایبەت هاتە ڕێگەت.. وەك: بتەوێت مەیلی منداڵەکەت بۆ لای خۆت ڕابکێشی یان ویستت سۆزی خێزانەکەت دەست بکەوێت یان کرێکارێکی سەرکەش بێنیتە ژێر بار..

هەوڵ مەدە یەکسەر پەنا بەریتە بەرچارەسەرە سروشتییەکە واتە غەریزەی تووڕە بوون و زۆر نواندن.. ئەوە هەمیشە هەڵەیە..

بەڵکو وەرە یەکسەر پەڕەکانی ئەم کتێبە هەڵبدەرەوەو سەیرێکی ئەو پێشنیارانە بکە کە دیاریت کردوون بە نیشانەی جیاجیا.. وە هەوڵ بدە جێبەجێیان بکەیت.. پاشان ببینە چ کارێکی ئەفسوناویت دەست دەخات..

٧-پارەیەکی کەم (١٥٠)دیناری چاپی نوێ بدە بەخێزانەکەت یان کوڕەکەت یان هاوڕێکەت لە ئەنقەس خۆت بڕگەیەك بشکێنە یا بیخەنەوە بیرت و تۆش لەباتیدا پارە یان پێ بدە بەم جۆرە جێبەجێکردنی ئەم کتێبە دەبێتە یاریەکی خۆش و زەوقلی..

٨-بەڕێوەبەری بانقێکی گەورە لە (وولْ ستریت) بۆ قوتابییەکانی گێڕایەوە کەڕێگایەکی تایبەتی زۆر چاکی هەیە بۆ ڕاست کردنەوەی خۆی.. ئەم پیاوە هەرچەند نیمچە خوێندەوارییەکی هەبوو کەچی بوو بەیەکێ لەپیاوە هەرە دەڵەمەندە کارامەکانی ئەمەریکا..

خۆی باسی کردووە کە هۆی سەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێگایەی کە بۆخۆی هەڵبژاردبوو.. من وازدەهێنم با خۆی بۆتان بگێڕێتەوە:

(ماوەیەکی زۆرە وا خۆم ڕاهێناوە کە ڕۆژژمێرێك دەخەمە گیرفانم و چی چاوپێکەوتن و بەخەڵك گەیشتنێکم کرد بێ هەموویم تێدا دەنووسیەوە.. وە هەموو

کۆتایی هەفتەیەك لەکاتی شەودا بەتەنها دەبم و دەست دەکەم بە لێپرسینەوەیەکی خۆم..

بۆیە ڕۆژ ژمێرەکەم دەردەهێنا و هەموو بەخەڵك گەشتن و چاوپێکەوتنەکانم دەهێنایەوە یادی خۆم.. لەگەڵ هەموو دەمەقاڵەو لێکۆڵینەوەکاندا و پاشان لەخۆمم دەپرسی:

ئەو هەڵانە چین کە کردووتن؟.. ئەی ئەوشتە پرسوودانە چین کردووتن یان نەتکردوون؟!. وە بە چ ڕێگایەك بتوانم لەمەولا خۆم چاك بکەم؟..

ئەو دەرس و ئامۆژگاریانە چین کە لەتاقیکردنەوەی هەفتەی ڕابردوودا دەستم کەوتن؟..

زۆرجاربێتاقەتیی و بێزاریی ڕووی تێ دەکردم بەبۆنەی ئەو هەڵەو گێلیانەی کە لەو ماوەیەدا کردوومن..

بەڵام ئەوەندە هەبوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرە بەرە کەم کەم لەو هەڵانە دەتەکێنم و گێلیم نەماوە..

ئەم ڕێگایە لەهەموو ڕێگاکانی تر زیاتر سودی پێ گەیاندم لەپەرەپێدانی توانای هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا..

دەی تۆش بۆچی ڕێگایەکی بەم جۆرە ناگریتەبەر بۆ لێپرسینەوەی خۆت لەجێبەجێکردنی ڕێگاکانی ئەم کتێبەدا؟..

٩-ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی کە لەپێناو جێبەجێکردنی ئەم ڕێگایانەدا دەیدەیت.. لە دەفتەرێکی یان لە ڕۆژژمێرێکی تایبەتی‌دا بینووسەو پاشان لەجێیەکداهەڵی بگرە..

ئای چەند خۆشە پاش ماویەکی تر بگەڕێیتەوە سەریان و چاوێکیان پێدا بخشێنیتەوە کەواتە ئەگەر دەتەوێت بەجوانترین شێوە کەڵك لەم کتێبە وەربگریت.. ئەم پێشنیارانە جێبەجێ بکە:

١-حەزوو ئارەزوویەکی پڕ تاسە لەخۆتدا دروست بکە بۆ زیاترکردنی توانایی جوان هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا..

٢-هەموو بەشێك دووجار بخوێنەرەوە.. پێش چوونە سەر شتێکیتر..

٣-هەندێ جار لەخوێندنەوەکەتدا ڕاوەستەو لەخۆت بپرسە: باشە چۆن ئەم پێشنیارەی کە دێتە ڕێم جێبەجێی بکەم؟..

٤-نیشانەیەك لەپاڵ هەموو خاڵێکی گرنگدا دابنێ..

٥-مانگی جارێك پیاچوونەوەیەکی بکە و بیخوێنەرەوە..

٦-ئەم (ڕێگایانە) لەهەموو ڕووداو و کاتێکدا جێبەجێبکە.. وەئەم کتێبە بکە بە سەرچاوەیەکی کردەوەیی.. یارمەتیت دەدات بۆ چارەسەرکردنی کۆسپ و چەڵمەکانی خۆت..

٧-هەوڵ بدە تۆزێ خۆش و بەلەزەتی بکەیت وەك گەمەیەکی خۆشی لێبکە.. بەوەی کەلەڕێگایەکی لاتدا (یان بەئەنقەست خۆت لادا) دینارێك بدە بە هاوڕێکەت یان خزمەکەت کاتێ کە ڕاستت دەکاتەوە و ئاگادارت دەکاتەوە..

٨-هەموو هەفتەیەك جارێك پێدا چوونەوەیەکی خۆت بکەو چیت کردووەو یان چ زیانێکت پێگەیشتووە.. لەخۆت بپرسە: ئەو هەڵەو لاریانە چین کە کردووتن؟ وە تا چ ڕادەیەك گۆڕانت بەسەردا هاتووە.. ئەو دەرس و ئامۆژگاریانە چین کە دەستت کەوتن و بۆ دواڕۆژت بەکەڵکن؟..

٩-با ڕۆژژمێرێکی تایبەتیت پێبێت و یەکسەر هەڵسە بەتۆمار کردنی کات و شوێنی جێبەجێ کردنی ئەم ڕێگایانە..

## بەشی یەکەم

## سێ بنەڕەتی هونەری لەهەڵس و کەوت دا

### یەکەم/ بۆنەوەی هەنگوینت دەستکەوێ شانەی هەنگ تێك مەدە .

لەحەوتی مانگی مایۆ ئایاری ساڵی (١٩٣١) تاوانبار و خوێن ڕێژ (کرۆلی دەبڵ دەمانچە) لە شاری نیویۆرك دەستگیر کرا کە هەرگیزاو هەرگیز نیویۆرك پیاوکوژو سەرکەشی وەك دەبڵ دەمانچەی بەخۆیەوە نەدیبوو لەوکاتەوەی دروست بوەو پایتەختە.

لەوڕۆژەدا، (٥٠٠)پۆلیسی بەهێز دەوروپشتی ئەو خانووەیان دا کە (کرۆلی) تێیدا بوو کەماڵی خۆشەویستەکەی بوو.. هەستان بەوەشاندنی گازی فرمێسك ڕژێن بەڵام بێ سوود بوو..

ناچار بەتیربارو چەکی قورس سەربانی ماڵە دراوسێکانیان گرت و دەستیان کرد بە تەقە کردن.. بەجۆرێك کە گەڕەکی (وست ئاند)ی جوان و کەشخەی ناوجەرگەی نیویۆرك بۆماوەی یەك کاژمێر هاتبووە هەژان و ئاگر باران بوو بەسەر ئەو ماڵەی کە (کرۆلی) خۆی تێدا حەشار دابوو..

کاتێ (کرۆلی) دەست گیرکرا، سەرکردەی پۆلیسەکان ووتی: ئەم دەبڵ دەمانچەیە ترسناك ترین تاوانبار و خوێن ڕێژە کەپایتەختی ئەمەریکا بەخۆیەوە دیبێتی، چونکە بەپەڕە مریشکیش بوایە خەڵکی بێتاوانی سەردەبڕی و لەناوی دەبرد)..

بەڵام با بزانین ئەم کرۆلییە چۆن سەیری خۆی دەکرد؟ لەکاتێکد ا کەپیاوانی پۆلیس خەریکی تەقە و ئاگر باران بوون بەسەر ماڵی کرۆلیدا کەچی کرۆلی خەریکی نوسینی نامەیەك بوو کەتیایدا نوسیبووی (بۆهەموو ئەوانەی کەمەبەستیانە بزانن، بابزانن کەلەنێوان دەروونمدا دڵێکی سەرگەردان هەیە بەڵام بەبەزەییە، دڵێك کە ڕق و کینەی تێدا نیەو خراپەی بۆ هیچ دروست کراوێك ناوێت)..

بەڵێ فەرمانی لەسێدارەدانی کرۆلی دەرکرا کە بەکورسی کارەبایی بیکوژن کاتێ کە بردیان بۆ ژووری سێدارە لە زیندانی (سنج سنج) نەیووت: (ئەمە پاداشتی

خوێن ڕێژی و تاوانباریم بوو) بەڵکو ووتی (ئەمە بوو پاداشتی بەرگری کردنم لە خۆم)!!

ئەوەی مەبەستمانە لەچیرۆکی کرۆلی ئەوەیە کەلەگەڵ ئەو پیسی و تاوانباریەیدا لۆمەی خۆی نەکردووەو خۆی بەهەڵە نەزانیوە..

باشە ئایا کرۆلی جۆرە خەتابارێکی تایبەتی بووە؟ بێگومان نەخێر..

گوێ بگرە بۆ ئەم بەسەرهاتە: (گوڵی عومرم بەزایەدا لەپێناو گەڕان بەدوای خەڵکیدا و پڕکردنەوەی کاتە بۆشەکنیان کەچی پاداشتم لەسەر ئەمە ئەوەبوو کەپیاوانی پۆلیس هەوڵی خوێن ڕشتنم دەدەن..)

ئایا گومانت بۆ کێ دەچێت کەئەم قسەیەی کردبێت؟..

ئەمە ووتەی (ئال کابونی) تاوانبارە کە نازناوی دەرکردبوو بە (دوژمنی ژمارەیەکی گەل) کە سەرکردەی دڵڕەق ترین باندی تاوان و خوێن ڕێژی بوو لە (شیکاگۆ) سەری هەڵدا..

ئەم (ئال کابونی)یە هەرگیز لۆمەی خۆی نەکردووە، خۆی بەهەڵە نەزانیوە..

بەڵکو وای پیشان داوە کە پیاوباشێکی چاکە خوازی کۆمەڵایەتییە، بەڵام میللەت نرخیان نەزانیوەو لێی تێنەگەیشتوون..

دیسان (شوڵتر هوڵندی) کەیەکێك بوو لەهەرە بەناوبانگ ترین تاوانبارەکانی نیویۆرك..

ڕۆژێ لەیەکێ لەقسەکانیدا کە بۆ ڕۆژنامە نووسێکی کردبوو، تیایدا خۆی بە (چاکە خوازێکی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دابوو، وە هیچ کات گومانی نەبوو لەڕاستی ئەم قسەیەی).

زۆرجار لەنێوان من و بەڕێوەبەری زیندانی (سنج سنج)دا لەم بارەیەوە نامەو وتووێژ ڕووی دەدا لەنێوانماندا.. ڕۆژێ بۆی نوسیم کە گوایە (کەم جار ڕێك دەکەوێت لەتاوانبار و پیاو کوژاندا کەسێ هەڵکەوێت کە خۆی بەتاوانبار و خراپە لەقەڵەم بدات.. هەموو ئەو زیندانیانەی زیندانی (سنج سنج) واسەیری خۆیان دەکەن هەروەك چۆن تۆ سەیری خۆت دەکەیت..

وەبەو جۆرە شێوازەی کەخۆیان هەیانە دەیسەلمێنن کە بێتاوان و پاك و بێگەردن.. وە لەو باوەڕەدان کە بەهیچ جۆر پێویست ناکات و ژیرانە نییە کە ئەمان ئاوا بەند کراوون..

جا ئەگەر (ئال کابوونی و دەبلْ دەمانچە و شولتز هۆڵەندی) و هاوچەشنانیان لەخراپە کاران و پیاوکوژان لۆمەی خۆیان ناکەن هەرگیز. دەئیتر چۆن بمانەوێت لەخەڵکی بەڕێز و ڕێك و پێك، کە من و تۆ لەگەڵیان دەژین و پێکەوە پێوەندین کە بتوانن قبوڵی لۆمەو سەرزەنشت بکەن؟..

ڕۆژێکیان لێپرسراوی دارایی بەناوبانگ (جون وانامیکر) پێی ووتم:

(پەند وەرگرتنم لەتاقیکردنەوەی (٣٠)ساڵ تەمەن بۆم دەرکەوتووە کە گەمژەییە گەر بتەوێت لۆمەی کەس بکەیت.. ئیتر پاشان دەستم کرد بەڕاست کردنەوەی هەڵەکانی خۆم و وازم هێنا لەوەی بیربکەمەوە لەوەی کە بۆچی خوای پەروەردگار ژیری و زیرەکی و بەهرەیی بەیەکسانی بەش نەکردووە بەسەر خەڵکیدا..

(وانا میکر) بەخێرایی گەیشتە ئەم باوەڕە بەڵام من زیاد لەچارەکە سەدەیەك لەناو ئەم بیرە لارەدا دەژیام وام دەزانی کە لۆمە کردن بەسودە بەڵام پاشان گەشتمە ئەو باوەڕەی کە لە (٩٩٪)ی خەڵکی خۆیان بەهەڵە نازانن و لۆمەی خۆیان ناکەن ئیتر با هەڵەکانیشیان زۆر بڵح بێت..

(لۆمە کردن) بێسوودە نەزۆکە چونکە وادەکات لە ئادەمیزاد کەدەست بکاتە بەرگری کردن لەخۆی، ئەیبات بەرەو بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاستی بۆچوونەکەی و هەوڵ دەدات بەرزی و سەربڵندی خۆی نەنەوێت..

برای خوێنەری خۆشەویست دەتوانیت هەزاران نموونەی تۆمار کراو لە لاپەڕەکانی مێژوو ببینیت کە کاتێ ڕاستی نەزۆکی و بێسوودی (لۆمەکردن ) پیشان دەدات....

بۆنموونە ئەو دووبەرەکییەی کەلەنێوان (ثیودۆر ڕوزفلت)و سەرەك کۆمار تافت)دا ڕوویدا کاتێ کە (ثیدور) کۆشکی سپی بەجێهێشت ساڵی (١٩٠٨) بەرەو ناوچەکانی ئەفەریقیا کەوتە ڕێ بەنیازی ڕاوەشێر..

(تافت)ی لەجێگەی خۆی داناو کردیە سەرۆکی ئەمەریکا تا دێتەوە، کاتێ کەلە گەشتەکەی گەڕایەوە خەریك بوو لەداخ و مەراقدا بتەقێت کە بینی کەم تەرخەمی و بێ موبالاتی و کەم ئیدارەی تافت لەڕادە بەدەرە بۆیە دابەزیە سەری و دەستی کردە سەرزەنشت و لۆمە کردنی بەشێوەیەکی ڕەق و نەشیاو.

ئەمەش کاتێك بوو کەهەڵبژاردنی سەرەك کۆماری نزیك بووبویەوە.. خۆ (ڕوزفلت) لەسەر هەڵە نەبوو، لۆمەو سەرزەنشتەکەی ناهەقی نەبوو.. بەلام هەرکە هەڵبژاردن دەستی پێکرد یەکسەر پارتی کۆماری تێك شکا, بەسەرۆکایەتی (ڕۆزفلت) بەتێك شکان و دۆڕانێکی زۆر ناشرین..

سەیرکەن ورد ببنەوە ئایا (تافت) لۆمەی خۆی کرد و خۆی بەتاوانبار دایە قەڵەم؟..

بێگومان نەخێر. بەڵکو بەدەم گریان و فرمێسکەوە ووتی: (من لەو باوەڕەدانیم کە شتێکم کردبێت جیاوازبێت لەوەی پێویست بوو کە بیکەم).

لێرەدا ئایا ڕاستر وایە لۆمەی کامیان بکەین؟ ڕوزفلت یان تافت؟.

لەڕاستیدا من نازانم بەلام گرنگ نیە کە بیزانم.. ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە لۆمەکردن و دابەزینە سەرتافت (لەلایەن ڕوزفلت)ەوە هیچ قەناعەتێکی بە (تافت) نەکرد تا بڵێ من هەڵە بووم..

بەڵکو وای لێکرد کە دەست بکاتە پاکانە بەری کردنی خۆی و فرمێسکیش بە چاوەکانیدا قەتارە بکات.

نمونەیەکی دیکە کە ئەویش ئابڕو چوونەکەی (تیبوتی دووەم) کەدەنگ و باسەکەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چەند ساڵێکی دوورو درێژی خایاند و میللەت بەهەموو جۆرێ نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەری بەتوندی.. ئەمەش چۆن بوو؟..

لەکاتی فەرمانڕەوایی (هاردینگ)دا ئەو (پترۆڵ) و نەوتانەی کە دەوڵەمەنی ئەمەریکی ئیشی پێیان نەبوو درایە دەست وەزیری ناوخۆ (ئاسبرد فول) کەلە ناوچەی (ئلك هیل و تیبوت دوم) دابوو کە ئەو بڕە پترۆڵە تەرخان کرابوو بۆ هێزی دەریایی ئەمەریکی..

بەڵام (فول) لەباتی ئەوەی کەبیرە نەوتەکان بخاتە مەزادخانەی ئاشکراوە هەستا بەسوك و ئاسان دای بە هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆی کە ناوی (ئیدوارد روهینی)بوو..

(روهینی) لەپاداشتی ئەم چاکەیەی فولدا (١٠٠)هەزار دۆلاری پێدا بەڵام فول لەبەر قسەی ئەم و ئەو ناوی نابوو قەرز..

پاش ئەوە (فول) فەرمانی سەربازی دەکرد کە هەستن بەدوور خستنەوەی ئەو کەسانەی کەبیرەکانیان نزیکە لەبیرەکانی دەوڵەتەوە.. بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەم بیرانە دەبنە هۆی ڕاکێشان و هەڵمژینی پترۆڵی دەوڵەت .

یەکسەر خاوەن بیرەکانی ئەو ناوچەیە بەخێرایی خۆیان گەیاندە دادگەو سکاڵایان پێشکەش کرد کە فول چی کردوە پێیان.. وەپەردەشیان لادا لەسەر ئەو ناپاکی و بەرتیل وەرگرتنەی (فول) کە (١٠٠)هەزار دۆلاری ئەمریکی.

لەم کاتەدا گەل خۆی پێ نەگیراو بەتوندی ناڕەزایی خۆی دەبڕی و شوشەو پەنجەرەی سەرکردایەتی (هاردج) یان تێك شکاند و هەڕەشەشیان کرد بە تێك شکاندنی پارتی کۆماری و لەبەر ئەوە دەوڵەت بەپەلە (ئلبرد فولی) لەزیندان توند کرد).

کاتێ( فول) ئەم تێك شکاندنە بێئابڕوییەی بەسەردا هات ئایا پەشیمان بوویەوە یان ئایا لۆمەی خۆی کرد؟ هەرگیز، نەخێر نەیکرد..

پاش چەند ساڵێك سەرۆکی ئەمەریکی و گوتارێکی دا کە (هووڤەر) تیایدا باسی ئەوەی کرد کە مردنی (هاردینگ) بەهۆی ئەو (صدمە)یەوە بوو کە هاوڕێیەکی هەستا بوو بە ناپاکی یەك..

لەوکاتەدا ژنی( فول ) لەناوجەماوەرەکەدا دەبێت خێرا لەجێی خۆی هەستایەوەو بەتوندی دەستەکانی کێشا بەیەکداو هاواری کرد: (ئەوە دەڵێی چی؟ یانی مێردی من ناپاکی لەگەڵ (هاردینگ)دا کرد نەخێر مێردی من هەرگیز ناپاکی لەگەڵ کەسدا نەکردووە.. وەگەر پڕی ئەم شوێنە ئاڵتوون بە مێردەکەم بدرایە

هەرگیز ئەوە نەیئەخەڵەتاند کە ناپاکی بکات.. بەڵکو ئەو کەسێك بوو کەخەڵکی ناپاکی‌یان لەگەڵ کردوو بەرەو مردن و شەهیدی بردیان).

ئائەمەیە سروشتی مرۆڤایەتی! ئادەمیزادی هەڵە هەموو کەس لۆمەو سەرزەنشتی دەکات تەنها خۆی نەبێت؟؟!!

کەواتە ئەگەر ڕۆژێ هات بەخەیاڵتدا کەلۆمەی کەسێك بکەیت، پێویستە لەسەرت کەچەندانی وەك (ئال کابونی و دەبلێ دەمانچە و ئەلبرد فۆلت, لە بیربێت و ئەوەش بزانە کە (لۆمەکردن) وەك باڵندەی نەرم فڕ وایە هەمیشە لەلانکەی خۆی دەنیشێتەوە!..

سەرلەبەیانی ڕۆژی شەممە نیسانی (١٨٨٥) (ئەبراهام لنکولن) کەوتبوو بەدەمداو بەدەم گیان دەرچوونەوە هاواری دەکرد، کە لەخانوویەکی ناخۆش و دڵ تەنگدا بەرامبەر هۆڵی شانۆی (فۆرد) کە (یوپ) تەقەی لێکردبوو..

لەم کاتەدا کە (لنکوڵن) لەسەر جێگە دواگیانی خەریك بوودەرچوو، وەزیری جەنگی ئەوکاتە (ستانتۆن) هاتە سەری و ووتی: (ئالێرەدایە ئارامگای تێرو تەسەل ترین فەرمانڕەوا لە دنیا (لەوەتی دنیا دروست بووە) بەدی دەکەین).

چی بوو بەهۆی ئەوەی کە (لنۆکلن) سەرکەوتووبێت لەهەڵس و کەوتیدا لەگەڵ خەڵکی؟..

ئایا هەمیشە لەلۆمە کردنی خەڵکیدا بوو؟ بەڵێ، کاتێك کەمنداڵ بوو لە (دۆڵی بیجون کریك) کەسەر بە ویلایەتی (ئەندیایا) بوو کە خۆی لەدایك بووی ئەوێ بوو.. نەك هەر لۆمەی خەڵکی دەکرد و بەس، بەڵکو لەوەش خراپتر، ئەڕۆیشت نامەو شیعری دەنوسی‌و تیایدا ڕەخنە و لۆمەی لەخەڵك دەگرت و پاشان لەسەر شەقامە گشتییەکان فڕێی دەدایە بەر پێی خەڵك و خەڵکیش بەرچاویان دەکەوت و بێگومان سەیریشیان دەکرد..

تەنانەت یەکێ لەو نامانەی لنکوڵن بووبەهۆی دوژمنایەتییەکی بەردەوام بەدرێژایی تەمەنی!!.

بەڵكو پاش ئەوەش كەبووبە پارێزەر (لەنێوان سپرنگ فیڵدو ئیلینوا)دا ویستی لەوەو دوا هەربە ئاشكرا لەڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا گەردەلوولی ڕەخنەو بارانی لۆمە ببارێنێتە سەر خەڵكی.. بەڵام بەس تەنها جارێك هەستا بەم كارە!..

ئەویش ئەوەبوو لەپایزی ساڵی (١٨٤٤)دا شورەت و ناوبانگی كابرایەكی سیاسی ئێرلەندی كەوتە بەرگوێی.. كەناوی (جیمس شیلدن) بوو (لنكوڵن) باسێكی لەڕۆژنامەی (سپرنگ فیڵد)دا بڵاوكردەوە بەبێ ئەوەی ناوی تەواوی خۆی بدات و تیایدا بەجۆرەهسا لاقرتی و گاڵتە جاڕی دابەزیە سەر ئەو سیاسەتمەدارە مەزنە.. خەڵكی ئەو ناوچەیە دەستیان كرد بە پێكەنین و ڕابواردن بەو كابرایە!.. (شیڵدن)یش بەكوڵی داخ و مەراقەوە گەڕا بەشوێن كاكی نووسەردا تا سەرئەنجام ناسیەوەو بانگی كرد بۆ شەڕ و زۆرانبازی ئەگەر ڕاست ئەكات و ئازایە!..

(لنكوڵن) نەیویست (نەیوێرا) شەڕ بكات، بەڵام ڕووی نەهات بڵێ نایكەم بۆیە بەیەكەوە ڕۆژێكیان دیاری كردو لەقەراغ ڕووباری (مسیسپی) لەسەر ئەوە ڕێك كەوتن كە یەكێكیان یەكێكیان بكوژێت!..

بەڵام باش بوو لەوێ چەند خێر خوایەك كەوتنە نێوانیان و نەیانهێشت خوێنی یەك بڕێژن..

ئائەمە بوو تاكە خاڵێكی ڕەش لەسەر لاپەڕەكانی ژیانی (لنكوڵن)و دەرسێكی وای دادا كە هەرگیز لەیادی نەچێت لەچۆنیەتی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ خەڵكیدا.. لەوڕۆژە بەدواوە هیچ شتێكی نەنوسیوەو نەوتووە كە ئابڕوی كەسی تێدا بەرێت و گاڵتەی بەكەس نەكردووەو لۆمەی كەسی نەكردووە لەسەر هیچ شتێك!!

بەڵێ (لنكوڵن)بوو سەرۆكی ئەمەریكا، لەماوەی ئەوەدا جەنگی ناوخۆیی و نەیاری سەری هەڵدا، ئەمیش چەند گەورە و فەرماندەیەكی كردە لێپرسراوو سەركردەی سوپاو ناردنی بۆ جەنگی سەرووی وولات..هیچی لەو سەركردانە بێ لەكە نەبوون و قسەیان لەسەر بوو كە گوایە هیچ ناتوانن و گێژن و نیوەی خەڵكی لەڕەخنە گرتنیاندا بوون، بەڵام (لنكوڵن) بەهیچ شێوەیەك توانج و ڕەخنە و لۆمەی

نەکردە سەریان و هەمیشە ووتە بەناوبانگەکەی خۆی دەووت: (لۆمەی کەس مەکە تا لۆمە نەکرێیت).

کاتێکیش خێزانەکەی و هەندێ لەخزمانی ویستیان وای لێبکەن هێرش بکاتە سەر نەیارەکانی خواروو (لنکۆڵن) وەڵامی دەدانەوە کە (لۆمەیان مەکەن دڵنیابن ئێمەش وامان ئەکرد ئەگەر ئەوان لەم جێگەی ئێمەو ئێمەش لەجێگەی ئەوان بووینایەو ئەو کەشەی ئەوانمان هەبوایە)!..

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کەسێك سەربەست بکەیت و بۆی هەبێت لەشتی ڕاست و گونجاودا لۆمە بکات ئەوە تەنها (لنکۆڵن) شایانی بوو کەچی هەربەباشی نەدەزانی.

با نموونەیەك بێنینەوە:

ئەوا جەنگی (گتسبێرگ) لەمانگی مایو (١٨٦٣)دا دەستی پێکرد، لە ئێوارەی چوارەمین ڕۆژی ئەو جەنگەدا، سەرکردەی سوپای نەیارەکان ناوی (جنرال لی)بوو پاشە کشێی کرد، بە تێك شکاوی لەوکاتەدا باران بەخوڕ گلێلەی دەکرد لافاو دەشت و چەم و دۆڵی گرتبوویەوە، کاتێ (لی) گەشتە شارۆچکەی (بوتوماك) بەسوپاکەیەوە هەڵتەقین بەدەریایەکی گەورەدا کە بەردەمی لێ گرتن و نەیان توانی لێی بدەن، لەپشتیشەوە سوپای باکوری دەوڵەت تەنگی پێ هەڵچنیبوون..

(لی) بەخۆیی‌و سوپاکەیەوە تووشی دەربازبوونی نەما . (لنکۆڵن) کەبەمەی زانی‌و هەستی کرد ئەمە هەلێکی زێڕینەو پەروەردگار بۆی هەڵخستووە، بۆئەوەی خوێن ڕێژی کۆتایی بێت و (لی) دەستگیر بکات، بەخێرایی فەرمانی دەرکرد بۆ سوپاو نوێنەری تایبەتی نارد بۆلای سەرکردەی سوپا (مید) کە داوای لێکرد زۆر بەخێرایی ئەم کارە بەئەنجام بگەیەنێ ئەمە هەلەو با لەدەست نەچێت.. با بزانین (مید) چی کرد؟؟.

(مید) دەستی کردە خۆ خەریك کردن و کەمتەرخەمی و خۆی دواخست.. بەپەلە چەند بروسکەیەکی بیانووی بۆ (لنکۆڵن) نووسی و داوای لێبوردنی لێدەکرد، لەکۆتاییدا بڕیاری هێرش نەکردنە سەر (لی)دا!!.. لەئەنجامی ئەم کەمتەرخەمییەی (مید)دا سوپای نەیار (لی) لەجێگایەکی تەنگەوە پەڕینەوە لە ئاوەکە!..

(لنكۆڵن) ئاگری تووڕەیی تێپەربوو.. هەر لەكۆشكی (ڕۆبرت)ەوە هاواری دەكردو دەینەڕاند: (ئەی خوای مەزن ئەوە مانای چی دەگەیەنێت؟ سوپاكەی (لی) لەناو لەپماندابوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ئەو هەموو قسەو فەرمانانەدا كەچی سوپا هەڵنەسا دەست بەكار بێت: (لنكۆڵن) بەتێكشكاوی و بێهیواییەكی تاڵەوە دەست ئەژنۆ دانیشت و ئەم نامەی نووسی: (جەنراڵی خۆشەویستم، واگومان نابەم كەبەتەواوی هەست بكەی بەو بەدبەختیەی كە بەهۆی ڕاكردن و دەربازبوونی سوپای (لی)یەوە تووشمان بوو.. بەڕاستی هاتبووە بەردەستمان، ئەگەر بهاتایەو دەستمان بگرتایە بەسەریدا ئەوا كۆتایی بەجەنگ و هەرا دەهات بەیەكجاری.. بەڵام بەم حاڵەی ئێستامان جەنگ هەردرێژە پێ دەدات و بەردەوام خوێن دەڕێژرێت تا ئەوكاتەی مەگەر خوا خۆی بزانێت كەی تەواودەبێت.. كە تۆ دووشەممەی ڕابردوو بەو هێمنی و دڵنیایی و بێترسیەوە هێرشت نەكردە سەری، بۆخاتری خوا چۆن دەتوانیت لەخوارووی ڕووبارەكەوە هێرشی بۆ بكەیت كە ناتوانی لەوێ بجەنگیت بەچەند چەكدارێكی كەمەوە نەبێت؟ تازە باوەڕناكرێت كەبتوانیت شتێكی بەكەڵك بكەیت..

بەڕاستی هەلی زێڕینت لەدەست خۆت دا كەئەمەش زۆر ناڕەحەت و دڵگرانی كردم و پێم ناخۆش بوو)..

ئەم نامەیەی (لنكۆڵن) نەگەیشتە دەستی (مید) ئەزانن بۆ؟ چونكە بۆی نەنارد!. بەڵام پاش مردنی لەنێوان وەرەقەو كتێبەكانیدا دۆزراوەتەوە..

من وای بۆ دەچم (كەئەمە بۆچوون و شیكاری خۆمە) كە (لنكۆڵن) دوای ئەوەی لەنوسینی نامەكە بۆتەوە، لەپەنجەرەوە سەیرێكی دەرەوەی كردوە و پاشان بەخۆی وتووە: (دەقەیەك، بۆ من نییە پەلە بكەم لە لۆمەكردنی (مید) چونكە زۆر ئاسانە بۆ منێ كەلەژێر سێبەری كۆشكی سپیدا قاچم لێناوەتە سەرقاچ و لەدورەوە فەرمان دەربكەم بۆ (مید) كە هێرش بكات بەڵام ئەگەر من لەو جێگەیەی ئەو دەبووم لە (گتسبێرگ) ئەو هەموو خوێنە ڕژاوەم بدیایەو هەروەك (مید) بە چاوی خۆی بینیویەتی، ڕەنگە ئەوچی كرد منیش هەروام بكردایە.. هەرچۆنێ بێت كە هێشتا

هەر ئاوەکە خوڕە لای پردەکەوە، ئەگەر من ئێستا ئەم نامەیەم بنێرم بۆی بەڵێ کەمێ خەفەتی ناو دەروونم کز دەبێت و نامێنێت..

بەڵام وادەزانم کە (مید) هەوڵ دەدات بێتاوانی خۆی دەربخات و ئەو هەڵوێستەی بەڕاست بزانێت، کێ دەزانێ؟ لەوە دەچێ ئەو هەوڵ بدات لۆمەی من بکات؟ وە دووریش نیە هەر سوپا واز لێ بهێنێت و دەست هەڵنەگرێت؟.

پاش ئەمانە لەوە دەچێ (لنکۆڵن) نامەکەی خستبێتە لاوە، چونکە تاقیکردنەوەکانی ژیان فێری کردووە کە لۆمە کردن تەنها نەزۆکی و بێسوودی نەبێت هیچی تری بەلاوە نیە..

دەگێڕنەوە کە (ثیودۆر رۆزفێلت) سەرۆکی ئەمەریکا هەرکاتێ تەنگ و چەڵەمەیەك بهاتایە ڕێی و نەیزانیایە چۆن چارەسەری بکات.. پاڵی دەدایەوە بەکورسییەکەیەوەو لەتابلۆ هەڵواسراوەکەی لای سەری ورد دەبوویەوە کەوێنەی (لنکۆڵن) بوو پاشان لەخۆی دەپرسی: (خۆزگە ئەگەر (لنکۆڵن) لەم جێگەی مندا بوایە چی دەکرد؟ وەچۆن ئەم تەنگ و چەڵەمەیەی چارەسەر دەرکرد؟.

یەکەم جار لەخۆتەوە دەست پێ بکە:

تا ئێستا لەبیروخەیاڵتدا هەیە کە بەهەموو حەزو ئارەزوویەکتەوە بتەوێت هەڵسوکەوتی کەسێك ڕاست بکەیتەوەو ڕەوشتی جوان بکەیت و دەستی بگریت و بەرەو ڕاست ترین ڕێگای بەریت؟..

ئەگەر نیازت وایە ئەمە کارێکی بەرزو پیرۆزەو شایانی هەموو سوپاسێکە.. بەڵام باشە ئایا یەکەم جار بۆ لەخۆتەوە دەست پێناکەیت؟..

لەلایەن ئارەزووە ناوەکی و غەریزەکانەوە وادیارە کەگرنگیدان بە (خۆ) گەلێ خۆشترو ئاسانترە بۆ مرۆۋ و کەمتر مەترسی تێدایە.. (براونج) دەڵێت (هەرکاتێك جەنگی نێوان مرۆۋ و دەروونی دەست پێدەکات ئەوکاتە ئەو ئادەمیزادە شایانی هەموو سوپاسێکە).

دەڵێی چی ئەگەر ساڵێك تەرخان بکەیت (بەلایەنی کەمەوە) بۆ چاککردنی کەم و کوڕیەکانی خۆت و ڕاست کردنەوەی خوارو خێچییەکانت؟ دواى ئەوە ئیتر بۆت

هەیە ساڵەکانی تەمەنت هەر هەمووی تەرخان بکەیت بۆ چاککردنی خەڵکی و بەرزکردنەوەی ڕەوشتیا و ڕێنمایی کردنیان..

(ونفشیوس) دەڵێت: (سەربانی دراوسێ بەفرماڵ مەکە تا بەفرەماڵی سەربانی خۆت نەکەیت)..

کاتێ کەسەرەتای گەنجیم بوو، زۆر هەوڵم دەدا کە سەرنجی خەڵکی رابکێشم بۆلای خۆم، ئەمەش لەئەنجامی خۆ لێگۆڕان و لەخۆبایی بوون بوو.. ڕۆژێکیان نامەیەکم نووسی بۆ نوسەری بەرزی بەناوبانگ (رتشارد هاردنگ دیفین) و پێم ووت: من باسێکم بەدەستەوەیە دەربارەی دانەرو نوسەرە بەناوبانگەکان، پاشان داوام لێکرد کە ڕێنمایم بکات بۆ چۆنیەتی نوسین بەتایبەت ڕێگاکانی نوسینی خۆی..

من لەوەو پێش چاوم کەوتبوو بە باسێك کەنوسەرەکەی لەکۆتاییدا نوسیبووی: (ئەمە دەس نووسی یەکەم جارەو و پیاچوونەوەو پاکنوس نەکراوە) ئەم ووتەیەی کۆتایی باسەکە زۆر کاری تێکردم چونکە وای دەگەیاند کە نووسەر زۆرسەری قاڵەو دیارە کەڵە نوسەریشە.. بەڵام من نە سەرم قاڵ بوو نەنوسەریش بووم، بەڵام ویستم (دیڤین) واتێبگات لە من و بەسوك سەیری باسەکەم نەکات لەکۆتاییدا نوسیم: (نوسینی یەکەم جارە و پاکنوس نەکراوە).

(دیڤین) هەروەڵامی نامەکەشی نەدامەوە ئەوەندە نەبێت هەستا بوو خستبوویەوە بەریدەوەو لەسەری نوسیبوو (بێ تەربیەتی و بێ ئەدەبیت لەئاستێکدایە مەگەر بێ ئەدەبی و بێتەربیەتی خۆت پێی بگات).

لەڕاستیدا و بێگومان من شایانی ئەو تەمێیە بووم..

بەڵام پاش دەساڵ هەرکە هەواڵی مردنی (دیڤین)م بیست هیچ تێك نەچووم و پێم ناخۆش نەبوو هەرچەندە وا دەڵێم شەرم و خەجاڵەتی دەمگرێت (تەنها ئەوەندە نەبێت کە ئەو نووسراوە ناشرینەیم هاتەوە یاد)..

پێویستە کاتێ تۆ هەڵس و کەوت ئەکەیت لەگەڵ خەڵك، بزانە کەتۆ لەگەڵ ژیران و فەیلەسوفەکاندا قسە ناکەیت.. بەڵکو لەگەڵ سۆزو هەست و دەروونی پڕ ئارەزووتدا قسە دەکەیت.. کەپڕە لەگەورەیی و لەخۆبایی بوون..

(لۆمە کردن) پرژی ئاگرینی پڕ ترسناکی لێدەبێتەوە.. کە لەتوانایدا هەیە ئاگر بەربداتە بەنزینی فیزو و خۆبەگەورە گرتن.. یان ئاگرێکی وای تێبەر بدات کەهەندێ جار ببێتە هۆی مردن و لەناوچوونی لۆمەکراو..

چونکە هەر گڕو کڵپەی ڕەخنە و توانج بوو وای کرد لەچیرۆك نوسی بەناوبانگ (تۆماس هاردی) کەسەروەتێکی گەورەی بەنرخ• شێوە بەئەدەبی ئینگلیزی. بڕیاری بدات واز لەنوسین بێنێت و هەرگیز چیرۆك نەنوسێت..

هەروەك گەردەلولی ڕەخنە وای کرد لەشاعیری ئینگلیزی دەروون ناسك کە بەجۆرێ هەستی بریندار بوو خۆی (کوشت)( کەناوی (توماس شاترون)بوو..

(بنیامین فرانکلین) لەکاتی لاویدا هونەری قسەکردن و هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی نەدەزانی بەڵام پاشان ناوبانگی دەرکرد بەقسەزان و هەستیار و عاقڵێك کەبوو بەهۆی ئەوەی فرانکلین بگەیەنێتە ڕادەیەك کەهەڵی بژێرن بۆ باڵوێزی ئەمەریکا لەفەرەنسا، ئەبێ هۆی ئەم گۆڕانە چی بووبێت؟؟..

بەڵێ تاقیکردنەوەکانی ژیان بەجۆرێ خۆشەیان کرد کە باش بۆی دەرکەوت (ڕەخنەو لۆمەکردن) نەزۆکە و سوودی نیە بۆیە بوبە خاوەنی ئەم وتە بەناوبانگە (بەهیچ جۆر باسی خراپەی هیچ کەسێك ناکەم، بەڵکو پێشەکی ئەو لایەنە خێرو چاکانە باس ئەکەم کە لەخەڵکدا بەدی دەکەم).

هەموو گەوج و گەمژەیەك دەتوانێ لۆمەی خەڵکی بکات.. وەخەڵکی پێلەکەدار بکات.. وەڕەخنە بگرێت بەڵکو ئەمکارە زۆربەی گەمژەو گەوێلان خەریکن پێوەی.

دەوەرن باپێکەوە لەباتی ئەوەی لۆمە بکەین و عەیب و خەوشی خەڵکی گەورە بکەین و ئاشکرای بکەین با هەوڵ بدەین تێبگەین و بیانوو بۆ خەڵکی بێنینەوە لەسەر ئەو کارانەی دەیکەن.. چونکە ئەمە لەلۆمە زۆر خۆشترە بۆچی؟! چونکە ئەمە سۆزو بەزەیی و دڵڕاگرتنی یەکتری تێدایەو دڵسافی بەدوادا دێت..

باوتەی (دکتۆر جۆنسۆن) بێنینەوە یادی خۆمان:

(ئەی بەڕێزم، خوای پەروەردگار لەمرۆ ناپرسێتەوەو موحاسەبەی ناکات تا ڕۆژی خۆی (دوای مردن).. دەی ئیتر من و تۆ بۆجەرگی خەڵکی کون کون بکەین بە نەشتەری لۆمەو ڕەخنەو پەلە کردن و زوو لێپرسینەوەی خەڵکی و خێرا حوکمدان بەسەریاندا!؟.؟..

# پاشکۆی یەکەم

## ١- هەموو ئادەمیزادێ هەڵە دەکات

ئیسلام، واشوێن کەوتەکانی پەروەردە دەکات، کەفێربن و تێبگەن لەشتێکی زۆر گرنگ لەژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەویش ئەوەیە کەهەموو کەسێك جگە لە(پێغەمبەرا)نی خوا قابیلی هەڵەیەو مەعصوم نییە و ناتەواوە..

چونکە ئادەمیزاتد دروستکراوێکە لەنێوان فریشتەی پاك و بێگوناهو گیان لەبەرانی نەفام و دوور لەژیری..

بەڵکو ئادەمیزاد لەو نێوانەدا پاکی و چاکی و بەرزی لێ دەوەشێتەوە.. هەر ئەم مرۆڤەش شتی گەوج و خوارو خێچی ای‌دەوەشێتەوە..

ئائەمەیە فەلسەفەو حیکمەت لەناردنی قورئانی پیرۆز بە(پێغەمبەر)ی خوادا (محەمەدی کوڕی عبداللە) بۆگرۆهی مرۆڤایەتی بەگشتی[٢]، تالایەنی بەرزی و پاکی برەو پێ بدات و چەند جارەی بکاتەوە تیایدا..

وەبەپێچەوانەشەوە ئەولایەنە شەیتانیە پیس و خراپانەی کز بکات و پاشانیش ڕیشەکەنیان بکات..

مەبەستی سەرەکی و هەرە بەرزی ئیسلام ئەوەیە کە مرۆڤەکان فێر بکات چۆن و بە چ ڕێگایەك لایەنی گەوجی‌و خراپی و ناپاکی لەمرۆڤدا نەهێڵن و هەڵس و کەوتی بەرزوبڵندیان فێر بکات لەگەڵ کێ؟

لەگەڵ خوا لەگەڵ خەڵکی لەگەڵ خۆیدا..

هەردوو لایەنی (هەڵس و کەوت لەگەڵ خواو لەگەڵ خۆ) بەهێزکردن بۆ ئەوەیە کە فێر بێت چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکات..)

(پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وخالق الناس بخلق حسن[٣]) واتە: بەڕەوشتی بەرزو جوان ترین شێوە هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ خەڵکیدا، لە ئیسلامدا

---

٢ – پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) بۆ گرۆهی جن و ئینسە( وماارسلناك الارحمة للعالمين) الانبياء١٠٧ ئاماژەیەکی ڕوونە، هەروەها سورەتی( الجن) تەواو ڕونکەرەوەی ئەو مانایە(قل...نفر من الجن...(١) يهدي..فئامنابة...(٢)

٣ – رواة احمد والنسائي والحاكم والبيهقي

هەموو ئادەمیزادێك بەرپرسیارە لەهەڵەی خەڵكیو دەبێت بەپێی توانا هەوڵی چاككردنی بدات وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ ((ال عمران ١٠٤)) واتە: با لەناوتاندا هەبێت كۆمەڵێك كە بانگێشەی خەڵكی بكەن بۆ چاكەكردن و ڕێگری بكەن لەخراپە) .

كەواتە ئەركی سەرشانی موسڵمانە توند كردن و داكوتانی مێخی چاكە خوازیو هەروەها هەوڵدان بۆ دەرهێنانی بنج و بناوانی ڕەگی تاوان و خراپەكاری، یان لەفەرموودەیەكی (پێغەمبەر)دا (ﷺ) دەردەكەوێت كە یەك بەیەكی موسڵمانان لەسەریانە كە خراپە بگۆڕن و دەم و دەست و چاو داخەن لەئاستی دا (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه وإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الايمان) رواه مسلم.

بەلام ئیسلام مەرجی داناوە لەسەر ئەوەی دەبێت خەڵی چاكە بكات:

یەكەم/ دەبێ خۆی چاك كردبێت چونكە نەخۆش ناتوانێت نەخۆش چاك بكاتەوە.

دووەم/ نیەتی پاك كردبێت و لەبەر هیچ بەرژەوەندییەكی خۆیی و دنیایی نەبێت.

سێیەم/دەبێت بەحیكمەت و لێزانانە خەڵك لەخراپە دوور بخاتەوە ئەگەر وانەبێ زیانی لەقازانجی زیاتر دەبێت.

بەڵێ ئایینی ئیسلام زۆری پێ ناخۆشە كە مرۆڤ خۆی پشت گوێ بخات و بەلاروێری خۆی بهێڵێتەوە و دەست بكات بەچاككردنی ئەم و ئەوو تەمێ كردنی خەڵكی لەكاتێكدا خۆی دەردەدارو ناساغ بێت.. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾((البقرة ٤٤)) هەروەها خوای پەروەردگار خۆ پاراستنی لەدۆزەخ پێش تر خستووە لەپاراستنی خەڵكانی دەوروبەر وەك دەفەرموێت: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾((التحريم ٦))

دەبێت وتەی ( عەلی کوڕی ئەبی طالب ) چاك لەپێش چاو بگرین کەدەفەرموێت: (معلم النفس اولى بالاجلال من معلم الناس)، واتە: مامۆستای خۆ چاککەر شایانترە ڕێزی لەمامۆستای خەڵکی.

چونکە گەر بتەوێت شتێك پاك بکەیتەوە کەی دەبێت بە ئاوی لێڵ و پیس پاك بکرێتەوە!.. وەهەرکاتێك موسڵمان توانی خۆی چاك بکات، ئەو کاتە قسە ووتار و کرداری زۆر کاریگەر دەبن لەسەر دڵەکان.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ ڕێگە نادرێت کەخەڵکی پشت گوێ بخات و هەقی بەسەر یەکەوە نەبێت..

بەبەڵگەی ئەوەی هێشتا لەچاککردنی خۆم نەبوومەتەوە!! بۆئەوەی کەس وانەڵێت ئیسلام وای داناوە کە مرۆڤ خۆشی و خەڵکیش چاك بکات لەیەك کاتدا وەك درەخت لەڕەگەوە بۆ خۆی هەڵمژێ و لەقەدیشدا بەخەڵکی ببەخشێت! یان وەك هەنگ لەیەك کاتدا گوڵ هەڵمژێ و هەنگوین ببەخشێت!..

بەڵام ژیان و کردارو گوفتاری (پێغەمبەر)مان (ﷺ) ڕاڤەیەکی قورئانە بەکردەوە شیرینەکان چۆنیەتی گۆڕانی تاوان و خراپەی فێری هاوەڵە شیرینەکانی کردووەو بەئەوپەڕی چاکی و ڕێك و پێکی بەرگری لەخراپە و ناڕەوایی کردووە هەرگیز هەستی خاوەن هەڵەی بریندار نەکردووە و نەیشکاندووە (ڕەخنەو لۆمەو سەرزەنشت) نزیکی (پێغەمبەر)ی خوا ننەکەوتونەتەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە: (کە (١٠)ساڵ خزمەتی (پێغەمبەر)ی خوام کردووە هەرگیز پێی نەوتووم (ئەوەت بۆ کرد ئەوەت بۆ نەکرد ئەوەت بۆ شکاند) متفق علیە.

وەك لەشیعرێکدا وتوومە: ئەنەس دەفەرموێ بۆماوەی دە ساڵ
لەخزمەتیابووم لەدەرو لەماڵ
نەقسەی پێ وتووم نەلێشی داوم
بەقوربانی بێ هێزو هەناوم

عائیشەی خێزانی (پێغەمبەرﷺ) دەگێڕێتەوە کە (پێغەمبەر)ی خوا هەرگیزاو هەرگیز ڕەخنەی لەچێشت نەگرتووەو لۆمەشی نەکردووین لەسەر خواردنی (بێ خوێ و سەتاو) ئەگەر حەزی لێ بکردایە دەیخوارد وەگەرنا بەبێدەنگی دەچووە دواوە!! (وراه البخاري ومسلم).یان هەرگیز بەرەو ڕوویان پاش ملە ڕەخنەی لەگەس نەگرتووەو بەلۆمەکاری نەیشکاندووە. ئەی ئەگەر لاریەکی لەیەکێکدا بدیایە چۆن چاکی دەکەردەوە؟ بەڕێگای ناڕاستەوخۆ، واتە (دیوار بەتۆمە و پاسار گوێت لێ بێت).

نمونەیەك لەسەر ئەمە: چەند کەسێك لەسەردەمی (پێغەمبەر)دا (ﷺ) بڕیاریاندا یەکێکیان وتی من قەد ژن ناهێنم هەرخواناسی دەکەم.. یەکێکی تریان بڕیاریدا هەموو ڕۆژێ بەڕۆژووبێت یەکێکی تریان بڕیاریدا هەرگیز شەونەخەوێت و هەر شەونوێژبکات! (رواه البخاری و مسلم).

کاتێ (پێغەمبەر) (ﷺ) ئەمەی بیست خێرا بانگی نەکردن و لۆمەیان بکات و لەناو هاوەڵاندا بیانشکێنێت و بڵێ: شتی وانەکەن ها.. ئەمە ڕێگەو بەرنامەی خوا واناڵێت.. ئەگەر وایان بگوتایە من یەکەم کەس وام دەکرد تێگەیشتن؟؟.

نەخێر.. هەزار نەخێر (محمد) (پێغەمبەر)ی دەروونناس چۆن شتیوادەکات؟ ئەی چۆن چاکی کردن؟ بەڵێ هەستا لەسەر (دوانگە) گوتارێکیدا تیایدا فەرمووی: ئەمە چیانە هەندێ کەس!! (ورد بەرەوە لەووشەی (هەندێ کەس) چۆن لێزانانە ناوی کەسی نەبرد) بیستوومە ئاواو ئاوایان وتووە، سوێند بەخوا من لەهەمووتان زیاتر لەخوا دەترسم و بەندایەتی دەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا ژنیش دێنم و بەڕۆژووش دەبم و دەشی شکێنم وە نوێژیش دەکەم و دەشخەوم هەرکەس لەو ڕێگەیەم لابدات ئەوە لەمن نییە!.. بێ ئەوەی هەستیان بریندار بکات هەرسێکیان وازیا هێنا لەوهەڵانە!!..

ئا بەم جۆرە (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) هاوەڵانی پەروەردە کردووە کەبە (هەڵەشەیی) و (ڕەخنە کاری) و (شکاندن) و (ئابڕووبردن) و (تەریق کردنەوە) و (هەڕەشەکاریو چاوترساندن) ناتوانن خەڵکی بگۆڕن و کۆمەڵگە چاك بکەن..

بەڵکو بە (هەست ڕاگیر کردن) و (سەلماندن) و (ئامۆژگاری دڵسۆزانە) خراپە بگۆڕن و بەرەو چاکە ببەن.. لەماوەی (٢٣)ساڵی (پێغەمبەر)ایەتیدا چەندا هێڵی پان و درێژی کێشاوە کە مرۆڤایەتی لەسەری بڕۆن خراپەو تاوانی پێ بگۆڕن..

بۆنموونە جارێکیان گەنجێك دێتە خزمەت سەروەرمان و لەلای دادەنیشێت و پاشان دەڵێ: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا من بەهەموو شتێکی ئیسلام ڕازیم و گوێ ڕایەڵم بۆی.. بەڵام من گەنجم و خۆم بۆ ڕاناگیرێت ناتوانم (زینا)نەکەم!.. لەبەرئەوە ڕوخسەتم بدە بۆی؟.!.

هاوەڵان کە گوێیان لێبوو دابارینە سەری تەنانەت عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازیبێت) شمشێری هەڵبڕیو ووتی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا ڕێگام بدە لەملی بدەم ئەم دوو ڕووە بێناموسە؟ (پێغەمبەر)ی دانا و لێزان وەك دەروون ناس بەدەستە پیرۆزەکانی ئاماژە دەکات کەوا نابێت و بێدەنگ بن.. چونکە لە ناو خەڵك دا لۆمەی دەماری خراپە زیاتر سور دەکات بۆیە ئاژەی کرد کە نەخێر وانابێت و بێدەنگ بن.. چونکە ئەوەی ئەوان هەڵوێستی هەڵسوکەوت چاکردن نیە.. تورەبوون و سوربوونەوە و هەڕەشە و شکاندن و ڕەخنەی ناوخەڵك و لۆمەکردن دەماری خراپە زیاتر سوردەکاتەوەو دەی ئاوسێنێ..

بۆیە بەنەرم و نیانی دەستی خستە سەرشانی کوڕە گەنجەکە و پێی ووت: (ئایا تۆ ڕازی دەبیت (زینا) لەگەڵ دایکتدا بکرێت؟ کوڕەکە ووتی نەخێر، گیانم فیدات! دیسان پرسی، ئەی لەگەڵ خوشکتدا؟ ئەویش دیسان ووتی: نەخێر گیانم فیدات! تا فەرمووی: ئەی بۆ پورت؟ کوڕەکە هەرهەمان وەڵامی دەدایەوە!.. بۆیە پێی فەرموو: دەی هەروەها خەڵکیش دایك و خوشك و پوورو..هتد یان هەیە..دیسان بۆئەوەی زیاتر ڕەگی زینا لەدەروونیدا هەڵبکێشێت دەستەپیرۆزەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و نزای بۆ کرد و فەرمووی: (خوایە دڵی پاك کەرەوەو لەداوێن پیسی بیپارێزەو لەگوناهیشی خۆش ببە) بۆیە گەنجەکە دەڵێت: (کاتێ هاتمە خزمەت (پێغەمبەر) زینام زۆر پێ خۆش بوو ! بەڵام کاتێ هاتمە دەرەوە زینابوویە پیس ترین شت لەلام ) .

نمونەیەکی تر.. جارێکیان کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی موسڵمان بوو هاتە خزمەت سەروەرمان( (ﷺ) لەمزگەوتدا بوو سەرئاو زۆری بۆ هێنا! لەگۆشەیەی مزگەوتەکەی (پێغەمبەر)دا (ﷺ) دانیشت و میزی کرد!.

هەرکە خەڵکی پێیان زانی توڕەبوون و خەریك بوو بیدەن بەبناگوێیداو لەناوی بەرن چونکە ڕێزی مزگەوتی شکاند..

تا (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بەمەسەلەکەی زانی و کەوتە نێوان و بەنەرمییەوە تێیگەیاند کەوا نابێت چونکە ئێوە ڕەحمەتن بۆ گشت جیهان و بەدڵڕەقی و توڕەیی لەگەڵ خەڵکی مەجوڵێنەوە!..

بەڵکو ئەوەندە بەسە هەڵسن بڕۆن دۆلکەیەك ئاو بهێنن و بیکەن بەجێگە میزەکەیداو نوێژیی بکەنەوە ئیتر پاش ئەوە ئەو کابرایە بۆی دەرکەوت کە دەبێ ڕێزی مزگەوت وەك چاو! بپارێزرێت..

کەواتە ئەگەر بهاتایەو هاوەڵان (خوایان لێڕازیبێت) دەستیان بکردایە بەلۆمەو ڕەخنە گرتن لێی و بەجارێ تەریقیان بکردایەتەوە.. کێ دەزانێ؟ دەماری فیزو خۆبەزل زانی ئەم کابرایە هەستایەو لەداخا زیاتر مزگەوتەکەی بێ ڕێز بکردایە!!.

چونکە وای لێدەهات ئەمیش بەرگری بکات و کارەکەی خۆی بەڕاست بزانێت!..

کێ دەزانی لەوە دەچوو پەنا بەخوا هەر لەئیسلامیش پاشگەز ببوایەتەوە!..

نمونەیەکیتر لەونمونە زیندووانەی کە(پێغەمبەر)ی ئیسلام (ﷺ) پێش چەند سەدەیەك لەدامەزراندنی زانستی دەروون ناسی محمد (ﷺ) بەکردەوە دەروونی ئادەمیزادەکانی بەهاوەڵان دەناساند و بەرنامە داڕێژیش بوو بۆنەوەکانی دوای خۆی کەبەو جۆرە هەڵس و کەوت بکەن تا دڵەکان وەك پەڕەی گوڵ لەئاستیاندا دەم بکاتەوە ئەمانیش بچنە ژوورەوە.

سەرکردەی سوپا( (پێغەمبەر)) لە فەتحی مەککەدا فەرمانی دەرکرد کە سوپا بۆ شوێنێکی نهێنی بەڕێ بکەوێت، ئەمەش لەبەر تەکنیکی جەنگ بو تادانیشتوانی مەککە هەست نەکەن کە بۆ ئەوان دەردەچێت بەکوتوپڕی بدات بەسەریانداو قیبلەی بڕواداران لەبت پەرستان بسەنێتەوەو ڕزگاری بکات..

چەند کەسێکی کەم نەبێت کە ئاگاداری ناوچەی هێرش بۆکراو یەکێ لەوانە (حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە)بوو کەهاوەڵێکی دڵسۆزی گیان لەسەردەستی (پێغەمبەر) بوو. بەڵام لەبەرچەند شتێك وای بەچاك زانی مەککە ئاگادار بکاتەوە لەم هێرشە، بۆیە بەنامەیەك کە بەنهێنی دای بەژنێکی مەککەیی خێرا بیگەیەنێتە مەککە.

بەڵام خوای پەروەردگار (پێغەمبەر)ەکەی ئاگادار کرد کەنەخشەکەت پێی زانراوەو ئەگەر هەرچی زووتر نەگەنە ئەوژنە ئەوا دەیبات بۆ مەککە.. دەست بەجێ دووهاوەڵی دەنێرێت بەدوایدا و بەزۆر نامەکەی لێ دەسێنن کەلەناو پەلکەکانیدا قایمی کردبووا..

لەپاشان کەنامەکە هێنرایەوە دەرکەوت کە (حاتەب) ئەمەی کردووە. بۆیە موسڵمانەکان هەموویان بارانی لۆمەو ڕەخنەو سەرزەنشتیان باراند بەسەریدا لەسەر ئەم ناپاکییە بڵحە.. تەنانەت یەکێك لەهاوەڵان ووتی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا گیانم فیدات.. ڕێگام بدە با بدەم لەملی ئەم ناپاکە دووڕووە!!.

(پێغەمبەر)ی دەروون ناس (ﷺ) فەرمووی بەهاوەڵان (نەخێر، ئەمە ئەهلی بەدرە) ئەهلی بەدر کێ دەڵێ خوای گەورە لەگوناهیان خۆش نەبووەو سەرپشکی نەکردبن کەچی دەکەن بابیکەن)).(انك لاتدري لعل الله اطلع علي اهل بدر فقال: اعملو ماشئتم فقد غضرت لكم)

بۆیە ئەم ووتە شیرینە جوانە کاری کردە سەر دڵ و دەروونی (حاتەب) و چی لەدڵدابوو بۆ (پێغەمبەر)ی دەربڕی و هاتە گوفتار و ووتی: (بەڵێ ئەی (پێغەمبەر)ی خوا من ناردوومە بەڵام سوێند بەتەنهایی خوا لەو لەوکاتەوە باوەڕم هێناوە پەشیمان نەبوومەتەوەو نیازی ناپاکیم نەبووە و نیمە، .. بەڵام ئەوەندە هەیە زۆربەی هاوەڵان کەس و کاردارن یان ناسراوێکیان هەیە کە ژن و منداڵەکەیان بپارێزێت لەمەککە تەنها من نەبێت، کەس شك نابەم لەمەککە ویستم بەم نامەیە بێباوەڕەکانی (مەککە) وا لێبکەم لەپاداشتیدا ماڵ و منداڵەکەم بپارێزن..!).

بەڵێ (حاتەب) بەنیازی خۆی چاکەی کردووە لەگەڵ ئەوەشدا محمد (ﷺ) ئاوا لەگەڵی جوڵایەوە خۆ دەیتوانی فەرمان دەرکات بدەن لەملی و سەری بڕن چونکە لەیاسای نێودەوڵەتیدا گەورەترین ناپاکی کردووە..بەڵام محمد (ﷺ)بڕیاری وا دەرناکەت ، چونکە بەم کارەی کەس لێی نزیك نا بێتەوە و هاوڕێیەتی ناکات !..

لەکۆتایی ئەم باسەدا شتێك هەیە جێگای خۆیەتی کە ئاماژەی بۆ بکەین.. ئەویش ئەوەیە ئیسلام تاکە بەرنامەیە کەبتوانێ خەڵکی وا پەروەردە بکات.. کە بەلۆمەو سەرزەنشت دڵیان بکرێتەوەو سوودی لێوەرگرتن و بۆ لەوەودوا وانەبن.. یەکسەر بەهەموو دڵێکیانەوە پێیان خۆش بێت و دابەزن لەهەڵوێستی خۆیان وەك عومەر دەفەرموێت: (ڕەحمەتی خوا لە کەسێك هەڵەکانی خۆمم بەدیاری بۆ دێنێتەوە)..

یان بەئاشکرا (پێغەمبەر) بەئەبوبەکری صدیق بڵێ: (ئەی ئەبوبەکر شتی وا مەکە) (ئەی عومەر وێنەی تۆ شتی واناکات) (ئەی ئەبو زەر تۆ هێشتا خەوشی سەردەمی نەفامیت تێدا ماوە)..

یان نەك ئەمە ئەمیری موسلمانان عومەری کوڕی خەتاب لەوتارێکدا ویستی سنوور بۆ مارەیی ژن دابنێت، بەڵام ژنێك هەستایەوەو قسەی پێ بڕی و ووتی: ئەی عومەر بۆتۆ نیە سنور بۆ شتێك دابنێیت کە خوا بۆی دانەناوە! خۆ عومەر وەك دیکتاتۆرەکانی ئەم سەدەیە دەیتوانی فەرمانی بڕینی زمانی ئەو ئافرەتە دەرکات بەڵام نا..

یەکسەر ووتی: ئافرەتێك پێکایی‌و عومەر بەهەڵەداچوو.

بەڵام هەڵەیەك کەزۆربەی خەڵکی ئەمڕۆی تێکەوتووە ئەوەیە کەگوایە دەپەرموونەوە بەیەکداو بەوەی کە یان خزمیەتی یان هاوڕێیەتی یان هاوکاریەتی دەبینی بەئاسانی قسەی پێدەبڕێت و ڕەخنەی لێدەگرێت و لۆمەی دەکات و سەرزەنشتی دەکات و دەیشکێنێت!!

گەر لێی بپرسیت بۆچی وادەکەی برای خۆم خۆ دڵیت زویر کرد؟! خێرا پێت دەڵێت: گرنگ نیە خزمی خۆمە، یان: قەینا هاورێمە! یان گوێمەدەرێ هاوکارمە! یان: قوتابی خۆمە..

بەڵێ، خزمتە یان هاورێتە یان.. یان ... یان.. دیارە کە لەکیست ناچێت و تازە خزمتە بەلام بزانە دڵیت لەکیس دەچێت و سۆزو خۆشەویستی بەرامبەرت نامێنێت! ئەی نابینیت هەزاران خزم ساڵی جارێ یەکتری نابینن وسەر لەیەك نادەن؟ ئەمە لەئەنجامی چییە؟ بێجگە لەقسەی تاڵ و ڕەخنەو بەچاوی سووك سەیری یەکتری کردن و تەریق کردنەوەی یەکتر؟!.

یان نەگبەتی لەوەدایە کەسێك هاورێیەکی دەست دەکەوێت! خۆشبەخت دەبێت پێی! کەچی بەداخەوە پاش ماوەیەك پارێزگاری ئەم هاورێیەتییە ناکات و دەیشکێنێ‌و لۆمەی دەکات و ئەمەت بۆ کرد ئەوەت بۆ نەکرد! لە کاتی نارەحەتی سەری لێنادات و خەمی ناخوات! بۆیە هەر ئەوەندە دەزانێت دەبنەوە نەناسی یەك مەگەر لەسەرەگرتنی سەمونخانەدا یان ڕێکەوت لەپاسەکەدا بکەونە پاڵ یەك ئەوجا بیریان بکەوێتەوە کەهاورێ و دۆستی یەکترن!!.

یان لەمانەش ناخۆشتر گەنجێکی پابەند بەئیسلامەوە.. دەبینی برایەکی مولتەزیمی وەك خۆی هەیەو پێکەوەن.. لەباتی ئەوەی دڵی یەکتر ڕاگیربکەن و پشت‌و پەنای یەکبن.. دەچێ ڕۆژی جارێك دو جار سێ جار لەسەر شتی بێ ئەهمیەت و بچووك کوڕە باگەورەش بێ سەرزەنشت و لۆمەی دەکات و تەریقی دەکاتەوە!!..

ئیتر لەناو خەڵکیدابێت کە ئێشەکی پیس ترە لەسەر دڵ یان هەر خۆیان بن!!

ئەگەر لێی بپرسین باشە بۆ وادەکەیت تاوانە و ڕق و کینە دروست دەبێت؟! خێرا دەڵێت: بێقەزابی ئەوە کەسێك نی یە کە زویربێت!؟ ئێمە سیقە لەبەینماندا هەیەو لەیەك دڵمان نایەشێت!! هەمووومان (أخوة في الله)ین!..

لەبەرئەوە با لەپشتی پەردەوەو ناڕاستەوخۆ ئامۆژگاریان بکەین تا بۆمان دەکرێت با بە (کنایە) ئامۆژگاری هەموو کەسێ بکەین و دڵیان ڕاگیر بکەین..

## بەشی یەکەم

### ٢- گەورەترین نهێنی لەهەڵس و کەوت کردندا لەگەڵ خەڵکی

هیچ چارەیەك نییە، هیچ ڕێگایەکی بەسوود نییە بۆ ئەوەی کارێك بەکەسێك بکەیت یەك چارە نەبێت ئەویش ئەوەیە کەوای لێ بکەیت حەزێکی دەروونی پاڵی پێوە بنێ بۆ هەستان بەوکارە و بەخۆشی خۆی بیکات..

بەڵێ ئەتوانیت وابکەیت لەکەسێ کەخۆی بەدەستی خۆی کاتژمێرەکەیت بداتێ، ئەگەر لوولەی غەدارەکەت بخەیتە بناگوێی!.

بەڵێ دەتوانیت وابکەیت لە فەرمانبەرێك چیت بوێت لێی.. بۆت بکات بەمەرجێك بەدیاریەوە بوەستیت، هەرپشتت هەڵکرد ئیتر نایکات..

خۆ دەتوانیت، چیت بوێت لەمنداڵەکەت بیکات بەمەرجێك قەمچییەك یان دارێکت پێ بێت بۆی.. بەڵام ئەم ڕێگایانە هیچیان سەرکەوتوو نین و ڕێی مرۆڤی عاقڵ و هۆشمەند و پێشکەوتوو نییە بەهیچ کلۆجێ.

بەڵکو تاقانەترین ڕێگایەکە تۆ چیت پێخۆشەو حەزت لێیەتی بیخەمە بەردەستت.. حەزو ویستەکانی تۆ چین؟ (فرۆید) دەڵێت: هەموو ئیش و کارو هەڵس و کەوتی مرۆڤ لە دوو بنچینەوە دەردەچێت:

یەکەم: حەزێکی جنسی و ناوەکی(١).

دووەم: حەزکردن لەبەرزی و بڵندی..

مامۆستا (جون دیوی) وەك ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی هەیە بەڵام تەنها بنچینەی دووەمی فرۆید دوبارە دەکاتەوە بەجۆرێکیتر: (باشترین هۆیەك کە پاڵبنێت بە مرۆڤەوە بۆ کردنی کارێك ئەوەیە: (حەزکردنی لەوەی کەباس بکرێت لەناو خەڵکدا).. ئەم دووبڕگەیە چاك لەبیر بێت: (حەز کردنی لەوەی کەباسی بکرێت) چونکە ئەم ووشەیە دەبیستیتەوە لەم کتێبەدا:

بە پرسیارکردن لەزۆرێ لەمرۆڤە پێشکەوتووە ئاسیاییەکان، ڕوون بۆتەوە کەئەو شتانەی حەزیان لێیەتی بەم شێوەیەی خوارەوەیە بەپێی گرنگیان:

١-تەندروستی چاك.

٢-خۆراك.

٣-خەو.

٤-ماڵ و دارایی.

٥-ژیانی ئاسوودە لەدوای مردن.

٦-ژن و ماڵی چاك.

٧-موچەیەكی باش بۆ بەخێوكردنی منداڵەكان.

٨-باسی بكرێت و ناوی هەبێت.

هەموو ئەم حەزو ئارەزووانەی پێشوو ئاسانن و لەوانەیە هەموویان بێتە دی بێجگە لەوەی هەشتەم كە فرۆید ناوی ناوە (حەزكردن لەبەرزیو بڵندی) (دیوی) ناوی ناوە (حەزكردن لەوەی كەباسی بكرێت).

ئائەمە (هەی یاران) حەزێكی زۆر پێویستی مرۆڤەكانە بەگشتی هیچ گومانی تێدانییە كەئەو كەسەی بتوانێ ئەم پێویستیەی خەڵك تەواوبكات و حەزەكانیان بێنێتەدی.. دەبا دڵنیا بێت كە دڵی هەموانی كردۆتە خۆی، تەنانەت وادەكات لەو خەڵكە كە بەبینینی گەش ببنەوەو بەمردنیشی تەنانەت (دوكاندارەكانیش) غەم بارو داخ لەدڵ بن بۆی!.

(حەزكردن لەبەرزی) و (دەنگ و باس بوون) گرنگ ترین خاڵی جیاوازییە لەنێوان مرۆڤ و گیانلەبەرانیتر.. چەند نموونەیەك لەسەر ئەمە بێنینەوە..

باوكم لەویلایەتی (میسوری) لەناو كێڵگەكەیدا مەڕوماڵاتی بەخێو دەكرد بەشێوەیەكی چاك.. عادەتی پێوە گرتبوو هەموو جارێ بەشداری دەكرد لەپێشانگای مەڕوماڵاتدا كە شارەوانی دەیكردەوە بۆ مەڕوماڵاتی ئەو ناوچەیە..

باوكم بەزۆری لەوپێشانگایانەدا دیاری و خەڵاتی سەنگینی وەردەگرت وەك قوماشی ئاوریشمی شینباو كە پێشانگاكە دەیبەخشێ بە خاوەنی چاكترین مەڕوماڵات..

تا ئێستاش لەیادمە كەچۆن باوكم ئەو خەڵاتانەی كۆدەكردەوەو بەبەنێكی ئاوریشم ئەی نووساندن بەیەكەوە.. هەركاتێ میوانێكمان بهاتایە.. باوكم بەخێرایی ئەچوو ئەو شریتەی دەهێنا سەرێكی خۆی دەیگرت و ئەو سەرەكەشی دەدایە

دەست من لەبەردەم میوانەکەدا درێژی دەکردو کەشخەیی پێوە دەکرد و خۆی هەڵدەناو فەخرو شانازی پێوە دەکرد..

خۆ وڵاخ و مەڕو ماڵاتەکان بێگومان گوێیان نەداوە بە خەڵات و دیارییەکان.. بەڵام باوکم زۆر گوێی دەدایە.. بۆچی.. چونکە حەزو ئارەزووی دەهاتەدی ئەویش (ناو دەرکردن) بوو..

بەڵێ حەزوو ئارەزوو بۆ (ناودەرکردن) کەوا بکات لەنوسەرێکی بێ ئەهمیەتی فیسقەو بچکۆلانەی شاگردی دوکانێك.. کە نیمچە خوێندەوارییەك نەبێ هیچی تری نەبوو.. وای لێ کرد کە دەست بەکات بەخوێندنەوەی چەند کتێبێکی یاسایی کەلەبنی بەرمیلێکی زبڵ دا کەوتبوون!..

لەوەش دەچێ ناوی ئەم پیاوەت بیستبێ؟ (ئەبراهام لنکولن) کەپاشان بوو بەسەرۆکی ئەمەریکا!

هەر ئەم حەزو ئارەزووە بوو دیسان وای کرد (چارلز دیکنز) هەستێت بەنووسینی ڕۆمانە زیندووەکانی.. وە وای کرد لە (ڕۆکفێلەر) کە ببێتە دەوڵەمەندترین کەسی جیهان..

وەهەر ئەم حەزەیشە وادەکات لەدەوڵەمەندترین کەسی ناوچەکەتان کەکۆشك و تەلاری زۆر زیاتر لەپێویستی خۆی بەرز بکاتەوەو هەر ئەوەشە وای لێدەکات کە تازەترین و جوانترین جل و بەرگ لەبەربکات.. کەشخەترین مۆدێلی ئۆتۆمبیل بخاتە ژێری..

باسی کوڕو کچەکانت بەگەورەیی دەکەیت و هەڵیان دەبڕی لەلای خەڵکیدا.. تەنانەت هەر ئەم حەزەیشە وادەکات لەهەندێ کەس بیانەوێ لەڕێگەی خراپەو شەوکوت و جەردەیی و خوێن ڕێژییەوە ناو دەربکەن..

(أز برمارونی) سەرۆکی پێشووی پۆلیسی نیوێۆرك بۆی گێڕامەوەو ووتی:

یەکەمین شتێك کە تاوانباری ئەمڕۆژە داوای دەکات پێش لەسێدارەدانی ئەوەیە کە ئەو ڕۆژنامەیەم پێبیشان بدەن کە باسی پاڵەوانی و منی تێدایە ئیتر لەبیری

دەچێت کە پاش چەند ساتێکی تر کورسی کارەبایی چاوەڕوانی دەکات و زۆر بە دوری دەزانێت..

ئەوەی زۆر گرنگ بێت لەلای کاکی تاوانبار ئەوەیە کە ناوی خۆی ببینێتەوە لە تەنیشت ناوی بەرزی (ئانیشتاین و تۆسکانینی و ڕوزفلت)!..

پێم بڵێ چۆن و بەچ ڕێگایەك دەتەوێت ئارەزووی (باسکردنت) بێنیتەدی.. ئەوکاتە من پێت دەڵێم تۆ چ جۆرە پیاوێکی؟ چونکە ئەم حەزوو ئارەزووە چاکترین پێوەری تۆیە!..

نمونەی ئەمە پیاوێك بەناوی (جون رۆکفلر) ئەم ئارەزووی ناو دەرکردنەی بەخەرج کردنی پارەیەکی زۆر لەڕێگای کرنەوەی (خەستەخانەیەکی گەورە لەچین) بۆ چارەسەرکردنی هەزاران هەزار نەخۆش کە نە وولاتی خۆی بوو نەهیچ!..

لەکاتێکدا کە (دلنجر) ئەم حەزەی دێنێتە دی لەڕێگای دروست کردنی باندێکی سەرکەش بۆ کوشتن و بڕین و دەست درێژی کردنە سەر بانقەکان..

مێژوو پڕە لەبەسەرهاتی خۆش و سەرسوڕهێنەر کەدەگێڕێتەوە بۆمان پیاوە بەناوبانگەکانی جیهان ئەم ئارەزووی ناو دەرکردنە یان چۆن بووە؟.

یەکێ لەوانە (جۆرج واشنطون) حەزی دەکرد پێی بڵێن (خاوەن شکۆ) سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان) (کریستۆفر کۆلۆمبس) لەقەبی شانشینی ئۆقیانوسی.. جێگری شای هیندستان).. وە (کانت کاترینی) گەورە نەیدەهێشت هیچ وتارێکی بڵاوبکرێتەوە ئەگەر لە پێش وتارەکەوە نەنوسرێت (خاتو ئیمبراگور خاوەن شکۆ) وەخێزانی (لنۆکڵن ڕۆژێکیان قیژاندی بەسەر ژنی جنراڵ (گرانت) وەك پڵنگی تێك شکاوو ووتی: (چۆن دەوێریت دانیشیت لەخزمەتمدا تا خۆم بانگت نەکەم؟)!!.

دەوڵەمەند و ملیۆنەرەکان پێش بڕکێیان دەکرد لەبەخشینی سەروەت و سامانی بێ ژمارە بۆ ئەو گەشتیارەی کەویستی جەمسەری خوارو (قطب الجنوبی) بدۆزێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەوشاخە بەفرینە بەرزانەی کە دەگات پێی بەناوی ئەوانەوە ناوی بنێت تا دوای مردنیان ناویان هەر بمێنێت..

تەنانەت (ڤیکتۆر هیگۆ) کەم هەوڵی نەدا تا (پاریس) بەناوی ئەوەو ناو بنرێت بۆ ئەوەی ناوی هەمیشە لەسەر زار بمێنێتەوە!..

تەنانەت زۆریّ لەوکەسانەی کە شێت دەبن هۆکەی ئەوەیە کە سۆزو بەزەیی خەڵکیان ایّدوورەو کەس گرنگیان پێنادات!..

(مس کلنلی) مێردەکەی ناچار کرد کەواز لەسەرۆکایەتی بهێنیّ و کاری دەوڵەت بخاتە ئەولاوە بۆ ئەوەی کە لەگەڵیدا پێکەوە لەخانوەکەیدا ژیان بەرنە سەر بەچەشنیّ کەلەیەکتر نزیك بن و لەیەك جیانەبنەوە دەپاڕایەوە کە دوور نەکەوێتەوە لێی هەمیشە ئاوا پێکەوە بن..!

(کنلی) ئارەزووی گرنگی پێدانی وای لیّ کرد کە سووربێت لەسەر ئەوەی مێردەکەی لەلای بمێنێتەوە لەخەستەخانە تا ددانەکانی چاك دەبێتەوە..

تەنانەت هەندیّ لەزانایانی دەروونناسی وای بۆ دەچن کە هەندیّ کەس خۆیان بەرەو شێت بوون هەنگاو دەنێن. ئەمەش بەنیازی خۆیان ئەو ئاوات و حەزانەکەی کە هەیانە لەژیانی ڕۆژانەدا بۆیان نایەتەدی.. دەڵێن بەڵکو لەژیانی خەوو خەیاڵاتدا ئەو گرنگی و سۆزەیان دەست بکەوێت کەلە ژیانی واقیعیدا دەستیان ناکەوێت!!..

هۆی نەخۆشی شێتی چییە؟.

نیوەیەك لەو کەسانەی کە توشی شێتی بوون (زانایان هۆیەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە(مەیی و تلیاك و حەشیشە) زیانێکی زۆر دەگەیەنی بە دەمارەکانی مێشکیان و شێتیان دەکات یان چەند هۆیەکی تر..

بەڵام ئەی ئەو نیوەی تر هۆی چییە واشێت دەبن؟؟..!

هەر ئەم پرسیارەم ئاراستەی دکتۆرێکی گەورە کرد کەتایبەت بوو بەنەخۆشیەکانی مێشکەوە ووتی: بیّ کەم و زیاد هۆیەکانی نازانم چین وەلەو باوەڕەیشدانیم کە کەس بزانێت بۆچی هەندیّ کەس شێت دەبن.. بەڵام ئەوەی کە تێبینی کرابێت لەم بارەیەوە ئەوەیە کە هەندیّ لەوانەی دووچاری نەخۆشی مێشك بوون هەوڵی (گرنگی پێدانێك) دەدەن بۆ خۆیان کەلە ژیانی ڕۆژانەی دنیا لەلایەن کەسەوە دەستیان نەکەوتووە).

پاشان ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە:

نەخۆشێکی ئافرەتم لەلایە.. شووکردنی بووبەهۆی کارەساتێکی دڵتەزێن ماوەیەك پێش ئەوەی نەخۆش بکەوێت.. ئەم ئافرەتە لەدەروونی خۆیدا وای دانابوو کە هاوسەرێکی وای دەست کەوێت ئەمی زۆر زۆر خۆش بووێت و کوڕو کچی لێی ببێت و پایەیەکی کۆمەڵایەتیشی هەبێت بەڵام ڕۆژگاری ژیان یەك بەیەکی ئاواتەکانی بۆ کێشا بە دیوارێکداو پارچە پارچەی کرد).

نەمێردەکەی خۆشی ویست و قەدەری خوایش وابوو کە هەر منداڵی نەبێت! ئەم ئافرەتە شێت بوو، بەدەم خۆیەوە وای دانابوو لەخەیاڵی خۆیدا کە لەم پیاوە (طلاق) دراوەو شووی کردۆتەوە بە پیاوێکی نەجیب زادەی ئینگلیزو بەگەرمی (سورە) کەبانگی بکات (لێدی سمیپ)..

بۆ منداڵیش.. ئێستە ئەم ئافرەتە وا خەیاڵ دەکات کەهەموو شەوێك منداڵێکی دەبێت..

هەرجارێ دەچم سەری لێبدەم یەکسەر پێم دەڵێت: (دوکتۆر ئایا دەزانی من دوێنێ شەو منداڵێکم بوو)؟..

ئایا تۆ واگومان دەبەیت کە شێت بوونی ئەم خانمە کارەساتێکی دڵتەزێنە؟.

دکتۆرەکەی دەڵێت: ئەگەر بتوانم هۆش بگەڕێنمەوە بۆ ئەم ئافرەتە و چاك بێتەوە نایکەم! چونکە ئەو ئێستا گەیشتۆتە ئاوات و بەختەوەربووەو ئەوەی ویستوویەتی بۆی هاتۆتە دی! هەستی کردووە بەو (گرنگییە)ی کەلەدونیای واقیعدا هەستی پێنەکردووەو دەستی پێی نەگەیشتووە).

بەڵێ شێتەکان لەمن و تۆ بەختەوەرترن! چۆن وانەبن کە هەموو ئەو کۆسپ و چەڵەمانەی کە تیا دەژیان چارەسەر کراوەو لەدونیای خەیاڵاتدا ئەو گرنگی پێدانەیان دەست کەوتووە کە ساڵەها ساڵ ئاواتیان بۆ دەخواست و پێی نەدەگەیشتن!؟.

لەزیاتر کە لەتوانایاندا هەیە چەکێکی بانقت بۆ بکەن ملیۆن دۆلاری بێت؟! یان ئامۆژگاری ئاغاو سەرکردەکانت بۆ دەکەن؟! یان چ زۆر دارێك کەس پێی ناوێرێت ئەوان قسەی پێ دەڵێن؟!

جا وردبەرەوە! هەندێ کەس بۆ دەست کەوتنی بەرزی و بڵندی و گرنگی پێدان پەنا دەبەنە بەر شێت) بوون. جا بزانە چۆن (موعجیزەیەکە)! ئەگەر بێت و من و تۆ بتوانین دەستی خەڵکی بخەین و بەدەم هاوار و داواکارییەکانیانەوە بڕۆین و بۆیان بێنینەدی؟ لە دنیای واقیعدا!..

هەرگیز لەمێژوودا ڕووی نەداوە کە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك مووچەی بگاتە (ملیۆنێك دۆلار) لەساڵێکدا، بێجگە لەدووکەس نەبێت کە یەکەمیان ناوی (والترکرایزلر)و دووەمیان ناوی (تشارلس شواب)بوو..

بابزانین بۆچی ئەندروکارنیجی لەساڵێکدا ملیۆنێ دۆلار بە (شواب) دەدا واتە (سێ هەزار دۆلار) بەس لەیەك ڕۆژدا!؟.

ئایت (شواب) هەڵکەوتوویەکی سەردەمی خۆی بوو؟ نەخێر.. ئەی ئایا ئیشە ناڕەحەتەکانی لەخەڵکی باشتر ئەنجام دەدا لەکارگە؟ نەخێر! (شواب) خۆی دەگێڕێتەوە کە کەسانێك لەبەردەمیدا کاردەکەن لەم شارەزاترن لەکارداو خیبرە و شارەزاییان زۆر زیاترە..

بەڵام (شواب) ئەم مووچە زۆرەی وردەگرت تەنها لەبەر یەك شت! ئەویش هونەری هەڵس و کەوت کردنی زۆرباش زانیوە!..

جارێك پرسیارم لیکرد لەنهێنی ئەو توانایەی کەهەیەتی ووتی: من توانای هەڵنان و بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکی) بەگەورەترین دەست مایەی خۆم دەزانم!.. گەشتنم بەو ڕێگایە زۆر ئاسانە.. من خەڵکی هەڵدەنێم و وەصفی چاکەیان دەکەم.. وەلە ڕێزگرتن و ئازاکردنیان دا ڕۆدەچم لەڕادە بەدەر چونکە هیچ شتێك ئەوەندەی ئەوە (کوشندە) نییە بۆ گیان و هەستی خەڵکی بەڕادەی (ڕەخنە لیگرتن) لەلایەن کەسانێکەوە کەلێپرسراوی ئەمن! بەڵام من هەرگیزا و هەرگیز ڕەخنە لەکەس ناگرم وە بەهیچ جۆرێ بۆ هەڵەی کەس ناگەڕێم .

ئەگەر بۆم هەبێت وەصفی خۆم بکەم بەخۆم دەڵێم: (من پیاوێکم لەباس کردنی چاکەی خەڵکی و ڕێزگرتنیاندا، هەرزۆر دەست بڵاوو ڕۆچووم (مسرف و مفرط)!..

ئابەم جۆرە بوو کارو پیشەی (شواب).. بەڵام ئەی من و تۆ چی دەکەین؟ بێگومان بە پێچەوانەوە دەیکەن! ئەگەر شتێکمان بەدڵ نەبوو! دەست دەکەین بەسەلێنی ڕەخنە و لۆمە کردن و تەمێ کردن..

بەڵام ئەگەر شتێکمان بەدڵ بوو وەپێی ڕازی بوین هیچ ناکەین و دوولێومان ناکەینەوە..

نهێنی ئەو سەرکەوتنە مەزنەی (ڕۆکفلیلەر) دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆچوون و لەڕادە بەردەر لە پیاهەڵدان و هەڵنانی خەڵکیدا!..

ڕۆژێکیان زەرەرێکی گەورەو قورس دەکەوێت لەکاسبیە هاوبەشەکەی لەگەڵ (ئیدومارد برفورد) کەبێگومان خەتاکەش دەگەڕێتەوە بۆ (ئیدوارد) چونکە کاسبییەکەیان زۆر گەورە بوو یەك ملیۆن دۆلار زەرەریان کرد!!..

(ڕۆکفیلەر) ئەگەر بیویستایە هەر لەخۆیەوە تێك بچوایە باوبارانی سەرزەنشت و ڕەخنە و لۆمەی بەسەر (ئیدوارد)دا دەباران.. بەڵام ژیرانە خۆی گرت.. چونکە دەیزانی کە (ئیدوارد) چی لەتوانادا بوو کردوویەتی و حەزیشی بەم زیانە نەکردووە.. لەبەر ئەوە لەسەر خۆو بە وردی گەڕا بەمەسەلەکەدا و پاشان ڕووی کردە (ئیدوارد) و دەستی کرد بە باسی چاکەو پیاهەڵدانی و دەست خۆشی لێکرد!!

چونکە بۆی دەرکەوت کە (ئیدوارد) بەوپەڕی هەوڵ توانیبووی لە (٦٠٪)ی زیانەکەی کەم کاتەوە لەدەست مایەکەیان..

یان (زیجفیلد) ئەوکەسەی کە ڕۆژانێکی دوور و درێژ (بڕۆدوای) سەرسام کردبوو.. وەکاری سیحری کردبوو چاوەکانیان.. وە ناوبانگی دەرکردبوو بەوەی کە توانایەکی بێهاوتای پەیدا کردبوو لەخۆشەویست کردن و گرنگیدانی بە کچانی ئەمەریکا وایان لێ بکات کە هەست بە بوونی خۆیان بکەن..

هەرکاتێك ئافرەتێکی لاوازی ناشرینی بدیایە کە کوڕان هەرگیز سەیریشیان نەدەکرد چ جای خواستنی.. بانگی دەکرد و دەیبردە سەر تەختەی شانۆ خەڵکانێکی زۆر سەیریان دەکرد و دڵی چەندان لاوی کەمەندکێش دەکرد بۆ خۆی پاش ئەوە پێش برکیێ دەبوو لەسەر خواستنی!.. ئەم کابرایە ئەوەندە متمانەی بەجوانی و قەشەنگیان هەبوو! وای ایێکردبوون کە متمانەی تەواویان بەخۆیان پەیدا کردبوو..

جارێکیان ویستم بەڕۆژوبم و نان و ئاو نەخۆم.. شەش ڕۆژ لەسەر یەك بەڕۆژوو بووم.. بۆم دەرکەوت کە ڕۆژو گرتن زۆر ئاسانە و هیچ ناڕەحەتییەکی تێدا نییە، بەڵکو شەشەم ڕۆژ لە دووەم ڕۆژ ئاسان تر بوو..

لەگەڵ ئەوەشدا زۆریێ لەخەڵکی ویژدانیان قبوڵی ناکات و خەریکن خۆیان دەکوژن کە کاتیێ شەش ڕۆژ منداڵەکانیان نان نەبێت بیخۆن!..

بەڵام هەرگیز ویژدانیان ناجولێت و ناڕەحەت نابن کە کاتێك (گرنگی پیێدان و ڕێز ایێنان و بەرزی و بڵندی دەگرنەوە لەمنداڵ و کەس و کار و ژێردەستەکانیان) کەلەخواردن پێویست ترە و وەك خواردن حەزیان ایێیەتی..

ئێمە خۆمان تەرخان دەکەین و تیێ دەکۆشین بۆ پەیدا کردنی خۆراکی گەشەی منداڵمان..

بەڵام زۆر بەکەمی هەوڵ دەدەین بۆ کوژاندنەوەی ئاگری تینوێتینان بۆچی؟! تینوی ئەوەیانە کە گرنگیان پیێ بدرێت و باس و خواستیان هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا چروکی (بخیلی دەکەین و هەندیێ ووشەی ڕێزو هاندان و بڵندکەر و وورەو متمانە بەخۆ دروست کەریان پیێنادەین کە مافی خۆیەتی لەمێشکیاندا بیهێڵینەوە تا لەسنگ و دەروونیاندا دەنگ بداتەوە و هەروەك ئەو دەنگە خۆشەی بولبول لەسەر چڵ هەیەتی.....

وا دەزانم کە خوێنەرانی بەڕێز کاتیێ ئەم چەند دێرە دەخوێننەوە، بەدەم خۆیانەوە گاڵتە دەکەن و دەڵێن: (ڕووپامایی.. دووڕوویی.. خۆهەڵواسینی بیێتام

کە هەر هەموو ئەوانە کە کارێکی وەختی و لەناوچووەو بۆ کەس تاسەر ناشێت بەتایبەت بۆ زیرەك و هۆشمەندان.)..

ئەو خوێنەرانە لەسەر هەقن و ڕاست دەکەن. ڕووپامایی و دووڕوویی و خۆهەڵواسین و چەورەیی کردن هەر هەموو ئەوکارانە هۆشمەندو زیرەکەکان نابێت بە هیچ جۆر لێی نزیك ببنەوە!..

چونکە هەر کەسێکیان بێجگە لە خەڵەتاندن و خۆپەرستییەکی پیسی ئاشکرا هیچی تر نییە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگرێتەوە کە بەهیچ جۆر نەکرێت، بەتایبەت لەگەڵ کەسانێکدا کە زۆر زۆر تینووی ئەوەیانە کە ڕێزیان لێ بگیرێت و بڵند بکرێن..

ئەوانە بەجۆرێکن کە شتێ بخرێتە بەردەستیان و کاریان پێدا بدرێت سێ و دووی لێ ناکەن و بەبێ ملە جەڕێ کردن پێی هەڵدەستن و گوێ ڕایەڵن بۆی.. نموونەی ئەوکەسانە وەك ئەوە وایە کە لەبیابانێکدا پێ بگێرێ و لەتینواندا دەستی نەگاتە ئاوی پاك ئاوی پیس وەستاویش دەخواتەوە گەر ڕێی لێ بکەوێت..

نموونەی ئەوە وەك (براکانی مێدیڤانی) کەبەڕاستی سەرکەوتوو بوون لەبازاڕی ژن هێناندا.. تەنانەت دەستیان گەیاندە دوو حۆری سەرشاشەی سپی و مارەیان کردن، ئیتر با ملیۆنەری قەشەنگ (بەربارە هاتوون)یش بێت،ئەزانن بۆچی؟..

ڕۆژێکیان ئەستێرەی سینەما (یۆلانجری) پێی وتم: (بەڕاستی ئەو چەند برایەی مێدیڤان هونەری خۆ هەڵواسینیان چاك دەزانی بەڕادەیەك کە پێشتر کەس بەو جۆرە نەیزانیوە..

هونەری خۆ هەڵواسین وەك دەزانیت لەم ڕۆژەدا پشت گوێخراوە)..

تەنانەت شاژن (ڤیکتۆریا) بەهونەری خۆهەڵواسین خەڵەتاو بەدەمییەوە هات.. کە (دزرائیلی) دەڵێت: زۆرجار خۆ هەڵواسینم بەکار هێناوە لەکاتی هەڵس و کەوتمدا لەگەڵ شاژن ڤیکتۆریا.. (دزرائیلی).

بەڵام لەسیاسەت مەدارە زۆر هۆشمەندو ژیرەکانە کە حوکمڕانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایان کردووە.. ئەگەر بێت و خۆهەڵواسین و ڕووپامایی بەکاری ئەو هاتبێ..

مەرج نیە بەکاری من و تۆ بێت.. لەوانەشە گەر بێت و چەکی رووپامایی لەشان بکەیت بەئەنجام و بەرهەمەکەی بگەیت لەوانەشە بەپێچەوانەوە بێتە دی..

کەواتە جیاوازی چییە لەنێوان (ڕێز لێنان) و (خۆهەڵواسین)دا؟..

وەڵامەکەی ئاسانە: یەکەمیان پاك و بێگەردە.. دووەمیان بۆگەن و درۆو پڕ لە غەشە..

یەکەمیان لەدڵەوە دەردەچێت .. بەڵام دووەمیان لەزمانەوە.. یەکەمیان: خاڵی یە لە خۆپەرستی.

دووەم: پارچەیەکە لەخۆپەرستی.. یەکەمیان هەرهەمووی پێی خۆشە.. دووەمیان: هەر هەمووی بێزی لێدەکاتەوە..

لەم دواییەدا پەیکەرێکی (ژەنراڵ ئۆبریجۆن)م بینی لەکۆشکی (شاپۆڵتیك) لە شاری (مەکسیکۆ) چەند ووشەیەکی پڕمانام بینی بەژێری پەیکەرەکەوە نوسرابو کەیەکێ بوو لەفەلسەفەکانی (ئۆبریجۆنی تیایدا نوسرابوو (مەترسە لەو دوژمنانەت کە لەکەمین دان بۆت و هێرشت بۆ دێنن.. بەڵکو لەو هاوڕێیانە بترسە کە خۆهەڵواسین و چەورەیت بۆ دەکەن.)..

نەخێر.. نەخێر.. من هەرگیز پێشنیاری ئەوەتان بۆناکەم کە چوونە پێشەوەو خۆهەڵواسینی و مامە حەمەیی بکەن.. بەڵام ئەوەندە هەیە من بانگتان دەکەم بۆ شێوازێکی نوێ لەشێوازەکانی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا..

پاشا (جۆرجی پێنجەم) چەند نووسراوێکی بەتایبەت هەڵگرتبوو چوار چێوەی تێگرتبوو لەژوورەکەی خۆی لەکۆشکی (بکنگهام) هەڵی واسیبوون.. کەیەکێ لەو پەندانە دەڵێت: (فێرم مەکە هەربمدەیتێ، وە فێرم مەکە پێشوازیم بکەیت بە پیاهەڵدانی خۆڕایی و بێپارە) ئائەمەیە پیاهەڵدان وخۆهەڵواسینێکی بێبەرامبەر.

ڕۆژێکیان پێناسەیەکی خۆهەڵواسینم (التملق) خوێندنەوەوە بۆیە حەزدەکەم لێرەدا باسی بکەم:

خۆهەڵواسین(( ووتەیەکە بەکەسێکی بڵێیت کەخۆی گومان نەبات تیایەتی..))

بەڵام (ڕێز لێ گرتن)ێ کەمن مەبەستمە ئەوەیە کە وەك ووتەی (ڕاڵف واڵد و ئێمرسون) دەڵێت:

(هەموو کەسێك کە دەگەم پێی (بەلایەنی کەمەوە) لەیەك شتدا لەمن باشترە، کەواتە من لێوەی فێردەبم)..

دەی کەواتە با هەوڵ بدەین چەند ڕەوشتی جوان لەخەڵکیدا هەیە. باسیان بکەین و خۆهەڵواسین (چەورەیی) لەبیربکەین.. باڕێزێکی پاك و بێگەرد) بۆ هەمووان هەبێت..

بەزیادە ڕەوی و بەردەوامی چاکەی خەڵکی باس بکەوڕێزێکی لەسنوور بەدەریان بگرە.. ئەوکاتە خەڵکی بیر لە ووشەکانت دەکەنەوەو پاش چەندان ساڵ هەر لەبیریان دەمێنێ کەتۆ هەر لەبیریشت نەماون..

**پاشکۆی یەکەم:**

**٢- ڕێزی براکەت بگرە و دان بەچاکەو لێهاتوویەکانیدا بنێ:**

ئیسلام بەرنامەیەکە داڕێژراوی دەستی خوای پەروەردگارە.. هەرشتێ ئەمڕۆ زاناو عاقڵ مەندانی جیهان پەی پێبەرن و بیری لێبکەنەوەو بەپێویستی بزانن و خەڵکی بۆ بانگ بکەن.. ئیسلام زیاتر لە (١٤٢٠)ساڵ لەمەوبەر بیری لێکردۆتەوەو بەپێویستی زانیوەو خەڵکی بۆ بانگ کردووە..

لەبەشی دووەمدا (دیل کارنجی) ئەوەی ڕوون کردەوە کە حەزێکی (فیکری) شاراوە لەهەموو کەسێکدا هەیە.. ئەویش حەز کردن لەبەرزی و بڵندییە.. هەرچەندە ئێمە خاڵ بەخاڵ پاڵ پشتی (دیل)ناگرین.. چونکە ئەو ژیانی (پێغەمبەر)و کارتێکردنی هاوەڵان و موسڵمانانی دوای ئەوان نەگەشتۆتەلای و نەی بیستووە.. چونکە ئەگەر بگەشتایە پێی من دڵنیام ئەگەر موسڵمانیش نەبوایە هەر هیچ نەبێ هەندێ لەبۆچوون و بیرەکانی پیاچوونەوە دەکردەوەو پاك و پیسی دەکردن..

ئیسلام بەوپەڕی لێبڕانەوە هەوڵ دەدات کەهەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بەجۆرێ پەروەردە بکا حەزێکی دەروونی دروست بکات تیایاندا.. کەهەر ئەو حەزو ئارەزووە دەروونییە پاڵ پێوەنەریان بێت بۆ کردنی هەرکارێك یان وازهێنان لێی..

نەك ترساندن و چاو سووركردنەوەو داروفەلاقە.. هەروەك لەیەکێ لەسەربازگەکانی عێراقدا ئەفسەرێکی دەرەجەدار پاش ئەوەی بەقیڕەو هاوار و لێدان هەرچی کرد بوو نەیتوانیبوو بە جوانی سەربازەکان ڕیز بکات بە جۆرێ کەکەس لار نەوەستێت و ڕیزتێك نەدات بە تووڕەییەوە وازی لێهێنان بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە هاتە دەرەوەو سەیرێکی ناوخەڵکەکەی کرد چی بینی؟..

زۆر سەیرە ئەوانەی کە ئەم بەیانیە بەئەفسەرو پێنج عەریفەوە نەمان توانی ڕیزیان بکەین..

وا ئێستا لەم پەڕە بۆ ئەو پەڕ یەك ڕیزی ڕێك وەستاون و نوزەیان لەخۆیان بڕیوەو هێمن هێمنێ نوێژ دەکەن.. کابرای ئەفسەر زۆر سەری سوڕما و ووتی ئەوە ئەفەنی بۆ من بۆ واڕیزنابن و جوان ناوەستن..

ئەم ئەفسەرە زۆربێ ئاگایە.. و هەژارە وادەزانێ بەدراێکی ئەفسەریەوە یان بەتوڕەیی عەریفەکانی دەتوانێت بچێتە دڵیان و خۆشیان بوێ و بگوێی بکەن..

نازانێت کە ئیسلام پێش ئەوەی فەرمان دەرکات و گوێ ڕایەڵی بوێت.. نرخ و ڕێزی لە ڕادە بەدەری بەئادەمی بەخشیوەو کردنی بە خاوەنی بەرنامەو ڕێبازو پەروەردگارەکەیانی پێناساندوون و بەڵێنی بەهەشتی پان و بەرینی پێداوون و ئەوەندەی باوەڕتێدا دروستکردوون کە لێیان ڕوونە هەرشتێ زیانبەخش نەبێت قەدەغەی نەکردووەو هەرشتێکیش چاك نەبێت فەرمانی پێنەداوە..

نموونەیەکی زیندوو: چەند ساڵانێك لەمەوبەر لەساڵی سییەکاندا بەشی تەندروستی ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەڕاپۆرتێکیاندا بەرزیان کردەوە بۆ دەوڵەت کە (عەرەق خواردن) هەڕەشە لەدواڕۆژی ئەمەریکا دەکات.. وەسەرەکی ترین هۆی نەخۆشین و لەش داڕزانەو هەروەها زۆربەی کارەسات و تاوان و خوێن ڕشتن و تێك چوونی خێزانەکان لە(سەرخۆشیەوەیە)..

بۆیە ئەمەریکا بڕیاریدا کە هەستێت بەقەدەغەکردنی عەرەق.. لەهەموو ئەمەریکیەکان.. بەڵێ (یاسای قەدەغەکرنی عەرەق) ١٩٣٠ دەرچوو.. بەلام پێش دەرچوونی بۆ جێبەجێکردن.. دەست کرا بەڕێگە خۆش کردن بۆی وەك

١- بانگێشەیەکی فراوان کرا بۆ باسکردنی زیانی عەرەق لەڕێگاکانی ئێزگەو تەلەفیزیۆن و سینەماو شانۆکانەوە..

٢-وەمامۆستا و دکتۆر و پسپۆڕان تەرخان کران بۆ دەرکردنی کتێب و نامیلکەو گرتنی چەندان کۆڕ بۆ ئەم مەبەستە کە (٦٥) ملیۆن دۆلاری تێچوو..

٣- وە (٩)هەزار ملیۆن لاپەڕە دەربارەی زیانەکانی عەرەق نووسرا..

٤- هەموو کارگەکانی وەستێنران و نەشیان هێشت لەدەرەوەبێت..

(٢٠٠)کەس لەسێدارە دراو نیو ملیۆن کەس گیرا و تا (٤)ملیۆن دۆلار غەرامە سەنراو نزیکەی (١٠٠٠)ملیۆن دۆلار دەستی بەسەردا گیرا لەبەر سەرپێچی ئەم یاسایە..

ئایا خوێنەری بەڕێز وا دەزانێت (عەرەق) بنەبڕکرا لەوولاّتە یەکگرتووەکان؟؟..

بێگومان نەخێر.. ئەمەریکا ناچار بوو لەساڵی (١٩٣٣)دابڕیارە کە هەڵوەشێنێتەوە..بۆچی؟

چونکە لەحەزێکی ناوخۆییەوە نەبوو بەڵکو لەزۆری دەسەلاّتەوە ئەمەیان پێکرا.. بۆیە بە مردنیش وازیان نەهێنا..

بەلاّم ئیسلام پێش (١٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر هەر کەفەرمانی حەرام کردنی عەرەقی دەکردبەتەنها ئایەتێك کەتیایدا دەفەرموێت: (فاجتنبوه) واتە لێی دوور کەونەوە هەرهەموو موسڵمانان وازیان هێناو بەدەستی خۆیان هەرچی کوپە و گۆزە عەرەق هەبوو شکاندیان و ڕژاندیان بەبێ هیچ زۆر کردنێك تەنانەت هەبوو لەدەمیدا بوو هەرکە فەرمانەکەی خوای بیست خێرا تفیەوەو فڕێیدا..

بەرنامەی ئیسلام لایەنی ڕێزگرتن و ڕێزلێنان و پێزانینی پشتگوێ نەخستووە.. ئەوەتا خوای گەورە کەدروست کەرو بەدیهێنەرەو هەزاران هەزار بەخششی بەئادەمیزاد بەخشیوە.. لەوانە هیچ ئازایەتی نییە کە مرۆڤ سەری بەندایەتی بۆخوا شۆڕ بکات.. بەڵکو ئەوپەڕی سپڵەیی و بەدنمەکی یە ئەگەر پشت لەخوا هەڵبکات..

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە نافەرموێت نوێژبکەن و من بناسن، ئەوە نییە منیش بەخشیشم باراندووە بەسەرتاندا.. نەخێر بەڵکو وەصفی نوێژکەران بە چاکە دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾ ( المعارج ٣٤) پاشان یاداشتەکەشی دەخاتە پێش چاویان ئەوەندەی پاڵنەریان بۆ بەردەوامی لەسەر گوێرایەڵی و دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي جَنَّٰتٖ مُّكۡرَمُونَ﴾ ئائەو نوێژکەرانە بەڕێزەوە دەبرێنە بەهەشتەکەی خوا..

کەچی من و تۆ کەپێمان بووتریٚ: سوپاسی فلاٌن کەس بکە چونکە زۆر ماندوو دەبێت لەگەڵ منداڵەکانتدا لەقوتابخانەو تۆزیٚ پێیدا هەڵبدە و ڕێزی لیٚبنیٚ.. یەکسەر دەڵێیت: ئیٚ چییە خۆ مووچە دەخوات .. خۆ خێری باوکی ناکات..

یان ئایا کەی بیر لەوە دەکەیتەوە کە ڕۆژیٚ تۆ بڵیٚ جاریٚ لەجاران چوبیتە تەنیشت فەڕاشێك یان کەناسێك یان حەماڵێك تۆزیٚ لەلای دانیشتبیت و سوپاس و پێزانینی ماندوویەتیەکی بۆ دەربڕێت وەوای لیٚبکەین کە بڕوابە خۆبوونی تێدادروست ببیٚ و کەمێکیش کینە کەشەیتان بۆی دروست دەکات تێیدا نەمێننێت.. کەبڵیٚ بۆچی ئەمانە ئەندازیارو مامۆستاو دکتۆرن و منیش!..

ئەوەتا هەندیٚ لەئافرەتان لەمەککەوە بەدزی کەس و کاریانەوە منداڵ و مێردو ماڵ بەجیٚ دێڵن و بەرەو مەدینە دەکەونە ڕیٚ و دەشت و دەر و دۆڵ و چیا دەبڕن و دەگەنە خزمەتی (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) و موسڵمان دەبن..

خوای پەروەردگار ڕێزێکی تایبەتیان لیٚ دەنیٚو لەقورئانەکەیدا باسی کردوون و داوا لە (پێغەمبەر)ەکەی دەکات کە دوای دڵنیابوون لەنیەتیان (پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو داوای لیٚ خۆشبوونیشیان لەخوا بۆ بکە)..

وەك دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَـٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ ۙ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.. (الممتحنة ١٢)

ئائەمەیە ڕێزلێنانی ڕاستەقینە و گرنگی پێدان.. هەتا ڕۆژی قیامەت موسڵمانانی جیهان لەقورئاندا باسیان دەخوێننەوە..

لەانەیە یەکێکی وەك من و تۆ بوایە دەیووت: دەی هاتوون هاتوون.. خۆ چین؟ هەموویان شەش حەوت ژنێکن و هاتوون موسڵمان دەبن.. ڕۆژی سەدان و هەزاران پیاوو ژن دەهاتن بۆ مەدینەو بڕوایان دەهێنا.. یان دەیووت: کاتیٚ ڕێککەوتنی حودەیبیە بوو مەککەییەکان هیچ چارێکیان نەمابوو موسڵمان بوون نەبێت..

نا..نا.. خوای مەزن دەیەوێت تێبگەین کە با چاکەو خێری خەڵکیش کەم بێت ئێمە هەر سوپاسگوزارو بەئەمەك بین بەرامبەری.. دوای ئەوەش خۆ موسڵمان بوونی ئەو ژنانە کەم نەبوو.. ئەمان تەنها لەبەر خواو (پێغەمبەر)ەکەی وازیان لەڕۆڵەکانیان و مێرد و ماڵ و حاڵ و کەس و کارو وەتەن هێنا.. کەی ئەمان لەگەڵ عەرەبەکانی چواردەوری مەدینە دەبن بەیەك هەرکە زانیان (محمد) دەسەڵات و شکۆی پەیدا کردو لوتی دوژمنانی شکاند ئەوجا هاتن و موسڵمان بوون.. ماڵ و حاڵیان لەخۆیان تێك نەدا..

ڕێز لەخەڵکی نان ئەوەیە کە تابۆت دەکرێت لایەنی چاکەیانت بیرنەچێت و هەمیشە باسی بکە بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ خاوەنەکەیی و زیاتر سوور بێت لەسەر ئەو چاکەیەیی و هەست بکات کە کەسانێك هەن ئەم چاکانەیان دەبینێت و پێیا دەزانن و ئافەرینیان لێ دەکەن..

دەبا من و تۆش وابین وەك (پێغەمبەر)ی خوا وابین.. با پەردە لەسەر چاکەی خەڵکی هەڵبدەینەوەو باسی بکەین و سوپاس و پێزانین دەربڕین.. نەك هەر بەشوێن لایەنی خراپەدا بگەڕێین و خاوەنەکەی لەناو خەڵکیدا یان لای خۆیدا بیشکێنین..

(پێغەمبەر)ی بەرزی ئیسلام محمد (ﷺ) بەیەکێ لەهاوەڵەکانی دەفەرموێت: (إن فيك خصلتان يحبهما الله ورسوله) واتە: دوو ڕەوشتت تێدایە خواو (پێغەمبەر)ەکەی زۆریان بەلاوە خۆشەویستە (الحلم والاناه) کە نەرم و نیانی و لەسەرخۆییە (رواه مسلم)..

تاقی بکەرەوە.. بزانە چەند بەسوود و بەرهەم دارە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی چاکەی خەڵکی.. بۆیە (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بە عومەر دەفەرموێت: (ئەگەر (پێغەمبەر)ێ بهاتایە لەدوای من ئەوە (عومەر دەبوو) ! أخرجه الترمذي والحاكم و صححه في التأريخ الخلفاء)..

یان ئازایەتی و بەجەرگی و فیداکاریو لێبڕانی (خالیدی کوڕی وەلید) بۆ هەڵکردنی ئاڵای ئیسلام و گەیاندنی پەیامی خوا بە وڵاتان.. (پێغەمبەر)ی خوای

دڵخۆش کردبوو بەپرادەیەك کە ناوی نابوو (سیف الله المسلول) واتە شمشێری نەبەزیووی خوا..

ئەمانە دەرسن بۆ ئێمە تالایەنی چاکەی خەڵکی پیٚ بەهێز بکەین و لەلایەکی تریشەوە خۆمان بەرینە دڵیانەوە و بیانکەینە هاوڕێی خۆمان.. وەگەر تۆ لەجیاتی (پێغەمبەر) بویتایە لەوانەنبوو بتگوتایە: دەی چییە؟ خۆ خالید ئازایەتی ناکات و حونەری نییە؟..

چونکە چەندان ساڵ دژایەتی قورسی (پێغەمبەر)ی خوای کردووەو تەنها لە جەنگی (ئوحوددا) (٧٠)هاوەڵی شیرینی (پێغەمبەر)ی شەهید کرد..

خالید ئازایەتی ناکات.. مایە دێنێتەوە.. پۆژانی پەش و پڕ شەرمەزاری رابووردووی دەشواتەوە.. بۆ خوا پێتان دەڵێم هەی یاران ئەگەر خالید ئەم قسانەی لەگەڵ بکرایە ئایا سارد نەدەبوویەوە؟..

کەچی من و تۆ دوکانداریٚك کاتیٚ شتەکان هەرزان دەدات پێمان.. سوپاسی ناکەین و پیٚ نازانین و زیاتر هانی نادەین بۆ خاتر گرتنی خەڵکی.. بەڵکو لەوانەیە بڵێین.. فێلبازە ئەیەویٚ زوو شتەکانی بفرۆشێت و کڕیاری زۆرکات بۆشتەکانی.. یان لەوەدەچیٚ: بەهەرزان دەستی کەوتبێت و پارەی پیٚ نەدابیٚ..

کەواتە لە(پێغەمبەر)ەوە بەسە ئەوەندە فێربین کە دەروونی خەڵکی چەندە پێویستی بە ئامۆژگاری و تەمیٚ کردن و سەرزەنشتی ژیرانە هەیە.. هەر بەو شێوەیەش ئەگەر نەڵێم زیاتر چاکەکاران و دڵسۆزان و لێبڕاوان پێویستیان بەهەڵنان و ئافەرین و دەست خۆشبیٚ هەیە..

لەلایەکی ترەوە (پێغەمبەر)ی سەروەرمان گرنگی بەهەموو کەس داوەو وای لێکردووە کە هەست بەبەرزی و بڵندی بکات و باوەڕ بەخۆکردنی تێدا دروست کردوون..

ژیانی (پێغەمبەر) هەمووی وانەی دەروونناسی فێری موسڵمانان دەکات.. ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) دەگێڕێتەوە بۆمان کە (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بیدایە بەلای مندالانی سەرکۆلاندا سەلامی لیٚ دەکردن و دەیفەرموو: (السلام

علیکم یا صبیان) بەڕوویەکی خۆشەوە دەستی بەرز دەکردەوەو بۆیان و دەیووت: (سڵاوتان لێ بێ منداڵە جوانەکان) رواه البخاری و مسلم.

وادەزانم ئەو منداڵانە تامردن ئەو یادگاریە خۆشەیان لەبیرنەدەچوو وە ڕێزو خۆشەویستی تایبەتیان بۆ (پێغەمبەر) (ﷺ) هەبوو..

لەبیرم دێ منداڵ بووین.. دەچووین بۆ مزگەوتی مامۆستا مەلا صالحی گەورە بۆ نوێژ بەڵام تەپوتۆزاوی و پیس و پۆخڵ بووین و نوێژمان نەدەزانی.. دوو یاداشت ی دژ بەیەك هەرگیز لەیادم ناچن یەکەمیان: هەڵویستی پیاوە پیرەکان بوو تەنانەت پیاوێك لەوان.. کەکاتێ دەچووینە ژووری مزگەوت، دەهات بۆمان و بە زللە بناگوێی سوور دەکردینەوە و بەتووڕەییەوە دەیناردینەوە و دەیگووت: پیسی چڵکنانە مزگەوتەکەتان لەنوێژ برد ئێوەو نوێژ کوجا مەرحەبا..

هەڵوێستی دووەم: چەند کەسێکی کەم لە لاوەکان بەدزی پیاوەکانەوە: دیانگوشین بەخۆیانەوەو بەڕوویەکی گەشەوە دەیان ووت: ئەی ئافەرین فریشتەکانی مزگەوت.. هەرگیز لەنوێژی جەماعەت دوانەکەون ئێوە پیاوی دواڕۆژی ئیسلامن..

من وا بۆی دەچم کە هەندێکمان کاتێ گەورەبوون وازیان لە نوێژ هێنا لەداخی هەڵوێستی کۆمەڵی یەکەم بوو.. ئەوانی کەشمان بەدامەزراوی لەسەر نوێژکردن ماینەوە هۆی هاندان و ڕێز لێنان و گرنگی پێدانی کۆمەڵی دووەم بوو بە ئێمە..

یان پیرە پیاوو پیرە ژن کە هێزی دەست و ئەژنۆو چاوو گوێچکەیان کز بووەو تووشی چەندان نەخۆشی بوون و منداڵ و کەس و کار لێیان دوور کەوتۆتەوەو بێناز کەوتوون..

کەس هیچ هیواو مەبەستێکی پێیان نەماوە بۆیە نەك هەر خەڵکی دوور بەڵکوو کوڕی خۆشیان هەندێ جار وای لێ دێت کە شەرم دەکات بڵێ باوکمە یان دایکمە!!..

بەڵام (پێغەمبەر)ی بەسۆزو بەبەزەیی هەرکاتێك لەڕێگاوباندا بگەیشتایە بە پیرەپیاوێك یان پیرەژنێك سەلامی لێ دەکرد و بەدەمییەوە دەوەستاو گوێی شل

دەکرد بۆ سکاڵاو داواکاری و بێ نازییەکانی، ئیتر جاری واهەبووە چەندێ لەهاوەڵەکانی وەستاندوە تا ئەو پیاوەیان ژنە بەساڵاچووە ڕایی دەکات!..

لەوە دەچێ کەسێکی کەم فام یان کەسێکی سەرقاڵ و کارمەند و ڕامیار بڵێ: چ پێویست دەکات ئەوەندە کاتی بێ سود بکوژێت! بالەباتی ئەوە کاتەکەی لەگەڵ گەنجێکدا بەسەر ببردایە باشتر یابوو؟.

نەخێر، ئەمە ووتەی لێزان و ژیرو بەسۆز نییە! خاوەنەکەی نیازی نیە خەڵکی بکاتە خۆیی‌و کاریان تێ بکات و خۆشیان بووێت.. پیاوی زاناو هۆشمەندو ڕامیار کەسێکە هەموو چینەکانی کۆمەڵ خۆشیان بوێت و بە بینینی دڵیان بکرێتەوەو شادمان بن..

بۆیە (پێغەمبەر)ی ئازیزمان (ﷺ) چاك لەبیری بوو ئەم پیرەی وا ئێستا توانای هیچی نەماوە ڕۆژانێك بوو کارمەند و دڵسۆزو لێهاتوو بووەو پەککەوتە نەبووە.

زانایانی مێژووناس بۆمان دەگێڕنەوەو کەڕۆژێکیان پیرەژنێك لەڕێگایەکدا بەدەست کۆڵێکی قورسەوە پێگیرابوو.. چاوەڕوانی خێرەومەندێکی دەکرد کەبیداتەوە کۆڵی!..

خەڵکانێکی سەرقاڵ دەیان دا بەلایدا نەیان دەپەرژایە سەری! ئەم هەلەی کە هەڵکەوتووە بۆیان کەدڵێك کەمەندکێش کەن بۆ لای خۆیان لەکیسیان دەدا..

بەڵام (پێغەمبەر)مان هەمیشە لەفرسەتی ئەوەدابوو کەخێرێ بکات و کەسێکیش بۆلای ڕووناکی قورئان بانگ بکات بەکردەوە شیرینەکانی.. بۆیە هەرکەچاوی کەوت بە پیرەژنەکە خێرا لێی چووە پێش و ئافرەتەکەش ووتی: ئاڕۆڵەگیان بەڵکو ئەو کۆڵە بدەیتە شانم؟.

(پێغەمبەر)یش (ﷺ) کۆڵەکەی بۆ هەڵگرت و نایە سەر شانی خۆی و فەرمووی بۆکوێی بەرم؟..

ژنەکە لەم هەڵوێستە مەردانە چاوەڕوان نەکراوە زۆر سەری سوڕماو ئەوەبوو خۆشەویستی (محمد) ڕۆشتە دڵییەوە وای لێکرد کە لەپاداشتی ئەم چاکەیەدا ئامۆژگاریەکی دڵسۆزانەی دایکانەی بکات..

پێی ووت: کوڕی خۆم پیاوێك لەم شارەدا هەڵکەوتووە گوایە دەڵێ من (پێغەمبەر)م و خوا ناردوومی بۆلاتان: نەکەی گیانەکەم بخەڵەتێی شوێنی بکەویت وەك ئەوشێت ببیت..

(پێغەمبەر)ی پێشەوامان بزەیەك گرتی و بەنەرمییەکەوە فەرمووی: دەی دایەگیان من ئەو (پێغەمبەر)ەم و خوای گەورە ناردوومی..

ژنەکە ووتی: ئەگەر تۆ ئەو کەسەبی نەخێر درۆزن و شێت نیت و ئەوا باوەڕم پێهێنای..

(پێغەمبەر) نەیفەرموو شاری مەککە هەر گەنجەو بابڕۆم بەلایانەوە من چیم لەپیرەژن داوە هەروەها نەی ووت: کوڕە خۆبەشێت و جادوو بازو درۆزنم دەزانێت و کۆڵەکەی لەشانی فڕێ بدایەتە خوارەوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوەندە گرنگی دەدات بەم ژنە کەلەو کاتەناسکەشدا هەر پێدەکەنێ بەدەمیەوە ! دەبا ئێمەش وابین..

## ڕێگای یەکەم:

**٣- ئەوەی ئەمە بکات هەمووی خەڵکی دێنە ڕیزیەوە ئەوەشی نەیکات بەدرێژایی تەمەن بەتەنها دەمێنێتەوە**

وا خووم پێوە گرتبوو کە هەموو هاوینێك دەچووم بۆ (مێن) بۆ ماسی گرتن.. هەمیشە وام پێخۆش بوو کەژاڵەی کرێماوی بکەم بە قولاپەکەمەوە.. بەڵام من ئەم دەزانی کە ماسی زیاتر حەزی لە (کرمە).. وەلە بەرئەوەی کە من بەس بۆ ڕاوە ماسی ئەوگەشتەم دەکرد.. بۆیە لەباتی ژاڵەو کرێم دەچووم کرمێکی بچکۆلانەم دەکرد بۆ قولاپەکەمەوە و شۆڕم دەکردەوە بۆ بنی ئاوەکە و بە ماسیەکانم دەوت: حەز لە ئەم شتە خۆشە دەکەن؟.

دەی باشە (یاران) بۆچی هەر ئەم شێوازە ژیرانەیە بەکار نەهێنین لەڕاوکردنی خەڵکیدا؟..

(لوید جۆرج) ئەمە پیشەی بووە هەمووکات.. بۆیە کەکاتێ پیاوێك لێی دەپرسێت: چۆن و هۆی چییە؟ ئەم ماوە زۆرە لەسەرکورسی حوکم ماویتەوە؟ کەچی کەسانی وەك: (ولسۆن و ئۆرلاند و کلیمنصو) کە هەریەکەیان لەگەورە پیاوانی ڕامیاری جەنگی جیهانی یەکەم دەژمێررێن، کەچی وەك تۆ نەماونەتەوە؟..

لەوەڵامدا ووتی: هۆی مانەوەی من لەسەر حوکم تەنها یەك شتە، ئەویش ئەوەیە کە من توانیومە شتێك بکەم بەقولاپەکەوە کە ماسی زۆر حەزی لێی بێت)..

ئایا بۆچی هەمیشە باس لەوشتە دەکەیت کە خۆت پێت خۆشە؟ تۆ چیت پێخۆشە با خۆشت بوێت هەمیشەیش خۆشت دەوێت بەڵام بەرامبەرەکەت مەرج نییە وەك تۆ خۆشی بوێت..

کەواتە تاکە ڕێگایەك بۆ کارکردنە سەر خەڵکیتر ئەوەیە کە قسە بکە لەگەڵ خەڵکیدا لەوشتانەی کە حەزیان لێیەتی و پێیان خۆشە.. بەڵکو ڕێگا پیشاندەریشی بە بۆ گەیشتنی بەو حەزو داوایانەی..

سبەینێ ئەمەت لەبیر بێت.. کاتێ دەتەوێت هەوڵ بدەیت کەسێك کارێکت بۆ ڕاپەڕێنێت..

ئەگەر تۆ ویستت نەهێڵی کوڕەکەت جگەرە بکێشێت.. مەبە بە ئامۆژگاری ڕیش سپی بەسەریەوە.. لەولایەنەوە پێی مەڵێ کەخۆت حەزی لێ دەکەیت و بەچاکی دەزانیت.. بەڵکو بۆی ڕوون بکەرەوە کە جگەرە کێشان ئەبێتە هۆی هەناسە سواری و دۆڕاندنی لەیاری تۆپی پێدا (بۆنمونە) یان پێشبڕکێکەی..

هەر بەم جۆرە هەڵس و کەوت بکە با لەگەڵ منداڵاندا بێت یان لەگەڵ گوێرەکەو مەیمون..

ڕۆژێکیان (ڕاڵف والد ئیمرسۆن) لەگەڵ کوڕە بچوکەکەیدا ویستیان گوێرەکە بچکۆلەکە بەرنەوە بۆ گەوڕەکەی خۆی بەڵام زۆر بەهەڵەدا چوون کاتێ ویستیان بەو جۆرە بڕواتەوە کە خۆیان پێیان خۆشەو دەیانەوێت..

بۆیە بێهودە (ئیمرسۆن) لەدواوە پاڵی بەگوێرەکەوە دەناو کوڕەکەشی لەپێشەوە ڕای دەکێشا بەڵام ئەم گوێرەکە بچکۆلانەیە لەوان (إنکار)تربوو.. لەجێگەی خۆی نەدەجولا..

چونکە ئەویش هەر وەك ئەوان ئەوەی خۆی دەیویست ئەوەی دەکرد.. بۆیە قاچەکانی وەك مێخ لەزەوی توند کرد و جم و جوڵی لەخۆی بڕی.. خێزانی ئێمرسۆن کاتێ لەپەنجەرەکەوە ئەم دیمەنەی بینی هەرچەندە ئەم خانمە وەك مێردەکەی ئەدیب و نوسەرو دانەر نەبوو بەڵکو نیمچە خوێندەوارێك بوو بەس.. بەڵام ئەم چاك دەیزانی ئەم گوێرەکەیە چی پێ خۆشەو چی دەوێت. بۆیە بەخێرایی دەستی سوێر کردو بەرەو ڕوویان ڕۆیشت وەك دایکێکی دڵسۆز پەنجەی خستە دەمیەوەو بەهێمنی دایە بەرو بەرەومالّ بردیەوە بەهەموو ڕەزامەندییەکی گوێرەکەکە..

(هاری ئۆڤەرستریت) لەکتێبی(کارکردنە سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان)(٢) دا دەڵێت: هەموو سەرچاوەیەکی چالاکی دەگەڕێتەوە بۆ حەزێکی ناوخۆیی جێگیر لەدەروونمدا، پاشان باشترین ئامۆژگاری بۆ ئەوانە کە هەوڵ دەدەن خەڵکی بهێننە سەر قسەی خۆیان.. ئیتر بالە هەربوارێکدا بێت بواری کارگە بێت یان ماڵەوە یان قوتابخانە یان مەیدانی ڕامیاری ئەم ڕێگایەیە:

یەکەم جار حەزێکی (لەوکارەی کە دەیدەیت بەسەریدا)بۆ دروست بکە حەزێکی لەڕادە بەدەری پڕتاسە).. ئەوکەسەی وابکات، دڵنیابن هەموو دنیا دێنێتە ڕیزیخۆیەوە..

ئەوکەسەش کە واناکات با بزانێت کە دەبێت هەر خۆی بەتەنها ڕێگە ببڕێت و کەس لەگەڵی نایەت:

(ئاندروکارنیجی) ئەو منداڵە هەژارە ئوسکتلەندییە بوو کە ژیانی بەکرێکاری دەستی پێکرد کە کاتژمێرێ بە دوو (سانت) کاری دەکرد کە هەر سانتێ نزیکەی (٨ ) ملیمە بەڵام کاتێ مرد سەروەت و سامانێکی وای بەجێ هێشت کە خۆی دەدا لە (٣٦٥)ملیۆن دۆلار.. ئایا ئەمەی چۆن توانی:

(چونکە هەر لەسەرەتای ژیانییەوە تێگەیشتبوو کە تاکە ڕێگایەك بۆ کارکردنە سەر خەڵکی ئەوەیە کە بە جۆرێ قسەیان لەگەڵ بکەیت لەگەڵ حەزو ئارەزوویاندا بگونجێت)..

(کارنیجی) تەنها چوار ساڵ خوێندوویەتی و بەس.. بەڵام بێ مامۆستا و بێ قوتابخانە تێگەیشتشت کە چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکات..

ڕۆژێکیان دەبینێ براژنەکەی زۆر دڵتەنگ و بێتاقەتە بەوەی کە دوو کوڕەکەی چووبوون بۆ (بیل) بۆ خوێندن ماوەیەکی زۆر بوو دایکیان پشت گوێ خستبوو تاقە نامەیەکیان بۆ نەدەناردەوە هیچ وەڵامێکی ئەو هەموو نامە یەك لەدوای یەکانەی دایکیان نەدەدایەوە..

(کارنیجی هەڵدەستێت بەبەخشینی (١٠٠)دۆلار بەوکەسەی کەبتوانێت ئەو دوو گەنجە ڕازی بکات کەنامە بنێرنەوە بۆ دایکان..

یەکێك دەڵێت من بەوکارە هەڵدەستم.. بۆیە بە (کارنیجی) دەڵێت: یەکی نامەیەکیان بۆ بنووسەو تێیدا بڵێ: لەگەڵ نامەکەدا (٥)دۆلارم بۆ ناردیت) پاشان پارەش مەخەرە نێو نامەکە..

پاش ماوەیەکی کەم هەر ئەوەندەیان زانی لەلایەن دووکوڕەکەوە دوونامە گەیشت و تیایاندا نووسرابوو زۆر زۆر سوپاسی مامی خۆشەویستمان دەکەین

(مامە ئاندرۆ) بۆ ئەو سۆزو بەزەیی و بەخشندەییەی..) کە گومانی تێدانییە خۆت (برای خوێنەر) دەتوانیت نامەکە تەواوبکەیت..

وام دانابوو کە سەرەتای هەموو وەرزێك (٢٠)ڕۆژ لە (نیویۆرك) ئوتێلێکم بەکرێ دەگرت لەو ئوتێلانەی کەبەسەر باخچەکاندا دەیڕوانی و چەند کۆڕێکم تێدا دەگرت..

لەسەرتای یەکێك لەو وەرزانەدابوو.. ئوتێلێکم گرت و لەڕۆژنامەکاندا بانگێشەمان بۆ کرد و کات و شوێنی دیاری کراووبلیت بڵاوکرایەوەو فرۆشرا.. ماوەیەکی کەمی مابوو دەست پێبکات..

لەوکاتەدا کوتوپڕ هەواڵێکی ناخۆشم بیست کە گوایە خاوەنی ئوتێلەکە سێ قات کرێکەی لەسەر زیاد کردووم..

بێگومان من ئەم هەواڵەم پێخۆش نەبوو.. بەڵام چار چییە.. قسەکردن لەگەڵ خاوەنی ئوتێل چ سوودێکی هەیە.. قسە هەر قسەی ئەوە؟..

ناچار ڕۆشتم بۆلای خاوەنی ئوتێلەکەو لەسەر خۆ پێم ووت:

بەڕاستی دڵ گران بووم هەر کەهەواڵی ئەم زیاد کردنەی جەنابتانم بیست.. بەڵام من بە هیچ جۆرێ لۆمەتان ناکەم و ناهەقتان ناگرم.. خۆ ڕەنگە منیش لەو جێگەی تۆ بوومایە هەروام دەکرد..

تۆ ئەرکی سەرشانتە وەك بەڕێوەبەرێکی ئەم ئوتێلە.. کەتابۆت بکرێت قازانجی زیاتری پێ پەیدابکەیت.. وەگەر وانەکەیت لەوە دەچێت لەسەر کارەکەت دەرت بکەن..

بەڵام ڕێگام بدەن با قازانج و زیانەکانی ئەم بڕیارەتان بۆ باس بکەم و پێتی بڵێم: ئەمەم ووت پاشان وەرەقەو قەڵەمێکم دەرهێنا و هێڵێکی ستوونیم کێشا لەناوەڕاستی وەرقەکەداو پەڕەکەم پێکرد بە دووبەشەوە..

لەسەر ڕووی بەشی یەکەمدا نووسیم ئوتێلەکەت بەچۆڵی دەمێنێتەوە.. پاشان بەدرێژی باسم کردو ووتم: بێگومان کە ئوتێل بەچۆڵی دەمێنێتەوە ئەمە زۆر چاك نەبێ بۆ ئێوە، چونکە دەتوانن بیدەن بە کرێیەکی باش بە هونەرمەندەکان یان بۆ

ئاهەنگی جۆراو جۆر .. یان بۆ هەرشتێکی تر کە ئەمەش زۆر بەسوودەو قازانجی زیاترە بۆ تان لەوەی کە بیدەن بەمن بۆ ووتنەوەی چەند وانەیەك (محاضرات)..

بەڵام ئێستا بچنە سەر باسی زیانەکانی: یەکەم: نەك هەر قازانج ناکەیت بەڵکو هەر هیچتان دەست ناکەوێت چونکە من ناتوانم ئەو پارەیە بدەم وە ناشیدەم، پاشان قازانجێکی تری ئەوەیە کە ئەم کۆڕگرتنانە لەئوتێلەکەتدا بێگومان خەڵکانێکی زۆر ئەدەب دۆست و ڕۆشنبیر و خوێندەوار ڕوودەکەنە ئوتێلەکەت و ئوتێلەکەت شارەزا دەبن ئەمەش بەڕای من (چاك ترین بانگێشەی ناو دەرکردنە بۆ ئوتێلەکەت ئایا وانییە؟)..

بەڵکو ڕاستر وایە کە بڵێین ئەگەر بەڕێزتان (٥,٠٠٠) دۆلارتان بدایە بە ڕۆژنامەو گۆڤار و بڵاوکراوەکان بۆ ناساندنی ئوتێلەکەت (بانگەشە) باوەڕناکەم هەرگیز کۆمەڵێکی خوێندەوارو ڕوناك بیر و پلەو پایەدار ئوتێلەکەتیان نەدەناسی و ڕوویان تێ نەدەکرد...

پاشان وەرەقەکەم دایە دەستی و پێم ووت: (چەندم پێخۆشە کە ئەم قازانج و زیانانە بەووردی ڕەچاو بکەن و پاشان دوا بڕیارتانم پێ بڵێین)..

لەڕۆژی داهاتوودا نامەیەکم لەخاوەنی ئوتێلەکەو پێگەیشت کە بڕیاری دابوو لە( ٣٠٠٪ )دابەزێنێ بۆ (٥٠٪) لەسەرم..

لەهەمووی گرنگ تر ئەوەبوو کە من ئەم داشکاندنەم دەست کەوت بەبێ ئەوەی دوو لێوم بکەمەوە و قسە بکەم دەربارەی شتێ خۆم حەزم لێیەتی و بۆی هاتووم.. بەڵکو بەدرێژایی کات من هەر لەوشتانە قسەم دەکرد کەبەرامبەرەکەم حەزی لێیەتی و دەیەوێت و من تەنها ڕێ پیشاندەری بووم کە چۆن دەستی بکەوێت..

وادابنێین کەوەك زۆربەی خەڵکیم بکردایە، وادابنێ بەتوڕەیی و خێرایی بەرەو ڕووی بەڕێوەبەر بچوومایە و پێم بووتایە: توخوا (ئەفەنی) مانای هەیە کە کرێکەم لەسەر سێقات دەکەیت لەکاتێکدا کە دەشزانیت بلیت و دەعوەت نامەکان دابەش کراوون و بانگێشەش لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا کراوەو کار لەکار ترازاوە تازە دەڵێی:

٣٠٠٪ زیاد دەکەم ها؟!.. ئەمە دەست بڕینە، ئەمە دەست خەرۆکردن و دزییە یەك (فلس) نادەم چی دەکەن بیکەن..

ئایا چی ڕووی دەدا پاشان؟ بێگومان دەمەقاڵەیەکی گەورە و بێ بەرهەم ڕووی دەدا..

خۆشتان چاك دەزانن کە دەمەقاڵە (مجادلە) بەچی تەواو دەبێت..

تەنانەت ئەگەر واشم لێ بکردایە کە دان بنێ بەهەڵەی خۆیدا.. ئەوکاتە کەسایەتی و سەربەرزی و فیز زلی نەی دەهێشت بڕیاری خۆی بدات..

فەرموون ئێوەو بەنرخترین ئامۆژگاری کە ئەمڕۆ پێشکەش بکرێت لەهونەری پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان ئەویش ووتەی (هێنری فۆردە) کە دەڵێت:

(گەر ڕێگایەکی بێوێنە و نادیار هەبێت بۆ سەرکەوتن.. ئەویش ئەوەیە کە بتوانیت بۆت دەرکەوێت کە بۆچوون و حەزی بەرامبەرەکەت چییە؟ پاشان لەو نیگایەوە بڕوانیتە مەسەلەکان)..

هەموو ئادەمیزادێکی ئاسایی ئەتوانێت هەست بەم ڕاستییە بکات.. لەگەڵ ئەوەشدا لە ٩٠٪ی خەڵکی لە ٩٠٪ ی کاتەکاندا خۆیان لەم ڕاستییە گێل دەکەن!!..

هەزاران فرۆشیاری گەڕۆك چەند جار ئەم سەرو ئەوسەری وولات دەکەن، کەچی بەشەکەتی و نائومێدییەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە ئەوەندەیان دەست ناکەوێت کە شایانی باس بێت!! ئەزانن بۆچی؟!..

چونکە بەدرێژایی ڕۆژ ئەوان بیر لەفرۆشتنی شتێ دەکەنەوە کە خۆیان حەز لەفرۆشتنی دەکەنەوەو لە فرۆشتنی دەزانن!! بەڵام ئەگەر بیان توانیایە حەزو ئارەزووی کڕینی ئەوشتانەیان تێدا دروست کردینایە یان بەحەزو پێویستی کڕیار شتیان بهێنایە ئەوکاتە بەڕاکردن لەماڵ دەردەچووین و سەرەمان دەگرت و شەڕمان دەکرد لەسەر شتەکانیان!!).

ڕۆژێکیان ئاوا لەسەرخۆم وردە وردە بەرەو سکەی شەمەندەفەر کەوتمە ڕێ بەنیازی سەفەرێك..

لەڕێگا گەیشتم بە پیاوێك.. کە ئەم سەرو ئەوسەری (لۆنج ئیلاند) دەگەڕا زەوی‌و زارو خانوی دەکڕی و دەیفرۆشت چوومە ڕێگەیی‌و پێم ووت بەڵکو خانوویەکی بچکۆلەی (پێلٰ بەستم) (مسلح) بۆ پەیدا بکات،.. چونکە زۆر شارەزای ناوچەکەبوو. لەوەڵامداوتی: شك نابەم نییە!.. بەڵام پاشان ئامۆژگاری کردم بەشتێ کە خۆم دەمزانی ئەویش ئەوەبوو پێی ووتم کە پرسیار بکەم لە) یەکێ لەباخچەکانی (مۆریس هێڵن) پاشان داوایەکی برایانەی لێ کردم کە ئەگەر دەستم کەوت با (عقد)و شتەکانی تری بگرمە ئەستۆ!..

خۆ ئەم پیاوە مەبەستی یارمەتی دانی من نەبوو.. بەڵکو بەس مەبەستی بەرژەوەندی خۆی بوو هیچی تر.. ئەم پیاوە ئەبوایە دوودانە لەکتێبە خۆشەکانی (فاش بونم) بدایەتێ کەیەکەمیان بەناوی (فرۆشیار) و دووەمیان (سەروەتێك بەشی تۆشی تێدایە) (٣)ئەگەر بەووردی ئەم دوو کتێبەی بخوێندایەتەوە سەرنجی برگەکانی بەباشی بدایەو پاشان ئیشی پێبکردایە لە ژینی دنیایدا سوودێکی لەرادەبەدەری پێ دەگەیشت..

چەند ساڵێك لەمەوبەر لە (فیلادلفیا) چووم بۆ عەیادەی پزیشکێك کە تایبەت بوو بە نەخۆشییەکانی لووت و چاوو گەروو.. ئەم پزیشکە پێش ئەوەی دەست بکات بە (فحص) و چارەسەر کردنم.. پرسیاری لێ کردم ئیشم چییە؟ بەچییەوە خەریکم؟ لەکوێم؟ ئەوەندەی گرنگی بەخۆم و کارو کاسپیم دەدا! ئەوەندە گرنگی بە نەخۆشییەکەم نەدا!!..

ئەم پزیشکە زیاتر لەوەی یارمەتیم بدات لەدارایی‌دا , زیاتر وای لێکردم کەچۆن دەستم بکەوێت و بگەم پێی!..

باابزانین چ ئەنجامێکی هەبوو؟ ئەوەبوو کاتێ لە عەیادەکەی دەرچووم.. هەمووکیانم ڕێزو پێزانین بوو بۆ ئەم پزیشکە!..

بەڵام بەداخەوە جیهان خاڵی یە لەپزیشکی ئاوا!! بەڵکو زۆربەی زۆریان خۆپەرستی و کۆکردنەوەی پارەو مادە مەبەستیانەو هیچی‌تر!!..

بەڵام ئەوکەسەی بەپاکی لێ دەنەوێو بەڵسۆزی خزمەتی خەڵکی دەکات یەك شتی تایبەتی چاکی هەیە کەلەکەسدا نییە.. ئەویش ئەوەیە کەکەس نییە بەربەرەکانێیان بکات و بیانەوێ وەك ئەوبن لەهیچ کوێ!..

(ئەوین یونگ) جارێکیان ووتی: ئەوپیاوەی کەبتوانێ بچێتە ناخی خەڵکیو لەڕادەی بیروهۆشیان تێ بگات ئەوپیاوە هەرگیز هەق نییە لە پاشەڕۆژی بترسێن و خەمی دواڕۆژی بخوات)!..

لەم کتێبەدا تەنها یەك شتت دەست بکەوێت بەسە ئەویش:

ویست و نیازێکی تەواوت هەبێت کە خۆت بخەیتە شوێنی بەرامبەرەکەت و لەڕوانگەی ئەوەوە سەیر بکەیت ئائەمە لەگەڵ ئەوەی یەکەمدا بەردێکی پتەوە بۆ کۆشکی سەرکەوتن و دروست کردنی کەسایەتی..

یەکێ لەقوتابییەکانم زۆر مشەوەش و دڵ گران بوو بۆ منداڵەکەی کە تەندروستی تەواو نەبوو وەنانیشی نەدەخوارد.. لەبەرئەوە خۆی و خێزانەکەی ڕێگانائاساییەکەیان گرتەبەر کە ئەویش: قسەپێ وتن و توڕەبوون و لۆمە و سەرزەنشت کردنی بوو وەك : بخۆ دایکت دەڵێت نان بخۆ (باوکت حەز دەکات نان بخۆیت تا گەورە بیت و ببیت بە پیاو)..!

ئایا ئەم منداڵە گوێی دایە ئەم حەزو ئارەزووانەی ئەوان؟ وەك تۆ چۆن گوێ دەدەیتە فەرمانە پیرۆزە ئایینییەکان! ئایا کەس واگومان دەبات بێجگە لە گەلحۆو گەمژەکان؟!

کەوایە منداڵێکی سێ ساڵە گوێ دەداتە قسەی باوکێکی سی ساڵە؟!!..

پاش ماوەیەك ئەم قوتابییەم بیری کردەوەو هەستی کردکە ئەم جۆرە هەڵس و کەوتە زۆر هەڵەیە!.. تاوای لێهات لەخۆی پرسی: ئاخۆ ئەم منداڵە چی دەوێت؟ چی بکەم بۆ بەیەکگرتنی ئەوەی من دەمەوێت و ئەوەی ئەو دەیەوێت؟.

دوای ئەوەی کەدەستی کرد بەم جۆرە بیرکردنەوانە.. بەبەرە گیروگرفتەکانی بەرەو چارەسەر دەڕۆیشتن.. ئەم منداڵە پاسکیلێکی هەبوو.. دەیبردە دەرەوە و

زۆری پـێ خۆشـبوو کـە لەکۆڵانـە دوورو درێژەکـەی ئـەو دیـوو لێـی بخوڕێـت بەئارەزووی خۆی..

بـەڵام لـە منـداڵێك دەترسـا کەلـەخۆی گـەورەتر بـوو ماڵیـان هـەر لـەو دەوروبەرەدابوو..

لەناکاو پڕی دەدایە سەری و دایدەبەزاند و بەزۆری شەق خۆی سوار دەبوو!!.. ئەم منداڵە ستەم لێکراوەش بەگریان گریان ڕای دەکردەوە بۆ ماڵ و دایکی دەهات پاسکیلەکەی لێ دەسەندەوەو دەری دەکرد!..

ئەم منداڵە چی دەویست؟..

بێگومـان دەیویـست کـە تۆڵـەی بـۆ بـسەنرێت لـەو منداڵـە چـەقاوە سـوورەی کـە هەمیشە هەستی ئەمی بریندار کردووەو نەی هێشتووە کە ئەم هەست بکات بە گرنگی خۆی!!..

بـاوکی بەمـەی زانـی بۆیـە دەسـتی هێنـا بەسـەریداو بـەڵێنی پێـدا کەتۆڵـەی بـۆ دەکەمەوە لـەو منداڵـە.. بەرچـەوازیە گرەو لێی دەدەم بۆت. بەمـەرجێك دایکت چی پێدایت بیخۆیت ئا لێرەدا گیروگرفتەکە چارەسەر کرا!..

پاش ئەمە ئەم منداڵە ئامادەیی خۆی دەربڕی کەچی بخەنە بەردەست بیخوات بەبێ جیاوازی تا زووگەشە بکات و گەورە بێت..

ئاواتەکەی هاتـەدی کـە تەمێیـەکی چاکی ئـەو منداڵـە بکرێ کەئـەمی دەشـکاندو بەستەم لێکردن بەرزی و جوامێری لەدڵ و دەروونی ئەم منداڵەدا تێك دەشکاند؟..

یەکـەم جـار حـەزێکی پڕتاسـە لەبەرامبەرەکەتـدا درووسـت بکـە بـۆکردنی هـەر ئیشێك کەبەوجۆرەی تۆ دەتەوێت دڵنیابن هەموو دنیا دێنیتە ڕیزی خۆتەوە!..

وەئـەو کەسـەی بـەم جـۆرە نـەکات ئـەوە بەتـەنها هـەر خـۆی ڕێگـای دوورو درێـژ دەبڕێت و کەسی لەگەڵ نابێت..!.

## بەشی یەکەم

**سێیەم: نرخ بۆ حەزو ئارەزووی براکەت دابنێ:**

ئیسلام.. دوایین بەرنامەی پەروەردگارەو هیچ ئاینێکی تر بەدوایدا نایەت و لەبەر ئەوە دەبێت هەموو مرۆڤایەتی لەتیشك و ڕووناکییەکەی بێبەش نەبن و بگاتە هەموولایەك..

وەتاکانە ڕێبازێکە کەگونجاوو لەبارە بێتە بەرنامەی سەرتاسەری جیهان و جیهان هەمووی لەژێر تیشکی قورئان و فەرموودە ژیان بەرنەسەر..

لەبەر ئەوە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر هەموو موسڵمانان کە ئیسلام بگەیەنن بەگشت لایەك.. ئەوەتا خوای (جل جلالە) دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴾ واتە خەڵکی بانگ بکە و بەبەرنامەکەی خوا ئاشنایان بکە..

بەڵام خوای گەورە هەربەوەوە نەوەستاوە، بەڵکوو مەرجیگرتووە کەدەبێ بانگ کردنەکەتان بەجۆرێ بێت کە پڕبێت لەحیکمەت و لێزانین و دڵگیرکردن وەك دەفەرموێت:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴾ بەڵام بە چ جۆرێك ﴿بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾ نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لەکاتی تێگیرانی قسەکردندا لەگەڵ بێباوەڕان دا دەبێت ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ بە جوانترین شێوەی دەمەقاڵە، دەمە قا ڵەیان لەگەڵدا بکەن چونکە موسڵمان خەڵکی لەسوتاندن و تۆڵەی خوایی دەپارێزێت و بەبەهەشتی هەتا هەتاییان ئاشنا دەکات و دەیان خاتە سەر ڕاسترین بەرنامەی ژیان..

نابێ بەجۆرێ بانگیان بکات وەك ئەو بازرگانەی دایان نابوو بۆ ئەوەی شت بفرۆشێت و کڕیار ڕابکێشێت!!! کەچی شت و مەکەکان نەفرۆشراون و کڕیاریش نەهاتوون بەلایدا بۆ؟ چونکە هەرکەسێ هاتبێ بۆلای ئەم پێی وتووە: (بەتوڕەییەوە) ئەمەیە زۆر چاکەو ئەسڵە.. دەتەوێ بتەوێ! ئەگەر ناشتەوێت دای بنێ وەسەرم مەیەشێنە!! عەرەبانەکەت ڕابکێشە؟!!..

بەڵکو بانگکەرانی ڕێگەی خوا وەك دکتۆر چۆنە لەگەڵ نەخۆشدا ئەمانیش گوێ نەدەنە قسەو توانج و وئێش و ئازاری خەڵکی کە پێیان دەگەن..

جارێکیان لەخەستەخانە بووم پزیشکێك ویستی دەرزیەك بدات لە نەخۆشێك نەخۆشەکە هاواری کردە دکتۆر و قسەی پێ وت و پەلاماری داو سرنجەکەی بەدەستییەوە شکاند!

دکتۆر بەهێمنیەکەوە سرنجێکی تازەی هێناو بەڕوویەکی خۆشەوە دەرزیەکەی لێدا!!..

(پێغەمبەر)ان ئا بەم جۆرە بوون لەگەڵ گەلەکەیاندا کاتێ بێباوەڕان ئەوپەڕی بێئەدەبییان نواندووە لەگەڵیاندا کەچی ئەمان بەنەرمییەکەوە فەرموویانە:

﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾(غافر ٤١)..!

واتە: ئەی گەلە نازدارەکەم ئەوەچییە من ئێوە بانگ دەکەم بۆ ڕزگاربوون کەچی ئێوە بەپێچەوانەوە من بۆ ئاگری جەهەنەم بانگ دەکەن؟؟!!

کەواتە لێزانین و حیکمەت و وریایی ئەگەر لە (دعوە)دا نەبوون، ئەوکاتە بانگەکە لەباتی ئەوەی سوودی هەبێت و خەڵکی بانگ بکات بۆ ڕێگەی چاکەو ئیسلام بگەیەنێت.. بە پێچەوانەوە بێ سوود دەبێت و خەڵکی نەك واز لەڕێگەی خراپە ناهێنن و بەڵکو ئیسلامی بێگەردیشیان لەبەرچاو دەکەوێت!!..

بۆیە (پێغەمبەر)ی سەروەر (ﷺ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (هەرکەسێ قسەیەك باسێك بکات بۆهەر کۆمەڵێك کە لەڕادەی تێگەشتنیان بەرزتر بێت ئەوە فیتنە و خراپە و زیان نەبێ هیچی تری لێ بەدی ناکرێت. رواه مسلم.

وەك باوکێك کە منداڵێکی بچووکی لەلایەو دایکی لەلانیە.. ئەم منداڵە دەست دەکاتە گریان و بێ تاقەت و زویری دەبێت!! باوك هەرچی دەکات نازانێت چۆنی ژیری بکاتەوە!! دەیگرێتە باوەش هەردەگری! دای دەنێ هەردەگری! شت و مەکی دەخاتە بەردەست هەرماوەیەکی کەم بێ دەنگە پاش ئەوەدەست دەکاتەوە بەگریان! تا هەندێ باوك ناچار بەنەزانی و گێلێتی خۆی لێی دەدات یان دەڵێ دووسەعات

بگری مەرج بێت لێت نەپرسمەوە!!.. بەڵام دایکە کە باش دەزانیت چۆن ژێری دەکاتەوە و بیانوی دەبڕێت . ..

هەروەها بانگ خوازی ژیرو سەلیقەدار دەزانێت هۆی گریان و بێ تاقەتی چییە لە خەڵکیدا لەوڕێگەیەدا دەست دەکات بە چاککردن و ڕێنمایی.. وەك چۆن دایکەکە دێتەوەو بەئەسپایی و دڵسۆزانە دەیگوشێ بە خۆیەوەو ماچی دەکات و پاشان دەیگۆڕێت و پاکی دەکاتەوەو تێرو پڕ شیریشی دەداتێ!! جا پاش ئەوە لێی بپرسە ئایا باوکت خۆشتر دەوێت یان دایکت؟

بێگومان ناڵێت باوکم ئیتر با جل و بەرگ و پێڵاوو خواردنی هەمیشە بۆ کڕیبێت!!..

ڕاگیر کردنی دڵەکان و خۆبردنە ناویانەوە دەبێت لە پێش بانگ کردنەوە ئەنجام بدرێت!

ئەگەر ئەمەت کرد بانگ کردنت زۆر ئاسان دەبێت.. ئەگەر وات کرد دڵنیا بە بانگیشیان نەکەیت ئەوان هەر دێن بەدەمتەوە چونکە خۆشیان دەوێیت.. بەڵام ئەگەر وانەکەیت بانگ کردنەکەت ناچێتە دڵ و دەروونەکانەوە!.. و کەس نایەت بەدەمتەوە!!.

سەیری ئەم بەسەر هاتە بچکۆلانە کورتە بکە.. پیاوێك بەئەسپایی دێتە (مەدینە)نیازی کوشتنی (پێغەمبەر)ی خوای (ﷺ) هەیە..(عومەری کوڕی خەتاب)(ڕەزای خوای لێ بێت) دەیبینێ و دەیگرێت و دەیبات لەمزگەوت دەیبەستێتەوە بەکۆڵەکەیەکی مزگەوتەکەوە..(پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ)دێت بەڕوویەکی خۆشەوە سەلامی لێ دەکات و بەهاوەڵان دەفەرموێت: بیکەنەوەو نان و خواردنی پێ بدەن و ڕێزی لێ بگرن..

پاش ئەمە پێغەمبەری خوا دێتە لایی و پێی دەفەرموێت: بەڵکو موسڵمان ببیتو ڕێگەی خوای پەروەردگار بگرێت!.. پیاوەکە دەڵێت: نەخێر موسڵمان نابم!!..

(پێغەمبـەر)(ﷺ)جـارێکی تـر بـەهێمنی و بەڕوویـەکی گەشـەوە دەفـەرموێت: موسڵمان ببەو خۆت ڕزگار بکە لە ئاگری دۆزەخ!. کابرا دەڵێت: نەخێر!!.. بۆیە (پێغەمبەر)ی خوا فەرمووی بەهاوڕێکانی بەرەڵای بکەن با بڕوات!!..

هـاوەڵان زۆر ناڕەحـەت بوون کـە تاوانبـارێکی خـائین ئـاوا بـەم ئاساییە بـەرەڵا بکرێت!!

بـەڵام قسەی پێغەمبـەریان نەشـکاندو بـەریان دا.. لـە ڕێگـا کـابرا موسـڵمان بـوو هاتەوە خزمـەت سـەروەر (پێغەمبـەر(ﷺ)و فەرمووی: ئـەی ئەوکاتـە چۆن موسـڵمان نەبوویت؟!..کابرا ووتی: ئەگـەر ئـەو کاتـە موسـڵمان بومایـە ئـەوە لـە دڵـەوە نـەدەبوو بەڵکو لەبـەر خـاتری گیـانی خـۆم دەبـوو!..بـەڵام پـاش ئـازاد کـردنم بیرم کـردەوە کـە ئەمە تەنها هەڵس و کەوتی (پێغەمبەر)انەو تۆ (پێغەمبەر)ی خوایت..

دەبیرێ بکـەرەوە ئایـا تـۆ هـەڵس و کـەوتت لەگـەڵ بـرا مسـڵمانەکانیـشدا وایـە، چ جای بێ باوەڕو دوژمنانی خوێنە خۆرت؟..ئایا لـە خـۆمـان بپرسین کـە: واباش بـوو یەکسەر لە سێدارەی بدایە یان نواندنی هونەری ڕاست ترین هەڵس و کەوت؟!..

نموونەیەکی تر جوان گوێی بۆ شل بکە تابەباشی لە (پێغەمبەر)(ﷺ) بکەیت لـە هونەری هەڵس و کەوت کردندا لەگەڵ خەڵکی..(پێغەمبـەر)مـان(ﷺ)لەسـەر فـەرمانی خـوای گـەورە کـە بـۆی دەرکردبـوو..هەسـتا و هـەموو خزمـەکانی کـۆکردەوەو پێـی ووتـن: خزمـەکانم ئایـا ئەگـەر پێتـان بڵـێم سـوپایەك لـەودیوی ئـەو کەژەوەیـە و دەیەوێت بدات بەسەرتانا ئایا باوەڕم پێ دەکەن؟..

هەموو ووتیان: بەڵێ چونکە درۆمان لێ نەدیوویت!!.

دەی هـەر بـەو جـۆرە ئاگـادار تـان دەکـەم کـە سـزای سـەختی پـەروەردگار چاوەڕوانتان دەکات ئەگەر موسڵمان نەبن!!.. خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوون!!..

تەنها (ئەبو لەهەب)ی مامی نەبێت کەووتی: دەك دەستت شکێ و لەناو چیت بۆ ئائەمە کۆت کردینەوە لەم جێیەدا؟.

لێرەدا (پێغەمبەر) خۆی گرت و هیچی نەووت بەمامی!.. تا خوای پەروەردگار لەسەری هاتە وەڵام و فەرمووی: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾(المسد ١)واتە: دەستەکانی ئەبو لهب لەناو بچێت وەك لەناو چوو!!..

لەم باسەدا ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە (محمد)(د.خ)زۆر حەکیمانە گەشتە فریای ئەو هەڵوێستە و زانی چۆن هەڵس و کەوت بکات..

بە(بێ دەنگ بوون)!!..

خوێنەری ئازیز وا دابنێ ئەگەر پێغەمبەرمان محمد(د.خ) بهاتایەتە وەڵام بیگوتایە: (مامە بەخوا خۆت لەناو دەچیت.. بۆ لەناو گشتیاندا تۆ خۆت دیاری دەکەیت.. لای خۆی تۆ مامی منیت.. خوای هەزار مامی وا ببڕێت؟!..

هەرگیز(ئەبو لەهەب)داوای لێ بووردنی نەدەکرد!نەیدەووت تۆ ڕاستەکەیت ببورە!..

لەلایەکی ترەوە ئەگەر محمد وەڵامی جوێنەکەی بدایەتەوە.. ئایا خەڵکی نەیدەووت(محمد)ئاگای خزمایەتی لەلانەماوە، هەروەها دەبووە دەمەقاڵێ لە نێوان مام و برازایەکدا )و بڵاوەیان لێ دەکرد و دەیانووت: مام و برازایەك دەمیان تێ گیراوە بابڕۆین!!

ئەوکاتە ئەو مەبەستە نەدەهاتە دی کە لە پێناویدا(محمد)کۆی کردبوونەوە کە بانگ کردنیان بوو بۆلای ڕێبازەکەی خوا!!.

هەروەك چۆن دەرسێك بوو بۆ هاوەڵانی کە خۆگر بن و زوو هەڵنەچن لە تورە بوون و جنێو و قسەی بێ باوەڕان وەك چۆن پزیشك، نەخۆش قینی لە خۆی و دەرمانە تاڵەکەیەتی!.

هەر ئەم قوتابخانەیەی (جوانترین هەڵس و کەوت کردنەی (پێغەمبەر)) کاری کردە سەر قوتابیان ئەوانیش وەك ئەو خۆگر بوون و هونەری بانگەواز کردن فێر بوون.. چونکە وەك دەزانن هەر کەسێ لەناو گوڵدا بژی گوڵاوی دەبێت..

بۆیە سەیری هەڵوێستی یەکەم باڵوێزی ئیسلام (سفیر)(مصعب کوڕێ عومەیر)(خوا لێی ڕازی بێ) کە کاتێ (پێغەمبەر) (د.خ)ناردی بۆ مەدینە تا بانگیان

بکات بۆلای ئیسلام.. بۆیە (مصعب) دڵسۆزانە شەووڕۆژی دەدایە دەم یەك و قورئانی بەسەردا دەخوێندن و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن.. تا ئەوەبوو کۆمەڵێك لە دانیشتوانی مەدینە موسڵمان بوون.. لەچواردەووری خڕدەبوون و ئەویش ئامۆژگاری دەکردن..

تائەوە بوو سەرکردەی هۆزێکی گەورەی مەدینە هات بۆ مصعب و ویستی بیکوژێت.. چونکە بە بیروڕای ئەم ( موصعەبە)ـ .

ئەوکەسەیە کەشاری مەدینەی تێك داوەو خەڵکی لە ئاینی باو باپیر لاداوە و گوایە ئاینی تازەی بۆ هێناون!!.

کاتێ کە (مصعب) بەژیرانە و لەسەر خۆییەوە گوێی شل کرد بۆ ئەم ووتە ڕەقانەی (سعد) کە لێبویەوە (مصعب)بەنەرمی و هێمنی و ئەدەبێکەوە ڕووی تێکردو ووتی: بەیارمەتی خۆت! فەرموو دانیشە! گوێمان لێ بگرە! ئەگەر قسەکانمان بەدڵتان بوو ئەوە ئیسلام دەرگایەکی کراوەیە بۆ بەڕێزتان!! وەئەگەر قسەکانت بەدڵ نەبوو زیانیان هەبوو ئەوە ئەوکاتە چی دەکەی بیکە و مافی خۆتە!!.

(سعد)کەمێ دامرکایەوەو لەسەر خۆ دانیشت و ووتی: قسەیەکی جوانە!!.

(مصعب)ناوی خوای لێ هێنا و چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندنەوەو باسی گەورەیی و یەکتا پەرستی پەروەردگاری بۆ کردن و دڵی هەموویانی هێنایە جۆش!.. بەڵێ ووتەکانی (مصعب)کاریان کردە سەر دڵ و دەروونی (سعد) و چاوەکانی پڕ بوو لە ئاوو بەدەنگێکی گڕەوە ووتی: ئەی (مصعب) چی بڵێم تا موسڵمان ببم؟.

خوێنەری خۆشەویست، ئایا دەزانیت ئەگەر ژیری و لێزانی و دەروونناسی (مصعب)نەبوایە هەرگیز دڵی سەعد کەمەندکێش نەدەبوو تۆ بڵێ هۆزێك موسڵمان نەدەبوو!!.

نەك هەر موسڵمان نەدەبوو بەڵكوو دەزانی چی ڕووی دەدا؟ بێگومان ئەگەر وەك مرۆڤێكی ئاسایی لە (سعد)تووڕە ببوایە و بیوتایە: ئارەزووی خۆمە و كەس بۆی نییە قسە بكات..

هەموو سەربەستە لەهەڵبژاردنی بیرو باوەڕدا تێگەیشتی؟؟.

ئەو كاتە (سعد)فیزو گەورەیی شوێنەواری بڵندی لەدڵی هۆزەكەیدا نەیدەهێشت بێدەنگ بێت بەڵكوو دەیكردە هەراو دەمەقاڵە تەنانەت كوشتاریش!.

لەوە دەچێت . (مصعب)لەو جێیەدا موسڵمانەكان زۆر بوون ئەیتوانی ئەویەك دوانەی لەگەڵ (سعد)دا بوون تەمێیان بكات و لێیان بدات بەڵام ئایا (مصعب) لەدەستی هۆزێك ڕزگاری دەبوو؟

وەئەگەر ڕزگاریشی ببوایە!! بێگومان دڵی شاری مەینەی لەدەست دەدا و كەس موسڵمان نەدەبوو چونكە دەیانوت: ئیسلامێكمان ناوێت! كە هەر لەیەكەم ڕۆژەوە شەڕ و پشێوی و ئاژاوەو دوژمنایەتی خستەوە شارەكەمان!!.

من لەم باسەدا هیچ موسڵمانێ: بانگ ناكەم بۆ ترسنۆكی و كزۆڵی و سەر شۆڕی وەك بەناوی مەسیحەوە دەڵێن وتوویەتی: (هەركەس زللەیەكی دا لەلای ڕاستت تۆش لای چەپی بدەرێ). ئیسلام واتە عیزەت و سەربەرزی و نەبەزی لەجێگای خۆیدا و سوودی هەبێت وەك پاشای فارسەكان لە نوێنەری موسڵمانەكان دەپرسێت چی هێناوتی بۆ ئێرە ؟ موسڵمانەكەش لە پرسیارەكەی تێ دەگات: بەئازایانە دەڵێت: بیستوومانە كە خوێنی ئێوە خۆشترین خوێنە!! هاتووین بۆ مژینی!!).

بەڵام ئەوەندە هەیە(لە توندو تیژیدا دڵەكان لە دەست دەدرێت ئەمەلی هاوڕێ گرتن نامێنێت لەبەر ئەوە باشتر وایە دوایین چارە بێت)..

ئەگەر لێزانی و ژیری و دەروونناسی ئیسلام و پیاوانی هەڵگری ئیسلام نەبوایە.. دڵنیابن كە ئەم ئیسلامە ئاوا تەشەنەی نەدەكرد و جیهان بەئەم دینە ڕاستە ئاشنا نەدەبوو..

ئیسلام هیچ شتێکی نیە دڵ و هەست و دەروون بریندار بکات ویست و ئارەزوویان لێ زەوت ناکات، بەرزی و بڵندی کەس دانانەوێنێت، ئیسلام مرۆڤەکانی سەرپشك کردووە لە هەڵبژاردنی بیرو بڕوادا﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾!..(الكهف ٢٩)

ئەم ئیسلامە ئاوایە! ئیتر من و تۆ چین سەربەستی و ئازادی لە برا موسڵمانەکەت ئەگریتەوەو ئەتەوێت بێتە سەر بۆچوون و حەزەکانت واز لە هەموو حەزێکی خۆی بێنێت..

لەکاتێکدا کە ئەویش لە تۆ زیاتر ئەوەی خۆی بەڕاست دەزانێت..

کەواتە ئەتوانیت لە ڕێگای قەناعەت و نەرم و نیانی و گرنگی پێدان و ڕێزگرتنەوە بچیتە دڵی خەڵکەوە، ئەوکاتە خەڵکی بەئاسپایی و لەسەر خۆ دێنە سەر قسەکانت..

# بەشی دووەم

## بەشەش ڕێگا دەچیتە دڵی خەڵکیەوە

### یەکەم/ ئەمە بکە لە هەموو جێگایەك( پێشوازیت )دەکەن

جێگای خۆیەتی پێش ئەوەی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە سوودێکی گەورە و چاك لەهونەری هاوڕێ گرتندا لەشتێکەوە وەربگریت کە بەگەورە ترین (هاوڕێ گر) ناسراوە لە جیهاندا.. لەوە دەچێت لەسەر شۆستەو قەراغ جادەکاندا ببینیت وەگەر لە پاڵیدا بوەستیت بۆت پاڵ دەکەوێت و لەخۆشیاندا خەریکە لە پێستەکەی دەرچێت بۆت! کاتێ لێی نزیك دەبیتەوە کلکە لەقەت بۆ دەکات.. ئەمەش لەبەر ئەوە دەیکات کە ڕادەی خۆشەویستی خۆیت بۆ دەربخات کە چەندێ تۆی خۆش دەوێت ئەم خۆشەویستیەش لەبری هیچ مەبەست و پێناوێك نییە چونکە هیچ مەبەستێکی پێت نییە نەدەیەوێت شت و مەکی لێ بکڕیت و نەکچەکەیت لێ مارە بکات.. ئەوەش(سەگە).

ئایا دەزانیت سەگ تاکە گیانداریکە کە بۆ هیچ بەرهەمێك کە بماندات ڕای ناگرین لەماڵدا بۆ ئەوەی ڕۆزی خۆی مسۆگەر بکات؟ مریشك هێلکە دەکات.. مانگا شیر دەدات.. بولبولی کەناری دەنگی خۆش دەدات.. بەڵام سەگ هیچی پێ نییە.. یەك شت نەبێت کە ئەویش (خۆشەویستییە)..

تەمەنم(٥)ساڵ بوو باوکم توتکەیەکی خنجیلەی بۆ کڕیم کە ڕەنگی توتکەکەی ئاڵتونی بوو.. بەڕاستی بوبووە جێگای کەیف و سەفا و خۆشیم.

هەر کە کاتێ گەڕانەوەم لە قوتابخانە بهاتایە.. لەبەردەم دەرگای ماڵەوە نەوەستاو گوێی قوت دەکردەوەو بەچاوە جوانەکانی دوور دەیڕوانی بۆ ڕێگاکەم.. هەر کە گوێی لە تەپەی پێم دەبوو.. وەلە دوورەوە بەدی دەکردم.. منیش زەمیلەی خواردنەکەی قوتابخانە هەڵدەجەڕاند و دەمبینی ئەویش بەباز بازێن وەك با دەفڕێ بۆ لام بەخێرای و بە قونکە خۆی دەگەیاندە سەر گردەکە دەستی دەکرد بە وەڕین وەك بڵێ، بەخێر هاتنەوەم لێ بکات..

ئەم سەگەم کە ناوی (تیپی)بوو بۆ ماوەی پێنج ساڵ هاوڕێی دڵسۆزم بوو.. بەڵام ئەوشەوە شومە نالەبارەم هەرگیز لە یاد ناچێت کە لەتاریکی شەودا هەورە بروسکەیەك لێی دا و کوشتی.

مردنی(تیپی)بوو لە ڕۆژە ڕەشە نەهاتییەکانی منداڵیم بوو ..

بەڵام ئەوەندە هەیە کە تۆ ئەی(تیپی) هیچ کتێبێکت لەبارەی دەروونناسییەوە نەخوێندۆتەوە چونکە هیچ پێویستییەکت پێی نەبووە.. چونکە تۆ بە سروشتی (غریزە)خوایی کە تێیدا دروست کردبووی ئەتزانی کە هەموو کەس دەتوانێت لەڕێگای گرنگیدانی بەخەڵکەوە لەماوەی (٢)مانگدا ئەوەندە هاوڕێ و دۆست بگرێت کەسێکی تر ناتوانێت لەماوەی دووساڵدا بیگرێت بەڵام لەڕێگای ئەوەوە کە هەوڵ بدات خەڵکی گرنگی بەم بدەن کۆمپانیای تەلەفونی نیۆیۆرك هەستا بەلێکۆڵینەوەو شیکار کردنی ئەوەی کە ئایا چ ووشەیەك زیاتر بەکار دەهێنیرێت؟ ئایا گەشتە چ ئەنجامێك؟ گەشتە ئەوەی کە ڕاناوی (من)بۆ قسەکەری ئەم ووشەیە(٣٩٩٠)جار بەکار هاتووە لە(٥٠٠)تەلەفون کردندا..

ئەگەر گومانت هەیە لەمەدا، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە؟ ئایا کاتێك کە سەیری وێنەی کۆمەڵێك هاوڕێت دەکەیت کەوێنەی خۆشتی تێدایە، یەکەم جار چاو بۆ کێ دەگێڕیت؟

دەئیتر خەڵکی چۆن گرنگی دەدەن بە تۆ لە کاتێکدا تۆ گرنگی نادەیت بەئەوان؟ یان پێم ناڵێیت چۆن دەتەوێت خەڵکی ڕابکێشیت بۆلای خۆت؟.

(ناپلیۆن)کەوتە ئەم هەڵە گەورەیە تاوای لێ هات بە (جۆزفین)ی خێزانی بڵێت کە دواین یەکتر بینیان بوو (جۆزفین) من ئەوپەڕی سەربەرزی و سەربڵندی و دەسەڵات و جوامێریم دەستکەوت بە جۆرێ کە تا ئێستا کەس بەو جۆرەی دەست نەکەوتووە.. لەگەڵ ئەوەشدا من تا ئێستا هیچ هاوڕێیەکی دڵسۆز نیە لە چواردەورم کە پشتی پێ ببەستم جگە لە تۆ نەبێت..

تەنانەت مێژوو نووسەکان گومانیشیان هەیە لەوەدا کە توانیبێتی بتەواو پشت بەویش بەستبێت.

زانای دەروونناسی نەمساوی بەناوبانگ (ئەلفرد ئەدلەر)کتێبێکی نوسیوە بەناوی ( ژیانێکی پڕمانا بۆ تۆ)تیایدا دەڵێت: (ئەوکەسەی گرنگی نادات بە خەڵکی ئەوکەسە زیاتر تووشی نەهاتی و ناڕەحەتی و پشێوییەکانی ژیان دەبێت.. وە لەوێنەی ئەم جۆرە کەسانەدا بێ هیوای مرۆڤایەتی بەهەموو شێوەیەکییەوە بەدی دەکرێت).

کاتێ لە نیویۆرك هونەری کورتە چیرۆك نوسینمان دەخوێند.. سەرنوسەری گۆڤاری (کۆلێزەر)هاتە پۆلەکەمان و چەند قسەیەکی بۆ کردین تیایدا ووتی: کە من ناتوانم هەریەکە لەو چیرۆکانەی ئەگەنە دەستمان و لەسەر مێزەکەم دانراوون هەستم بە خوێندنەوەیان.. بەڵام بەس بەچاوپێخشانێك یەکسەر بۆم دەردەکەوێت کە ئایا نووسەرەکەی خەڵکی خۆش دەوێت یان نا؟ پاشان ووتی: ئەگەر نوسەرەکەی خەڵکی خۆش نەوێت.. خەڵکیش چیرۆکە کەیان ناچێت بەدڵدا و خۆشیان ناوێت..).

جارێکیان شەوم بەسەر برد لە پشتی پەردەوە لە ژورەکەی (هوارد ترستون)شای جادوگەرو مارگرەکان.. کە بۆ ماوەی (چل) ساڵ ئەم سەرو ئەو سەری جیهانی دەکرد.. هەموو گەلانی جیهانی بەیارییە جادووییە سەر سوڕهێنەرەکانی سەرسام کردبوو.. ژمارەی ئەوانەی کەلەم ماوەیەدا ئاهەنگەکانی ئەمیان بینیوە زیاترن لە (٦٠)ملیۆن کەس.. بەهۆی ئەم کارەیەوە سەروەتێکی وای بەدەست هێنا کە دەگەشتە(١)ملیۆن دۆلار

لەوشەوەدا پرسیارم لە (مستر ترستون)کرد.. کە نهێنی لەوەدا چییە توانیوتە ئابەو چەشنە سەر سوڕ هێنەرە کاربکەیتە سەر تەماشا کەرانی لە هەموو شوێنێ؟.

لەوەڵامدا ووتی: زۆرێ لەوانەی کە ئەم کارەی من دەکەن بە جۆرێ دەڕواننە جەماوەری تەماشا کەریان کە کۆمەڵێکی بێ ئاگای گێل بەڵام سەیر کردنی من بۆبینەران زۆر جیایە لەو سەیر کردنانەی ئەوان..

من هەموو جارێ کەدەچمە سەر تەختەی شانۆ بەخۆم دەڵێم: (چەند سوپاس گوزاری ئەم بینەرانەم کە هاتوون بۆ سەیری هونەری من.. وە هەر وەك بوونەتە

هـۆی مـسۆگەر کردنـی ڕزق و ڕۆزی مـن بـەجۆرێکی چـاك و پـڕ لـە ڕەزامەنـدی.. دەکەواتە لەلایەن خۆمەوە توانایەکم دەخەمە کار بۆ ڕازی کردن ودڵخۆش کردنیان!!

خاتوو(شومان هینگ)ی گۆرانی بێژی بەناو بانگ.. هەمان وەڵامی (ترستون)ی دامـەوە، تەنانـەت خـۆ هەڵواسـین و خۆشەویـستی جـەماوەری گەشـتبووە ڕادەیـەك لەوکاتەشـدا کەویـستی خـۆیی و منداڵـەکانی بکوژێـت.. هـەر بینـەرانی خـۆی لەیادنەچووە و گۆرانی بۆ ووتوون!!.

تـا ئـەوەبوو گەشـتە چڵە پۆپـە لەهونـەری گـۆرانی ووتـن دا.. وە بـوو بـەگۆرانی بێـژێك کـە بـچێتە دەورەکـانی (فـاجر)و توانیویـەتی دڵـی خەڵکەکـە بـۆ لای خـۆی کەمەنـدکێش بکـات!.. یـاری بەهەسـت و نەسـتیان بکـات، ڕۆژێکیـان پـێی ووتم: کە هۆی سەرکەوتن و ناو دەرکردنم دەگەڕێتەوە بۆ یـەك هـۆ ئـەویش: (خـۆش ویـستنی جەماوەرە)!!.

وەهەر ئەم هۆیەش بوو کە ئەو ناوبانگە گەورەیەی بە (تیـۆدۆر ڕۆڤلـت)دەرکرد.. کە توانی دڵی هەموو خەڵکەکە بکـات خـۆیی و کۆیـان کاتـەوە لەسـەر خۆشەویـستی خۆی.. تەنانەت خزمەت کارەکانیشی بیری بکەنەوە.

ڕۆژێکیـان دوای لا چـوونی لەسـەر حـوکم لەسـەردەمی(تافـت)دا سـەردانێکی کۆشکی کرد، لەوکاتەدا تافت و خێزانی بۆ سەردانی چوو بوونە دەرەوەی کۆشك.. ڕۆزفلـت دەسـتی کـردە گـەڕان و قـسەی خـۆش لەگـەڵ خزمـەتکارو پاسـەوان و باخـەوانانی کۆشـك.. هـەموویانی بـەناوی خۆیانـەوە بـانگ دەکـرد.. سـوعبەت و پێکەنینی لەگەڵدا دەکردن!!...

کوڕەکـەی زۆزفلـت سـەبارەت بـەم سـەردانەی بـاوکی نووسـبووی: (کـاتێ بـاوکم گەیـشت بـە چێـشت لێنـەری کۆشـك(ئـەلیس)ایـێ پرسـی: ئـەوە ئێـستاش هـەر (لەفە)خۆشەکان دروست دەکەیت؟..ووتی: بەڵێ جار جارێك دروستی دەکەم بەلام بەس بۆ خزمەت کارەکان چونکە گەورەپیاوان دەمی بۆنابەن!.

(لێرەدا باوکم کەمێك تێك چوو)دەیگوت: ئائەمـە گـەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر تێك چوونی (زەوقی)بە ڕپرسان مەرج بێت کە گەشتم بە (تافت)ئەمەی پێ بڵێم (کەوانا

بێت.) (ئەلیس)بە قاپێ لەو خواردنەوە هات بۆلام و .. ئەمیش دەستی کرد بە خواردن و هەر بەتیکەکەی دەمییەوە بەرەو ژووری سەرەك کۆمار کەوتە ڕێ..

بەڵێ تا چەندێك دوای ئەمەش خزمەت کارانی کۆشك ئەو ڕۆژەیان هەر لەیاد نەدەچوو!..

تەنانەت باخەوانی کۆشك(ئیت هوڤەر)بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە ووتی: ئەو ڕۆژە بەختەوەرترین ڕۆژ بوو کەبەسەرماندا تێپەڕ بوو بێت پاش دوو ساڵ؟.. وە هیچی لە ئێمە ئامادە نیە کەئەو یاد گاریە خۆشە بگۆڕێتەوە بە (١٠٠)دۆلار!..

هەر ئەم خۆشەویستی خەڵکی و گرنگی دانە بەکۆسپ و چەڵەمەکانی ژیانیان هۆی سەرەکی بوو بۆ سەرکەوتنی دکتۆر (تشارلس ئیلتون)کەیەکێکە لەو مامۆستا هەرە بەرزانەی کەیەك لە دوای یەك بوون بەسەرۆکی زانکۆی (هارڤارد)!..

دەفەرموو لەگەڵ ئەم نموونەیەدا و بزانە کە چۆن خۆشەویستی خۆی دەبردە دڵی خەڵکی یەوە..

ڕۆژێ لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، قوتابیەکی دواناوەندی کە (کرتندون)ی ناوبوو هاتە ژوورەوە و داوای (٥٠)دۆلار قەرزی کرد.. لەصندوقی ڕاسپاردنەکانی قوتابیان. مامۆستاش ئەو پارەیەی کە داوای کرد پێ ی دا..

(کراندون)دەڵێت: پاش ئەوەی زۆر سوپاسی سەرەك زانکۆم کرد لەسەر ئەم سۆزو بەزەییەی ویستم بێمە دەرەوە.. بەلام مامۆستا وەستاندمی و ووتی: فەرموو: دانیشە، پاش ئەوە بۆ ئەوەی سەرسامەیەکەی بشکێنێ ووتی: (بیستوومە لەژوورەکەتدا تۆ خۆت خواردن بۆ خۆت دروست دەکەیت!! من پیرۆزبایی ئەمەت لێ دەکەم، منیش لەتەمەنی تۆدا هەروام کرد.. باشە پێم بڵێ جارێ لە جاران خواردنی کە (گۆشتی وردی تێکەڵ دەکرێت) (کوبە)دروستت کردووە؟ ئائەوە لەلای من خۆشترین و بەچێژترین خورادنە وە من بەم جۆرەی دروستم دەکرد..)مامۆستا بەوردی و درێژی بۆی باسکردم کە چۆن گۆشتەکە دەجنێ و پاشان دیکوڵێنێت لەسەر ئاگرێکی کەمێ لەسەر خۆ پاشان شتەکانی تری تێکەڵ دەکات!..

بـەتاقی کردنـەوە گەشـتومەتە ئـەوەی کـە ئـادەمیزاد لەڕێگـەی (گرنگـی دانـی بەخەڵکییـەوە)ئەتوانێت وا بکات لـەگرنگ تـرین و بـەرزترین پیاو کە گرنگی بەئەم بدات!! دەفەرمووو با بەڵگەت لەسەر ئەمە بۆ بێنمەوە:

چەند ساڵێك لەمەو بەر لەپەیمانگای (برۆکلین)ی ویژەو زانست.. هونەری چیرۆك نووسینمان دەخوێند.. هەموو قوتابییەکان پێکەوە ویستمان کاریێ بکەین کەکەڵە نووسـەرە خـاوەن کاتـە بـە نرخـەکان بێن بۆلامـان و سـەردانمان بکـەن.. تـا سـوود لەبەهرەکانیان وەربگـرین!.. وەك مامۆسـتا (کاسـلین نـوریبس) و (فـانی هێرسـت) و (ئیداتاریل) و (ئەلبەد بیسون تیرهۆن) و (رۆبرت هیون) و کەسانی دیکەی تریش.

هەسـتاین بەنامـە نووسـین بۆیـان و تیایـدا ڕەزامەنـدی و حـەزو ئـارەزووی پـڕ تاسـەمان بەرامبـەر خۆیـان و چـیرۆکەکانیان دەردەبـڕی و ڕادەی تینیۆتیمـان بـۆ ئامۆژگارییە بەنرخەکانیان دەردەبڕی و حەزو ئارەزوو دەکەین کە هۆی سەرکەوتنی هونـەرییان بـزانین.. پاشـان زیـاتر لـە (١٥٠) قوتـابی ئیمزامـان دەکـرد و بۆمـان دەناردن..

وەلـەو نامانـەدا ئـەوەمان لـەبیر نەدەچوو کـە بنوسـین (ئێمـە پێشتر دەزانـین کـە بـەڕێزتان سـەری قاڵـە و ناتـان پـەرژێ) لەبـەر ئـەوە نەماندەنووسـی سـەردانی قوتابخانەکەمان بکەن پاشان یەك لیستەمان بۆ هەریەکەیان پڕدەکردەوە.. تیایدا چەند پرسیارێکمان لێ دەکرد سەبارەت بە ژیـانی خۆیىو ڕێگاو چۆنیەتی یەکانی نوسینی خۆی.. بەهیوای ئەوەی وەلاممان بدەنەوە..

تۆ چۆن گومان دەبەیت لە ئەنجامەکەی کە چۆن بوبێت؟..

ئەوکەڵە نوسەرە بەناوبانگانە وازیان لەکارو نووسـین دەهێنـاو لـەبورجی بـەرزیان دادەبـەزین و هـەر بـە خۆیـان ئامـادەی (بـرۆکلین) دەبـوون بـۆ ئـەوەی لـە نزیکـەوە دەستی یارمەتیانمان بۆ کێش بکەن!!..

هەربەهەمان ڕێگا توانیومە (لیلی شو) وەزیری خەزێنە لەدەوڵـەتی (ڕوزفلت)دا و (جورج و یکر شام) وەزیـری داد لەدەوڵـەتی (تافـت)دا و (ولـیم جنیجـر) لەدەوڵـەتی

(فرانکلین ڕوزفلت) داو زۆرێکی تریش ڕازی بکەم کە بێن بۆ پەیمانگاکەم و لەگەڵ قوتابیەکانم بدوێن..

ئێمە هەرپێمان خۆشە کە خەڵکی ڕەزامەندی خۆیان دەرببڕن بەرامبەرمان..

بۆنموونە سەیرکە (غەلیوم) قەیسەری ئەڵمانیای پێشووی دوای جەنگی جیهانی یەکەم تووشی سەر شۆڕیو بێ نرخییەکی سەخت هات! بەجۆرێك کەهیچ پاشایەك تا ئێستا وای بەسەر نەهاتووە!.. تەنانەت براکەی خۆیشی لێی هەڵگەڕایەوە.. پاش ئەوەی کە ڕایکرد بۆ هۆڵەندا بۆ ئەوەی ملی خۆی دەرباز بکات لەپەتی سێدارە!..

خەڵکی ئەوەندەیان ڕق لێبوو. بەجۆرێك کە ملیۆنەها کەس ئاواتەخواز بوون کە بەقەپ لەشی پارچە پارچە بکەن یان بەزیندوویی بیسوتێنن!..

ئا لەم کاتەدا کە بورکانی ڕق کینەو تورەیی دادەباری بەسەریدا.. منداڵێك نامەیەکی بۆ نووسی کە تیایدا سۆزو خۆشەویستی و ڕەزامەندی خۆی بەرامبەر دەربڕی!!

نووسی: (خەڵکی چۆن گومان دەبەن با بیبەن.. ئەم هەر بەدڵسۆزیو وەفاداری دەمێنێتەوە بۆ پاشای خاوەن شکۆ!!..))...

قەیسەر ئەم نامەیە کاری کردە دەروونی بۆیە هەستا بە دەعوەت کردنی ئەم منداڵە بۆلای خۆی!..

منداڵەکەش لەگەڵ دایکیدا دێت بۆلای پاشا.. لەپاداشتی ئەم نامەیەدا دایکی دەخوازێت!!..

ئەم منداڵە هیچ کات پێویستی بە خوێندنەوەی کتێب نەبوو دەربارەی هونەری هاوڕێ پەیداکردن و کارکردنە سەریان.. بەڵکو بە (غەریزەیەکی ناوەکی ئەم هونەرەی بەچاکی زانیوە)..

ئێمە ئەگەر ویستمان هاوڕێ پەیدا بکەین.. وەخەڵکی بکەینە دۆستی خۆمان.. نەی باخۆمان بخەینە خزمەتی خەڵکی.. با دەستێکی پڕ سودی دڵسۆزانەیان بۆ کێش بکەین کە دوور بێت لەخۆپەرستی و بەرژەوەندی کاری نیازپیسی..

کاتێـك (دوق ویندسـۆر) ئامـادە کـرا بـۆ (دەسـەڵات داری داهـاتوو) (ولی عهـد) ویستی سەرێك بدات لەئەمەریکای خواروو.. پێش ئەوەی بڕوات چەند مانگێکی تەرخان کرد بۆ فێربوونی زمانی ئەوگەلەی کە دەڕوات بۆ ناویان (زمانی ئەسپانی) ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ووتارەکەی بەزمانی خۆیان بێت و زیاتر کاری گەربێت.

دانیشتوانی ئەمەریکای خواروو خۆشەویستی (دوق) ڕۆشتە دڵیانەوەو ئەم کارە جوانە ناوازەیان لەبیر نەدەکرد و بۆیان دەپاراست!!..

کۆمپانیـای تەلـەفونی نیۆیـۆرك هەستا بـە کردنـەوەی خولێـك بـۆ فێـر بـوون و ڕاهێنـانی چـەند ئافرەتێك لەسـەر کـارکردن و چۆنیەتی قسەکردن لەگـەڵ تەلـەفون کەراندا.. فێریان دەکردن کە بڵێن: ( بەیارمەتی خۆت چ ژمارەیـەکت دەوێ ) و بڵێن ( بەیانیت باش من زۆر بەختیارم کەلە خزمەت تۆدام) .

دەبا تۆش ئەم ووشانەت لەبیر بێت کاتێ تەلەفون لەگەڵ یەکێك دا دەکەیت!..

ئایا ئەم فەلسەفەیە لەدنیای کارو کاسپیو پارە پەیدا کردندا دەوری هەیە؟

ئـەتوانم دەیـان نمونـەت بـۆ بێنمـەوە کـە بـەڵێ سـودی زۆر زۆرە.. بـەڵام لەبـەر بێماوەیی و نەبوونی کات تەنها دوو نموونە دێنمەوە:

فەرمانبـەری یـەکێ لەبانقـە هـەرە مەزنـەکانی نیویـۆرك کـە نـاوی (چارلس واڵتر) بوو، ئەرکی ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی نهێنی خرایە ئەستۆ دەربارەی کۆمپانیایەکی دیاری کراو.. لەو ناوچەیەشدا تەنها یەك کەس هەبوو کە بتوانێت یارمەتی بدات بۆ زانینی ئەو نهێنیيانە.. کە ئەویش بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی پیشەسازی بوو، (چارلس) ڕۆشت بۆ چاوپێکەوتنی..

(واڵـتر) هـەر کـە ڕۆشـتە ژوورەوەو لەبـەر دەمیـدا وەسـتا.. لەوکاتـەدا کـچێك دەرگاکەی کردەوەو ووتـی: بەداخـەوە ئەمڕۆ پولی بەریدی دیکەمان لانییە!.. پاش ئەمـە بەڕێوەبـەر ڕووی کـردە (مـستر واڵـتر ) وتـی: مـن هـەموو جۆرە پـولێکی بەریـد کۆدەکەمــەوە بــەلام بــۆ خــۆم نــا.. بــەڵکو بــۆ کــوڕە بــچکۆلەکەم کــە (١٢) ســاڵ تەمەنییەتی!.. پاشان ( واڵتر ) هۆی سەردانەکەی بۆ ڕوون کردەوەو دەستی کردە پرسـیارکردن لێـی بـەڵام ئـەم وەڵامـەکانی بەڕێوەبـەری بـەدڵ نـەبوو! چونکە جۆرە

ئاڵۆزی و بێ ئەنجامییەکی تێدا بەدی دەکرا وەپاش کەمێ کۆتایی بەوەڵامەکانیشی هێنا!.. ( مستر والتر ) کەیەکێکە لە قوتابییەکانم دەڵێت: سەرم سوڕ مابوو نەم دەزانی چ بکەم.. پاش ماوەیەکی کەم کتوپڕ پولی بەرید و منداڵە دوانزە ساڵەکەم بیر کەوتەوە.. وە بیرم کردەوە کە ئەو بانقەی من کاری تێدادەکەم لەهەموو کیشوەرەکانی جیهانەوە نامە و پولی بۆ دێ.. بۆیە بەپەلە چوومەوە و هەموو جۆرە پولێکم بۆ پەیدا کرد..

لە ڕۆژی داهاتوودا دام لەدەرگای بەڕێوەبەر و ئاگادارم کرد کە پولم لەگەڵ خۆم هێناوە بۆ منداڵە جوانکیلەکەت.. هەر ئەوەندەم زانی کابرایەك بەگەرمی هات بەدەممەوەو دەستەکانی بەتوندی گوشیم و بەجۆرێ خۆشحاڵ و شادمان بوو کە ئەگەر مژدەی هەڵبژاردنیم بدایەتێ کەبووەتە ئەندامی کۆنگرسی ئەمەریکی! ئەوەندە دڵخۆش و بەکەیف نەدەبوو!!. ئەم بەڕێوە بەرە پولەکانی دەدا بەمدیو و ئەودیودا و لێی ورد دەبوویەوەو یەك بەیەك سەیری ئەکردن و دەیگوت: خوایەگیان چەند جوانن!.. ئەگەر (جۆرج) ئەمانە ببینێ چەند دڵخۆش دەبێت.. سەیری ئەمەیان کە: ئەمە گەوهەرە گەوهەر؟..

نزیکەی نیوکاژمێر لەبارەی پولەکانەوە دواین! سەیری وێنەکەی کوڕە نازدارەکەیمان دەکرد.. دوای ئەوەش نزیکەی کات ژمێرێك باس هاتە سەر باسی ئەوەی کە لەڕاستیدا بۆی هاتبووم، هەرچییەکی دەزانی لەوبارەیەوە هەمووی پێوتم و پاشان بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو جێگرەکەی بانگ کرد و زانیاریشی لەویشەوە وەرگرت بۆم! دوای ئەوەش هەندێ زانیاری تری وەرگرت لەڕێگای چەند هاوڕێیەکییەوە بە تەلەفون!!. باوەڕبکەن کاتێ کە هەستام بڕۆم گومانم هەبوو بتوانم ئەو هەموو زانیاری و نهێنیانەی کە پێیدام هەڵیان بگرم!!.. با نموونەیەکی ترتان پێ بدەم:

لە (فیلادلفیا) مستر (نافل) هەموو هەوڵێکی خستەکار بۆ ئەوەی کە خەڵوزەکەی بە کۆمپانیایەکی گەورەی زنجیرە گەنجینەکان (٦) بفرۆشێ بەڵام بێهوودەبوو لەهەوڵەکەی.. چونکە کۆمپانیاکە دەیوویست لە کەسێکی تر بکڕێت!.. لەوماوەیەدا

(مستر نافل) کەیەکێکە لە قوتابیەکانم لە داخاندا لەبەردەمی هاوڕێیەکیدا دەستی کرد بە قسە ووتن بە کۆمپانیای زنجیرە گەنجینەکان هەر هەموویان و بەجۆرێك ناوی بردن کە گوایە: خاڵێکی ڕەشە بە ناوچاوی گەلەوە!..

پاش ماوەیەك واڕێك کەوت کە لێکۆڵینەوەیەکمان ڕێك خست لە پۆلدا بۆ قوتابییەکان دەربارەی (زیانەکانی کۆمپانیا زنجیرە گەنجینەکان زیاترە لە سوودەکانی) لەوێ ئامۆژگاری (نافل)م کرد کەلایەنی نەیار بگرێت.. وە بۆ ئەم کارەش با سوود لە بەڕێوەبەری کۆمپانیای زنجیرە گەنجینەکان وەربگرێت کە ئەم قینی لێیەتی!!..

هەر ئەوکاتە بەخێرایی( نافل ) خۆی گەیاندە لای بەڕێوەبەری کۆمپانیاو پێی ووت: من ئەم جارە بۆ ئەوە نەهاتووم کە خەڵووزتان پێ بفرۆشم، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم کە دەستێکی یارمەتیم بۆ کێش بکەن.. بەسەر هاتی لێکۆڵینەوەکەی قوتابیانی بۆ باس کردو ووتی: بەڕێز من هاتوم داوای یارمەتی دەکەم لەجەنابتان.. چونکە من واگومان نابەم کەسێکی تر هەبێت بێجگە لەبەڕێزتان شتێ بزانێت دەربارەی ئەو زانستیانەی من دەمەوێت سەبارەت بە (کۆمپانیای زنجیرە گەنجینەکان).. من زۆر مەبەستمە لەم لێکۆڵینەوەدا سەرکەووم و بیبەمەوە، وەمن سوپاس گوزاری هەریارمەتییەك دەبم کە جەنابتان هەستێت پێی.

(نافل) بۆتان دەگێڕێتەوە کەچی ڕوویدا دوای ئەوەو دەڵێت: کاتێ کەچوومە لای بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە داوام لێکرد یەك (دەقیقە)م لەکاتی خۆی پێبدات!.. لەسەر ئەم مەرجە ڕازی بوو کە لەگەڵم دابنیشێت..کاتێ کەباسی (لێکۆڵینەوە)کەم بۆ کرد بەپێوەبوم! کەچی ئامارژەی بۆ کردم بەدەست کە دابنیشم! کاتژمێرێك و چل و حەوت دەقیقەی تەواو قسەی بۆ کردم!.. پاشان یەکێك لەفەرمان بەرەکانی بانگ کرد کە کتێبێکی دەربارەی کۆمپانیای زنجیرە گەنجینەکان نوسیبووی داوای لێکرد کە دانەیەکم لەو کتێبە پێ بدات!..پاشان نووسی بۆ (یەکێتی گەنجینەکان) کە دانەیەکم لەو کتێبەی باسی لێکۆڵینەوەیەکی هەر لەوچەشنە دەکات کە لە ڕووی دابووم پێم بدەن!..

ئەم بەڕێوەبەرە زۆر زۆر باوەڕی بە (کۆمپانیای زنجیرە گەنجینەکان) هەبوو.. وەلەو باوەڕەشدا بوو کە خزمەتێکی گەورە بە مرۆڤایەتی دەگەیەنێت..

وە جێگای خۆیەتی کە منیش دان بەوەدا بنێم کە چاوی کردمەوەو شارەزای کردم کە لەزۆر شت کەمن هەر نەم دەزانی.. بەڵکو بەتەواوەتی بیروڕای گۆڕیم بەرامبەر کۆمپانیاکان..کاتێ ویستم بڕۆمە دەرەوە تابەردەرگا لەگەڵم هات و دای بەناو شانمدا و ووتی: هیوادارم کەسەرکەوتووبیت لەم دەمەقاڵەو لێکۆڵینەوەیەتدا.. پاشان داوای لێکردم کە لە ئەنجامەکەی ئاگاداری بکەم و سەرێکی لێ بدەمەوە..

لەکۆتا ووشەیدا پێی ووتم: بەڵکو لەکۆتایی بەهاردا سەرێکمان لێ بدەیتەوە.. چونکە حەز دەکەم پێت ڕابگەیەنم کە پێویستمان بە خەڵوزێکی زۆری ئێوە هەیە!!..بەڕاستی ئەمە لای من وەك موعجیزە وابوو.. سەیرکەن ئەوەتا خۆی حەز دەکات لەهەموو دڵێکی خۆیەوە کە خەڵووزم لێبکڕێت! بەبێ ئەوەی من تاقە وشەیەك لەم بارەیەوە بڵێم!!.بەڕاستی من ڕێگایەکی دوور و درێژم بەدوو کات ژمێر بڕی!.. کە هەرگیز بەدە ساڵیش نەم دەتوانی بیبڕم ئەگەر بمویستایە ئەو گرنگی بەمن بدات بەو خەڵوزەی کە دەیفرۆشت..!!ئەم چاکەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەمن گرنگیم دا بەکۆمپانیا کەو کاروو فەرمانەکانی و زانیاری دەربارەی ئەوانە..!بەڵێ مستر (نافل) تۆ بۆیەکەم جار هەستت بەم ڕاستییە نەکرد و وە نەت دۆزیەوە.. بەڵکو سەد ساڵیش پێش لە دایك بوونی مەسیح (سەلامی خوای لێ بێت) یەکێ لەشاعیرە دێرینەکانی ڕۆمان بەناوی (ببلیلیۆس سیوس) دەڵێت: (ئێمە گرنگی بەخەڵك نادەین تا خەڵکیش گرنگیمان پێبدەن)

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی خۆشی بوێت.. بڕگەی ژمارە یەك جێبەجێ بکە:( گرنگی بەخەڵك بدە )

## بەشی دووەم

## پاشکۆی یەکەم/ گرنگی دان بە براکانت

خوای گەورەو پەروەردگار کە ئادەمیزادی دروست کردووە.. ئەم ئادەمیزادە ئەگەر نەفس و شەیتان دەست نەگرن بەسەر عەقڵ و دڵیدا پەروەردگاری بەدی هێنەری دەناسێت و سەری بەندایەتی بۆ کەچ دەکات و لەبەرنامەو پرۆگرامەکەی لانادات و ئەوەندەشی پەروەردگار خۆش دەوێت کە بەزیکرو یادی ئەو دڵی بکرێتەوەو گوێ ڕایەڵی تەواوی بۆ بکات و لەقەدەغەکراوەکانی نزیك نابێتەوە!..

ئەم ئادەمییە لەبەر چی و چۆن ئەمە دەکات!!.

وا دەزانم هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ چەند شتێك.. سەرەکیترین هۆیان ئەو گرنگی پێدانە گەورەیەیە کە خوا داویەتی بە ئادەمیزاد!.. هەرلەیەکەم جارەوە سوجدەی بەهەموو فریشتەکان برد بۆ ئەم ئادەمیزادە!..

پاشان هەموو بەخشش و نیعمەتێکی باراندوە بەسەریدا!.. لەهەموو گرنگ تر کردی بەسەرداری هەموو گیان لەبەران!.. پاشان هەربەوەشەوە کۆتایی نەهات بەڵکو بەرنامەو پرۆگرامی خۆی بۆ ناردوون لەڕێگەی (پێغەمبەر)انەوە!!..

بەم کارەی پەروەردگار من واتێ دەگەم کە ئامۆژگارییەکی چاکیشە بۆ ئێمە کە ئەی موسڵمانان ئێوەش ئاوابن لەگەڵ دەورووبەرتانداو گرنگی چاکیان پێ بدەن و بەدەمیانەوە بچن تا ئەوانیش گرنگی بەئێوە بدەن و بێن بەدەمتانەوەو گوێتان بۆ بگرن و بڵند سەیرتان بکەن..

ئەوەنییە خوایەك بەو بەرزیو بڵندییەیەوە گرنگی داوە بە ئادەمیزادێکی بچکۆلەو بێ ئەهەمیەت و لەیادی نەکردووە.. دە ئێوەش لەگەڵ یەکتریدا ئابەم جۆرە بن..

کەواتە زۆر ئاساییە کە (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) لە ڕادە بەدەر گرنگی بەخەڵکی چواردەوری بدات و بڕوات بەدەمیانەوە!..

چونکە ئەو ئەرکە گەورەیەی خراوەتە ئەستۆی کە بانگ کردنی خەڵکی و قەناعەت پێکردن ئەوەی دەوێت کە فەرامۆشیان نەکات تا ئەوانیش ئەم فەرامۆش نەکەن و گرنگی بەووتەکانی بدەن و شوێنی بکەون..

ئەوەتا (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بانگ کردن و موسڵمان کردنی خەڵکی مەککە ڕێی لێ ناگرێت کە گرنگی بدات بە ئەو غەریبەی هاتبوو بۆ مەککەو شتی بەئەبو جەهل فرۆشتبوو بەڵام (ئەبو جەهل) هەردەستی دەستی پێ دەکرد پارەکەی نەدەدایەو دوای دەخست کابراش هانای بۆ (پێغەمبەر) هێنا!..

(پێغەمبەر)یش(د.خ)لەگەڵیدا بە توڕەییەوە بەرەو ماڵی ئەبو جەهل کەوتە ڕێو بەتووندی دای لەدەرگاو هاواری کرد خێراکە وەرە دەرەوە و پارەی ئەم پیاوە غەریبە هەژارە بەرەوە..

(ئەبو جەهل) بەو گەورەیی و ناودارییەیەوە لەرزی لێهات وخێرا پارەکەی هێنا و دایەوە بە پیاوەکە!..

کێ دەڵێ ئەم گرنگی دان و بەدەمەوە چوونی (پێغەمبەر)(ﷺ ) کاری نەکردبێتە سەر ئەو کابرایە و موسڵمان نەبووبێت؟ هەر هیچ نەبێت خۆشەویستی (محمد) چۆتە دڵییەوە و لەهیچ جێیەکدا ڕازی نەبوو بێ بە (محمد) بووترێت شێت یان جادووگەر یان درۆزن!!و بەرگری لێ کردبێت!..

یان ئایا ئەمە نەخشەیەکی (پێغەمبەر) نییە؟ بۆ هاوەڵان و هەموو هەڵگرانی بانگەوازی ئیسلامی کە نەکەن بە ناوی سەرقاڵی و دەرس زۆری و هەوڵی (دعوە) وە خەڵکانی تری لەبیر بچێت و گرنگی بەکەس نەدات؟

داخی بەجەرگم! هەندێ برا سەردان و مەرحەبایی و گرنگی بە خەڵکیان خستووەتە ئەولا!

بەبیانووی بۆ نەکردن! من هەقم نییە و حوکم نادەم چاك دەکەن یان خراپ بەڵام با ئەوان دڵنیابن کە هاوڕێ و دۆستیان کەم دەبێتەوەو خۆشەویستیشیان لەناو دڵەکاندا کەم دەبێتەوەو نامێنێت!..

ئیسلام دەروونی موسڵمانەکان و گوش دەکات دڵ و هەست و هەناویان بۆ خەڵکی بێتە جۆش و بەهێمنی و ئارامی و خۆگرییەوە ڕاوەستن لەبەردەم ناڕەحەتییەکاندا کە کافر و دوور لەخوا بەسەریاندا دەیهێنن من وادەزانم کەئەوە ئەوپەڕی گرنگی دان و مەبەست بەرزییە بە مرۆڤایەتی!..

بۆنموونە لەسەر ئەمە: (پێغەمبەر) (ﷺ) ڕێگای سەخت و دوور و درێژ و پڕ ئێش و ئازاری بڕی تا گەیشتە (طائف) چونکە زۆر گرنگی دەدا بەوەی کە هیچ کام لەئادەمییەکان بەکافری نەمرن تووشی ئەشکەنجەو ئازاری پڕ ئێشی جەهەنەم نەبن!!..

بەڵام (طائف) بە نەزانی و نەفامی خۆیان (لەپاداشتیدا) منداڵ و شێت و هەرزەکارەکانیان تێبەردا ئەوەندە بەردیان تێگرد تا لەشی پیرۆزیان خوێناوی کرد و بەڕاشکاوی لەشار دەریان کرد؟!!.

خوای گەورە مەلائیکەتی کێوەکانی دەنێرێت بۆلای (محمد) کە پێی بڵێت: ئەگەر حەز دەکەیت با ئەو دووشاخەی ئەم بەراوبەری تائف بکێشم بەیەکدا.. و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە وردو خاش کەین و لەناوی بەرین بۆت!..بەڵام پێغەمبەری ئازیزو بەسۆز ڕازی نەبوو و بەڵکو فەرمووی : خوایەگیان بەڵکو لە نەوەکانی ئەمان کەسێك هەبێت کە هەڵگری ئەم دینە بێت .

بەڵێ ڕۆژان تێپەڕبوون پاش چەند ساڵێك شاری (طائف) بەنوری قورئان ڕووناك بوویەوەو بوونە دڵسۆزترین دڵسۆزانی ئەم دینە!! هاوەڵان دەڵێن: (هەموو کەس بەشی خۆی دڵسۆزی نواندووە بۆ ئیسلام بەڵام نەمان دیوە وێنەی ڕۆڵەکانی طائف لەدڵسوتاوییاندا بۆ ئیسلام و دڵسۆزیان بۆ (پێغەمبەر)ەکەی!!..

ئا بەم چەشنە (پێغەمبەر)ی ئیسلام نەخشەی هونەری هەڵس و کەوت کردن بۆ شوێن کەوتوانی دەکێشێت.. ئایا خوێنەری بەڕێز ئەگەر (پێغەمبەر) مرۆڤێکی کورت بین و بەرژەوەند پەرست بوایەو بیفەرمووایە: بەڵێ خوایە لەناویان بەرە

مادەم من بەرژەوەندی ئەوانم دەوێت کەچی ئەوان بەپێچەوانەوە بەردبارانیان کردم‌و شار بەدەریان کردم !!..

بەلەناوچوونی طائف ئیسلام زەرەیەك سوودی نەدەبینی.. بەڵکو بەپێچەوانەوە بێ بە شیش دەبوو لەو هەموولاوە دڵسۆزە طائفیە.. دیسان دەرسێکیش بوو لەوانەکانی ئارامی و خۆگری..

یان گرنگی دانی (ﷺ) بە دراوسێکانی و سەرلێدان و هەواڵ پرسین و بەدەمەوە چوون و خەمخواردنیان ئیتر با موسڵمان بووبن یان جولەکەو گاور، باوەڕکە ئەمەش گەورەترین کارتێکردن بوو لەسەر دەروونیان پاشان خۆشەویست کردنی خۆیی و بەرنامەکەی بووە لایان!..

پێشەوا (ئەبو حەنیفە) لەشاری کوفە دراوسێیەکی عەرەق خۆرو سەرسەری و هەرزەی دەبێت! هەموو شەوێ بەسەرخۆشی دەست دەکاتە گۆرانی‌و سیاچەمانەو پێشەوا نارەحەت دەکات!.. شەوێکیان (ئەبو حەنیفە) سەیر دەکات وەك شەوانی ڕابردوو بەزم و ڕەزم و سەفا و کەیفی نەماوە دەبێ چی بووبێت؟..

بۆسبەینێ دەپرسێت پێی‌دەڵێن : قوربان گیراوەو (لەخوا بەزیادبێت) و لەزینداندایە!! (ئەبو حەنیفە) نەیفەرموو ئەی بەخوا باشە نەجاتمان بوو لەو چەناگە شکاوە!! نەخێر ئەمە هەڵس و کەوتی دەروونناسانی ئیسلام نییە؟.. بۆیە خێرا خۆی کۆکردەوەو بەرەو لای (والی) کەوتەڕێ‌و تکای بەرەڵاکردنی ئەو لاوەی کرد کارمەندانیش دڵی (ئەبو حەنیفە) یان نەشکاندوو بۆیان بەرەڵاکرد.. کوڕە گەنجە عەرەق خۆرەکە ئەم هەڵس و کەوتە بەرزە کاری تێکرد و بەیەك جاری وازی نەك لە عەرەق بەڵکو لەهەموو خراپەیەك هێناو تەوبەی کرد و هاتە سەر ڕێگەکەی (ئەبو حەنیفە)!!..

وا دابنێین کە (ئەبو حەنیفە) ئەم هەڵوێستەی نەبوایە.. کوڕی مەست و سەرخۆش پاش چەند ڕۆژێك لەزیندان دەهاتە دەرەوە و وەك جاران و بگرە خراپتریش دەمایەوە یان ئەگەر ئەوشەوانە خۆی نەگرتایە و بچوایەتە سەری و

سەرزەنشتی بکردایەو قسەی لەگەڵ بکردایە.. هەموومان دەزانین ئەنجامی لۆمەکردنی چی دەبوو؟.

کوڕە هەر سوور دەبوو لەسەر هەڵوێستی خۆی و خۆی بەهەڵە نەدەزانی و ڕقیشی لە زانایان هەڵدەستا..

دیسان وانەیەکی تر لەو وانە بەرزانەی (پێغەمبەر) (ﷺ)فێری شوێن کەوتوانی دەکات ئەوەیە کە گرنگیدان لەهەمووکات و لەگەڵ هەموو کەسێکداپێویستە .. کاتی جەنگ بێت یان کاتی ئاشتی لەگەڵ منداڵ بێت یان پیاوبێت یان ئافرەت گرنگ ئەوەیە موسڵمان دڵی خەڵکی بۆ خۆی کەمەند کێش بکات و هەڵوێستێکی بەرزبنوێنێت..

جارێکیان سەرکردەی شۆڕشگێڕی سوپای ئیسلام (صلاح الدین الایوبی) لەیەکێ لە جەنگەکاندا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت بەهەموان کە پەیامی ئیسلام ئاشتییەو جەنگ بە دواچارە دەزانێت!..

ئەگێڕنەوە کاتێ ویستی بۆ دەست گرتنەوە بەسەر شاری (نەینەوا)دا هێرشێکی دلێرانەی کردە سەریان.. لەوکاتەدا شاژنی موسڵ سکی هەبوو وەکاتی بوونی منداڵەکەش نزیك بوو بوویەوە هەموویان لەکۆشکدا خەمیان لێهات کەلەم جەنگەدا بترسێت و سکەکەی لەبار بچێت.. بۆیە دایکی شاژن بڕیاریدا بچێت بۆلای سەرکردەی موسڵمانان (ئەیوبی) و تکای لێ بکات کە بەڵکو دوومانگ ئەم جەنگە دوا بخات تا کچەکەم بە هێمنیو بێ دڵە ڕاوکە شازادەی ببێت!..

پاش ووتی: دایەگیان ڕۆشتنەکەت بێسوود دەبێت چونکە سۆزو بەزەیی لەگەڵ جەنگدا کۆنابێتەوە کاتێ پیرەژنەکە هاتە خزمەت (صلاح الدین)و داواکارییەکەی خستەڕوو..

سەرکردە بێ وەستان و دوودڵی فەرمووی: ئێمە نابینە هۆی دڵداکەوتن و تۆقاندنی ژنانی سك پڕ و لەبار چوونی کۆرپە بێگوناهەکانیان..تا دوومانگی تر با جەنگ بوەستێت..

ئایا ئەم هەڵوێستەی (صلاح الدین) بەرهەمی هەبوو؟! بابزانین.

بەڵێ پاش کۆتایی دوومانگەکە پاشاو خێزانی و دایکی خێزانی و وەزیر و دەست پێوەندان بەکۆرپەلەی تازە لەدایك بووەوە چوونە خزمەت سەرکردەو بەبێ

شەڕ و گەڕ کلیلی شاری نەینەوایان خستە بەردەستی و فەرمووی هاتنە ژوورەوەیان لێ کرد.. (٧).

ئەمەیە ڕۆڵی گرنگی پێدان و سوودەکانی لەکاتی جەنگدا.. ئەی دەبێ لەئاشتیدا چۆن بێت؟ دەبیهێنە خەیاڵی خۆت کەسەرکردەیەکی سەرکەوتووی ( خاچ پەرست شکێن ) ئا بەوجۆرە گرنگی تەنانەت بە ساوایەکی هێشتا لەدایك نەبوو بدات..دە ئیتر چۆن من و تۆ گرنگی تەواو نەدەین بە براو خوشکانمان لەکاتێکدا هەموویان یەك بەرنامەو یەك زبان و نەژادین؟.. من خۆم لەژیانی خوێندنی زانکۆمدا هەستم بەم ڕاستییە کردووە؟ بابۆتان بخەمە ڕوو: هەندێ مامۆستای عەرەب چونکە گرنگیان بەخۆمان و کوردستانە پێشێل کراوەکەمان دەدا و هەمیشە دەیان پرسی لێمان دەربارەی باری گوزەران و حاڵی خەڵکی کوردستان.. جارێك چوومەلای یەکێ لەو مامۆستایانە(مامۆستا ناوی ( محمد عبید الکبیسی بو))و پێم ووت: مامۆستا گیان داوای لێبووردن دەکەم.. کە ماوەی (٢٠)ڕۆژە لێرە نیم و غایبم.. بە هۆی باری نالەباری کوردستان.. بەڵکو ئەو تاقیکردنەوانەم بکەیتەوە کە فەوتاون لەم ماوەی پێشوودا..

مامۆستا نەك هەر بڵێ باشە و بەسەرچاو.. بەڵکو ووتی: فەرموو دانیشە.. منیش بەئەسپایی دانیشتم ئای کە ئەو ساتە خۆشەم لەیاد ناچێت کەبەڕوویەکی گەشەوە دڵنەوایی کردم و لێی پرسیم: ئێستا باری باکوور چۆنە بەتایبەت شاری هەڵەبجەی خۆشەویست مەڵبەندی ئیمان؟..

بەتایبەت دوای ئەوەی کە بەڕاستی بۆم دەرکەوت لە دڵسۆزیەوە وادەپرسێت خەریك بو لەخۆشیدا گەشکە بکەم!.. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەو مامۆستایەم لەلا ئەوەندە شیرین بوو بۆیە حەزم دەکرد دانیشتنەکەم ساڵ بخایەنێت لەخزمەتیدا! منیش سنگم بۆ کردەوەو بەبێ ترس چیمان بەسەر هاتبوو هەموویم بۆ باس کرد

مامۆستا زۆر زۆر ناڕەحەت بوو!چاوەکانی ئاویان تیزا غەم دوای گرت! بۆیە هەندێ دۆعای خێری بۆ کردین و بەتایبەت کاتێ کەوتم برینداره مەدەنیەکانیان بەزیندوویی کردە ژێر خۆڵەوە!!. وە منیش باوکم و برایەکم و چەند خزم و دۆستو هاورێیەکم گیراوەو گەڕەکەکەشمان کانی عاشقان بە (تێ ئێن-تێ)

دەتەقێننەوە!! زۆر دڵ گران بوو پاش ووتی کوڕی شیرینم خوای گەورە تۆ لە سێنە ئەم حەقەتان دەسەنێت تۆش فەرموو بڕۆ بۆ پۆلەکەت تاقی کردنەوەکەش گرنگ نییە خەمت نەبێت!..

خوێنەری بەڕێزا. ئایا ئەم مامۆستایە بەم گرنگی پێدانە و هەواڵ پرسینە هیچی لێ کەم بوویەوە؟! ئەی ئایا منی نەکردە هاوڕێی خۆیی و کاری نەکردە هێزو هەناوم و خۆشەویست نەبوو لەلام؟!.. دەی سا من و تۆش با بەو جۆرە گرنگی بەخەڵك بدەین با تا مردن لەیادیان نەچین و گرنگیمان پێ بدەن؟!

زۆر بەی ڕقە بەرایەتی و کینەبازی و دوبەرەکی و دورە پەرێزی و کارتێ نەکردن دەگەڕێتەوە بۆ یەك خاڵ ئەویش ئەوەیە گوێ نادەینە یەکتر و گرنگی بەیەك نادەین و لەگەڵ ناسۆریەکانی یەکتردا ناژین!!..

نمونەیەك لەسەر ئەمە ساڵی (١٩٨٧) کاتێ گەڕامەوە بۆ خوێندن لە دوای (٢٠) ڕۆژ ئامادە نەبوون.. بەهەمان شێوەی پێشوو ڕۆیشتم بۆ لای مامۆستا یەکی تر.. و قسەم بۆ کرد! بەڵام ئەو بەهیچ شێوەیەك دڵی نەسوتا و گوێی نەدا بە منی هەڵەبجەیی ستەم لێ کراو!..

بەڵکوو ووتی: مردووتان مرێ دەچنەوە بۆ شار بۆ پیاسەو پاش مانگێك دەگەنەوە من و دەڵێن، تاقی کردنەوەکەمان بکەرەوە!!..

نەخێر بڕۆ دەرەوە و (صفر)!!منیش لە دڵی خۆمدا ووتم لەوە دەچێت نەی بیستبێت چی بە هەڵەبجە کراوە؟ کاتێ بۆم باس کرد بە هیچ شێوەیەك ناڕەحەت نەبوو تێك نەچوو وەڵامێکی ڕەقی بێ تامی وای دامەوە کەلە نارنجۆکەکانی فڕۆکەکانی بەعس بە ئێش تر بوون بەسەر دڵم!کاتێ: ووتی: بڕۆ دەرەوەو هەمووی سوچی خۆتانە ئەگینا دەوڵەت بۆ وا لەمن و شاری من ناکات وا دیارە شایەنتانە ئێوە هەمووتان پێشمەرگەن(عصاتن)!!..

نەگبەتی ئێمە لەوەدایە کە دەشزانین ئەم ڕێگایە دەبێـە هۆی بێ هاوڕێیین و نەهاتنە ناو بەرنامەو پرۆگرامی خوای گەورە کە دەدرێنە خەڵك کەچی زۆربەی خەڵك شوێنمان ناکەون بەڵکوو شوێن ئەم و ئەو دەکەون کەکەس نازانێت بەرنامەو یاسایان کامەیەو لە کوێوە هاتووە!!.

## ڕێگای دووەم

### دووەم/ چۆن بمانەوێت؟ شوێنەوارێکی جوان بە جێ بهێڵین لە دڵی ئەو کەسەدا کەیەکەم جار پێی دەگەین

ڕۆژێکیان بانگ کرام بۆنان خواردنی ئێوارەیەك لەو جێگەیە شتێك سەرنجی زۆر ڕاکێشام ئەویش دیمەنی ڕواڵەتی ئافرەتێك کە ئەویش وەك من دەعوەت بوو یەکێ بوو لەوانەی کەسامانێکی زۆریان بۆ بەجێ ماوە ئەو خانمە دەیویست بەو پەڕی هەوڵدان سەرنجی ئامادەبووان بۆلای سیمای خۆی ڕابکێشێت.

وا دیار بوو هەندێ پارەو پوولی سەرف کرد بوو بۆ ڕازاندنەوەی خۆیی و جل بەرگی!..

بەڵام شێوە و ڕواڵەتی وا دیار نەبوو کەبە خۆشەویستی پاك و سۆزی بێ گەرد ڕازاندبێتیەوە!..چونکە سەیر کردن و لاکردنەوەی وای دەردەخست کە وشکی و خۆپەرستییەکی تێدا بوو.. بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە ڕووی گەش و کراوەیەك کەبە ڕواڵەت بەدی بکرێت زۆر گرنگترە و چاکترە لە خۆ ڕازاندنەوەو ئارایشت کردن!..

ئایا بە بیرتدا هاتووە ئەم قسانەی پێشوو کەکردمان زۆر بەسوود و پێویستن کە بەخێزانەکەتی بڵێی کاتێ دیەوێت پاڵتۆیەکی فەرو بکڕێت؟!.

(هارلس شواب)پێی ووتم کە ڕووی خۆش و زەردەخەنە( یەك ملیۆن) ڕیاڵی دەست خستم! خۆ(شواب)ڕاست دەکات.. چونکە تواناو لێهاتنی دەست خستنی دڵی خەڵکی و ڕاکێشانیان لەلایەن ( شوابە) وە بوویە هۆی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کەبەدەستی هێنا!..

یەکێ لەو توانایانەی کە زۆر گرنگن.. زەردەخەنەی پرشنگداری بەردەوام و هەمیشەییە.

جارێکیان ڕۆژم بردە سەر لەگەڵ ئەستێرەی فەرەنسی قسە خۆش (مۆریس شیڤالیە) ڕاستییەکەی یەکەم جار کەلەلای دانیشتم هیوا بڕاو بووم بەتەواوەتی: چونکە زۆر بە مۆنی هاتە بەر چاوم و دەم و چاوی دابوو بەیەکدا!.. زۆر جیابوو لەوەی کە من دامنابوو بۆ ئەوەی کەوابێت.. تا ئەوەندەی دەمی کردەوەو زەردەیەك

گرتی!.. ئیتر من وام ئەزانی کە خۆر لەپشت هەورەو هەڵهاتووە و تیشکەکانی بەگشت جیهان بەخشیوە و جیهانی ڕووناك و گەرم کردۆتەوە.. تەنانەت زۆربەی گومان بۆ ئەوە دەچێت کە ئەگەر ئەم زەردەخەنە و ڕووە خۆشەکەی نەبوایە ئەم مۆریسە بە(دارتاش) دەمایەوە لەپاریس هەر وەك باوك و براکانی تری)..

دەربڕینی دەم و چاوو ڕوی خۆش قسە دەکات بە دەنگێکی زۆر کاریگەر تر لەدەنگی زمان!.. لەلای من زەردەخەندەو ڕوو خۆشی وەك ئەوە وایە کە خاوەنەکەی پێت بڵێ من خۆشم دەوێیت.. تۆ بەختەوەرم دەکەیت من زۆر کامەران و شادمانم بەبینینت! هەرهۆی ئەمەشە کە گیان لەبەرێکی وەك سەگ بۆ نموونە- سەرکەوتنێکی مەزنی لە ڕادەبەدەریان بەدەست هێناوەو لەهونەری خەڵك کردنە خۆو خۆشەویت کردندا.. بەمەرجێك ئەو هەر قسەش ناکات بەڵام خۆشی و شادی پێوە دیارە کاتێ دەمان بینێ بە جوانترین خۆشی و شادی.. تەنانەت لەخۆشی ئێمەدا خەریکە لەپێستی خۆی دەردەچێت.. دەئیتر ئاساییەو جێگای سەرسوڕمان نییە کە خۆشمان دەوێت..

وانەزانیت کەمن دەڵێم زەردەخەنە مەبەستم بەس ئەو شێوەیە بێ کەلەسەر لێو دەردەکەوێت و خاڵییە لە دڵسۆزی و ڕاستی و، بێ گیانە.. نەخێر! ئەمە هیچ نابەخشێت بەکەس.. بەڵکو من دەربارەی ئەو زەردە خەنەیە دەدوێم کە بەڕاستی لە قوڵایی دڵ و دەروونتەوە هەڵبقوڵێت.. بەشێوەیەك کە سوود و قازانجێکی زۆرت پێ دەگەیەنێت لە مەیدانی سەروەت و سامان پەیدا کردن و ئیشو کار و کاسبی دا..

بەڕێوبەری کارمەندانی یەکێك لە گەنجینە گەورەکانی نیویۆرك بۆی باس کردم ووتی: من کچێك هەڵدەبژێرم بۆ هەر کاتێك بێ لەکۆمپانیاکەم دا کە ڕوی خۆش و دەم بەپێکەنین و خەندە بێت ئیتر با ناوەندیشی تەواو نەکردبێت، باشترە لەلام لە دکتۆرێکی فەلسەفەی زانکۆ بەڵام ڕوو گرژو دەم و چاو داخراوو مۆن بێت..!

بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی پلاستیك پێی ووتم کە ئەو پیاوەی بە گیانێکی خۆشی و زەوق و پێکەنینەوەو بەکراوەیی بەرەو ڕوی کار نەڕوات زۆر بەدەگمەن سەرکەوتن بەدەست دێنێت.. وا دەردەکەوێت کە ئەم بەڕێوەبەرە لەو

پیشەسازیانەیە کە باوەڕیان بەو وتە کۆنە نییە کە دەڵێت: ( تیکۆشان و خۆ ڕەنجاندن تاکە هۆی سەرکەوتنە)..

پاشان لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و ووتی: پیاوانێك دەناسم کە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە ئیش و کاریانا چونکە بەجۆرێك بەرەو ڕووی کار دەچوون وەك چۆن بۆ گەڕان و پیاسە و سەیران دەچن بەداخەوە پاشان هەر ئەو پیاوانەم ئەبینی لەم دواییەدا بەجۆرێ بەرەو ڕووی کار دەچوون کە پڕ بوو لەهەڵەدەوان و خۆڕووتاندن و خۆ تێکدان و بێزارییەك بە جۆرێك کە لە زەت و خۆشی و حەزیان بۆ ئەو کارە نەماو پاشان سەرنەکەوتن و تێك شکان.. داوام کرد لە دەیان پیاوی کارمەندی گەورە کە قوتابی خۆم بوون کەبەدرێژایی هەفتە هەموو ڕۆژێ: تا ئێوارە بەدەم کەسێکی دیاری کراوەوە پێ بکەنن.. پاشان لەئەنجامەکەی قوتابییەکان ئاگادارم بکەن لە پۆل دا.. ئەمەش هەندێ لەو ئەنجامانەیە..(ولیم بب.شتین هارت)کە ئیش و کاری ناوەندکاری دەکات لە بازاڕی ( وەرەقە دراوەکانی) نیۆیۆرك ووتی: من زیاتر لە هەژدە ساڵە ژنم هێناوە.. لەم تەمەنەدوورو درێژەدا زۆر بەکەمی نەبێت بەدەم خێزانەکەمەوە پێنەکەنیووم!.. نەك هەر ئەوە بەڵکو بێجگە لەچەند وشەیەك هەر قسەشم لەگەڵ نەکردووە.. ئیتر هەر لە خەو هەستانەوە هەتا لەماڵ دەرچوونم بۆ سەر کارەکەم.. بێ تام ترین نموونەی مرو مۆن بووم!!.

کاتێك کەلە پۆلدا باسی زەردەخەنەمان دەکرد من و هاوڕێکانم.. بیرم کردەوە لەتاقی کردنەوە بەوەی کە زەردەخەندە لەگەڵ خێزانەکەمدا بەکار بهێنم..

لەڕۆژی داهاتوودا کاتێك لەبەر ئاوێنەکەدا قژم دادەهێنا.. سەیرێکی خۆمم کردو بەخۆم گوت..

ولیەم چاك گوێ بگرە..تۆ دەبێت . ئەمڕۆ ئەو پەڵە هەورە گرژ و مۆنییەی بەڕووتەوە هەیە بیڕەوێنیتەوە بەردەوام ئیتر ڕوو خۆش و خەندە لێو بیت دەبێت لەئەم ساتەوە دەست پێ بکەیت دەی..

پاشان چوومە سەر سفرەو خوان بۆ بەرچایی بەیانی.. سڵاوێکم لەخێزانەکەم کرد بەو شێوەیە (بەیانیت باش خۆشەویستەکەم)بێگومان بەدەم پێکەنین و زەردەخەنەوە ئەمەم پێ ووت..

بەڵام ماموستاکەم.. گەورەم(دیل کارنجی)جەنابت ئاگادارت کرد بووم کە سەرسام دەبێت و وەك لەبان بەری بەنەوە!.. بەڵام وا دەزانم ئەم(وەصفەی)جەنابتان کەم بوو بەڵکو لەخۆشیاندا هەرتێك چوو!.

بەڵام من یەکسەر هاتمە قسەو پەیمانم دایە کەلەمەو دوا بەبەردەوامی ئەم سڵاوەم لێ دەبیستێ.. بەڕاستی ئەم هەڵوێستە تازەیە لەماوەی دوومانگدا بەختەوەری یەکی وای هێنایە ماڵەکەمەوە کە دووساڵ لەمەو پێش بەختەوەری وام نەچەشتبوو!!..

ئێستا وام لێ هاتووە کاتێ دەچم بۆ نووسینگە کەم بە (بەیانیت باش)سڵاو دەکەم لەو کرێکارەی کەبەسەر سەرخەرەکەوە یە (مصعد).. زەردەیەکیشی بۆ دەکەم!.. هەروەها ئەو کەسەی کە من پسوڵەی سواربوونی شەمەندەفەرەکەی لادەبڕم لەپەنجەرەکەوە زەردەخەنەیەکی بۆ دەکەم..

وەکاتێ لەو جێگایەی کە چاوەڕوانی شەمەندەفەر دەکەم دەوەستم..

سڵاو لەو کەسانەی چواردەورم دەکەم کە هەرگیز نەمدیوون!.

هەر ئەوەندەم زانی سەیر دەکەم ئەو خەڵکەی دەوورم هەر هەموو ڕوو خۆش و دەم بە خەندەن بەرامبەرم!.. لەمەش سەرسوڕهێنەر تر ئەوەیە.. کە ڕووی خۆش و زەردەخەنەم بوو بەهۆی ئەوەی کە هەموو ڕۆژێك پارەی زیاترم دەست بکەوێت!.. هەر لەو نوسینگەیەمدا هاوڕێیەکم هەیە کە هەمان کاری من دەکات کە (ناوەند کارییە).. نوسەرەکەی کوڕێکی گەنجە.. کە هەموو کات ڕووی خۆش و کراوەیە.. کاتێ ئەم گۆڕانکارییەی لەمندا بەدی کرد هانی دام و بەرەو ڕووی خۆم پێی ووتم: یەکەم جار کە چاووم پێت کەوت و گومانم برد کە پیاوێکی ووشك و مۆنی و بۆئەوە ناشێیت کە تێکەڵاویت بکرێت!..بەڵام وا دیارە بەو جۆرە نەبوی کە گومانم پێ بردی!..

هەڵس و کەوتی خۆم پاك کردەوە لەگەڵ هەموو خەڵکیدا لە لۆمەکاری و ڕەخنە گرتن.. وەمن ئێستا ووشەی ڕێزو پیاهەڵدان دەبەخشم بەهەر کەسێ کە پێی دەگەم.. هەروەك چۆن خۆمم گرتەوە لەباسی خەڵك کردن و قسە کردن لەگەڵیان بەو جۆرەی کە خۆم دەمەوێ و حەز دەکەم..

خۆم والێ کرد کە بزانم بەرامبەرەکەم حەزی لە چییە و چی پێ خۆشە لەوێ وە بۆی بچم!.. ئەم گۆڕانکاریە یەك شۆڕشی پیرۆزی لەهەموو ژیانمدا بەرپاکرد.. وەمن ئێستا کە سێکی بەختیار و دڵخۆشم و خاوەنی کۆمەڵە هاوڕێ یەکی زۆرم..

ئەوەت لەیاد بێت کە ئەم قسانە لەیەکێکەوە دەرچوو کە لە هەڵکەوتووانی بازاڕی وەرەقە پارەی دراویەکانە(سوق الأوراق المالیة)وە بەیەکێ لەسەر کەوتوان دەژمێرێت.. کە ئەو کاسبییە زۆر زۆر سەخت و ناڕەحەتە و (گاڵتە نییە)چونکە ئەو ٩٠٪ی خەڵکی خۆیان لێ داوە بەڵام بە تێك شکاوی و زیانەوە لێی دەرچوون..!

ئەی ئەگەر زەردەخەندەت بۆ نەهات چی دەکەیت؟؟..

یەکەم جار زۆر بکە لە خۆت کەزەردەخەندە بە خۆت دەربهێنیت ئەگەر دەورو بەرت چۆڵ بوو وەهەر خۆت بوی دەست بکە بەفێڵ و ڕێ خۆشی و لەسەر لێوو مینکەمینگی گۆرانی و سرود دەربڕە.. دووەم جار وا خۆت پیشانی خەڵکی بدە کە مرۆڤێکی بەختەوەری، هەر ئەوەندەت زانی پاش کەمێ هەست بەکامەرانی و بەختەوەری ڕاستەقینە دەکەیت.. لەم بارەیەوە زانای دەروونناسی (ولیم جیمس)دەڵێت: ئێمە وا دەزانین کە هەڵسو کەوت دوای هەست پێ کردن دێت.. وانییە.. بەڵکو هەڵس و کەوت و هەست پێ کردن شان بەشانی یەکتر دەڕۆن، یان هەردوکیان دووڕوون بۆ یەك شت، ئەگەر هات و دەستمان بەسەر ژێردا بڕوات، کە ئەویش گوێ لە مشتی ویستەکانی، ئەو کاتە دەتوانین بەڕێگایەکی ناڕاستەو خۆ دەست بگرین بەسەر هەستدا.. کەواتە تاکە ڕێگایەك کە بمان گەیەنێت بە خۆشی و ڕووگەشی.. ئەوەیە کە ڕووی خۆمان وا خۆش و خەندە لێو بکەین وەك چۆن بەڕاستی ڕووخۆش و خەندە لێو بین.

هـەموو ئادەمیزادێـك لەژیانیـدا بـۆ کامـەرانی دەڕوانێـت وە تاکـە ڕێگایـەکی سەرکەوتووکە بت گەیەنێت بەم مەبەستە: ئەویش ئەوەیەکە دەست بگریت بەسەر بـیرو ڕات دا.. چـونکە کامـەرانی هـیچ کـات پەیوەنـدی نییـە بـە هۆکـارە دەرەکییەکانەوە، بەڵکو زۆربەی پەیوەندی هەیە بەناوەکی و دەروونەوە

بەختـەوەری و کامـەرانی بەسـەروەت و سـامان نییـە.. بـەڵکو بـەختیاری تـەواو لەوەدایە کە ئایا تۆ چۆن سەیری ئەو کارە دەکەیت و ڕات چۆنە بەرامبەری..

زۆر جار دەبینیت دوو کەس یەك کار دەکەن و یەك موچە وەردەگرن و یـەك پلـەو پایەیان هەیەکەچی لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکیان وەڕسـە و بێ تاقەتـە.. کەچـی ئـەوەی تریان زۆر دڵ خۆش و بەختیارە.. ئەمە هۆی چییە؟؟

چونکە هەریەکەیان جۆرە بیروڕاو خـەیاڵێکی جیاوازی هەیە لـەوی تریـان.. من خـۆم بـە بەختـەوەر و شـادمانی و کامـەرانی بـەدی کـردووە لـە نێـو چـەوانی ئـەو کرێکارە (چین)یانەی کە بەو پەڕی ماندوویەتییەوە کاریان دەکرد لەبەر تین و گڕی هەتاوی چین . بەچەند قروشێکی ڕۆژانە کە وەریـان دەگـرت هـەروەك چۆن لـەڕێگای (پـارك) لـە نیۆیـۆرك کەسـانی بـەختیار دەبیـنم.. شکسپیر دەڵێـت: دڕۆیـە جـوانی و ناشـرینی نییـە.. بـەڵکو بـیرو هـۆش دیمـەنی یـەکێکیانت لـە شـتێکدا بـۆ دەنەخـشێنێت.. (ئـەبراهام لنکـۆڵن) ووتوویـەتی: خـەڵکی بەختـەوەر و شـادبن بەئەندازەیـەك کـە ببنـە بەختـەوەر و شـاد و لەنیازیانـدا هەیـە پێـی بگـەن.. ڕاسـتە.. وایە.. من بە نموونەیەکی زیندوو ئەم ڕاستییەم بەچاو بینیوە.

ڕۆژێك بەسـەر ئـەو قادرمانـەدا سـەردەکەوتم کە دەڕوات بۆ (وێـسگە)ی (محطـة) (لۆبنج ئیلاند) لە نیویۆرك.. بینیم وا لەبەردەممەوە (٤٠)منداڵی کەم ئەندام (معوق) کـە دارشـەقیان بەدەسـتەوەیە تێپـەڕبوون و دەبیـنم بـە پلیکانەکانـدا سـەردەکەون.. ئەمـەم بینـی سـەرم سوڕما و تێك چووم بۆیـە هـەر کە سەرپەرشتیاری کارەکـەیانم بینـی پـێم ووت.. ئـەویش پێـی ووتم منـداڵی پەککەوتـە ئەگـەر هـەر لەسـەرەتای ژیانییـەوە پێـی بڵێیـت تـۆ تـا مـردن ناتوانیـت بڕۆیـت بـەڕێوە لـەوە دەچـێت بـدا لەمێشکی و شێت ببێت.. بەڵام هەر لەسەرەتاوە هـەوڵ بدات کـە سـەرکەوێت بەسـەر

ئەوتێك چوونە، ئەوا یەكسەر ڕازی دەبێت بەوبەشەی و لەمنداڵە ساغەكان زیاتر بەختەوەر دەبێت لەوكاتەدا هەستم كرد بەوەی كە پێویستە شەبقەكەم دابگرم و بینێم بەسنگەوە وەك ڕێزێك بۆ ئەو منداڵانەی كە وانەیەكی وایان دادام كە هەرگیز لە یادم نەچێت..

(فرانكلین بتجر) یەكێكە لەپیاوانی مسۆگەر كردنی ژیان و لەسەركەوتوانە هەر لەكۆنەوە بۆی دەركەوتووە كەپیاوی ڕووخۆش و دەم بەپێكەنین و خەندە لێو لەهەموو جێگایەك پێشوازی لێدەكرێت و فەرموو فەرمووی لێ دەكرێت.. لەو كاتەوە بەدواوە خۆی ڕاهێنابوو كە هەركاتێك بیەوێت بچێتە ژوورەوە بۆلای یەكێك لە فەرمانبەرەكانی لەبەردەرگا ساتێك دەوەستاو بیری دەكردەوە لەو بەخششە گەورەیەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوە ئەویش ڕووخۆشییەكە بەختیاری پێ دەست دەخات هەڵدەستا بەخۆش كردنی ڕووی خۆیی و بزەی دەخستە سەر لێویی و پاشان دەچووە ژوورەوە. (فرانكلین) هەموو سەركەوتنی خۆی لەفرۆشتنی پسوڵەی عەقدی مسۆگەری ژیان (عقد تأمین الحیاه) هۆیەكەی دەگەڕاندەوە بۆ ئەو پیلانە زۆر ئاسانەی خۆی كە زەردەخەندەو ڕووخۆشییە..

جوان ورد بەرەوە لەو ئامۆژگاریەی كە (هوبرت هبارت) كردویەتی!.. بەڵام ئەوەش بزانە كە خوێندنەوەی ڕووت بەتەنیا هیچ نابەخشێت.. ئەگەر جێبەجێی نەكەیت..

ئەگەر لەماڵ چوویتە دەرەوە.. سەر هەڵبڕە.. سیەكانت پڕ بكە لەهەوا بەكراوەییو ڕووگەشی سڵاو لەهاوڕێكانت بكە.. گیان بكە بەبەری تەوقەكانت دا.. هەرگیز نەترسی كە بەهەڵە لێت تێ بگەن..هەرگیز كات بەوە مەكوژە كە بیر بكەیتەوە لەو كەسانەی كەناكۆكیو ناحەزی لەنێوانتاندا هەیە.. بەڵكو هەوڵی ئەوە بدە ئامانج و مەبەستەكانت لا ڕوون بێت.. پاشان یەكسەر لێی بڕۆرە پێشەوە.. جا دوای تێپەڕبوونی ڕۆژانێك بۆت دەردەكەوێ كە هیچ هەلت لەدەست نەداوە سودت لەهەموویان وەرگرتووە.. بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانی هەموو ئاواتەكانت دێتە دی.. لەخەیاڵی خۆتدا وێنەی ئەو كەسە سەركەوتووە بكێشەو لەبەرچاوت بێت.

کەدەتـەوێت وەك ئـەو وابیـت.. ئـەم خـەیالْ و وێنەیـە بـەرە بـەرە ئـەتبات بـەرەو ئەوکەسـەی تـۆ دەتـەوێت وەك ئـەو وابیـت.. پاشـان تـۆ وات ل‌ێـدێت چـونکە بـیر کردنـەوە بەرزترین خاسیەتی ئادەمیزادە. بیر بکەرەوە بیرکردنەوەیـەکی ڕاست و دروست بنیات نەرو داهێنـەر بێت.. دڵنیابە هەموو هیوایەکی پیاوان لەسەرتاوە لەحەزو ئارەزووەوە دەستی پێکردووە!.. ئەوکاتە پاشان هەردەگەینە ئەو نمونەو چاولێکراوە بەرزەی (مثل اعلی) کە دڵمان حەز دەکات پێی بگەین و ئێمەش وامان ل‌ێبێت..

چینییە کۆنەکان وتەیـەکی زۆر خۆشیان هەیـە.. کەشایەنە بەخـەتێکی جـوان بنوسرێتەوەو بەسنگمانەوە هەڵی بواسین بۆ ئەوەی هەرگیز لەیادمان نەچێت:

(ئەو پیـاوەی کـە نـازانێ ڕوخـۆش و خەنـدە لێو بێت هـەرگیز نابێت دوکانـدارو بازرگان بێت) هەر بەم بۆنەیەوە (فرانك ئیرفنج فلتشر) پاگەندەیـەکی بڵاوکـردەوە بـۆ بەرهەمـەکانی کۆمپانیـای (ئویپنهـامو کـۆڵنزۆ و هاوکـارانی) لەیـەکێ لەجەژنـەکانی لـەدایك بوونـدا. پارچـە فەلـسەفەیەکی میللـی دەربـارەی (زەردەخەنـە) خوێنـدەوە کـەکارێکی گـەورەی هـەبوو لەسـەر ئـەو خەڵکـە ئەمـەش دەقەکەیـەتی: (زەردەخەنـە لەڕۆژی لـەدایك بووندا) (زەردەخەندە) هیـچی تێناچێت.. بـەلاّم خـیرو بێرێکـی زۆر دەداتەوە.. زەردەخەندە ئەو کەسانە ڕازی دەکات کە وەری دەگرن.. ئـەو کەسانەش هەژار ناکات کە دەیبەخشن.. ماوەی چاوتروکانێکی ناوێت .. بەلاّم یادگاریەکەی تا دوا تەمەن دەمێنێتەوە.. کەس نیە پێویستی پێی نەبێت..

کەسیش نـەدارو هـەژار نییە مادەم زەردەخەنـە لەسـەر لێوی بێت.. بەختـەوەری دەڕژێنێت بەناو ماڵدا.. چاکە باس کـردن.. مـۆری ڕەزامەندییە و دەنرێت بەبەڵێنی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیدا و پتەوتری دەکات..

بەڕاسـتی حەوانەوەیـە بـۆ مانـدوو.. تیـشکی هیوایـە بـۆ هیوابڕاوان.. جـوانترین دڵنەواییە بۆ خەفەتباران چاکترین چارەسەری سروشتیە بۆ گیرو گرفتەکان.. لەگەڵ ئەوەشـدا خۆڕاییـە پـارەی پێنادرێـت.. هـاوار کـردن و پـەلاماردانی ناوێـت.. قەرزکردنی ناوێت.. ئەوەندە بەروبومی پیرۆز دەدات خەریکە بەحەوادا دەچێت).

ئەگەر پیاوانی فەرمانبەری کۆمپانیاکەمان هاتنەلات و ویستیان پێویستیانی جەژنی لە دایك بوونت پێ بفرۆشن.. بەلاّم بەشێوەیەکی ڕووگرژ و مۆن و بێتاقەت هاتنە بەرچاوت وە خەندە لێو نەبوون.. دەی تۆ وەك برایەکی بەخشندە زەردەخەنت ببەخشە پێیان..

سوێند بەخوا (ئەوکەسەی کە تۆزقاڵێك زەردەخەنە لەسەر لێوی نییەو پێ ناکەنێت ئەوە زیاتر پێویستی بە زەردەخەنەو ڕووخۆشی هەیە لەگەڵیدا.. ئەگەر دەتەوێت خەڵکی خۆشی بوێت ئەوا بڕگەی ژمارە (دوو) جێبەجێبکە:

( دەم بە پێکەنین و ڕوو خۆش بە )

## بەشی دووەم

## پاشكۆی دووەم/ پێكەنین و ڕووی خۆشت بەدەم براكەتەوە خێر و چاكەیە بۆت

هەر هۆیەكی پاك كە ئادەمیزادەكان بگەیەنێتە قەراغی دەریای خۆشەویستیو لەیەك نزیك بوونەوەی دڵەكان –ئیسلام– گرنگی پێداوە و بانگی شوێن كەوتوانی بۆ كردووەو هۆیەكی تر كە بمان گەیەنێتە ئەو مەبەستە ئەوەیە كە پێبكەنین و زەردەخەنەو ڕووخۆشی لەلێوەكانمان نەبڕین..

لەم بارەیەوە (پێغەمبەر)مان (ﷺ) فەرموویەتی: (إبتسامتك في وجه أخيك صدقة) واتە: دەم بە پێكەنین و ڕووخۆشیت لەڕووی برا موسڵمانەكەتدا بەخێر بۆت دەنوسرێت و پاداشتت دەدرێتەوە لەسەری لای پەروەردگار..

ئەو سەركەوتنە مەزنەی كە (پێغەمبەر)مان بەدەستی هێنا لە ڕاكێشان و كەمەندكێش كردنی دڵەكان و زۆركردنی دۆست و هاوڕێ بۆ هەڵگرتنی ڕێبازەكەی هۆی چی بوو؟.

گەر ڕووی خۆش و كراوەییو نەرم و نیانی بە سۆزی ئەو نەبووایە هەرگیزاو هەرگیز خەڵكی ئاوەها لێی كۆنەدەبوونەوە و بەڵكو بڵاوەیان لێ دەكرد: وەك خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت: ( ولو كنت فظا غليظ القلب لانفضوا من حولك)(ال عمران ١٥٩ ).. هاوەڵان خوایان لێ ڕازیبێت دەگێڕنەوە كە (پێغەمبەر)ی خوا هەمیشە دەم بەخەندەو پێكەنیناوی بووە، (كان رسول اللهِ ضَحاكاً بساماً)..! وەهەركاتێك زەبرو زەنگ و سزای نەفامان ناڕەحەتی بكردنایە بەپەلە دەهاتنە خزمەت (پێغەمبەر) چونكە بەبینینی ڕووی گەش و كراوەی ئاسوودەییەكەیان بۆ دەهاتەوە.. لە جێگایەكی تردا دیسان (پێغەمبەر)مان (ﷺ) ئاگاداری موسڵمانان دەكاتەوە كە هەرگیز ئەم هەلە زێڕینە لەدەست نەدەن (زەردەخەنەو ڕووخۆشی) بەكەمی نەزان و فەرامۆشی نەكەن و وازی لێ نەهێنن ئەویش (لا تحقرن من المعروف شيئا ولو ان تلقى أخاك بوجه طليق)(رواه مسلم ٤٧٦٠) واتە: چاكەو خێر كردن

بەکەم نەزانن ئیتر با ڕوو خۆشییەکیش بێت لەڕووی براکەتدا بنوێنیت.. چونکە تەنانەت ڕووەکەکانیش وەك زانست دەڵێت ئەگەر لەدەوروبەرێکی هێمنی پڕ ئاوازی وەك دارو دەرخت ئاوا ڕووی خۆش کاری تێدەکات کە نەهەستی تێدایە نەهۆش، چ جای کە ئادەمیزاد کە خاوەنی هەست و هۆش و ژیرییە..؟!

هەرهۆی ڕووخۆشی و کراوەیی (پێغەمبەر) و هاوەڵەکانی بووە هۆی نزیك بوونەوەی خەڵك لە ئیسلام و لەهەموو دڵێکیانەوەو بەخۆشی خۆیانەوە هاتنە ژێر ئالای ئیسلام و شوێن (پێغەمبەر) کەوتن..

چونکە قازانج و سوودی لەهەموو شتێکی مادی زیاترە! وەکاری ئەو هەست و دڵ دەبزوێنێ و بۆی دەکرێنەوە وەك (پێغەمبەر) (ﷺ) دەفەرموێت: (إنكم لن تسعوّ الناس باموالكم ولكن يسعهم منكم بسط الوجه وحسن الخلقِ).. واتە ئێوە ناگەنە خەڵکی کاریان تێناکەن بەهۆی مادەو پارە هەڵڕشتنەوە لە بەردەستیان دا بەڵکو بەهۆی ڕووی خۆش و کراوەو ڕەوشتی جوانتان..

بەڕاستی وایە.. چونکە ئەوکەسەی خەڵکی بەهۆی پارەو ڕاگیر دەکات پارە دەیان خاتە سەر ڕێگەی ئیسلام هەر کە وشکایی پارە کە هات ئەمانیش بلاوەی لێ دەکەن.. وە هەر ناشی ناسنەوە!..

وە ئەگەر بەهۆی زۆرو چاو سورکردنەوە وەخەڵکی بکاتە خۆیی و بیان خاتە سەر ڕێبازەکە!. ئەوا هەرکاتێك ئەو زۆرو شەقەی نەما هەرهەموی ئاش بەتاڵی لێ دەکات و چواردەوری چۆڵ دەکەن..وەك دیومانە کەسانێکی زۆر شوێن گروهێکی تایبەت کەوتن بۆ پارەو ژیانی خۆش!!..یان لەترسی گورزو کوتەکەکەی کە بۆی هەڵبریون!!..

بەڵام کاتێ ئەو کەسانە دەسەڵاتیان نەما یان پارەو پولیان لەدەستا نەما!.. هەر هەموو شوێن کەوتوانیان وازیان لێ هێنان و نەفرەتیان بەدوایدا نارد!!.. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو مەوجەکەشیان بادایەوە بەلای ڕێبازێکی تردا و بۆلای کەسانێکی تر!!..

بەڵام ئەگەر من و تۆی موسڵمان دڵ و دەروونی خەڵکی ڕابکێشین و خۆشەویستی خۆمان و ڕێبازمان بەرینە دڵیانەوەو خۆیان بەخۆشی و حەزی خۆیانەوە بێنە سەر بەرنامەو بیرو باوەڕەکەمان!.. ئەوکاتە هەرگیزاو هەرگیز لەدڵیان دەرناچین و لەیادیان ناچین!..بۆیە دەبینین ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەپارەو پول وماڵی ڕشت بەسەر خەڵکیداو.. نە زەبرو زەنگێك بەكار هێناو بە زۆری هەوڵیدا تا خەڵکی ئیسلام بن!.. بەڵام چونکە ڕۆشتە ناو دڵ و دەروونی خەڵکی ئەوکاتە خۆیان لەناو دڵیاندا چەکەرەیان پێ کردوو گۆشیانکرد!..لەبەر ئەم هۆیەیە کە لەمێژووی دوورو درێژی ئیسلامدا.. کەس نەیدیوە کە گەلێك یان نەتەوەیەك بەگشتی وازیان لە ئیسلام هێنابێت.. بەتایبەت پاش ئەوەی کە ئیسلام سوڵتەو دەسەڵات و دەوڵەتی نەما و پارەو سامانیشی لەژێر دەستدا نەما.. کەچی خەڵکی زیاتر بە پەرۆشەوە بۆ ئیسلام و بەرەو ڕووی دەچن!!..شتێکی سادەو ئاسایی نییە.. کاتێ خوای پەروەردگار لۆمەو سەرزەنشتی (پێغەمبەر)ە خۆشەویستەکەی دەکات!.. کە ڕووی خۆی گرژو مۆن کردو پشتی هەڵکرد لەوپیاوەی کە هاتبوو کەمێ لە ئیسلامی شارەزا بکات..وەك لەقورئاندا دەفەرموێت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ۝٣ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ۝٤﴾ ( عبس ١-٤) باشە تۆ بڵێی ئەمە بۆچی؟.. لەوە دەچێت هەندێ بڵێت: باشە ڕووگرژکردنێ کەی ئەوە دێنێ کە (محمد) سەرزەنشت و لۆمە بکرێت بە جۆرێك کەلە قورئاندا تا دنیایە خەڵکی بیخوێنێ و ئاگادار بێ لێی!؟..بەڵام نەخێر ئەمە بۆچوونی مرۆڤی سادەو ڕواڵەت بینەکانە.. چونکە بەرنامەو پرۆگرامی خوای مەزن پەرەکانی دڵ هەڵدەداتەوەو بەئەسپایی و هێمنی دەچێتە ژوورەوە و جێگیر دەبێت! کلیلی هەڵدانەوەی دڵیش ڕووی گەش و کراوە و دەم بە پێکەنین و خەندەی سەر لێوەکانە..

ڕۆژی ڕەش و نەگبەتی ئەوکاتە هات کە کەسێکی زاناو ناودارو پلەو پایە بەرزو لەلایەنێکی ئیسلامیدا و خاوەن کەسایەتییەکی بەرزە.. کەچی داخەکەم لەگەڵ ئەوەشدا مۆن و ڕووگرژ و ووشك و داخراون.. بەتیشکی پێکەنین و خەندە و ڕووخۆشی دڵ و ڕوویان گەش ناکاتەوە تا دڵەکان لێیان نزیك بێتەوە..ئەم جۆرە

کەسانە نەلەژیانیاندا سەرکەوتوو دەبن و نەخزمەت بە ئیسلامیش دەگەیەنن!.. ئیتر با لەزانست و زانیاریدا لوتکەبن! و لەڕەوشت بەرزیشدا بێهاوتابن! و لەزانستی (دعوە)دا چڵە پۆپە بن چ دەبەخشێت!؟.. نەك هەر سەرکەوتوو نابن و خۆشەویست نابن و خەڵکی ڕاناکێشن بۆلای ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام! بەڵکو زۆر لەمەش خراپتر ئەوەیە کە ئەوانە دەبنە هۆی لەبەر چاوکەوتنی ئیسلام و ناشرین کردنی! چونکە خەڵکی لەڕووی مۆنی و ووشکی ئەوەوە سەیری ئیسلام دەکەن..

وە لەهەمووی خراپتر ئەوەیە کە ئەو جۆرە کەسانە.. ئەگەر موسڵمانی ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین ببینن..خێرا ڕەخنە و لۆمەو سەرزەنشتیان دەکەن و بە فاسقیش هەندێ جار دەریان دەکەن..!! کەواتە جێگای خۆیەتی کە قورئانی پیرۆز ڕەخنە و لۆمەی (پێغەمبەر)ی بکات ، وەك چۆن (پێغەمبەر) گەڕایەوەو پەشیمان بویەوە تا دەرسێکیش بێت بۆ مۆن و ڕووگرژەکانی ئیسلام کە با ئیتر واز بێنین و هەروەك (پێغەمبەر) هەرجارێ بگەیشتایە بە ئەو پیاوەی کە ئەم ڕووی لێگرژ کردبوو هەڵدەساو پێی دەفەرموو: مەرحەبا لەکەسێ کە خوا لەبەر ئەو ڕەخنەی لێگرتم..!!

خوێنەری خۆشەویست هەرگیز نەڵێی من چی بکەم خوا وای دروست کردووم و ڕووم خۆش نییە. یان مەڵێ: فلان کەس بەدەست خۆی نییە بەوەرەسە هەموویان وان لەماڵەوە!!.. وانییە! هەمووکەسێ توانای هەیە دەم و چاوی خۆی هەرچۆنی بوێت بیگۆڕێت.. ئادەی مژدەیەکی خۆش یان هەواڵێکی خۆش بدرێت بە مۆنترین کەس بزانە چۆن نەك هەر ڕووی بەڵکو موەکانیشی پێناکەنیَ؟!.. خۆزگە خوێنەران کەس نەیدەووت: ئەم قسانە بێ کەم و زیاد بەسەر فلان! کەسدا جێبەجێ دەبێت و ئەڵێی بەو دەوترێت!.. نا بەڵکو بۆ لەگەڵ منیەتی و دەبێ وانەمێنم!!.. ڕووی خۆش و دەم بەپێکەنین کاری ئەفسوناوی و سەرسوڕهێنەری وا دەکات لەسەر دڵ و دەروون و خاوەنەکەی ڕاستەوخۆ دەیگەیەنێتە ناو دڵ و تێیدا جێگیر دەکات! سەیرکە.. وورد بەرەوە.. لەو منداڵە ساوایەی کەڕووی گەشەو دەم بە پێکەنینە و خۆ بۆلای هەرکەسێ بانگی دەکات و دەیلاوێنێتەوە ئەمیش دەشنێتەوە و گڕو گاڵی بۆ دەکات!!..

دەبینی کەچۆن خۆشیاندەوێت و حەز دەکەن بیگرنە باوەش و هەرگیز لێی بێزار نابن و گشت کات هەواڵی دەپرسن!.. بەپێچەوانەشەوە! ئەو منداڵەی کە گرینۆك و گرژ و مۆن دەبێت کەس هەرنزیکی نابێتەوەو ناشی لاوێنێتەوە و لێی ناپرسنەوە!.. ئەمە منداڵێکە و ئاوایە! بەم کارەی دڵەکان کەمەندکێش دەکات!.. خۆنەپارەو پولی تیاسەرف کردووەو نەدەسەلات و زۆریشی هەیە!.. کەچی لەهەزاران دەوڵەمەند و دەسەلات داری مۆن و ڕوو گرژ خۆشەویست ترە!!..

قوتابی لەپۆلدا لێی بپرسە: کام مامۆستات خۆش دەوێت؟ لەوەڵامدا زۆربەیان دەڵێن فلان مامۆستا!.. کەکاتێ ورد دەبمەوە بۆم دەردەکەوێت کە ئەو مامۆستایە لەمامۆستاکانی تر زیرەك تر نیە و بەسوودتر نیە بۆ قوتابییەکان.. کاتێ کە لەگەڵی دادەنیشم سەیر دەکەم ڕوی خۆش و دەم بەپێکەنین و قسەخۆش و کراوەیە!.. خێرا دەڵێم بەئەم ڕووەکراوە و گەشەوە توانیویەتی جێی خۆی بکاتەوە لەسەر عەرشی دڵی..

لەزانکۆ دەمان خوێند.. هەندێ مامۆستامان هەبوو زۆر زیرەك و بلیمەت بوون! وەخاوەنی بڕوانامەی دوکتۆرا بوون و دانەری کتێب و نامیلکەی زۆر بوون.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا قوتابی حەزی لەدەرسیان نەبوو.. ئاواتیان ئەوەبوو زوو تەواوبێت و چاویان لە چاوی نەبێت!.. ئەمە بۆچی؟.. چونکە دەم و چاوی گرژ و مۆن و داخراو وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾(الانسان ١٠) بوو.. خوا نەکا پێکەنین و زەردەخەنە بیوێرایە نزیکی دەم و چاوی ببوایەتەوە!!.. لەهەمان کاتدا مامۆستای وامان هەبوو کەشارەزاییەکی ئەو تۆیان نەبوو! دوکتۆرا و ماجستێریشی نەبوو!.. هەڵکەوتوی دەرچووانی زانکۆکەی بوو بەس! کەچی بەڕووی خۆش و زەردەخەنەیان دڵی قوتابییەکانیان کردبووە خۆیان و کەس لێیان بێتاقەت نەبوو!..داخی بەجەرگم!.. هەندێ کەس لەناو موسڵماناندا بەتایبەت هەندێکیان بۆ نەگبەتی خاوەنی بڕوانامەو زانیاری بەرزن و بانگ خوازی ناودارن و بەپەنجە ئاماژەیان بۆ دەکرێت!..

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر چی کەمێ پێکەنین و خەندە لێوبن و ڕوگەش و کراوەبن وائەزانن لەنرخ و ڕێزو کەسایەتیان کەم دەبێتەوە!!.. بەڵام با ئەوانە بزانن کەتا سەدان ساڵی کە کەسایەتی و نرخ و ڕێز کۆبکەنەوە.. هەرگیز ناگەنە (پێغەمبەر)ەکەیان لەگەڵ ئەوەشدا با بزانن (پێغەمبەر) چۆن بووە؟.. هاوەڵان کەباسی دەکەن دەفەرموون: (کان ضحّاکا بساماً) واتە هەمیشە و بەزۆری دەم بەپێکەنین و زەردەخەنە بووە)!.. (ضحّاك و بسّام) لەسەر زمانی (فعال)ە کەلەزمانی عەرەبیدا بۆ مبالغە و زیادەیە.. واتە: زۆر زۆر ڕوخۆش و کراوەبوو!..چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خوشکە زەینەب غەزالید لەیەکێ لەگۆڤارەکاندا سازکرابوو.. لەوێنەکەیدا پێدەکەنیٚ!.. هاوریێیەکم ووتی ئائەمەیە زەینەب غەزالی بانگ خواز کەچی وادەمی کردۆتەوەو پیٚ دەکەنیٚ؟!.. منیش پێم ووت: براگیان خۆ (إنشاء الله) ناتەوێت بە گرژی و مۆنی یان بەدەم گریانەوە ڕەسم بگرێت!!.. بۆیە ئەگەر دەتەوێت کاربکەیتە سەر دڵ و دەروونەکان و بەرەو ئیسلام بیان هێنی و وەك خۆت بیر بکەنەوە.. ئەوە زاراوەی ووشکی و مۆنی و گرژی و ڕەزا قورسی لەخۆت دووربخەرەوەو لەباتیدا زاراوەی دەم بەپێکەنین و زەردەخەنە و کراوەیی و ڕووخۆشی لەخۆت نزیك بکەرەوە و خۆتی پیٚ برازێنەرەوە.

## بەشی دووەم

## سێیەم/ ئەگەر ئەمە ناکەیت چاوەڕوانی چەندان ناڕەحەتی بکە!

لەدێی (ستونی بیونت) کە دێیەکی بچکۆلەیە لەنزیك نیویۆرك. منداڵی یەکێ لە دانیشتوانی ئەو شوێنە مرد! دراوسێ و ناسیاوان هەستان بە ئەسپاردەکردنی تەرمەکەی..

(جیم فارلی) کە پیاوێکی خەڵکی دێیەکە بوو.. چووە گەوڕەکە و ئەسپەکەی زین کردو سواربوو تا بەشداری ناشتنی منداڵەکە بکات.. لەو ڕۆژەدا زەوی بەستبووی و دنیا زۆر سارد بوو باو بارانێکی بێ ئەندازە دێ یەکەی داگرتبوو.. لەوکاتە کە خەڵکەکە بەناو جادە پڕ لەئاوو زۆنگاوەکەدا بەرەو سەرقەبران دەڕۆیشتن..

لەناکاو جیم کەبەئەسپەکەی ڕێگای کرد لەگەڵیان ئەسپەکەی بازێکیدا قاچی هەڵبڕیو جیم کەوتە خوارەوەو یەك جووتەی کێشا پێیدا، کە جیم هەناسەی نەدا و یەکسەر مرد..

دانیشتوانی ئەو لادێ بچکۆلەیە لەیەك کاتدا لەباتی تەرمێ دوو تەرمیان ئەسپەردە کرد!..

(جیم) کە کوڕێکی (جیم فارلی) بوو لەوکاتەدا تەمەنی دەساڵان بوو.. ناچار بەدوای کارێکدا دەگەڕا.. تائەوەبوو لەکارگەیەکی خشت بڕین دا دامەزرا.. کەخۆڵو لمی دەهێناو دەیکردە قاڵب و لەبەر خۆر دای دەنا تا ووشك دەبوویەوە..

ئەم منداڵە خوێندەوارییەکی وای نەبوو.. بەڵام هەر بەسروشتی خوایی چاك دەیزانی کە خۆی بەرێتە دڵی خەڵکی!.. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك توانی خۆی بە جۆرێ لێ بکات کەبە باشی ناوی خەڵکی هەڵگرێت و لەبیری نەچێتەوە.. بۆیە هەر تەمەنی گەشتە چل ساڵی ئەم توانایەی وای لێکرد کە چوار زانکۆی ئەمەریکی پلەی دکتۆرای شانازی پێ بدەن..

تەنانەت لەم دواییەدا بوو بەسەرۆکی (لیژنەی دیموکراسی نەتەوەیی) وەپاشان بووبە (بەڕێوەبەری پۆستە لەوڵاتە یەکگرتوەکان)..

ڕۆژێ پێی گەیشتم و لێم پرسی.. کە ئایا هۆی ئەم سەرکەوتنە مەزنە بەهرەمەندەت چی بوو؟.

لەوەڵامدا وتی: هەوڵ و تێکۆشان.. منیش وتم: گاڵتە مەکە: ئەویش پرسی لێم: بۆتۆ دەتوانیت هەزار کەس بەناوی خۆیەوە بانگ بکەی..

وە من لەم گومانەمدا پێی بۆی چووم و پێکاومە.. وە هەر ئەو توانایەی (جیم)بوو کە یارمەتی (فرانکلین ڕۆزڤلت)بدات کە ببێت بەسەرۆکی وولاتە یەککگرتوەکان..

یان ئەی چۆن(جیم)توانی ئەم توانایە لەخۆیدا دروست بکات و بتوانێت ناوی خەڵکی لە بیر بێت؟ ئەمەش بە شتێکی ئاسان:

هەر کاتێ دەگەیشت بە هاوڕێ یەکی تازە.. ناوەکەی فێر دەبوو بەتەواوەتی.. ناوی خزمەنزیکەکانیشی.. چۆنیەتی کارەکەی.. ڕێ ڕەوی ڕامیاری.. ڕاو بۆ چوونە گشتییەکانی.

پاشان ئەم زانیاریانەی لە مێشیکدا هەڵدەگرت.. وەك چۆن وێنە کەیشی لەخەیاڵیدا دەپاراست..

کە بۆ جاری دووەم پێی بگەیشتایەتەوە ئەیتوانی بدات لەشانی و دەربارەی خۆی و خێزانەکەیی و منداڵەکانی بێگومان بەناوی خۆیانەوەو تەنانەت هەواڵی گوڵە جوانەکانی باخچەکەیماڵەوەی لێ بپرسێت..

کەواتە جێگای سەرسوڕمان نییە.. پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك لەم توانایەی پێش ئەوەی (فرانکلین)دەست بکات بە شاڵاوی هەڵبژاردنی بەمانگێك..(جیم فارلی)هەموو ڕۆژێك سەدان نامەی دەنارد بۆ هەموو ئەوانەی کە دەیناسین لەوولاتە یەککگرتووەکان..

پاشان شەمەندەفەرێکی تایبەتی تەرخان کرد بۆ ئەو مەبەستەو لەماوەی نۆ)ڕۆژدا هەموو کون و قوژبنێکی وولات گەڕا.. لەم گەشتە سەختە دور و درێژەدا(دوازدە)هەزار میل ڕێگای بڕی.

جیم کە دەگەیشتە هەر شارێك خێرا دەگەیشتە لای هاوڕێ و ناسراوەکانی و .. لەسەر سفرەی نان خواردن لەگەڵیان دا دەنیشت.. تاماوەیەك لەگەڵیان دەمایەوەو سڵاوو ڕێزێکی پاك و دڵسۆزانەی لێ دەکردن..

پاشان لەسەر گەشتەکەی بەردەوام دەبوو.. لەکاتی گەڕانەوەیدا لەگەشتەکەی لەهەریەکە لەوشارانەی کەسەری لێ داوون.. پیاوێکی هەڵدەبژاردو داوای لێ دەکرد کە لیستەیەکی بۆ ئامادە بکات و تیایدا ناوی هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووەو سەری لێ داون بنوسێت..

ئەم لیستانە ناوی هەزاران کەسی تێدابوو کە هەر هەموویان لەگەڵ (جیم فارلی)دانیشتبوون و قسەیان کردووە.

ئەم نامانەی کە (جیم)دەینوسێت بەم ووشانە دەستی پێ کرد: خۆشەویستم (بیل) کورتەی(ولیم)لە خۆشەویستیدا.. وەدەینوسی: (جۆی)خۆشەویستم کورتەی (جۆزیف). (جیم)هەر لەسەرتای ژیانیەوە بۆی دەرکەوتبوو کە خۆش ترین شت لای ئادەمیزاد ناوەکەیەتی..

کەی توانیت ناوی کەسێك لەیاد نەکەیت. لەجارێکی تردا کە بینیتەوە بادوای چەند ساڵێکیش بێت بەناوەکەی خۆی بانگی بکەیت.. باوەڕ بکە ئەوکاتە تۆ چاکەیەکی زۆر گەورەت لەگەڵ کردوە کە هەرگیز لەیاد ناچێت و هەردەم دەمێنێتەوە!..

بەڵام ئەگەر ناوەکەیت لەبیر چویەوە یان بەناتەواوی یان بەیەکێکی تر ناوت برد ئەوا تاوانێکت بەرامبەر کردووە وە لێخۆشبوونی نییە!..

نمونەیەك لەسەر ئەمە جارێکیان لەپاریس بەرنامەیەکم ڕێك خست لەوتاری هەمەڕەنگ دا.. بەوبۆنەیەوە چەند نامەیەکی زۆرم نارد بۆ هەموو ئەو ئەمەریکیانەی کەلە فەڕەنسا نیشتەجێ بوون وەبانگم دەکردن بۆ بەشداری لەم بەرنامەیەدا..

لەکاتی نوسینی ناوی ئەو بانگراوانەدا هەندێ هەڵە کەوتبووە ناوەکانیانەوە ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەوانەی بەسەر چاپەمەنییەکەوە بوون فەڕەنسی بوون.. بۆیە بەڕێوەبەری یەکێ لەبانقەگەورەکانی پاریس نامەیەکی بۆ ناردم و تیایدا سەرزەنشتی کردم وەبەگلەیی بوو لێم..

تەنها لەبەر ئەوەی کەلە پیتەکانی ناوەکەیدا هەڵەی تێکەوتبوو!..

بابزانین ئەو سەرکەوتنەی (ئاندرۆکارنیجی)هۆی چیبوو؟..

ئەم پیاوە نازناوی دەرکردبوو بە شای زەبرو زەنگ!.. بەڵام وەك خۆشی دانی پێدا ناوە کە لێزانی و کارامەیی ئەم لە پیشەسازییەدا(صلب)زۆر کەم تر بوو لە دەیان کرێکاری بەردەستی خۆی.

بەڵام هۆی سەرەکی ئەم سەرکەوتنەی دەگەڕایەوە بۆ کارزانی و کارامەیی لەهونەری هەڵس و کەوت کردندا لەگەڵ خەڵکی..

هەر لە منداڵیەوە حەزی لە یاساو سەرۆکایەتی کردن هەبووە.. کاتێ تەمەنی گەشتە (دە)ساڵان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە خەڵکی بەگشتیگرنگی یەکی زۆر دەدەن بەناوەکانیان..

جا ئەم ڕاستییەی کەتێی گشتووە کردوویەتی بەدار دەست و دڵی یاریدەدەرو کرێکارەکانی پێ کەمەندکێش کردووە.

نمونەی ئەمە کارنیجی کاتێ کە منداڵ بوو لەووڵاتەکەی خۆی (ئوسکتلندە) کەروێشکە کەژی یەکی(دە)بەچکەیی هەبوو.. نەیدەتوانی و نەیبوو بە خێویان بکات!.. ئەی چی بکات باشە؟..

ڕێی کەوت لەبیرێکی ژیرانە.. بە منداڵی دراوسێکانی ووت: وەرن قسەتان بۆ بکەم کەروێشکە بچکۆلانەکانم کەتازە لەدایك بوون.. بەناوی ئێوەوە ناویان دەنێم بەمەرجێ ئێوەش بڕۆن گیا و گژەیان بۆ بێنن هەموو ڕۆژێ .. ئەم کارەی کارنیجی وەك سیحر کاری خۆی کرد!.. ئەم پاڵێ لێ دایەوەو مناڵەکان باوەش لەدوای باوەش گیایان بۆ کەروێشکەکان دەهێنا!کە کارنیجی هەرگیز ئەمەی لە یاد ناچێت!..

بۆیە پاش چەند ساڵێك هەربەم پلانە بووبە ملیۆنەر!

(کارنیجی)جارێك ویستی بەرهەمی ئاسنەکەی بەکۆمپانیای هێڵی ئاسنی(پەنسلڤانیا)بفرۆشێت.. سەرۆکی ئەو کۆمپانیایە ناوی (ئید جار تومسۆن)بوو بۆیە (کارنیجی)یەکسەر لە (پستبرگ) کارگەیەکی گەورەی کردەوە

ناوی نا: (کارگەی ئیدجار تۆمسۆن بۆ ئیش و کاری ئاسن)کە تایبەت بوو بە دروست کردنی فارغۆنی شەمەندەفەر!!..

کاتیێ: کە (ئاندرۆ کارنیجی و جۆرج پۆڵمان)شان شا نێنیان دەکرد کەکامیان زۆر ترین لە هاوڕێکەی بتوانێت دەست بگرێت بەسەر دروست کردنی فارغۆنی خەوتن!..

لەم کاتەدا شای زەبرو زەنگ (ملك الصلب)چیرۆکی کەروێشکەکانی منداڵیێ هاتەوە یاد!.. هەردووکیان لە دژی یەکتر هەوڵیان بوو کەمتر بیکەن و هیوای یەکتر ببڕن لەدەست کەوتنی ئەو قازانجە زۆرە!..

بۆیە هەردووکیان (کارنیجی وپۆڵمان)بەرەو نیویۆرك بەڕێ کەوتن.. بۆ ئەوەی بگەنە لای سەرۆکی لیژنەی فەرمانبەری (یەکێتی باسفیك)..

واڕێکەوت کە هەردووکیان لە ئوتێلی (سانت ئیکۆلاس)دابەزین و ئەوشەوە لەوێ بوون کارینجی چو بۆ لای پولمان لە ژورەکەی خۆی ، کارنیجی پێی وت : ئەزانی من و تۆ گێلانە هەڵس و کەوت دەکەین لەگەڵ یەك..! پۆڵمان ایێی پرسی: یانی چی؟ مەبەستت چییە؟..بۆیە(کارنیجی)پێشنیاری کرد کە کۆمپانیای هەردووکیان یەك بگرن و.. بۆی باس کرد کە چەندێ قازانج دەگەڕێتەوە بۆ هەردوولا بەمەرجێ بەیەکەوەو بەکۆمەکی یەك کار بکەن.. نەك هەریەکەیان دژ بەئەوەی تریان کار بکات!..

لەم کاتەدا (پۆڵمان)بەوردی گوێی شل کردبوو بۆ ووتەکانی کارنیجی.. بەڵام بەتەواوەتی بەدڵی نەبوو.. لەدواییدا پرسیاری کرد لەکارنیجی کە ئەم کۆمپانیا هاوبەشەمان چ ناوێکی لیێ بنێین؟..

کارنیجی یەکسەر وەڵامی دایەوە: ئەی چۆن؟! بێگومان ناوی دەنێین: کۆمپانیای فارغۆنی پۆڵمانی گەورە!!..

(پۆڵمان)ڕووی وەك گوڵێ گەش بوویەوەو لە خۆشیدا ووتی: هاوڕێ گیان سبەینێ زوو وەرە بۆ نوسینگەکەم تا بەڕاستی لەم بارەیەوە بدوێین!!..

ئەو گفت و گۆیەی کە ئەوشەوە کەوتە نێوانیان ڕووداوێکی مێژوویی بوو لە جیهانی پیشەسازیدا!..

(کارینجی)شانازی بەوەوە دەکرد کە لە توانایدا هەیە کە هەموو کرێکارەکان لەگەڵ ئەو زۆربەیاندا بەناوی خۆیانەوە بانگ بکات.. وەتا ئەو کاتەی خۆی سەرۆکایەتی ئیشەکانی کۆمپانیای دەکرد دەریای ڕوونی کار لەنێو فڕنە زەبرو زەنگ و ناڕەحەتەکاندا نەبیستراوە یەك مانگرتن لێڵی کردبێت چونکە هەر هەموویانی ڕازی کردبوو!..

ئایا بەڵگە لەوە گەورە تر هەیە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی شانازی بەناوی خۆیانەوە دەکەن و خۆشیان دەوێ.. (بارنم)قەدەری خوا وابوو کوڕی نەبوو کە دوای خۆی ناوەکەی ئەم هەڵگرێت!..

بۆیە وەسیەتی کرد بۆ کچەزاکەی (سیلی)کە (بیست و پێنج)هەزار ڕیاڵت پێ دەدەم بەمەرجێ ناوی خۆی بنێت (بارنم سیلی)؟!!..

وە لە کۆن زەمانەوە دەوڵەمەند و پایەداران هەوڵیان داوە کە پارەیەکی زۆر بخەنە بەردەست نوسەرەکان تا ئەمانیش لە پێشەکی کتێبەکانیاندا.. پێشکەشی ئەمانی بکەن بەناوبردنیان!..

کتێبخانە و مۆزەخانەکانی هەموو وولاتێ لەوولاتەکانی جیهان.. کۆمەڵەیەکی زۆر لە شتی زۆر بەنرخ بەدی دەکرێت تیایاندا کەدەست و خامەی پیاوانێك بوون کەویستوویانە ناویان بمێنێت دوای خۆیان.. لە کتێبخانەی گشتی نیویۆرك هەردوو کۆمەڵەی (ئاستور و لینکۆکس)دەبینیت و لە مۆزەخانەی(مترۆ پۆلیتان) ناوی هەردو (بنجامین ئلتمان)و (ج.ب.مۆرگان)دەبینیت..

وە هیچ کڵێسەیەك وا دەزانم خاڵی نین لە ناوی کەسانێك لەدروست کردنیدا لە گۆشە جوان و نەخشاویەکاندا ئاماژەیان بۆ کراوە!..

ئەگەر لە زۆر کەس بپرسیت: باشە بۆچی خێرا ناوی خەڵکتان لەیاد دەچێەوە؟ هەزار بیانوو دێنێتەوە کەسەر قاڵین و ئیشمان زۆرە!..

بەڵام ئەوانە هیچ کات ئەوەندەی سەرۆکی ئەمەرکیا(فرانکلین ڕوزڤلت)سەر قاڵ و خەریك نین کە تەنانەت ناوی کارمەندە بچکۆلانەکانیشی دەزانی و کاتێ دەیبینین بەوناوە وە بانگی دەکردن!..

جارێك كۆمپانیای(كرایلزر)هەستا بەدرووست كردنی ئۆتۆمبیلێكی تایبەتی بۆ (فرانكلین)كە خۆی ایێی بخورێت. بۆیە پاش تەواو بوونی بەڕێوەبەری كۆمپانیاكە(چمپرلین)و دەیگێڕێتەوە ئەو ڕۆژە چی ڕووی دا:

پاش ئەوەی گەشتبێتە كۆشكی سپی من دەستم كرد بە فێر كردنی (فارنكلین ڕووزفلت)كە چۆن بەئاسانی لێیبخورێت. بەلاّم ئەویش شتی زۆری فێر كردم لەهونەری هەڵس و كەوت كردندا لەگەڵ خەڵكی..

هەر كە گەشتمە كۆشكی سپی بەڕوویەكی گەش و كراوەوە پێشوازی كردم و بەناوی خۆمەوە بانگی كردم و بەگەرم ترین شێوە بەخێر هاتنی كردم..

ئۆتۆمبیلەكە بە جۆرێ نەخشە كێشرابوو كەبەدەست ایێی بخورێت و بەس چونكە (فرانكلین)هەردوو قاچی شەلەلی تێدابوو بەڕاستی دڵخۆشی دەربڕینی سەرۆك بەرامبەر ئۆتۆمبیلەكەو بەتایبەت نەخشەكەی زۆر زۆر دڵخۆشی كردم بەتایبەت كاتێ پێی ووتم: بەڕاستی جوانە.. ئای كەپێم خۆشە و حەز دەكەم كاتم هەبێت و بتوانم بەشەكانی هەموی لەیەك بكەم و تێكی بدەم بزانم چۆن كار دەكات..

كاتێ كە هاوڕێ و دەوروبەرەكانی (ڕۆزفلت) سەرسامی ی خۆیان بەرامبەر جوانی ئۆتۆمبیلەكە دەربڕی لە بەرچاوی هەموویاندا ڕووی تێ كردم ووتی: (بەڕاستی من ڕێزی ئەو هەموو كات و ماندوو بوون و گرنگی پێدانەت دەخەمە سەر چاوم كەسەرفت كردووە لەنەخشە داڕشتن و دروستكردنی ئەم ئۆتۆمبیلەدا بۆم، بەڕاستی ئەمە كارێكی هەر زۆر گەورەیە)..

(سەرۆك)سەرسامی خۆی دەربڕی بەرامبەر چالاكی مەكینەكەیی و ئاوێنەكانی و كات ژمێرە ئامێرییەكەیی و گلۆپە كارەباییەكەیی و بەكوشنی شۆفێرو ئەو جانتایەی كە بەتایبەت دروست كردبوو بۆ جل و بەرگ.. بەگشتی بەهەموو شتێكیدا هەڵیدا و وەسفێكی چاكی كرد بەوانەی كەمن گرنگی تایبەتیم پێ دابوون و نارەحەتییەكی زۆرم تێدا چەشتبوون..

پێی ووتم: ئەم شتانە سەرنجی (مسز ڕوزفلت)و وەزیری كاروبارو سكرتێرە تایبەتییەكەی ڕادەكێشێ نەك هەر ئەوەندە بەڵكو دەرگاوانی كۆشكیشی ئاگادار

کرد کە کابرایەکی زنجی بوو بۆ خۆشی بەگاڵتەوە پێی ووت: ها (جۆرج)تۆش ئاوا گرنگی چاك بدە بە جانتای شت و مەك بە جوانترین گرنگی پێدان..

من لەکاتی گەشتەکەمدا بۆ کۆشك کرێکارێکی میکانیکیم لەگەڵ خۆم برد هەرکە گەیشتینە ئەوێ پێشکەشم کرد و ناساندم بەسەرۆك.. ئەم کرێکارە زۆر شەرمن بوو رووی دەکرد بۆیە تا دووایین ووتەمان ئەو یەك قسەی نەکرد و بێدەنگ بوو.. بەلاّم سەرۆك پێش خوا حافیزی لێ کردنمان بەناوی خۆیەوە بانگی کردنەی و توند توند دەستەکانی گوشی و سوپاسی ئەم سەرلێدانەی کرد.. وە ئەم سوپاس کردنەی هیچ جۆرە رووکەشی و هەوانتەیی تێدا نەبوو بەڵکو هەموو ووشەیەکی مەبەستێکی تایبەتی تیادا هەبوو خۆی دەیزانی بۆچی وتوویەتی؟..

پاش گەرانەوەمان بۆ نیویۆرك بەچەند رۆژێك وێنەیەکی سەرۆکم پێ گەشت لەگەڵ نامەیەکدا کە ئیمزای خۆی لێ دابوو.. لەگەڵ ووتەیەکی کورتدا کە رێزو سوپاسی تێدا دەربریبوو..

نازانم چۆن..(فرانکلین)ئەوەندە کات و بواری بۆ خۆی رەخساندبوو کە دانیشتو ئەم ووشانە بۆ من بنوسێت.. ئەمە شتێکە هەرچی دەکەم ناتوانم لێی تێ بگەم مەگەر زۆر بە زەحمەت، بەڵێ سەرەك کۆمار(روزفلت)دەیزانی کە رێگایەکی ئاسانی مسۆگەر بۆ دەست خستنی دڵی خەڵکی و راکێشانیان ئەوەیە: (ناوەکەیانت لە بیر بێت)و بەم کارە وایان لێ بکەیت کە هەست بکەن تۆ گرنگیان پێ دەدەیت.. ئایا چەند کەسمان بەمە هەڵدەستێت؟..

ئێمە نیوەی کاتەکانمان بەسەردەبەین لە (ناسینی خەڵکانێکدا)کەیەکەم جارە بیانبینین.. لەم هەلە زێرینەدا بەداخەوە چەند ووشەیەکی وشك و بێ گیان لەگەڵ یەکتردا دەکەین و بەس!!..

وەك (پێخۆشحالّم بەناسینت)و (خەریکی چیت)و (ماڵتان لێرەیە)..هتد!..

پاش ماوەیەکی کەم ناوەکەی لەبیر دەکەین!.. تەنانەت پاش کۆتایی یەکتر ناسینەکە!! جاری وا دەبێت ناشتوانین کاتێ دەروات بەناوەکەی خۆیەوە خواحافیزی لێ بکەین!!..

گرنگرتین دەرسێ: کە سیاسیەکان سوودی لێ وەربگرن ئەوەیە: ناوی ئەو کەسەت لەبیر بێت هاتووە بۆ هەڵبژاردن لە هەڵبژاردنی ئەنجومەن بۆ نموونە ئەوە

نیوەی ڕێگای سەرکەوتنت بڕیوە.. بەڵام گەر ناوەکەیت لە بیر چوو ئەوە نیوەی ڕێگای تێك شکانت بڕیوە..

ناپلیۆنی سێهەم کە ئامۆزای ناپلیۆن پۆنابارت بووە شانازی بەوەوە دەکرد کەناوی هەموو ئەوانەی لەبیرە کە بینیونی و لەگەڵیان دانیشتووە!! ئاخۆ چ ڕێگایەکی بەکارهێناوە؟

هەر زۆر ئاسانە ئەگەر بەباشی ناوەکەی هەڵنەگراتایە پێی دەووت: ببورە ناوەکەتم بەباشی هەڵنەگرتووە پێم بڵێرەوە.. ئەگەر ناوەکەی کەمێك نامۆ (غریب)بوایە دەیپرسی ئەوە چۆن دەوترێت ووشەکانی؟.. پاشان لەکاتی قسە کردن و دەمەقاڵەدا لە ئەستۆی خۆی گرتبوو ناوەکەی چەند جارێك لەدڵی خۆیدادەووتەوە! وە هەوڵی دەدا کە لەوکاتەدا بەراورد بکات لە نێوان ناوەکەیی و شێوەی هەڵس و کەوت و قسەو پێکەنین و درێژی و کورتی و لاوازی و قەڵەوی پەیوەست دەکرد لەگەڵ ناوەکەیدا!..

وە ئەگەر بیزانیایە ئەو کەسە کەسێکی ئاسایی نییە! وە پلەو پایە دارو گرنگە!.. ناپلیۆن بەکارێکی نارەحەت تر هەڵدەستا: ئەویش ئەوەبوو کاتێ دەوروبەری چۆڵ بوایە و هەر خۆی بوایە.. ناوەکەی لەدەفتەرێکدا دەنووسی.. پاشان لێی وورد دەبوویەوە و شێوەی دەهێنایەوە خەیاڵی خۆی بەم کارەی هەروەك زانیارییەکی وەردەگرت بەچاو دەربارەی ناوەکەی: ئەوا بەگوێچکەش زانیارییەکی زیاتری وەردەگرت. بەم جۆرە هەرگیز ناوەکەی لە بیر نەدەچوویەوە!..

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵك خۆشی بوێت بڕگەی ژمارە(٢)جێ بەجێ بکە:

**(بزانە کە ئادەمیزاد ناوەکەی بەلاوە لەهەموو شتێك جوانتر و خۆشەویست ترە)**

## پاشكۆی سێیەم/ناوی هاوڕێكەت لەبیر مەكە

خـوای گـەورە لـە قورئانتـدا باسـی ئـەوە دەكـات كـە كـەس بـانگ مەكـەن بـەناوی كەسەوە بەڵكو تەنها بەناوی خۆیانەوە بەتایبەت بەناوی باوكیانەوە بانگیان بكەن.. چـونكە خـوا وای پـێ باشـە و باوكـانیش دڵیـان پـێ خۆشـە!.. وەك دەفـەرموێت: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾(احـزاب ٥)﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ ﴾(الحجـرات ١١) مەسەلەی ناو لە ئیسلامدا بایەخێكی تایبەتی پێدراوە.. تەنانەت (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ)لەبەرئـەوەی دەیزانـی نـاو كاردەكاتـە سـەر خاوەنەكـەی و هەسـت بەلـەزەت و خۆشی دەكات كاتێ ناوەكەی دەبیستێتەوە بۆیـە هەمیشە هـەوڵی دەدا موسـڵمانان ناوی پڕ مانا و جوان و جوامێری هەڵبژێرن.. وە دوور دەكەوتەوە لـە نـاوە ناشـرینە دڵ تەنگـە بێزارەكـان.. هـەروەها نـاوە دڵ تـەنگ و بێزارەكـانی دەگـۆڕی بـۆ نـاوی خۆش‌و دڵگیر!

وەك (شقی)نەگبـەت، بـە (سـعید)بـە ختیـار.. وە (عاصـی)سـەركەش دەیگـۆڕی بـۆ (مطیع)واتە گوێ ڕایەڵ.. وەفەرمانی داوە بەباوك و دایكان كەناوی جوان هەڵبـژێرن بۆ كۆرپەكانیان چونكە لە دواڕۆژدا لێپرسینەوەی لەسەرە..

هەسـتێكی وا لـە مرۆڤـدا دروسـت كـراوە كـە حـەز دەكـات بەبیـستنی ناوەكـەی خۆی‌و دڵی پێ دەگەشێتـەوە.. ئەمەش سروشتێكی خوا كردەو هیچ پەیوەندییەكی نییـە بـەڕووپامایی و خۆدەرخـستن وەكـەس ناتوانێـت ملـە جـڕێ لەمـەدا بكـات. هەركـەس گومـانی لەمـەدا هـەبێت مـن لێـی دەپرسـم كـەكاتێك باسـێ دەنێرێـت بـۆ گۆڤارێك. لەگەڵ دەرچوونی ئەو گۆڤارەدا ئەم چاوبۆ چ باسێك دەگێڕێت؟..

بەڵێ هەیە حەزی لەوە نییە كەناوی ببرێت و كەس باسی بكات و بەبیستی نـاوی خۆی هیچ دڵخۆشی یـەكی بۆ دروسـت نابێت بەڵام ئەوانە زۆر كـەمن و دەگمـەنن و زۆرینەی خەڵكی وانییە!..

هەر لەبەر ئەم پێخۆش بوون و حەزە سروشتییەیە كە لە مرۆڤدا هەیە وای كردوە خـوای گـەورە لـە قورئانـدا بـەناوی خۆیـەوە بـانگی دەكـات!.. وەك بەخـەڵكی دەفـەرموێت: ﴿یـا اَیهُـا النـاس ﴾(النـساء ١) و بەپیغەمبـەران دەفـەرموێت: ﴿

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ﴾(مريم ١٢) ﴿يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡ﴾ (القصص ٣١) ﴿يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ١٠٤ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآ﴾(الصافات ١٠٤-١٠٥) يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ (البقره ٣٥)یان بەسەر دڵانی (پێغەمبەر)ان فەرمیوێت: ﴿﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ (أحزاب ١) !!.. پاك و بێگەردی بۆ خوا كە بێهودە و بۆ گاڵتە خۆی یەك یەك ناویان نابات.. هەروەك (پێغەمبەر) (ﷺ) خۆشەویست هەستی بەم ڕاستییە قورئانییە كردووەو خۆشی بەسەریدا ڕۆشتووە.. وەك دەفەرموێت: (یامعاذ إني أحُبك)( یا عبد الرحمن لا تَسال الأمارة) (یا عَباسُ یا عماه)(یا صَفیة بنت عبد المطلب)(عمدا فعلته یا عمر) ( یا أبا ذر أخلِصِ العَمل فإنَ الناقدَ بصَیرُ)!!..

ناو هەڵگرتن و لە بیر نەچوونەوە ی كەسێك بۆ ماوەیەكی تر گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە تۆ گرنگیت داوە پێی و پشت گوێت نەخستووە بەمەرجێك بتوانیت لە هەركوێ بینیت بەناوی خۆیەوە بانگی بكەیت.. خۆ ئەگەر لەگەڵ ناوەكەیدا بەهرەیەكی یان پیشەیەكت هەڵگرتبوو ئەوە جوانترە وەك (تۆفلان كەسی خۆشنوس نیت؟)یان (تۆ فلان كەسی وەستانیت)یان (مامۆستا)یان (شاعیر)نمونەیەك لە ژیانی (پێغەمبەر)مان (ﷺ)كەعب كوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من و هاوڕێ یەكم ویستمان بچینە خزمەت (پێغەمبەر)ی خوا.. بەڵام ئێمە هەردووكمان نەمان دەناسی و لەوە وپێش نەمان بیبوو!.. گەشتین بە پیاوێكی مەككەیی و لێمان پرسی! ووتی: نایناسن؟ ووتمان نەخێر.. ووتی ئەگەر چوونە مزگەوت پیاوێكە لەگەڵ عەباس دا دانیشتوە.. ئێمە عەباسمان دەناسی بەبۆنەی بازرگانیەوە.. بۆیە كە چووینە ژوورەوە، چوینە خزمەتی و دانیشتین.. (پێغەمبەر) بە عەباسی فەرموو: ئەی باوكی فەزڵ ئەم دوو پیاوە دەناسیت؟.. وتی: بەڵێ.. ئەمەیان بەرائی كوڕی مەعرورە گەورەی خێڵەكەی ئەمەیان كەعبی كوڕی مالیكە.. سوێندم بەگەورەیی خوا ئەووشەیەی پێغەبمەرم لەبیر ناچێت كە فەرمووی:

شاعیرەكەیە!!.. ووتی: بەڵێ ئەوە..

سەیركە زانیاری پێشووی (پێغەمبەر) تاجێكی ڕێز بووو كردیە سەری كەعب..

نمونەیەکی تر جارێك پیاوێك دێتە خزمەت (پێغەمبەر) (ﷺ)دەڵێ: ئەی نێرراوی خوا من ئەو کەسەم کە ساڵی پار هاتمە خزمەتت.. (پێغەمبەر)یش فەرمووی: (ئەوە لەشت بۆوا لاواز بووە)!! پیاوەکە زانی کەناسیەوەو تەنانەت قەبارەی لەشیشی لەبیر ماوە کەوەك پارنەماوە!..

بۆیە پیاوەکە ووتی: هەگیز بەڕۆژ نانم نەخواردوە بەشەو نەبێت.. (پێغەمبەر)یش فەرمووی: کێ ووتی ئابەم جۆرە خۆت تووشی سزاو ناڕەحەتی بکەیت؟..

وا دیارە پار زۆر بە ووردی سەیری کردووە و شێوەکەی هەڵگرتووە!!..

لەبیر نەکردنی ناوی خەڵك و هەندێ لە تایبەت مەندییەکانی ئەوکەسەی کەیەکەم جار پێی دەگەیت بەڵگەیە کەلەناو دڵتا پاراستوتە و لەیادت نەکردووە .

بەپێچەوانەشەوە ئەگەر لەیادت چوو ئەوە نیشانەی بێ موبالاتی و گوێ پێنەدان و پشت گوێ خستنە کە زۆر جار دەبێتە هۆی ڕق و کینەی ئەو کەسە بۆت..

بۆ نموونە جارێکیان لە بەغداد عەریفێکی خۆمانم بەدی کردو ناسیمەوە کە پێش چەند ساڵێك لەوەو بەر لەسەر بارگەی (موسڵ)مەشقی بە قوتابیان دەکرد.. سەیرێکی یەکترمان کرد و تەوقەمان کرد ئەو ووتی: دەمناسیتەوە؟ووتم: بەڵێ تۆ عەریفمان بووی لە موسڵ!.. کابرا وەك گوڵ گەش بوویەوەو بەگەرمی ڕووی تێ کردم ووتی: ئێ (وەصفی)برادەران چۆنن باشن؟ بە پێچەوانەشەوە من زۆر ناڕەحەت و بێزار بووم کە ووتی: من ناوەکەی تۆم لە بیر چۆتەوە!!.. ئەوەناوت چیبوو؟!!..

ئەو مامۆستایانەی کە لە زانکۆ دەرسیان پێ دەووتین.. هەندێکیان زۆر گرنگی یان بە ناوی قوتابی دەدا و زۆر باش لێمان وورد دەبوونەوە تا بەجوانی ناوەکانمان هەڵگرن و فێری بن..

ئەوە جێگای سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە ئەو مامۆستایە پێش (٣) ساڵ وانەی بە من وتبوو وەپاشان یەکترمان نەدیبوویەوە.. کەچی وەڵامی دامەوە و بەناوی خۆمەوە ووتی: (أهلا وسهلا عمر توفیق)!!..

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەواڵی شاری هەڵەبجەشی لیٚ پرسیم!!.. بەو هەڵس و کەوتەی ئەوەندەی تر ڕۆشتە دڵمەوە!!..

کەچی بەداخەوە هەندیٚ مامۆستای ترمان ئەم هەلە زێرینەیان لەکیس خۆیان دەدا!..

وە سوودیان لیٚ وەرنەدەگرت و گرنگی یەکەیان لەپێش چاویان نەگرتبوو!!.. بۆیە چەند جار لەناوەکانمان دیان پرسیەوەو لەبیریان دەچوو..کاتێك وەرەقەی تاقیکردنەوە دەچووە بەردەستیان و ڕووبە ڕوو تاقیکردنەوەی دەمییان لەگەڵ دەکردین..

لەگەڵ ئەم هەموو هۆی ناو هەڵگرتنەدا کە بۆیان ڕەخسا بوو کەچی کاتیٚ دەگەشتین پێیان و قسەمان دەکرد پێکەوە پیٚی دەوتین: (ئەوە تۆ ناوت چییە؟)!! یان دەیووت: (ئەوە تۆ قوتابیت لەلامان؟)..

بابزانین کە ئەو قوتابییەی ئاوای پیٚ دەوترێت.. هەست بەدڵ شکاوی و پشت گویٚ خراوییەکی تەواو دەکات و لەخوێندن سارد دەبێتەوە..

ئەوکەسەی کە لایەنی (ناو هەڵگرتن)پشت گویٚ دەخات و گویٚ نادات بەناسینی خەڵکی و گرنگ نیە محمود بەئەحمەد و ئەحمەد بە محمود بناسێت!.. نەك هەر ناچێتە دڵی خەڵکی و خۆشیان ناوێت..

بەڵکو لەژیانی ڕۆژانەشیدا زیان دێنێت و بەهیچ جۆر قازانج ناکات.. و سەرکەوتوویش نابێت!!.. ئایا ئەمە چۆن؟..

دوونموونە بەسە لەسەر ئەمە بیهێنمەوە کە خۆم هەردووکیانم بەچاو دیووە: مامۆستا مان هەبوو لە زانکۆ لەبەر ئەوەی ناوی کەسی لەیەك جیا نەدەکردەوەو کەسی بەباشی نەدەناسی لەکاتی تاقیکردنەوەی مانگانەدا قوتابی بۆ قوتابییەکی

تر تاقیکردنەوەی دەکرد نمرەی بۆ چەند قوتابی یەکی تر دەهێنا کەلەوێ نەبوون یان لەوێ بوون بەلاّم سەعی یان نەکردبوو!

لەتاقی کردنەوەیەکدا قوتابییەك نمرەی بۆ خۆی دەهێنا.. هەرهەمان ڕۆژ یان ڕۆژێ دوو ڕۆژ پاش ئەوە تاقیکردنەوەی لەهەمان وانەدا دەکردەوە بۆ هاوڕێیەکی!!..

لەکۆمپانیای ئیسکانی سەربازی(لەبەغداد کەمن فەرمانبەری مەدەنی بووم و کاری خۆشنوسیم دەکرد.. خواردن و خەوتن مان لەسەر کۆمپانیاکە بوو.. جارێکیان سەرەمان گرتبوو بۆ وەرگرتنی خواردەمەنی بەلاّم ئەو دوو کەسەی لە لێپرسراوی دابەش کردنی خواردنەکە بوون.. لەوکەسانە بوون کە وریانین و کەس ناناسنەوە و ناو هەڵناگرن!!..

بۆیە هەردەم سکالاّیان لێ دەکرا لەلای بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە.. کە گوایە دادپەروەرنین لەدابەش کردنی خواردنەکەدا.. ئەو هەژارانە دادپەروەر بوون بەلاّم هۆ سەرەکییەکەی ئەوەبوو کە ئەوان ئاگایان لە خۆیان نەبوو فەرمانبەرو کرێکارەکان دووبارە وسێ بارە دەچوونەوە ڕیزەوە و سەر لەنوێ خواردنیان وەردەگرتەوە!!..

لەکەڵك و سوودەکانی هەڵگرتنی ناو چەند نمونەیەك دێنمەوە کە تاچ ڕادەیەك زانا و هەڵگرانی بانگی ئیسلامی بەکاریان هێناوە و سوودیان لێ وەرگرتوە:

زانایانی فەرموودە (علما ءالحدیث)هەڵگرتنی ناو خۆنارەحەت کردنی لە جیاکردنەوەیان دا سوودیان لێ وەرگرتووە بۆ پاراستن و جیاکردنەوەی فەرموودە ڕاستەکان لەفەرموودە دەم هەڵبەس و لاوازەکان! ئەمەیان چۆن دەکرد؟!..

زانایانی وەك (بوخاری)و (موسلیم)و هاوکارانیان بۆ ئەوەی بزانن کام فەرموودە ڕاستە و (پێغەمبەر) فەرموویەتی.. ئەهاتن یەك یەك ناوی ئەو کەسانەیان لەبەردەکرد کە فەرموودەکەیان دەماودەم گێڕاوەتەوە..

هەر بەمەوە نەدەوەستا بەڵکو دەهاتن ژیان و ووتارو کردارو هەڵس و کەوتیان وەردەگرت و. ئەگەر هات و یەکێ لەوانە درۆزن بوایە ئەوە دەیان ووت ئەم

فەرمودەیـــە لاوازە یـــان ڕاســـت نییـــە.. بـــەم شـــێوەیە خزمـــەتێکی گـــەورەیان بەفەرمودەکانی (پێغەمبەر) کرد و بۆ ئێمە یان پاراست..

لـەژیانی بانگـەوازدا.. ناوهـەڵگرتن زۆرگرنگـی هـەبووە و پێـشەوایانی بـانگی ئیسلامی لەکۆن و نوێدا کەڵکێکی باشیان لیٚ وەرگرتووە..

لـەم سـەردەمەی خۆمانـدا مامۆسـتای شـەهید(حسن البنـا)(ڕەحمـەتی خـوای لـیٚ بێت)مامۆستایش دەچێت بۆلایان و لـەویٚ هەریەکـەیان بە (نـاوی خۆیـەوە)سـلاٚویان لـیٚ دەکـات!!..ئـەم کۆمەڵە لاوە زۆر سـەرسـام دەبـن و لـەڕادە بـەدڵخۆش و کامـەرانی ڕوویان تیٚ دەکـات..لەکۆتایی دانیشتنەکەدا لێمـان پرسـی کەچـۆنمان دەناسـیت وا هەریەکە بەناوی خۆیەوە بانگ کرد؟!!..

مامۆسـتایش بەزەردەخەنەیەکـەوە فـەرمووی: کـاتیٚ پێناسـەکانتان هاتۆتـە بەردەسـتم بـۆ ئـەوەی ئیمزایـان بکـەم.. لەوکاتـەدا لەوێنـەی هەریەکـەتان ورد دەبوومـەوە و زۆر بـەووردی بـەراوردم دەکـرد لەگـەڵ نـاوو شـوێن و سـاڵی لـەدایك بوونتاندا!!..

مامۆستا( عەباس سیسی ) لەکتێبی (ڕێگا بەرەو دڵەکان) دا دەڵێت: جارێکیان لەبنکـەی برایـان (قـاهیرە) دانیـشتبووین.. دوو گـەنج هـاتن و هـەواڵی برایـەکیان پرسی..

پێمان ووتن: چاوەڕیٚ بکەن تا دێت ئێستا لێرە نییە..

پاش کەمیٚ لیٚیان نزیك بوومەوە.. هەرەیەکەیان بەناوی خۆیەوە سلاوم لیٚکردن ئەو دوولاوە هەردوکیان زۆر سەرسام بوون کە ئایا ناومانی چۆن زانیوە!..

بۆیە هەردووکیان وەك گوڵ گەش بوونـەوەو زۆریـان پـیٚ خـۆش بـوو لەیـەکتر یـان دەپرسی کەئەمە ناومان چۆن دەزانێت؟.. بۆیە لێیان پرسیم؟ منیش پێم ووتـن: بۆ ئێوە هەموو بەیانیەك کاتژمێر (حەوت) لەجادەی (ڕصافە) سواری پاس نەدەبوون؟.

ووتیان بـەڵیٚ بـەڵام ئێمـە تۆمـان نـەدیوە؟.. ووتم ڕاسـت دەکـەن چونکە مـن جل و بـەرگی سـەربازیم لەبـەردابوو. کـاتیٚ لـەنزیك یەکـەوە دادەنیـشتین مـن گـوێم لیٚبـوو کەیەکترتان بانگ دەکرد بە محمد و ئەحمەد!!..

ووتیان دەی باشە ناوی ئێمەت بۆچی بوو؟ ووتی: بۆ ئا ئەم ساتەم بەکار هات!..

لەپێش کۆتاییدا ئەوە دەڵێم ناوهەڵگرتن بەوگرنگی و هەموو کەڵکەیەوە کە (پێغەمبەر)و هاوەڵان و پێشەواکانی موسڵمانان لەهەموو سەردەمێکا گرنگیان پێداوە نەیان وتووە: نامان پەرژێو سەرمان قاڵەو خەڵکەکە زۆرە و لێمان تێك دەچێت..

کەچی نازانم من و تۆ بۆ وادەڵێین!!؟ بەهەرحاڵ ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ ئاسان کردنی ناو هەڵگرتن و لەیاد نەچوونەوەی چەند خاڵێك دەخەینە پێش چاوی خوێنەرانی ئازیزەوە بە هیوای ئەوەی کە لەم بوارەدا سەرکەوتووبێت و کەڵك دەخەینە پێش چاوی خوێنەرانی ئازیزەوە بە هیوای ئەوەی کەلەم بوارەدا سەرکەوتووبێت و کەڵك لەم هەلە ئەفسوناویە کاریگەرە وەربگرن کەئەم خاڵانە گەر بەووردی و ژیرانە جێبەجێ بکرێت مرۆڤ هەزاران کەس دەکاتە خۆی:

١)کاتێ دەگەیت بە هاوڕێیەکی تازە و پێتیدەناسێنن.. بەدوو قسەی وشك وازمەهێنە و بەس وەك (پێخۆشحاڵم بە ناسینت) و (ناوی بەڕێزتان) و (بۆزەحمەت لەکوێ دەخوێنیت؟)!!..

ئەم هەلە زێڕینە لەدەست دەدات و خۆی خەریك دەکاتەوە لەگەڵ هاوڕێ ناسراوەکانیدا! ئیتر بێخەبەرە لەوەی کە دڵێکی تازە هاتۆتە بەردەستی هەلێکی زێڕینە!!.

٢)لەکاتێکدا لەگەڵ هاوڕێیەکی نوێدا وەستاوی و قسە دەکەیت.. بەچاوێکی وردیش سەیری شێوەو سیمای بکە.. ناوەکەی بەراورد بکە لەگەڵ هەیکەلی لەشیدا.. ڕیشی هەیە یان نا.. چاویلکەی لەچاوە یان نا.. کورتە یان درێژژ. قەڵەوە یان لاواز.. سپییە.. سوورە.. ئەسمەرە..

٣)لەوکاتەدا هەوڵ بدە بزانیت چ هۆزێکە.. لەکوێ دادەنیشێت.. کێ خزمیەتی کە تۆبیناسیت تا لەڕێگای ئەوەوە باشتر شارەزا ببیت لەژیانی هاوڕێی نوێت .

٤)یان ئەگەر لەوکەسانەیت کەزوو شتت لەبیر دەچێت.. با دەفتەرێك هەڵبگریت خێرا یان پاش یەکتر ناسینەکە ناوەکەی و تەمەنی و شێوەو ئەو ڕۆژەو شوێنەش کەتیایدا ناسیوتە بۆ یەکەم جار تێیدا بنوسیت .

٥)باشتر وایە ئەگەر زانیت لەونزیکانە نایبینیتەوە ناونیشانی وەرگرە و لەدوورەوە هەواڵی بپرسەو سەلامی بۆ بنێرە و ئەگەر کرایش نامەی بۆ بنووسە.. خۆ ئەگەر خۆت سەرێکی لێ بدەیت ئەوە زیاتر کاریگەرترە و دڵەکانتان دەبەستێت بەیەکەوە..

٦)ئەگەر دەسەڵاتت هەبوو با دیارییەکی بۆ بنێریت و تۆ لەیادیدا بهێڵیتەوە و لەگەڵ دیاریەکەشدا ووتەیەکی کاریگەری بۆ بنووسە وەك (ئەڵێی هاوڕێیەکی بێ ڕەحمیت.. تۆ ئێمە لەیاد کەیت.. ئێمە أن شاء الله تۆ هەر لەیاد ناکەین.. بەهیوای دیدار).. ئەزانی لەوکاتەوە یەکترمان ناسیوە من تۆم لەگۆشەیەکی بیرمدا پاراستووە).. ناونیشانی خۆت بنێرە بۆی لەگەڵ نامەدا..

لەکۆتاییدا با هەموو موسڵمانێك ئەوفەرموودەیەی (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) لەپێش چاوبگرێت و لەیادی خۆی نەباتەوە کە دەفەرموێت: (لەوشکی و خراپی مرۆڤە ئەگەر لەگەڵ کەسێك بوویتە ڕێبوار ناوی خۆی و باوکی لێ نەپرسی)!..

## بەشی دووەم

## چوارهەم/ بۆئەوەی قسەزانێکی لێهاتوویت

لەم دواییەدا بانگ کرام بۆ سەیرکردنی یاری (بریدج) لەگەڵ ئەوەشدا کە من خۆم هەرگیز ئەو یارییەم نەکردووە.. لەبەر ئەوە من بۆ خۆم لێی دانیشتم لەولاوە.. واڕێك کەوت هەرلەوێ کچێکی شۆخ و شەنگ کەئەویش وەك من یاری نەدەکرد دانیشتبوو کەوتینە نزیك یەك و بەقسەکردن کاتمان بردە سەر..

ئەم کچە هەر کەزانی من مامۆستای (لویل تۆماسم) و لەگەڵیدا گەشتێکم کردووە بۆ ئەوروپا بۆیارمەتیدانی لەگرتنی فلیمە سینەماییەکانیدا..

زۆر بەگەرمی و بەخۆشیەکەوە ڕووی تێکردم و وتی: (بێزەحمەت مستر کارنیجی باسی هەر هەموو ئەو جێگایانەم بۆ بکە کە بینیوتن؟)..!!

پێش ئەوەی داواکەی جێبەجێ بکەم ئەو لەخۆیەوە کەوتە قسەو وتی: (من لەم دواییەدا گەڕاومەتەوە بۆلای مێردەکەم چونکە لەئەفەریقیا بووم).

هەرکە ئەم وتەیەم لێ بیست خێرا هاوارم کرد: (ئەوە بەڕاستتە؟.. ئای کەچەند ئاواتەخوازبووم هەمیشە سەرێك لەئەفەریقیا بدەم!.. بەڵام داخەکەم ئەم ئاواتەم نەهاتە دی بێجگە لە گەشتێکی (٢٤)کاتژمێری کە لە (جزائیر ) بەسەرم برد! باشە پێم ناڵێی تۆ سەرت داوە لەو شارە ئەفسونیە؟! ئای کەبەختت هەیە من چەند حەسوودیت پێدەبەم! باسێکی ئەفەریقیام بۆ بکە؟..

بەڵێ ئەم ئافرەتە بەباسی (ئەفەریقیا) (٤٥)دەقیقەی تەواوی بەسەر برد ئیتر هەرلێشی نەپرسیم دەربارەی گەشتەکەی ئەورووپام!!..

لەڕاستیدا ئەم ئافرەتە نەیدەویست کەگەشتەکەمی بۆ باس بکەم!.. بەڵکو دەیویست گوێگرێکی تینوی ئەفەریقیای دەست کەوێت!!.. کە بەوردی گوێی بۆ بگرێت تا یادگاریەکانی ئەو وڵاتەی بێنێتەوە یاد!!..

خۆ ئەم ئافرەتە جۆرە دروستکراوێکی تایبەتی و شاز نییە.. نەخێر.. زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی بەم جۆرەیە..

لەم دواییانەدا لەئاهەنگێکی شەوانەدا کە بڵاوکەرەوەی (الناشر)ی بەناوبانگ (جرینجۆرج) سازی کردبوو.. لەوێ گەشتم بەزانایەکی ڕووەك ناسی بەناوبانگ.. من لەوەو پێش گوێم نەگرتبوو بۆ زانایانی ڕووەك ناس کە قسەم بۆ بکەن.. بۆیە لەزەت و خۆشیەکم بۆ دەهات لەگوێگرتنم دا بۆی!.. بەئەسپایی لەسەر قەراغی کورسیەکەم دانیشتم و گوێم بۆ گرت!.. بەڵام زۆر جوان گوێم بۆ شل کرد!!..

ئەویش بەدوورو درێژی باسی گیاو گوڵ و گوڵزارو باخچەکانی ناوماڵی کرد، ئەم زانایە ئەوەی چاك بوو من سوودێکی زۆرم لەقسەکانی وەرگرت بەتایبەت بۆ چارەسەرکردنی گرێو کۆسپەکانی باخچەکەم..

ئێمە هەروەك لەپێشەوە ووتم لە ئاهەنگێکی شەوانەدابووین؟!.. بەڵام من گوێم نەدا بە یاسای خۆڕازاندنەوەو قنج و قیتی و خەڵکەکەم پشت گوێ خست و دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ ئەو زانایەدا و وتەکانمان نزیکەی چەند کاتژمێرێکی برد!!..

نیوەشەوی ڕابردوو من هەستام بڕۆم و شەوێکی بەختیارم بۆ گشت ئامادەبووان خواست و ڕۆشتم پاشان ئەو زانایە هاتبوویەوە لای (میواندارەکە و باسی منی زۆر بەچاکی بۆ کردبوو.. من لەلای ئەو وەك خۆی دەربڕی بوو (پیاوێکی زۆر خۆش و ئاڵ و کەیفم)!!..

من ئەمە بووم و ئەوەم.. پاشان لەکۆتاییدا بەمیواندارەکەی ووتبوو: بەڕاستی مستر کارنیجی قسەکەرێکی لێهاتووە!)..

من؟! ئاخر چۆن؟! من هەرهیچم نەووت؟! بەڵکو هەر هیچم بۆ نەدەوترا پێش ئەوەی باسی قسەکان بگۆڕم.. تەنانەت من دەربارەی ڕوەك هیچ نازانم بێجگە لەپێوەن کردنی دار (پێنجوین) نەبێت!.. من چیم کرد؟.. بەس ئەوەندە هەبوو من بە هەموو حەزێکمەوە گوێم بۆ گرت!..

ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە من بەڕاستی حەزم لەوقسانەبوون کەئەو بۆی دەکردم ئەویش هەستی بەمەکرد تیامدا..

ئەمەش شتێکی ئاساییە!.. گوێ شل کردن بە ئەوپەڕی حەزو ئارەزووەوە گەورەترین پاداشت و چاکەیەکە دەیکەیت لەگەڵ ئەوکەسەدا کە قسەت بۆ دەکات!..

(جاك وورد فورد) لەکتێبی (چەند غەریبێك خۆشەویستی کۆی کردنوونەتەوە)دا دەڵێت: کەم کەس هەیە لەمرۆڤ وشك بێ‌و گوێ نەدات بە (سەناو چاکەیەك) کەلە گوێ گرتنێکی هێمنانەدا پێشکەشی بکرێت..

بەڵکو من لەمە دوورتریش بۆی ڕۆیشتم لەگەڵ زانای ڕووەك ناسدا!.. من زۆر لەڕادەبەدەر ڕێزم گرت و سەنا خوانیم کرد!.. پێم ووت: کە من بەڕاستی کاتێکی خۆش و پڕ سوودم بەسەر برد دەی ڕاستیەکەی هەر واش بوو.. پێم ووت: ئاواتە خوازبووم ئەو زانستە بەرزەی تۆ هی من بوایە دەی سوێندم بە خوا ئەو ئاواتەم هەیە!..

پێم ووت: کە ئاواتمە گەر ڕێك بکەوێت لەگەڵیدا باخچەکان بگەڕێم تاناوی هەموو ڕووەك و گوڵەکانم پێ بناسێنێت.. دەی من هەمیشە ئەم ئاواتەم هەیە!.. پێم ووت: پێویستە لە ماوەیەکی کەمدا جارێکیتر یەکتری‌ببینینەوە.. بەڕاستی هەقی خۆی بوو!!..

لەبەر ئائەمانەبوو کە منی بە (قسەزانێکی لێهاتوو) پێناسەکردبوو.. وە من لەوەزیاتر هیچ نەبوم کە گوێگرێکی باش بووم و هاندەری بووم بۆ زیاتر درێژەدان بەو بابەتە..

هۆی چییە؟ نهێنی چییە لەسەرکەوتنی مامەڵەیەکی سەرکەوتوو کەلەنێوان دووشەریك دا ڕوودەدات. کەهەردووکیان پیاوی ئیش و کارن؟..

(تشارلس ئیلیوت) دەڵێت: هیچ نهێنییەکی تێدانییە.. هەر ئەوەندە هەیە کەبەباشی و بەگرنگی گوێ بدە بەقسەی بەرامبەرەکەت.. هیچ شتێکی کەنییە ئەوەندە ئەوە دڵخۆشی بکات!!..

شتێکی زۆر ئاسانە.. وانییە ناشیەوێت تۆ چوارساڵ لەزانکۆی (هار ڤارد) بخوێنیت تا دەیگەیتیٰ!..

بەلام من لەگەلٚ ئەوەشدا دەزانم بیٚگومان تۆش دەزانیت کە بازرگانی وا هەیە گەورەترین بازاڕ و دوکان بەکریٚ و شتەکانیش بەنرخیٚکی گونجاو دەفرۆشیٚت و بۆناساندنی دوکانەکەشیان بەکڕیاران دەچن چەند لافتە و تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگ بەپیٚشی دوکانەکەیاندا هەلدەواسن و بەخەتیٚکی جوان ناوی دەنیٚن و شتەکانی یەك یەك لەسەر دەنووسن..

لەم ڕیٚیەدا پارەیەکی زۆر سەرف دەکەن کەچی لەگەلٚ ئەوەشدا پاشان کەسانیٚك بەسەر دوکانەوەدا دەنیٚن کەنازانن بەباشی گویٚ بەخەلکی بدەن و دەمەدەمەی وشكو بیٚ گیان لەگەلٚ کڕیار دەکەن و قەسەیان پیٚ دەبڕن و پیٚچەوانەی دەوەستن لەڕاوبۆچووندا و قسەی ڕەق وبیٚتامیان لەگەلٚ دەکەن و بەجۆریٚ کەخەریکن خەلکەکە لەدوکانەکە دەکەنە دەرەوە!!..

بۆنمونە سەیری بەسەرهاتی (س. دوتون) بکەن کەیەکیٚکە لە قوتابییەکانم ڕۆژیٚکیان خشلیٚکی تازەی کڕی لەبازاڕی( نیوٚئارك )لەبازرگانیٚکی ناودار لەویلایەتی (نیو جیٚرسی) پاش چەند ڕۆژیٚك بوٚی دەرکەوت کە ڕەنگی خشلەکە ئەصلٚ نییە و قەلبەکانەو ئەگەر ئارەق لیٚی بدات ڕەنگە جوانەکەی دەڕوات.. لەبەر ئەوە خشلەکەی هەلگرت و بردیەوە بۆ دوکاندارەکە.. بەلیٚ گەشتەوە دوکانەکەو .. بەسەر هاتەکەی بۆ گیٚڕایەوە کە بۆچی هاتووە.. چی؟ ووتم بوٚی گیٚڕایەوە؟!.. نەخیٚر (خوانەکات) بەلکو (ویستم) بوٚی بگیٚڕمەوە.. بەلام نەمتوانی چونکە فرۆشیارەکە بواری نەداو نەیهیٚش قسەکە تەواو بکات و پیٚی ووت:

چەند هەزارانمان لەم خشلانە فرۆشتووە.. وەئەمە یەکەم جارە کە سکالامان بیٚتە سەر!.. ئائەمە قسەکانی بوو.. بەلام خۆ لەهجەو شیٚوەی وتنی زۆر لەمە خراپتر بوو! کە هەمووی مانایەکی دەگەیاند و بەس ئەوەش وەك بلیٚ (تۆ درۆ دەکەیت)!.. تۆ وادەزانی کە دەتوانی توشی شتیٚکمان بکەیت؟..

دەباشە سەیرکە بزانە کاممان دەیبەینەوە!!..

لەگەرمەی دەمەقاڵەکەدا فرۆشیارێکی تر خۆی کرد بەناو مەسەلەکەداو ووتی: هەموو خشڵێکی تێر ڕەنگەکەی‌دەڕوات.. بەتایبەت خشڵە هەرزانەکان وەك ئەمەی تۆ!..

(مستر دیتۆن) دەیووت: من تا ئەوکاتە کەمێ توڕە بووم هیچ نەبوو، بەڵام کاتێ فرۆشیارەکەی تر خۆی تێ هەڵقورتاند و ووتی کە گوایە خشڵەکەم هەرزان بەهایە و پارەم نەداوە ئیتر وەخت بوو وەك مەنجەڵی کوڵ بەکوڵ هەڵچم!! خەریك بوو پێیان بڵێم ها ئەوە خشڵ و مشڵی خۆتان و لەگەڵ خۆتان بیبەن بۆ دۆزەخ..!

بەڵام باش بوو سەرۆکی بەشەکان هەستی بەم مشت و مڕەمان کردوو هاتە نێوانمان و لەوساتە ناخۆشەدا دایمرکاندمەوەو شۆڕشی توڕەیشی کوژاندمەوە.. چۆن؟!..

بەبەکارهێنانی سێ ڕێگا یەکەم: بەوردی گوێی شل کرد بۆ بەسەر هاتەکەم و تاهەر هەموویم بۆ نەگێڕایەوە یەك ووشەی پێ‌نەبڕیم!..

دووەم: هەر کە لەقسەکانم بوومەوە خێرا جەنابی ووتی: لەگەڵتام ڕاست دەکەی خشڵەکەت کاڵ بۆتەوە.. وەئاگاداری فرۆشیارەکەی کرد کەهەرگیز هیچ شتێك نەفرۆشێت تانەزانێ چاکەو خەڵکی پێی ڕازین..

سێیەم: لێی پرسیم کە ئێستا چی دەکەی بەم خشڵە؟ وای دەربڕی کە من چیم دەوێ وا بکات!.. من چەند دەقەیەك لەوەوبەر ئامادەبووم کە بڵێم: ها ئەوەشتە قەڵبەکانتانە و نامەوێ و هەڵیبگرن بۆ خۆتان بەڵام من لەسەر خۆ پێم ووت: من بەس داوای ئامۆژگاریەك لە جەنابت دەکەم کە پێم بڵێیت: ئایا ئەم ڕەنگ گۆڕانەی ناشرینی دەکات یان هەرکاتییە و هیچی‌تر؟..

بۆیە سەرۆکی بەشەکان وای پێشنیار کرد بۆم کەبۆماوەی هەفتەیەکی تر بیبەمەوە جا ئەگەر پێی ڕازی نەبووم بۆیان بەرمەوە..

بەڵێ بەدڵێکی خۆش و پڕ ڕەزامەندییەوە لە دوکانەکە دەرچووم!.. لەکۆتایی هەفتەکەدا خشڵەکە جوان بوویەوە ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە شت و مەکی ئەو دووکانە بوونە جێگای بڕوام..

هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەو کابرایە بووە بە سەرۆکی بەشەکەی.. بەڵام دوو فرۆشیارەکەی تر خەریکە بڵێم کە بەدرێژایی تەمەن بەدوکانداریش نامێننەوە.. نەء.. نەخێر .. بەڵکو دادەبەزن بۆ پلەی نزمی بارکردن و داگرتن و ئاگاداری مەخزەنی شت و مەکەکان.. کەهیچ پەیوەندییەکی دوور یان نزیکیان بە فرۆشیارانەوە و بەتایبەت کڕیارانەوە نامێنێت و شت نافرۆشن!..

تەنانەت ئەوانەشی کە زۆر وشك و توڕە و قسە ڕەقن خۆیان بۆ ناگیرێ و نەرم دەبن لەبەردەمی گوێگرێکی بەئارام و لەسە رخۆدا.. گوێگرێك کە بەئارام بێت و نەرم و نیان لەبەردەم توڕەیی بەرامبەرەکەیدا چۆن توڕەییەك؟ کەبێت و بڕوات و دەمی کەف بکات وەك کوێرە مار بێو کوێرانە ژەهری خۆی بەم لاولادا فڕێ بدات!..

نمونەیەك بۆ ئەمە: چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆمپانیای تەلەفونی نیویۆرك توشی بوبەپیاوێك کەبەشداربوو لەهێڵی تەلەفوندا جارێك دێتە سەر کۆمپانیا کە تێر و پڕ قسەی ناشرینیان پێ دەڵێ و تەنانەت جنێو و قسە بەبەڕێوەبەری کۆمپانیاو جێگرەکەی دەڵێت و بێئەدەبی و پیسی خۆی بەم کارە دەردەخات!. وە ووتیەك یەك فلس هەقی تەلەفونی ساڵانەش نادەم چی دەکەن بیکەن! چونکە درۆ دەکەن و بەتەزویر و ناپاکی ئەو پارە زۆرەتان خستۆتە سەرم و من هەرگیز ئەوەندەم سەرف نەکردووە!.. بۆیە هەر بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو لەوبارەیەوە چەندان باسی نووسی و لەگۆڤارەکاندا بلاوی کردەوەو سکاڵای خۆیشی گەیاندە لیژنەی خزمەت گوزارەگشتییەکان.. هەروەك گەردەلوول هێرشی دابارندە سەر کۆمپانیاکە!..

لەم دواییەدا ناچار کۆمپانیا فەرمانبەرێکی لێهاتوویان کەبە( گیرو گرفت لابەر) ناسرابوو، تەرخان کرد کە دانیشتنێك لەگەڵ ئەو کابرا لادەرەدا بکات.. بەڵێ لەدانیشتنەکەدا( گیرو گرفت لابەر) جوان جوان گوێی بۆ شل کرد بۆ کابرای توڕە کە ئاگری دەکردەوە.. تا ئەوەبوو کابرا قسەی پێ نەما و حاڵی بوو!!..

(گیروگرفت لابەر) خۆی بۆ قوتابییەکانی گێڕایەوە.. کە ئەم کابرایە وەك گەردەلوول دادەباری و توڕەیی دەردەبڕی بەرامبەرم بەڵام من هەر هێمن و لەسەرخۆم بووم و هیچم نەدەگوت بۆماوەی (٣)کاژمێر!!.. لەڕۆژی داهاتوودا

دیسان گوێم بۆ گرتەوە و تاچوار جار من دانیشتنم لەگەڵ کردا!.. لەجاری چوارەم دا من خۆم دامەزراند لەو دەزگایەدا کە کابرای تورە دروستی کردبوو بووم بە ئەندام تێیدا ... کە ناوی نابوو ( دەزگای پارێزگاری کردن لە بەشادارانی تەلەفون).. وەتا ئێستاش وابزانم من دووەم کەسم کەسەر بەم دەزگایەبم دوای سەرۆکەکەی!!..) کە خۆی بوو!.

ئەوەی من کردم تەنها ئەوەبوو کە زۆر بەگرنگی یەوە گوێم بۆ شل کردبوو.. لەسەر هەمو قسەیەکی دەم گوت.؟ لەگەڵتم لەمەدا ئەم پیاوە تائێستا کەسێك گوێی بۆ شل نەکردوە لەفەرمان بەرەکانی دەزگای تەلەفون..

بەڵکو ئەوشتەی کە لەپێناویدا هاتبوم بۆلای.. لەسێ سەردانی پێشەکیدا هەر باسیشم نەکردا.. وە لەسەردانی چوارەم دا بەیەکجاری پەردەم لادا لەسەر گیروگرفتەکە.. پاش ئەوە ئەم کابرایە (بەخۆشی خۆی) چی پارەی ساڵانەی تەلەفونی لەلابوو هەمووی‌دا !!.. وە بۆیەکەم جار لەماوەی دوو بەرەکیەکەیدا لەگەڵ کۆمپانیا هەموو سکاڵاو شکات نامەکانی کە لەدژی کۆمپانیا کردبوونی لێی پاش گەزبوویەوە!.. گومانی تێدانییە کە ئەم کابرا هاوبەشە..خۆی بەستەم لێکراوی تێکۆشەر دادەنا کە بەرگری لەمافی خەڵك دەکرد و ڕزگاری دەکردن لەپێشێل کردنو بەکارهێنانی ناڕەوا!!.. بەڵام لەڕاستیدا پێویستی بەوەهەبوو کە هەست بەگرنگی پێدانی خۆی بکات جا لەیەکەم جار دا ئەم هەستەی دەست دەکەوت لەشکات کردن و سکاڵاکردندا.. بەڵام پاش ئەوەی کەلەیەکێ لەفەرمان بەرانی کۆمپانیاوە دەستی کەوت.. خێرا ئەو پەڵە هەوری ستەم و پێشێل کردنەی کە بەخەیاڵی خۆی لێ کراوە هەمووی ڕەویەوە!. لەچەند ساڵێك لەمەوبەردا.. هەژاری و دەست کورتی وای کرد لەمنداڵێکی هۆڵەندی کە نیشتەجێی ئەمریکابوو کە بووبەکرێکارێکی پاك کردنەوەی پەنجەرە لەیەکێ لەنانەواکاندا پاش گەڕانەوەی لەقوتابخانە بەڕۆژانەی (٣) قرش!..

ئەم منداڵە شەش ساڵ زیاتر لەقوتابخانە نەی خوێند.. بەڵێ (ئیدوار دیوك) وازی لە قوتابخانە هێنا.. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا توانی ببێتە یەکێ لەرۆژنامەنوسە سەرکەوتوەکانی ئەو سەردەمە لەمێژووی رۆژنامەنوسی ئەمریکیدا.. ئەمەچۆن؟!.

ئەم بەسەرهاتە زۆر دوورو درێژە.. بەڵام گۆشەیەکی لێ باس دەکەین.. (یوك) دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی ئەم برگانەی لەم فەصڵەدا هاتووە.. لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا قوتابخانەی واز لێ هێنا.. هەستا خۆی دامەزراند لەکۆمپانیای (ویسترن یونیون) بە فەرمان بەری پۆستە بەرامبەر موچەیەکی هەفتانە کە شەش ڕیاڵ و نیو بوو..

لەم ماوەیەدا هەرگیز بەبیریدا نەدەهات کە بەیەکجاریی لەجیهانی خوێندن و خوێندنەوە ببچڕێت.. بۆیە دەستی کرد بە گەشەپێدانیو فێرکردنی خۆی بەڵام هەر بەخۆی.. دەستی کرد بە خۆگرتنەوەو کەم سەرف کردن.. لەکریێ پاص و نان خواردندا و بەوپارە پاشەکەوت کراوەی هەستا بەکڕینی کتێبی دائیرەی مەعاریف کە باسی نوسەرە بەرزەکانی ئەمریکا دەکاو دەیخوێندنەوە.. پاشان هەستا بەکارێك کەشتی وامان لەوەوپێش نەبیستبوو بێجگە لە ئەو..! هەستا بە خوێندنەوەی ژیان نامەی کەڵە پیاوانی هاوچەرخ.. پاشان دەستی کرد بە نامە نوسین بۆیان و داوای لێدەکردن کە زیاتر شارەزابێ لەبارەی منداڵیانەوە..

ئەمیش گوێگرێکی زۆر چاك بوو. هانی پیاوە گەورە بەناوبانگەکانی دەدا کەباسی ژیانی خۆیان بکەن.. نوسی بۆ (جەنەڕاڵ جیمس جار فلیت) کەیەکێك بوو لەوانەی خۆی هەڵبژاردبوو بۆ سەرۆکی ئەمریکا لێی پرسی: ئایا ڕاستە؟ وایە؟ کە دەڵێن بە منداڵی زۆر چەتون و بزێو بویت؟!.. هەروەها نوسی بۆ (جنراڵ گرات) کەدەربارەی جەنگێکی دیاری کراوی بدوێت؟ جنراڵ هەستا بەکێشانی نەخشەیەكو ئەم منداڵەی دەعوەت کرد تا شەویش پێکەوە بن و بەدوور و درێژی لەسەر نەخشەکە بۆی باس بکات! کەتەمەنی لەوکاتەدا (چوارده) ساڵ بوو؟!! وە نوسی بۆ (هیمرسون) و هانیدا کە باسی ژیان نامەی خۆی بکات!.. هەر ئەوەندەت زانی کە (پۆستەچی)یەك وای لێهاتووە نامەگۆڕینەوە وتوویژ لەگەڵ گەورە پیاوانی

وولآت دا دەکات: وەك: (ئیمرسون) (فیلیپ) (ئۆلیڤر) (وندل هۆلمز (ولنجفلیو) (ئیبراهام لنکۆڵن) (لیوزاما ئیلکوت) (جنراڵ شیرمان) (جیفرسون دیفین)!!.. وەهەر بەنامە ناردنەوە نەوەستا بۆیان و بەس .. نەخێر بەڵکوو لە کاتی مۆڵەت و ڕۆژانی پشودا خۆی سەردانی ماڵەکانیشی دەکردن!!.. ئەم تاقیکردنەوانە بڕوایەکی وایان تیادروست کرد کە بەهەزاران دۆلار نەکڕێت.. جارێکیان (ئیزاك مارکسون) پاڵەوانی جیهانی لەچاوپێکەوتنی بەناوبانگانی جیهاندا پێی ووتم: (زۆرێ لەخەڵکی شکستی ڕوویان تێدەکات) لەهونەری یەکەمین چاوپێکەوتندا) کەناتوانن شوێنەوارێکی چاك بەجێ بهێنن لەدەروونی ئەوانەدا کە ئەمان یەکەم جار پێیان دەگەن) ئەمەش بەوە دەبێت کە بە ئارامی و وردی گوێ شل بکەیت بۆیان!!.. ئەمانە هەرگرنگی بەڕێکخستنی ووشەکانی خۆیان دەدەن و هەر خۆیان قسە دەکەن بوار نادەن بە بەرامبەرەکەیان و خۆیانی لێ کەڕ دەکەن!.. گەورە پیاوان پێیان ووتم: کە ئەمان کەسێکیان دەوێت و لایان خۆشەویستە کە بەجوانی گوێیان بۆ بگرێ. هەتا کەسێك کەبە جوانی و چاك قسەیان لەگەڵ بکات.. بەڵام وادیارە توانین و هەستان بەگوێگرتن بۆ بەرامبەر لەهەموو ڕەوشتەکانی تر کەم باوو نامۆترە!.. نەك هەر گەورە پیاوان پێویستیان بەوە هەیە کە بەجوانی گوێیان بۆ بگیرێ.. بەڵکو هەر هەموو بەگشتی وایە.. هەروەك چۆن گۆڤاری (ریدرز دایجست) جارێك نوسی: زۆربەی خەڵکی کە پزیشك بانگ دەکەن (بۆ ماڵەوە) بۆ ئەوە نییە کە فەحسیان بکەن بەڵکو بۆئەوەیە کە بە وردی و بەهێمنی گوێیان بۆ شل بکەن)!.. لەناهەموارترین کاتی جەنگی ناوخۆییدا لەئەمریکا سەرۆکی ئەمریکی (لنکۆڵن) بەپەلە نامەیەك دەنوسێت بۆ یەکێك لەهاوڕێ کۆنەکانی لە (سبر نجفیلد) ی سەر بەویلایەتی ئەلیەنوا.. داوای لێدەکات کە هەرچی زوترە بکاتە لای لە (واشنتۆن)..

چونکە هەندێ گیرو گرفت هەن و دەبێت بەیەکەوە لێی بکۆڵنەوە.. هاوڕێکەی خۆی گەیاندە کۆشکی سپی .. (لنکۆڵن) دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیدا ماوەی چەند کاتژمێرێك دەربارەی ڕای خۆی لەمەسەلەی دەرکردنی بڕیاری (ئازادکردنی بەندەکان) وە هەموو ئەو ڕاوبۆچونانەی کە دەر بڕاون لەو مەسەلەیەدا خستنیە

ڕوو.. ڕاکان بەدەرکردنی بڕیارەکەو یان بە دەرنەکردنی و گرتنی لایەنی نەیار.. پاشان ئەو ووتار و باسانەی کە نوسراون و تۆمار کراون لەو بارەوە بۆ خوێندنەوەکە هەندێکیان نەیار و هەندێکیان لایەنگری دەرکردنی بڕیاری بەندە ئازادکراوەکان بوون!.. بەڵێ (لنکۆڵن) لەقسە دوور و درێژەکەی بوویەوە.. هەر دوو دەستی هاوڕێکەی گوشارد و شەوێکی شادی بۆ خواست یەکسەر گەڕایەوە بۆ (ئەلنەواا)!!. بەبێ ئەوەی تەنانەت بپرسێ لەڕاوبۆچوونی ئەو لەو مەسەلەیەدا!.. بەدرێژایی ئەو کاتەی کە (لنکۆڵن) قسەی دەکرد .. هاوڕێکەی بێدەنگ و لەسەر خۆ دەستی خستبووە ژێر چەناگەیی و گوێی بۆ شل کردبوو.. لەوبارەیەوە ئەو هاوڕێیە دەڵێت:

کاتێ کەلەقسەکانی بوویەوە هەستی بە حەوانەوەیەکی دەروونی دەکرد و لەڕاستیدا پێویستی بە ئامۆژگاری و ڕای من نەبوو!.. بەڵکو بۆ گوێگرێکی لەسەرخۆ و بەئارام دەگەڕا کەنیازی خۆی لابدرکێنێ و ئەوەی بەخەیاڵیدا دێت بۆی باس بکات!.. ئەمەش هەموو یەکێ لەئێمە پێویستی پێیەتی بەتایبەت کاتێ کە ماندوویی و ناڕەحەتی و گیروگرفت چواردەوری دەدەن.. ئائەمەیە کە زۆر جار (مشتەری توڕە) و (فەرمانبەری بێتاقەت) و (هاوڕێ بەسوك سەیرکراو) ئاواتە خوازن دەستیان کەوێت.. کەئەگەر دەتەوێت خەڵکی لەچواردەورت نەبن و لێت دوور کەونەوە نەیەن بەلاتەوە کاتێ پشتیان لێ هەڵبکەیت لە دواوە گاڵتەو لاقرتێت پێ بکەن.. ئائەم ڕەوشتانە جێبەجێ بکە:

بواری کەس نەدەیت دەم بکاتەوەو قەسە بکات.. هەربەردەوام باسی خۆت بکە.. وە ئەگەر بیرێك هات بەمێشکتدا لەوکاتەدا هاوڕێکەت قسەی دەکرد یەکسەر پێی ببڕەو نەهێڵیت تەواوی بکات.. چونکە ئەو وەك تۆ زیرەك و ژیر نییە.. جا ئیتر بۆ کاتت بەزایە دەدەیت لەگوێگرتن بۆ قسە بێسوودەکانی؟!.. قسەکەی لە نیوەدا پێ ببڕە و بەری لێ ببڕەوە و بەرپەرچی بدەرەوە!.. ئایا کەس دەناسیت ئەم ڕەوشتانەی تێدابێت؟!.. من دەیناسم!.. بۆ نەگبەتی و زۆر جێی داخ و

سەرسوڕمانە کە هەندێ لەم جۆرە کەسانە ناوو شووڕەتێکی پرشنگداریشیان هەیە لە ناو کۆمەڵدا!..

دکتۆر (نیکۆلاس بتلر) سەرۆکی زانکۆی کۆلۆمبیا دەڵێت: ئەو پیاوەی کە هەرباسی خۆی دەکات و بەس بەتەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە.. وەئەوکەسەی کە بەتەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە پیاوێکی نەفامەو پێویست دەکات کە بۆی بگریت.. ئەوە دەروونی نەخوێندەوارە ئیتر با پلەی زانستی لە ڕادەیەکی بەرزدابێت..! بۆئەوەی قسەکەرێکی لێهاتوو بیت.. دەی یەکەم جار گوێ گرێکی لێهاتووبە..

لەم بارەیەوە (مستر چارلس نورتام لی) دەڵێت: (بۆئەوەی تۆش گرنگ بیت.. گرنگی بە خەڵك بدە).. ئەو پرسیارەی کە دەزانیت بەئاسانی وەڵامت دەداتەوە هاوڕێکەت.. لێی بکە! پاڵی پێوە بنێ و هانی بدە تا باسی خۆی بکات و باسی کارەکانی بکات.. وە دەربارەی ئەو بوارەی کە ئەو پسپۆڕە تیایدا..

وە بزانە بەرامبەرەکەت ئەوەندەی کە گوێ بەخۆی و حەزەکانی و گیروگرفتەکانی دەدات.. سەد ئەوەندەی ئەو گرنگییەکەی کەبەتۆ و حەزەکانت و گیروگرفتەکانی تۆ دەدات..

وە بزانە کە دەرچوونی بایەك لەبەرامبەرەکەت لەناو کۆمەڵێکدا زیاتر ئازاری پێدەگەیەنێت و ناڕەحەتی دەکات لەوەی کە ببیستێ گەلی چین گرانی و برسێتی زۆریان بۆ هێناوە یان کارەساتێکی دڵ تەزێن ڕوویکاتە ئەفەریقیا ئەوەندەی (با)کەی خۆی ناخۆش نیە بەلایەوە!!..

دەی تۆ ئائەمانەت لەپێش چاو بێت زۆر بەچاکی.. بۆ جاری دووەم کە لەگەڵ هەر هاوڕێیەکت قسەو لێکۆڵینەوە دەکەیت..

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی خۆشی بوێت بڕگەی ژمارە (٤) جێبەجێ بکە:

**( گوێ گرێکی باش بەو بەرانبەرەکەت هان بدە لە بارەی خۆیەوە قسە بکات ).**

## بەشی دووەم

## پاشکۆی چوارەم/ بواری براکەت بدە با قسەی خۆی بکات تۆش هێمنانە گوێی بۆ بگرە

گوێ گرتن بە ووردی و هێمنانە بۆ ووتە و بەڵگەی (بەرامبەر) شێوازێکە قورئانی پیرۆز گرنگی پێداوە و لەکاتی گفت و گۆ لەگەڵ بت پەرستاندا بەکاری هێناوەو موسڵمانانیشی فێر کردووە کەبەووردی گوێ بدەن بە خەڵك و قسەیان پێ نەبڕن..

ئەوەتا کافر و بت پەرستان کاتێ پرسیاریان لێدەکرێ کە بۆچی بت پەرستی دەکەن؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾(الزمر ٣) بۆیە دەیان پەرستین چونکە بە سوودن و لەخوامان نزیك دەکەنەوە!..

پاشان بەڵگەیەکی تر دێننەوە ئەویش ئەوەیە کە ﴿إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ﴾ (الزخرف ٢٣) بۆیە دەیان پەرستین چونکە باو باپیرانمان هەر ئەمەیان پەرستوە ئێمەش ڕێگای ئەوان بەرنادەین.

قورئانیش پاش ئەم قسانە.. بەنەرمی و لەسەر خۆ وازیان پێ دەهێنێ لەبت پەرستی!! کەهیچ کات بت پەرستی کەس لەخوا نزیك ناکاتەوە و بگرە دووریان دەخەنەوە.. چونکە قازانج و زیان بەدەست دارو بەرد نییە.. وەپێی فەرموون: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡ﴾(الفرقان ٥٥)..

بۆ ووتەی دووەمیشیان تێی گەیاندن کە مەرج نیە باوو باپیریان پێکابێتیان و ژیرانە ئەم ڕێگەیەیان گرتبێ دەبا ئەمان کوێرانە ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەنەوە!.. وەك دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ﴾(البقرة ١٧٠)..

تەماشاکە چۆن خوای گەورە نرخ دادەنێ بۆ ووتەی کافر و بت پەرستان و پاشان لەسەر خۆ بۆچوونەکانیان ڕاست دەکاتەوە!..

بەڵام ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی بەووردی گوێ شل ناکەن بۆ بەرام بەرەکانیان و ناهێڵن قسەکانیان تەواوبکەن!.. جاری واش ڕوو دەدات کە قسەکەی پێ دەبڕێ و

دەڵێ: بەسە بەسە چی دەڵێیت من لەوسەرەوە دێمەوە!.. کەئەم خاڵە خاڵی یەکەمی دڵ ئێشانی بەرامبەرەکەیە کە وای لێ دەکات هەرگیز گوێت بۆ نەگرێت!!..

(پێغەمبەر)مان ﷺ ئەگەر کەسێ قسەی بۆ بکردایە بە جوانترین شێوە ڕووی تێ دەکرد و گوێی بۆ دەگرت و تا لێ نەبوایەتەوە قسەی پێ نەدەبڕی.. بۆیە کاتێ بێ باوەڕان (وەلیدی کوڕی موغەیرە) دەنێرن بۆ خزمەت ((پێغەمبەر)) تاوازی پێ بهێنێ لەقسە وتن بە (لات) و (عوزا) و ڕێك بکەون.. (وەلید) دەست دەکات بە قسەکردن بەدوورودرێژی بۆ (پێغەمبەر) (ﷺ) (پێغەمبەر) چاك دەیزانی کەباسی چی دەکات بەڵام لەسەر خۆ گوێی بۆ شل کرد تا چی پێبوو هەڵی ڕشت لەدواییدا وتی: ئەگەر پاشاییت دەوێ ئەت دەینێ! ئەگەر دەوڵەمەندیت دەوێ دەتدەینێ!.. بەڵام ئیتر بابەس بێت عەقڵمان تێك مەدە و گاڵتە بەبتەکانمان مەکە!.

پاشان (پێغەمبەر) فەرمووی: (وەلید) لێبوویتەوە؟ وتی: بەڵێ.. فەرمووی: دەی تۆش گوێ بگرە بۆیە دەستی کرد بەخوێندنی ئایەتێکی قورئان کەباسی ئەوە دەکات ئەگەر باوەڕ نەهێنن خوای گەورە سزایەکی وەك هەورە بروسکەی لەناوبەری عاد و ثمودتان بۆ دەنێرێت: ﴿أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾(فصلت ١٣)!.. ئەوەبوو (وەلید) بەترس و لەرزێکەوە هەستا و گەڕایەوە بۆلایان و وتی: واز لەم پیاوە بێنن با کاری خۆی بکات!.. وتیان (محمد) تۆشی تێك دا و کاری تێکردی!!..

گوێ بگرە بۆ خەڵکی بەوردی.. پاش ئەوە تۆش بەتەما بە گوێت بۆ بگرن و بێنە سەر قسەت..

بۆچی دوکاندار لەبازاڕ دەمی خۆی لەگەڵ کڕیار ماندوو دەکات و دەست دەکات بە وەصف کردن و پیاهەڵدانی شتەکانی (ئەصڵە-یابانیە-شکانی بۆنییە-نارزێ-دەست ناکەوێ-ئەها خۆشم لەوەم کردووە) لەگەڵ ئەم هەموو قسەیەی فرۆشیاردا کەچی کڕیار لێ ی دەدا و دەڕوات!..

بۆچی؟ چونکە هەموو کڕیارێك لەماڵەوە جۆر و وەصفی ئەو شتەی کە دەیەوێ بیکڕێ بۆی کراوە.. فرۆشیار لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو شتەی نەبێت و کڕیاری لە

کیس بچێت ناوێرێت بە جوانی گوێ بگرێ بۆ کڕیار بزانێت چی و چ جۆرێکی دەوێ؟!!..

زانایانی ئیسلام هەر لەمێژەوە هەستیان بە چاکی و پڕ سوودی گوێ گرتن کردووە و زانیویانە کە (بەرامبەر) چەند دڵخۆش دەکات، بۆیە یەکێ لە زانایانی (تابعین) بەناوی (عطا) وە دەفەرموێت: (جاری وا دەبێت گەنجێك شتم بۆ باس دەکات ئەو لەدایك نەبووە من ئەو شتانەم بیستووە!! بەڵام بەجۆرێ گوێی بۆ دەگرم کە وابزانێت یەکەم جارمە بیبیستم)!..

هەندێ لە پیاوانی بانگەوازی ئیسلام کەوتوونەتە ئەم هەڵەیەوە بۆیە بەدوورو درێژی هەر قسە دەکەن بۆ قوتابیەکانیان و بۆ خەڵکی.. بواری کەس نادەن قسەیان بۆ بکەن خۆیان لەشام دەیهێنن و لەشیراز ڕەدی دەکەن) و جۆرەها بەسەرهات و تەفسیری قورئان و فەرموودە دەدەن بۆیان.. لەم بوارەدا زۆر خۆیان ماندوو دەکەن..

بۆچی؟.. وا دەزانم یەکێ لەهۆسەرەکییەکانی ئەوەیە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەورد و درێـژی گوێیـان شـل نـەکردووە بـۆ قوتابیـان تاچـی لەدڵیاندایـە دەری بـبڕن و لەگیروگرفت و گومانە دەروونییەکانیان ئاگاداربن و پاشان بەپێی پێویست شوێنە نەخۆشەکەیان بزانن و چارەیان بۆ بنوسن..

وەك ئەو دکتۆرەی کە لەنەخۆش نەپرسێت و گوێی بۆ نەگرێت و لەشوێنی نەخۆشیەکەی ئاگادار نەبێت و هەر بڵێت ئائەم صیدلیەیە پڕە لەدەرمان بەکاریان بهێنە ئایا زیاتر سەرگەردان و نەخۆشی ناخات؟.. بەڵام ئەگەر بزانێت چییەتی یەك حەب یان یەك گولاج بەسە بۆ چارەسەر کردنی!!. نەك یەك صیدەلی تەواو!!.

گوێ گرتن بۆ بەرامبەرەکەت هەر هیچ سودی نەبێت خۆ ئەوەندە سوودی هەیە کە ویژدانی بجوڵێنێت و تۆی خۆش بوێت و بچێتە دڵییەوە پاشان چیت بوێ بۆت بکات!.. خوێنەری ئازیز نمونەیەکت لەم بارەیەوە بۆ دەگێڕمەوە: لەساڵی (١٩٨٧) لە بەغداد بووم ویستم مۆڵەتی خۆشنووسی (إجازة الخط) دەربهێنم و بەڕەسمی ببمە (خطاط)..

بۆیە ئاگاداریان کردم کە (حاجی خلیل الزهاوی)سەرۆکی بەشی خۆشنووسی لە مەڵبەندی (صدام)ی هونەری لەشەقامی حەیفا دەوام دەکات.. منیش ڕۆیشتم بۆ ئەو مەڵبەندە.. بەپەرۆشەوە بووم کە خۆشنوسێکی ناوداری کورد ببینم وەك (زەهاوی) بۆیە بەپەلە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم و ڕۆیشتم بۆ ژوورەکەی. کچێکی هونەر دۆستی لەتەنیشتەوە دانیشتبوو قسەیان دەکرد..

پاش سڵاو کردن بەرامبەری دانیشتم و کەمێ بێدەنگ بووم و لەدڵی خۆمدا وام بڕیاردا کەیەکسەر ئەوەی بۆی هاتووم پێی نەڵێم تا زیاتر لەلای بمێنمەوە.. پاش ماوەیەك ڕووی تێ کردم و ووتی: تۆ خەتی منت بینیوە؟ منیش دەست بە جێ پێم ووت: من تۆم لە خەتی فارسی دا بەرابەری هەموو خۆش نووسەکانی کورد و عەرەب داناوەو تابلۆکانی تۆم چووە بە دڵدا و هەر لەسەر کوڕاسەکەی جەنابتان خۆم فێری خەتی فارسی کردووە!!.. هەرکەوام ووت مامۆستا خەلیل وەك گوڵ گەش بوویەوە و دەستی لەفلیش وقامیش و وەرقەی سەرمێزەکە هەڵگرت و ڕوخسەتی لە ئافرەتەکەی تەنیشتی وەرگرت و هاتە تەنیشتمەوە وپێی ووتم: ئێ چۆنی!.. چی دەکەی لە بەغداد؟ خەڵکی کوێی؟ منیش لەسەر خۆ وەڵام دەدایەوە هەرکەبیستی ووتم خەڵکی (هەڵەبجە)م..

زیاتر ڕووی خۆش بوو پاشان ووتی: دەزانیت (هە ڵەبجە) خۆشترین شارە لەلامو چووە بەدڵمدا!.. ووتم: بۆ بەڕێزتان هەڵەبجەی بینیوە؟..

ووتی: یان چی من لەسەڵی (١٩٧١)لە مزگەوتی پاشا خادم بووم و لەساڵی (١٩٧٤)هەر خوا ڕەحمی کرد لە بۆردومانەکەدا تیا نەچووم!..

پاش ئەم قسانە کەمن بەبێ دەنگی هەر گوێم گرتبوو ووتی: هەندێ تابلۆی نوێم نوسیوە هەڵسە بابچین سەیریان بکەین.. کاتێ بردمی بۆ ژورەکەی لەو دیو چەند تابلۆیەکی خۆی پێ نیشان دام.. منیش زۆر سەرسامیم بەرامبەریان دەردەبڕی لە ڕاستیدا زۆر جوان و بەهێز بوون کاتێ تابلۆکانم سەیر دەکرد ووتم: زۆر جوانن!.. وە پێم ووت: کە من لەوەو پێش وام زانیوە بەس لە خەتی فارسیدا بەهێزیت! بەڵام بۆم دەرکەوت کەلە خەتی (ثلث) دەستێکی باڵات هەیە!!.. تاوای لێهات لە خۆشیدا

فەرمووی لێ کردم کە پێکەوە بابڕۆینەوە بۆ ماڵ زیاتر لەم باسانە بدوێین بەڵام من داوای لێ بووردنم کرد چونکە پاش نیوەڕۆ دەوامم هەبوو..

پاشان ووتی: کاك عمر چ کارێ یان پێویستی یەکت هەیە تا من بیخەمە سەرچاو!! ئالێرەدا ئەوەی بۆی هاتبووم پێیم ووت! ئەویش بەهەموو خۆشحاڵییەکەوە یەکسەر وەرەقەیەکی هەڵگرت و تێیدا نووسی: بۆ سەرۆکی بەشی خەتی عەرەبی (بەڕێز عبد الحکیم الورد) هەڵگری نامە خۆش نووس؟.. یەکێکە لە خزمە نزیکەکانی من!!. بەڵکو بەزوترین کات (مۆڵەتی خەتی)پێ بدەن!! لەگەڵ ڕێزو پێزانینماندا!!! ئیمزا: حاجی خلیل الزهاوی!!!

کەواتە خەڵکی ئە و پەڕی بەرزی و پلەیان هەبێت هەر پێویستیان بە گوێگرێکی هێمن هەیە کە قسەو پێشنیارەکانیان پێش کەش بکەن لەلایان..وە زۆر قین و دووبەرەکی لەوەوە دروست دەبێت کە ئەندامەکانی کۆمەڵگا (نرخ) بۆ قسەی یەکتر دانەنێن و بەچاوی سوکەوە سەیری بکەن و گوێی بۆ نەگرن.. لەبیرم ناچێت کە جارێکیان بەبرایەکی ئاواز دانەرم ووت: ئاوازم بۆ فلان سرود داناوە، ئەویش دەستی کردە پێکەنین و ووتی: تۆش ئاواز دادەنێت!؟ هەستا و بەجێی هێشتم..

منیش ئەو برایەم کەمێ لەبەر چاو کەوت.. دەی با بیوتایە ئاوازی چی!.. ئادەی با گوێم لێ بێت! باوەڕبکە زۆ خۆشە و تۆش توانای ئاواز دانانت هەیە وە ئەگەر لەم ئاوازە خۆشترمان دەست نەکەوت ئەوا ئەمەی تۆ ئامادە دەکەین!..

دڵی من چەند خۆش و کامەران دەبوو. ئیتر با ئاوازەکەشم ئامادە نەکرایە..

## ڕێگای دووەم

## پێنجەم/ چی بکەیت خەڵکی بە بینینت دڵخۆش بن؟

(ئیو دۆر روزفلت) لە (ئویسترباری) هەرکەسێ سەردانی بکردایە سەری سوڕ دەما لە پایەبەرزی و شارەزاییە لەڕادە بەدەرەکەی.. ئیتر بائەو میوانە گاوان بوایە یان ئەسپ سوار بوایە یان لەگەورە پیاوان بوایە لە بواری ڕامیاریدا..

ڕۆزفت بەو مەیدانەوە قسەی لەگەڵ دەکرد کە هەریەکەیان تیایدا پسپۆڕ بوون! وتیایدا ڕۆچووبوون!.. ئەمەی چۆن بۆ دەچووە سەر؟.. وەڵامەکەی زۆر ئاسانە!..سەرۆکی ئەمریکی ( تیۆدۆر ڕۆزفلت ) هەرکاتێ بیزانیایە کە میوانێکی دێت ماوەیەك پێش گەشتنی .. دەیپرسی کە حەزو ئارەزووی لە چییەوو لەچیدا زیاتر شارەزاو پسپۆڕە؟.. ئەو کاتە دەچوو شتێکی لەوبارەیەوە دەخوێندەوەو لەو بوارەدا کەمێ خۆی شارەزا دەکرد!...

چونکە (ڕوزفلت)چاك دەیزانی تاکە ڕێگایەك بۆ دەست کەوتنی دڵی کەسێك ئەوەیە کەلەو بارەیەوە قسەی بۆ بکەیت کە خۆی تێیدا دەژی و ئارەزوومەندییەتی نەك لەشتێکی ترەوە.

(ویلیم لێون فلیبس)کە پێشتر مامۆستای وێژە بوو لە زانکۆی(بیل) هەر لەسەرەتای ژیانی یەوەئەم وانەیە فێر بووبوو.. بۆیە لە باسێکدا کە بۆ گۆڤارێك نوسیبووی بەناوی (دەربارەی سروشتی ئادەمیزادەکان)دا و تیایدا دەڵێت:

کاتێك منداڵبووم تەمەنم هەشت ساڵان بوو.. خوم پێوە گرتبوو کە لە هەموو کۆتایی هەفتەیەکدا دەچووم بۆ سەردانی پورم(لیبی لنسی) لە (سنراد فورد).. ئەوە بوو ئێوارەیەکیان گەشتمە ئەوێ میوانێکیان هەبوو .. هەرکە زانی من هیوایەتم بەلەم و کەشتی دەریاوانیە .. ڕەوی قسەکانی گۆڕی بۆ باسی بەلەم و جۆرەکانی و ڕەنگەکان و هەموو لایەنێکی (بەلەم).

قسەکانی ئەم پیاوە کاریان کردە سەر دەروونم و شوێنەوارێکی جوان و خۆشیان بەجێهێشت.. کاتێ کە هەستا و ڕۆیی. منیش پرسیم لە پورم: ئایا

ئەمەکیٚ بوو؟ ئەی هۆی ئەو گرنگی دانەی بە (بەلەم)چی بوو؟ پورم پیٚی ووتم: ئەمە لە نیویۆرك پارێزەرە.. وە هیچ پەیوەندییەکی( نەدوور و نزیکی ) نییە بەبەلەمەوە!..

لێم پرسی دەباشە: پوریٚ گیان ئەی بۆچی قسەکانی هەموو دەربارەی بەلەم و بەلەمەوانی بوو؟!..

پورم وەڵامی دامەوە ووتی: چونکە ئەو پیاوێکی زۆر خۆش و هەمەزانستەیە.. هەر کەبە قسەکانتدا زانی تۆ حەزت لەباسی بەلەمەو لەهەموو باسێکی تر زیاتر پێت خۆشە.. ئیتر ئەویش لەبەر ڕاگرتنی دڵی تۆ لەباس کردنی بەلەم دا ڕۆچوو..

لەکاتێکدا کە من ئەم بەشە دەنووسم ووتەی (ئیدوارد شالیف) لەبەردەستمدایە کە ئەو یەکێکە لە پیاوانی لێزانی و کارامەیی.. تیایدا دەڵێت:

کۆمەڵێك لە پیاوانی کەشافە خۆیان ئامادە کرد بۆ گەشتێك بەناو (ئەورووپا)دا. لە ژێر چاودێری مندا.. یەکێك لەوانە منداڵێکی بچووك بوو کە زۆر حەزی دەکرد هاوبەشی بکات لەو گەشتەدا بەڵام دەست کورتی و نەبوونی خەریك بوو ببێتە بەربەستێك لە ڕێگای ئەم حەزەیدا..

منیش هەستام چووم بۆلای بەڕێوەبەری دەزگایەکی گەورە بە هیوای ئەوەی کە ئەرکی ماددی ڕۆشتن و گەڕانەوەی ئەو منداڵە بگرێتە ئەستۆ.. پێش ئەوەی بچم بۆلای بیستبووم کە چەکێکی (شیك)بانقی کردبوو کە بۆوەرگرتنی (ملیۆنیٚ ڕیالٚ ) کرابوو!! پاش بەکارهێنانی هەستابوو بە چوار چێوەتیٚ گرتنی و لەناو شووشەدا هەڵی گرتبوو.

هەر کە گەیشتمە نووسینگەکەی.. پاش ماوەیەکی کەم داوام لیٚ کرد کە حەز دەکەم ئەو چەکە ببینم بۆیە پێم ووت: چەکێکی ملیۆن ڕیالٚ؟ من وانازانم کە پێش ئەم کەسیٚ: بووبێت چەکی ملیۆن ڕیالی بڕیبێت!..

چەند ئاواتە خوازم کە ئەو چەکە ببینم و.. پاشان لە ماڵەوە بۆ منداڵەکانمی بگێڕمەوە کە من بەچاوی خۆم چەکی ملیۆن ڕیالێم بینیوە..!

کابرای بەڕێوە بەر گەش بوویەوە و بەپەلە چەکەکەی دەرهێنا و بە خۆشی و کەیفەوە پیشانی دام!.. منیش بەپەرۆشەوە لێم پرسی کە بۆم باس بکات چۆنی نوسی بۆ کێ و بۆچی نوسی؟..

بێگومان لێرەدا تۆ سەرنجی ئەوە دەدەیت کە (مستر شالیف) دەربارەی خۆیی و گەشت و منداڵە دەست کورتەکە و کۆمەڵە پیاوەکەی کە نیازیان وایە گەشتێك بە ئەوروپادا بکەن.. تاقە ووشەیەك نەدوا!!..

پاش کەمێ دوای باس کردنی چەکەکە بەڕێوەبەر لێی پرسیم: (ئابیرم کەوتەوە!! ئەو بۆنەیە چیبوو.. کە لە پێناویدا هاتوویت من ببینیت؟.. لێرەدا منیش هۆی سەردانەکەم بۆ باس کرد..

ئەوەی زیاتر سەرسامی کردم ئەوە بوو کەیەکسەر هات بەدەم داواکاریەکەمەوە!.. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو زیاتر لەوەش. من بۆ یەك کەس داوام کرد کەبینێرێت بۆ ئەورووپا.. کەچی ئەو ناردنی(٥)کەس و خۆمی گرتە ئەستۆ!.. کە بەهەموو پێداویستییەکیانەوە بیانێرێت بۆ ئەورووپا!..

لەمەش زیاتر: چەند نامەیەکی پێدام کە نووسیبووی بۆ هەر هەموو لقەکانی کۆمپانیاکەیان کە لە هەمو پایتەختێکی ئەورووپادا هەن.. کەلەوێ بێن بەدەممانەوەو کارمان بۆ ئاسان بکەن و کۆمەکی ئەم گەشتەمان بکەن!..

تەنانەت لە (پاریس)ڕێکەوتی یەکترمان کرد. ئەو بەڕێوەبەرە جێی نەهێشتین.. تالە گەڵماندا هەموو شار گەڕاو لە زۆر شت ئاگاداری کردین!!..

وەمن لە (سەدا سەد)١٠٠٪ دڵنیام کە ئەگەر لەسەرەتای چاوپێکەوتنەکەوە من خۆم قسەکانم لەو شتانەوە دانەمەزراندایە کەئەو حەزی لێ یەتی و پەیوەندی بەوەوە هەبوو.. دیارە نەم دەتوانی کە وای لێ بکەم ئاوا بەو خێراییە بێت بەدەممەوەو یەك لەدەی ئەویارمەتیانەم دەست نەدەکەوت..!.

خۆ بینیت کە چۆن ڕێگایەکی سەرکەوتووە لە جیهانی کاروفەرماندا؟..

ئەم نموونەیەش وەربگرە:

(هنری دوڤرنوا) کە خاوەنی چەند نانەوایەکی گەورە بوو لە ڕیزی نانەوا گەورەکانی (نیویۆرك) دەژمێردرا..

ئەم (مستر دوڤەر نەوا)یە دەیویست کە بەردەوام نان بفرۆشێت بە ئۆتێلێکی گەورەی بەناو بانگ لە پایتەختی ئەمەریکادا..

بۆ ئەم مەبەستە.. هەموو هەفتەیەك ڕۆژێ سەری لەبەڕێوەبەری ئۆتێلەکەدەدا.. ئەمەش بۆ ماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو... کە هەرجێگایەکیش بیزانیایە بەڕێوە بەر سەری لێ دەداو هات و چۆی دەکات وەك جێگا گشتییەکان و شوێنە کۆمەڵایەتیە کان.. ئەمیش خێرا هەڵدەسا و دەچوو بۆ سەردانی ئەو جێگایە کەبەڕێوەبەر بۆی چووە!.. تەنانەت ژوورێکی تایبەتیشی لە ئۆتێلەکەدا گرتبوو کە هەندێ کات خۆی تێدا دادەنیشت.. بۆ ئەوەی زیاتر نزیك ببێتەوە لێی و بەوبۆنەوە زووتر پەیمان نامەی کڕین و فرۆشتنی نان لە نێوانیاندا مۆر بکرێت!.. بەڵام هیچ سوودی نەبوو!!..

بۆیە (مستر دوڤر نەوا)دەڵێت: دوای ئەوەی کە دەربارەی پەیوەندی یە ئادەمیەکان شتم خوێندەوەو فێر بووم.. نیازم کرد کە لەمەولا ئەو ڕێگایەم بگۆڕم و ڕێگایەکی تر بگرمە بەر.. بۆیە بڕیارم دا کە بگەڕێم بەدوای ئەوشتەی کە ئەم پیاوە حەزو ئارەزووی لێیەتی و لە هەموو شتێکی تر زیاتر مەبەستیەتی.. لەکۆتاییدا دۆزیمەوە.. بۆم دەرکەوت کە ئەم کابرایە سەربە دەستەیەکە کەیەکگرتنی هەموو خاوەن ئۆتێلەکانی ئەمەریکای گرتبۆتە ئەستۆ کەناوی ئەو دەستەیە(دەزگای ئەمەریکی خاوەن ئۆتێلەکان)ە

ئەم پیاوە نەك هەر ئەندامێکە و بەس لەم کۆمەڵەدا!.. بەڵکو دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ کارەکەی وای کردبوو کە بیکەن بەسەرۆکی ئەو دەزگایە!.. بێجگە لەمەش سەرۆکی یەك دەزگای تریش بوو بەناوی (پێش وازی کارانی وولاتان)..!

ئەم پیاوە حەزو خۆشەویستی و لێبڕانی بۆ ئەم دەزگایە وای لێ کردبوو کەلەلای گران نەبوو لەپێناوی یەك دانیشتن و کۆبونەوەی دەزگاکەدا سەرکەوێت بەسەر

کەژو کۆسارو هەردو چیا بڵندەکاندا و ڕوبارو دەریامەزنەکان بەمەلە بېڕێ بێ ئەوەی کە گوێ بداتە ئەو ئێش و ئازارو چەرمەسەریەی پێی دەگەشت!!..

دوای ئەوەی کە ئەم زانیاریانەم دەست کەوت لەبارەیەوە.. هەستام و چوومە لای و دانیشتنێکم لەگەڵ کرد.. بەڵام ئەم جارەیان سەرنجم ڕاکێشا و دڵیم خۆش کرد بەوەی کە لەبارەی (پێشوازی کەرانی وولاتان)ەوە قسەم دامەزراندو بۆم باس کرد!!.. لە قسە گەرم و گوڕەکانییەوە بۆم دەرکەوت کە گشت هۆی خۆشی و کامەرانی و دڵشادیەکی ئەو ئەم دەزگایەیە و تاکە ئاواتی ژیانیەتی..

پێش ئەوەی نووسینگەکەی بە جێ بێڵم و خوا حافیزی لێ بکەم.. ڕەزامەندی خۆم دەر بڕی کە بمکاتە ئەندامێك لەم دەزگایەیدا و بەشانازیەوە بووم بەئەندام!..

لەکاتی ئەو چاوپێکەتنەدا دەربارەی نان و نانەوا هیچم نەوت!.. پاش چەند ڕۆژێکی کەم بەتەلەفون قسەی لەگەڵ کردم و پاشان داوای لێ کردم کەلەلای ئامادەبم و بارمتە و نرخ و پێداویستییەکانی تر لەگەڵ خۆمدا بێنم!!..

سەیر کە و بیر لەمە بکەرەوە.. چوار ساڵی ڕەبەق لەسەر یەك من لەدەرگای ئەم کابرایەم داوە ویستوومە نان لەمن بکڕێت بۆ ئۆتێلەکەی!.. ڕاستر وایە کە بڵێم تا ئەم ساتەش هەربێ هوودە لەدەرگاییم دەدا.. ئەگەر هەوڵم نەدایە و خۆم ماندوو نەکردایە بەدوای گەڕان بەشوێن ئەوشتانەی ئەو حەزی لێ دەکات و وپێی خۆشەو باسی لێوە بکرێ لەلایدا..

لەکۆتاییدا دۆزیمەوە و بەدۆزینەوەی ڕێگای دوورو درێژ کورت بوویەوە!..

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی خۆشی بوێیت.. بڕگەی ژمارەی (٥) جێبەجێ بکە کە ئەمەیە:

( **دەربارەی شتێ بدوێ کە بەرامبەرەکەت حەزی لێیەتی و پێی خۆشە** ).

## بەشی دووەم

## پاشكۆی پێنجەم/ گوێ بەحەزی براكەت بدە گوێ بە حەزت دەدات!..

بۆئەوەی زیاتر ئادەمیزادەكان خوایان خۆش بوویێت و بیپەرستن و لەڕێگاكەی لانەدەن بێجگە لەو هەموو بەخششانەی كە داویەتی پێیان بەهەشتێكی گەورە و ڕازاوە و نەبڕاوەی بۆ ئامادە كردوون!..

هاوەڵێكی موجاهیدی (پێغەمبەر)مان لەگەرمەی جەنگدا پرسیی لە (پێغەمبەر) (ﷺ) ئایا ئەگەر كوژرام لە كوێم؟ فەرمووی: لەبەهەشتدای، كابرا خورماكەی دەخوارد خورماكانی دەستی فڕێداو ووتی: چونكە لەبەهەشت دوام دەخات!.. ئایا دەزانیت؟ هۆی چییە وابەهەشت ئەوەندە خۆشەویستە و گشتی حەزی لێ دەكات؟..

وەڵامەكەی:

چونكە خوای پەروەردگار مرۆڤی دروستكردووە و زۆر چاك دەزانێت دەروونی حەز لەچی دەكات و چی پێخۆشە.. هەر بەپێی ئەو حەزانە پاداشتی بۆ ئامادە كردوون.. ئاواتی بەرزی ئادەمیزاد ژیانی هەمیشەیی و نەمرییە دەی بەهەشت بەو جۆرەیە ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(البقرة ٢٥).. حەز لەكارنەكردن و حەوانەوەیە بەهەشت ئەوەندە جێگایەكی حەوانەوەیە..

تەنانەت لقی بەرزی درەختی بەهەشت نزم دەكرێتەوە تا هەمووان دەستیان بیگاتێ ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾الحاقة ٢٣)..

كەواتە ئەگەر ویستت بەحەز و ئارەزووی تۆ كار بكرێت.. پێش ئەوە تۆ حەز و ئارەزووی خەڵكی پێشێل مەكە..

(پێغەمبەر)ی ئازیزمان (ﷺ) هەر بەم ڕێگا ناوازەیە توانی گەورەترین ڕووداوی خوێن ڕشتن لە نێوان تیرەكانی عەرەب لادا ئەمە چۆن بوو؟..

لەكاتێكدا عەرەب ویستیان (كەعبە) تێك بدەن و سەرلەنوێ تازەی بكەنەوە كاتێ لێبوونەوە ویستیان بەردە ڕەشەكە بخەنەوە شوێنی خۆی.. لێرەدا مشتومڕ دروست بو هەر تیرەیەك دەیویست خۆی شەرەفی هەڵگرتنی ئەو بەردەی دەست بكەوێت!..

هەمووده‌ستیان دایە شمشێر لەیەکتری!!.. کەس هیوای نەما و هەموو چاوەڕوانی دەست دانە ئێخەی یەکتری بوو!.. لەوکاتەدا پیر و بەساڵاچووەکانیان ناهێڵن و بڕیار دەردەکەن کە کێ سبەینێ یەکەمین کەس بێت وبێتە ناوکەعبەوە ئەوە با ناوبژیوانمان بێت.. بەڵێ هەموو لەسەر ئەمە ڕێك کەوتن و (محمد الامین) یەکەم کەس لەکەعبەدا بینرا و هەمو وتیان (نعم الحکم الامین)..

(محمد) ورد بوویەوە سەیر دەکات هەموو تیرەیەك ئەوپەڕی حەز دەکات کە ئەو هەستێ بەوکارە!..

ئەم حەزەش لەقوڵایی دەروونیاندا جێگیربووە.. وەبەبێ هێنانەدی حەزی هەریەکەیان ئاگری ناکۆکی ناکوژێتەوە!.. (پێغەمبەر) بەوردبینی خۆی بۆی دەرکەوت کە دەبێت هەر هەموویان لەم ڕێزەدا بەشدار بن!.. دەبێت حەزی هەموویان بێتە دی!..

بۆیە هەستا و عەباکەی خۆی داخست و فەرمووی بەردەکە بخەنە سەری پاشان بڕیاری دالەهەر تیرەیەك پیاوێك بێت و دەستی بدەنێ و بەیەکەوە بەرزی بکەنەوە.. هەرهەموو تیرەکان لەلایان جوان بوو لەبەر ئەوە شمشێریان خستەوە کێلان و بەرزیان کردەوە تا ئاستی شوێنەکەی خۆی ئەوجا (پێغەمبەر)مان بەدەستی پیرۆزی خۆی خستییە جێگاکەی خۆی!..

ئەگەر بهاتایە و گوێی بەیەك بەیەکی حەزەکانیانی نەدایە و بیفەرموایە: قەیناکا بادوو تیرەی گەورە و ناودار لەباتی هەمووان هەڵی بگرن!..

لەوەدەچێ ئەوکاتە بەگوێ یان بکردایە.. بەڵام ئەی ئایا دڵی چەند تیرەی دەشکاند و چەند دڵی لەکیس چوو؟..

من وا دەزانم ئەم بەسەرهاتەی پێشوو لەمەیدانی دەروونناسیدا قوتابخانەیە بۆ مان کە فێرمان دەکات تا بۆمان بکرێت دڵی هەموو لایەك ڕاگیر بکەین و نەیان شکێنین.. زۆربەی خەڵکی بەتایبەت بانگ کەرانی ڕێگای ئیسلام.. ئەم ڕێگا مسۆگەرە سەرکەوتووەی (پێغەمبەر)یان وازلێهێناوە و کەم جار نەبێت کاری پێناکەن..! سەیر دەکەیت زۆر جار فەرمان و ئیش و کاردەکەن بەحەز و ئارەزووی

خۆیان!.. بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە حەز و ئارەزووی قوتابییەکانیان و خەڵکی!.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەیسەپێنن بەسەریاندا و دەبێ جێبەجێی بکەن!..

داخم هەر ئەوەیە ئەگەر قوتابییەکی ژیر بڵێ ئەم فەرمانە چاك نییە! خێرا مامۆستاکەی ئەڵێ لەسەرووی تۆوە و ژیر تر بیریان لێ کردۆتەوە!!.. ئیتر نازانێ ئەوە زیاتر قوتابیەکە زویرتر دەکات! چونکە ڕووبەڕوو پێی دەڵێ -بەزوبانی حاڵ- تۆ ژیر نیت!!.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دەبینین زۆربەی لایەنەکان سکالای ئەوەیانە کە ڕادەی گوێڕایەڵی کەم بۆتەوە مەگەر لەبەر ڕووگیری یان لەبەر ڕووپامایی بەگوێیان بکەن.. کەچی (پێغەمبەر)ی خوا بۆ هەندێ فەرمانی گەورە سەربەستی دەخستە دەستی موسڵمانەکان و خۆی کەسێکی تایبەتی دەست نیشان دەکرد.. یان لەزۆر کاتدا قسەی قوتابییەکی خۆی وەردەگرت و قسەکەی خۆی واز لێدەهێنا وەك شوێنی جەنگی بەدرو منذر!.. بەڵام ئەمڕۆ داخەکەم لەناو خەندەق ناوەندی ئیسلامیدا هەر (کفرە) قوتابی ڕەخنە لەبڕیار و هەڵوێستەکانی لە خۆی گەورەترەکان بگرێت!!..

کەواتە باگوێ بدەینە حەزوو ویستی خەڵکی و مەرج نیە حەزی من و تۆ حەزی ئیسلام بێت و بەس، عومەری کوڕی خەتاب بەسەرکردەیەکی دادپەروەری ناوازە ناوی دەرکردبوو لە مێژوودا! لەبەرچی؟ لەبەر زۆر هۆ بەڵام یەکێ لەو هۆیانە ئەوەبوو کە بەحەز و ئارەزووی گەلان دەجولایەوە نەك حەز و ئارەزووی خۆی لەبەر ئەوە ئەو گەلانەش بەحەز و ئارەزووی ئەم رەفتاریان دەکرد.. کاتێ سوپای ئیسلام کوردستانی لەچنگی فارسە کیسراویە ئاگر پەرستەکان ڕزگار کرد نامەیان بۆ (عومەر) نووسی: کە گەشتووینەتە گەلێکی ئاواو ئاوا.. زۆر بەجەرگ و دڕن..!. عومەر فەرمووی: خانوە قوڕینەکانیان نەڕوخێنن و ئاگرەکانیان مەکوژێننەوەو بەنەرم و نیانی کاریان لەگەڵ بکەن!.. کوردیش ئەمەیان لە سوپای ئیسلام بینی (بەخۆشییەوە) ڕوناکی ئیسلامیان لەدڵەکانیاندا هەڵکرد و ئاگرەکانیان خامۆش کرد!..

یاخود کاتیٚ کە ناوچە فارس نشینەکان ڕزگارکرا پێویستی دەکرد سەرۆکێکی موسڵمان حوکمیان بکات بۆیە بیری کردەوە کە باشتر وایە و فارسەکان وا حەز دەکەن کە عەرەبێك تا دوێنیٚ ژێردەستەی خۆیان بوو ئەمڕۆ پادشایان نەبیٚ بۆیە فەرمووی: بالەخۆیان و لەزوبان و نەژادی خۆیان بکەمە سەرۆکیان!.. بۆیە فەرمانیدا بەسەر (سەلمانی فارسی)دا ئەو حوکمڕانی ناوچەی فارس بێت لە مەدائین!.. بۆیە فارسەکان زۆر دڵخۆش بوون برینی لەدەست چوونی (ئیمبراتۆریەتەکەیان) سارێژ بویەوەو زیاتر هاندەریان بوو بۆ هاتنە ناو ئیسلام!.. ئەگەر بەحەزی خۆی بکردایە دەیووت: یانی چی؟ ویست و حەزی ئەوانی چی ئەوان ژێر دەستەو تێك شکاون قسەقسەی ئیسلامە و سوپای ئیسلام!.. هەروەك من و تۆ حەزمان هەیە.. خەڵکیش هەربەو شێوەیە حەزیان هەیە.. تۆ حەز دەکەیت داواکاری و فەرمان و پێشنیارەکانت پشت گویٚ نەخرێت و کەس لێی دەرنەچێت..

دەی هەر بەو جۆرەش خەڵکی هەمان حەزیان هەیە وەك تۆ!.. بۆیە (پێغەمبەر)ی ئیسلام لەم بارەیەوە پێمان دەفەرموێت: (لا یؤمن احدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه) واتە: ئیمانی تەواوتان نەهێناوە هەتا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆشە بۆ براکەشتان پێتان خۆش نەبێت!..

تۆسەرت دێشیٚ! چەندت پیٚخۆشە یەکیٚ پێت بڵیٚ: ئەوە چیتە ئەڵێی نەخۆشیت؟ خوانەکات هیچ نیە (ان شاء الله) چاك ئەبیتەوە.. دەی تۆش هەربەو چەشنەبە لەگەڵ خەڵك وەك (پێغەمبەر)ەکەت بڵیٚ: (طهور إن شاء الله) رواه البخاري. کەواتە تاکە ڕێگای سەرکەوتن ئەوەیە کەبزانیت بەرامبەرەکەت چی پیٚخۆشە وابکە بۆی..

زۆربەی مامۆستاکانی قوتابخانەکان ئەم لایەنەیان بەرداوە! واتە: دەیانەوێت قوتابی سەعی بکات و ڕێك و پێك و ژیر بێت و ئەم چی دەویٚ خێرا بۆی بێتەدی!!.. کەچی جاریٚ لە جاران بیرناکاتەوە کە حەزو ویستێکی قوتابی بێنێتە دی وەك.. تاقیکردنەوە دواخستن وە نمرە پێدان و پرسیار ئامان کردن..!!

## بەشی دووەم

## شەشەم/ چی بکەیت کە خەڵکی هەر لەوێدا خۆشیان بوێیت؟

سەرەم گرتبوو.. لەڕیزدا بووم بۆ ئەوەی سەرەم بێت و بگەمە تەلەفونە گشتییەکە و تەلەفۆنێ بکەم.. وا سەرنجم دەدا کە کابرای سەر تەلەفوون کوڕێکی گەنجی مشەوەش و بێ تاقەت و وەڕس دیار بوو لەکارەکەیدا..

بەم دەس و ئەو دەس بەردەوام زەرف دەکێشێ.. پول پیادەنێ. باقی دەداتەوە.. دەنگەکانی دەگەیاندە یەك. بەکورتیەکەی وەك زنجیرەیەکی خاڵی کاری دووبارەی چون یەکی دەکردەوە.. وای لێهاتبوو خەوە نووچکەو بایوێشك بەدوای یەکدا سەریان تێ کردبوو..

لەدڵی خۆمدا ووتم: باکارێك بکەم خۆم خۆشەویست بکەم لەلای ئەم لاوەدا..

بێگومان ئەگەر بمەوێت خۆم خۆشەویست بکەم لەلای.. پێویستە وتیەکی نەرم و جوان و خۆشی پێ بڵێم بە ئەو! نەك بەخۆم!!.. لەخۆمم پرسی: باشە چ شتێکی وای تێدایە دەبینیت کە شایەنی ئەوە بێت سەرسامی خۆمی بەرامبەر دەربڕم؟..

وەڵامی ئەم پرسیارە هەندێ جار زۆر ناڕەحەت و گرانە.. بەتایبەت لەگەڵ نەناسدا..بەڵام لەوکاتەی مندا بەتایبەتی زۆر ئاسان بوو.. کوتوپڕ تێبینی شتێکم کرد تیایدا کە هەقی خۆی بوو سەرسامی خۆمی بەرامبەر دەرببڕم؟!!..

لەوکاتەدا کە گەنجەکە خەریکی کێشانەی زەرفەکەی من بوو.. منیش بەشێوەیەکی پاك و دڵسۆزانە پێم ووت: چەند ئاواتە خوازم کە قژێکی ئاوا ڕەشی خەڵوزی بریقەدارم ببوایە وەك ئەم قژە جوانەی تۆ!..

گەنجەکە بەنیمچە تێکچوونێکەوە سەری هەڵبڕی.. دەموچاوو ڕووی وەك گوڵ گەش بوویەوە.. بەشەرمێکەوە ووتی: ئەوە بەڕاستتە؟ بریقەو جوانییەکەی جارانی نەماوە، منیش دووپاتم کردەوە کە نەخێر ئێستاش هەر جوانە بەڕاستی جێگای سەرنجە کە بەجۆرێ دڵخۆش بوو.. چۆن دڵخۆشیکە؟ ووتی:

زۆر کەس ئاوا وەك تۆ پێشتر سەرسامی خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر قژم!..

من دەتوانم بارمتەتان پێ بدەم کە لەوە دەچێ ئەم گەنجە لەپاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا کە ڕۆشتۆتەوە بۆ ماڵ خەریك بووە بفڕێت و باڵ بگرێت!.. هەروەها دەچمە بارمتەی ئەوەی کە هەرکە گەیشتۆتەوەماڵ خێرا چی لەنێوان من و ئەودا ڕوویداوە کەهەمووی بۆ خێزانەکەی گێڕاوەتەوە !..

دیسان دەچمە بارمتەی ئەوەی کە هەر سەیری ئاوێنەی کردوە بەخۆی وتووە: ڕاستە بەڵێ بەڕاستی قژێکی جوانە!..

لەوانیە لێم بپرسیت کە ئایا چیم دەست کەوت لەم کارەمدا؟ یان دەبێت چیم دەست بکەوێت؟. کەواتە خۆت وا دابنێ کە بچیتە قاڵبێکی خۆپەرستی پیس کە هیچ خۆشی و کامەرانیەك بەخەڵکی نەبەخشیت هەتا لەپاداشتیدا دەست کەوت و سوپاست بۆ نەیەتەوە!!..

یان وادابنێ کەخۆت دابخە و بەسەر یەکدا قەپاتی بکە هەر وەك میوەی گوژاڵکە بێجگە لەتاڵی هیچ قازانجێکی تری نییە! جا ئەوکاتە تۆ شایانی هەموو ڕەنجەڕۆیی و تێك شکانێکی لە ژیاندا!..

بەڵێ من شتێکم دەست کەوت و بەبێ ئەوەی لەوڕێیەدا پارەم تیابچێت یان خۆم نارەحەت بکەم.. ئەوەم دەست کەوت کە هەست بکەم بەوەی کەمن شتێکم بەم کوڕە لاوە بەخشیوە.. ئەمەش بەبێ ئەوەی ناچاری بکەم کەلە پاداشتیدا شتێکم پێ بدات..

وە بێگومان ئەمەش هەستێکە کە ڕازیت دەکات و لەبیرتدا دەمێنێتەوە بۆ ماوەیکی دوور و درێژ!.. یەك ڕێگا هەیە کە زۆر گرنگ و بەپێزە لەهەڵس و کەوتدا لەگەڵ خەڵکیدا ئەگەر بە جوانی کاری پێ بکەیت هەرگیز ناکەویتە ناو گێرو گرفتەوە و تووش نابیت , ئەویش ئەوەیە: وابکە لەبەرامبەرەکەت کە هەست بەگرنگی خۆی بکات. هەر لەسەردەمە کۆن و دێرینەکانەوە فەیلەسوف و عاقڵمەندان ویستوویانە و گەڕاون بەدوای بنەماکانی پەیوەندییە ئادەمیزادیەکان.. لەو گەڕانە دوورو درێژەیاندا گەشتونەتە یەك ڕێگە چارە کە لەوڕێگایە چاکتر نییە!..

کە ئەو ڕێگایە (زەردەشت) فێری مەجوسیەکانی وولاتی فارسی کردووە سێ هەزار

ساڵ پێش ئێستا.. وەپێش بیست و چوارده سەده لەمەوبەر (کۆنفوشیوس) ئامۆژگاری چینییەکانی پێکردووە.. وە (لارتی) لە دۆڵی (هان) خستویەتییە دەمی قوتابییەتائییەکانی.. وە (٥٠٠) ساڵ پێش لەدایك بوونی مەسیح (بوذا) لەقەراغی (چانجن) مژدەی پێداوە.. وەلەکتێبی هندۆکەکاندا هاتووە لەپێش هەزار ساڵ وەبەر لە (بوذا)..

وە (عیسی) (سەلامی خوای لێبێ) لە گردۆڵکە بەردییەکانی خاکی (یەهوزا)وە پێش (١٩)سەدە لەمەوبەر هاواری بۆ کردووە.. بەڵکوو هەموو (پێغەمبەر)ێك بانگی گەلەکەی بۆ کردووە و هەموو عاقڵ مەندێك لەسەردەمی خۆیدا داوای کردووە لەخەڵکەکە.. کە:

( ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ براکەیشت با پێت خۆش بێت)! (١٠)

تۆ دەتەوێت خەڵکی بە چاکت بزانن. هەروەك دەتەوێت نرخ و ڕێزت بۆ دابنێن.. وەتامەزرۆی ئەوەی کە لەدنیا بچکۆلەکەتدا شت بەدەست و گرنگ بیت.. کەچی گوێ نادەیتە خۆبردنە پێشەوەیەکی هەرزان و تەنانەت (پەپە و لالایەکی) نادڵسۆزانەش بۆ کەس ناکەیت!..

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەتەوێت ڕێزێکی لەڕادەبەدەرو دڵسۆزانەت بگیرێت!..

یان دەتەوێت دۆست و هاوڕێکانت (هەروەك شواب) دەڵێت: لەڕێزگرتندا زیادەڕەوی بکەن و لەپیاهەڵدانتدا ڕۆبچن!.. هەرهەموومان حەزمان لەمەیە!..

دەی کەواتە: با واز بێنین و ئەم ڕێگە ئاڵتونییە جێبەجێ بکەین کە دەڵێت: بیدەین بە خەڵکی ئەوەی حەز دەکەیت بماندرێتێ!!..

چۆن؟ وە چ کاتێك؟..

وەلام: هەمووکاتێك و لەهەمووشوێنێك!!..

جارێك ڕۆیشتم بۆ کۆمپانیای (ڕادیۆسیتی) پێش چونە ژوورەوەم لەفەرمانبەری پرسگەکەم پرسی: کە ژمارەی ژوورەکەی (هنری سوفین) چەندە؟..

فەرمان بەرەکە کەکلێتەیەکی ڕەسمی سپۆرتی لەسەردابوو.. ویستی کەمێ خۆی هەڵبنێ کە بلێ زۆر پسپۆڕم لە کارم دا بۆیە زۆر بەجوانی و بەڕووتی وەلامی

دامەوە: ئاهـ..هنری سوفین.. ماوەیەك وەستا نهۆمی (٨١) ماوەیەکی تر وەستا ژووری ژمارە (١٨١٦)!..

(١٠) لێرەدا مرۆڤ لە وەسەری سوڕدەمێنیٚ کە (دیل کارینجی ئەو فەرمودە زۆر باو و ناسراوەی (پێغەمبەر)ی مرۆڤایەتی محمد المصطفی ی نە بیستوەیان خۆی لیٚ کەڕ کردووە کە دەفەرمویٚت (( لا يؤمِنُ أَحدكم حَتّى يُحِبَ لأَخِيِهِ مَا يُحِبُ لِنَفسِهِ ) (متفق علیە)

پێش ئەوەی لە ئاسان سوڕەکە دا (مصعدە) سەرکەوم کەمیٚ وەستام و گەڕامەوە بۆلایی و پێم ووت ئەمەوێت پیرۆزبایی لەجەنابتان بکەم لەسەر ئەو توانایی و لێهاتووییەتان کەوەلاّمی پرسیارەکەت پیٚدامەوە.. بەڕاستی وەلاّمەکەت زۆر ورد و ڕوون و ئاشکرابوو.. وە هونەرمەندێکی لێهاتوو ئەمە ناتوانیٚ.. لەبەر ئەمە تۆ شایانی هەموو پیرۆزباییەکیت..!

گەنجەکە لەخۆشیاندا ئارامی لیٚبڕاو بەدەم ڕوویەکی گەشەوە (بۆی باس کردم کەئەوساتە بێدەنگیانە مەبەستم چیٚبووە! وەبۆچی ووشەکانی ئاوا بچڕبچڕ دەربڕی!..

بەم هەڵنان و پیاهەڵدانە وام لیٚ کردبوو لەخۆشیاندا نەرمە کۆکەی دەکرد و بۆینباخەکەی ڕێك و پێك دەکرد!!.. لەوکاتەدا کە بۆقاتی هەژدەهەم سەردەکەوتم هەستم کرد کەهەندیٚ هاوکاریم کردووە لەبڵاوکردنەوەی هەست کردن بەبەختەوەری مرۆڤایەتی..

خۆناشیٚ چاوەڕوان بکەیت تادەبیتە باڵوێزی (سفیر) فرنسا.. ئەوکاتە بتەویٚ هەستی بەجێبەجیٚکردنی ئەم فەلسەفە، بەسوودە.. نەخێر .. نەخێر.. بەڵکو تۆ دەتوانیت لەگەڵ هەموو کەسدا و هەموو ڕۆژێك کاری پیٚ بکەیت و بەرهەمی چاکیشی ببێت!..

بۆ نموونە تۆ حەزت لە (پەتاتەی سورەوەکراوە) کەچی شاگردی چێشتخانەکە (شلەی پەتاتە)ی خستە بەردەستت!.. تۆش بەنەرمییەکەوە پێی بڵیٚ: (ببورە سەرت

دەیەشێنم و هەراسانت دەکەم.. بەڵام من پەتاتەی سورەوکراو بەڕێگای فەرەنسی حەز لێدەکەم)..

بێگومان ئەویش وەڵامت دەداتەوە: (بەپێچەوانەوە بەڕێز.. هیچ ئەزیەت و ئازاری تێدا نییە بەسەرچاو) زۆر بەپێخۆشحاڵیەوە بۆت دەگۆڕیت.. چونکە تۆ ڕێزت پێدا!..

ئەم جۆرە ڕستانە وەك: (ببورە نارەحەتم کردی) یان (ئایا دەتوانم) یان (ئایا دەفەرموویت) یان (ڕێگام دەدەیت) یان (من زۆر سوپاست دەکەم). هتد.. بەڕاستی کاری ئەفسوناوی خۆیان دەکەنە سەردڵ و دەروونی خەڵکی.. هەروەك ڕۆن و گریزن بۆ ژیانی ڕۆژانەیەك کە هەردەم دوێنێ دەسوڕێتەوە و دووبارە دێتەوەو ئادەمیزاد بێتاقەت و خاو دەکاتەوە.. ئەم ووشانە گوڕو تینی هەمیشەیی پێ دەدەنەوە..

ئایا رۆمانەکەی (هول کین) هیچ کامیانت خوێندۆتەوە؟ بێگومان ملیۆنەها کەسی لەژمارە نەهاتوو خوێندوویانەتەوە.. ئەم (هولە) کوڕە ئاسن گەرێك بوو هەشت ساڵ زیاتر نەیخوێندووە لەقوتابخانە.. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینیت بووە بەدەوڵەمەندترین کەس لەگەورەپیاوانی ئەدەب دۆست دا ئەمەش سەرگوزشتەکەیەتی:

(هول کین) زۆر حەزی لەهۆنراوەی کورت کردووە و لەبەری کردووە.. لەبەر ئەوە هەستاوە بەکۆکردنەوەی هۆنراوەکانی شاعیری بەناوبانگ.. (دانیل جابریل ڕۆیستی) و هەمووی لەبەرکردووەو.. لەکۆڕێك دا هەموویانی بەدەنگ و ئاوازی خۆشی خۆیەوە پێشکەشی جەماوەر کردووە وەدانەیەك لەتۆمارکراوی کوڕەکەی نارد بۆ (ڕۆیستی)و ئەویش زۆر زۆر دڵخۆش دەبێت بە ئەو پەڕی دڵخۆشی!.. دوور نییە کە لەدڵی خۆیدا ووتبێتی گەنجێك ئەمە ڕای بێت دەربارەی هونەرەکەم ڕەنگە زۆر ژیر و وورد بێت!.. بۆیە (ڕویستی) ئەم کوڕە ئاسنگەرە بانگ دەکات بۆ لەندەن و دەی کات بە سکرتێری خۆی!!..

هەر ئەم خاڵە بوبەهۆی گۆڕینی ژیانی (هول) بەوەی کە بوبەهۆی نزیک کەوتنەوەی لەگەورەترین شاعیر.. ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا لەگەڵ گەورە پیاوانی ئەدەب و هونەر دا دەژیاو لەگەڵیان کۆ دەبویەوە..

بەتێکەڵاویان زۆر سوودی وەردەگردت.. چونکە بەهۆی هاندان و سورکردنی ئەوانەوە باوەڕێکی بەخۆی پەیدا کردوو هیوای سەرکەوتنی تیادروست بوو لەجیهانی ئەدەبدا .. تا ئەوەبوو توانی ڕێڕەوێکی تایبەتی لەو مەیدانەدا بۆ خۆی دەست بخات کە بوە هۆی بڵندکردنەوە ناوی!.. تا وای لێهات تەنانەت لەدوای مردنیشی ماڵەکەی بوو بەڕووگەی گەشتیاران و لەهەموولایەکی جیهانەوەسەردانی ماڵەکەیان دەکرد.. وەپاش خۆی سەروەتێکی وای بەجێ هێشت کە خۆی دەدا لە دوو ملیۆن و پێنج سەد دۆلار!!..

کێ دەزانێ لەوەدەچێت ئەگەر ئەم نامەیەی نەناردایە بۆ (ڕۆستی) وە سەرسامی خۆی بەرامبەر هونەرەکەی ئەو دەرنەبڕیایە.. ئەوا هەتا مردن هەر ئاسنگەردەبوو!..

بەڵێ (ڕۆستی) زۆر بەکەسێکی گرنگ سەیری خۆی دەکرد.. بەڵام ئەمە جێگای سەرسوڕمان نییە.. هەرهەموومان بەگرنگ سەیری خۆمان دەکەین نەك گرنگ بەڵکو هەر زۆر گرنگ!..

ئایا تۆ لەوبڕوایەدای کە کانزای تۆ لەکانزای یابانیەکان پاك ترە؟.. دەگوێ بگرەو بزانە کە یابانی چەند قات خۆی لەتۆ پاك ترو چاك تر دادەنێت!.. تەنانەت یابانی پاك و ڕەوشت بەرز ئاگری تورەیی لێ دەبێتەوەو کاتێ (سپی پێستێك) ببینێ لەگەڵ کچە یابانیەك سەما بکات!.. یاخود خۆت لە (هیندۆکی یەك) بەپێشکەوتوتر دەزانێت؟!.. ئەمە خەیاڵ و بۆچوونی خۆتە ئەگەر نا (هیندۆکی) خۆی لەتۆ زۆر بەرزتر ڕادەگرێت!..

تەنانەت ئەو خواردنەی کە سێبەری تۆی بەرکەوتووە فرێی دەدات و نای خوات!..

یان خۆت لە (ئەسکیمۆی)ییەکان بەڕێزتر دەزانیت؟ ئەم جارە دەڵێین تۆ لەسەر هەڵەی!! ئایا بیستووتە ئەسکیمۆیی چۆن دەڕوانێتە تۆ! لەناو ئەسکیمۆییەکاندا

دەستەیەك هەن زۆر تەمبەڵ و تەوەزەل و بێکارەن و کەس کاریان پێ نابەستێتەوە! کەچی خۆیان ناوناوە پیاوە سپییەکان!! کەئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەچاوی سووك و بێ نرخانە سەیری سپی پێستەکان دەکەن!!.

بەڵێ ئەمە دابونەریتی هەموو گەلێکە! هەموو گەلێك واهەست دەکات کەلەهەموو گەلەکانی تر بەرزتر و پێشکەوتووتر و دێرین تر و ڕۆشنبیرترو بەرێزترە! ئائەم (ڕۆچوونەیە) لەخۆشەویستی نیشتماندا کە زۆربەی شەڕو شۆڕ و ناکۆکی نێوان گەلان بەرپا دەکات!!.

دەگەی بەهەرکەسێ وا دەزانێ خۆی زۆر لەتۆ باشترە!! هەرهیچ نەبێت خۆ لە لایەنێکدا لەتۆ باشترە..

کەواتە هیچ چارەیەك نییە کە بەهۆیەوە بتوانی بچیتە ناودڵی خەڵکیو خۆت خۆشەویست بکەیت لەلایان.. تەنها یەك ڕێگا نەبێت!.. ئەویش ئەوەیە کە وای لێ بکەیت ڕاستەوخۆ هەست بکات و بزانێت کە تۆ دان بەگرنگی و بەرێزی ئەودا دەنێیت!.. وە هەست بکات کە ئەو دان پیانانە لەهەموو دڵێکتەوەیە!..

ووتەی (ئیمرسۆنت) لەیاد بێت کە دەڵێت: هەرکەسێ کەمن پێی دەگەم بەلایەنی کەمەوە لەیەك شتدا لەمن زیرەك ترە!.. دەی کەواتە من ئالەو لایەنەوە سوودی لێ وەردەگرم و لێوەی فێردەبم.. دوو بەسەرهاتت بۆ دەگێڕمەوە کە هەردووکیان واقعین.. کە دووقوتابی خۆمن ئەم ڕێگایانەمیان جێبەجێکرد لەکاری ڕۆژانەیانداو باشترین ئەنجامیشی هەبووە:

بەسەرهاتی یەکەمیان پاڵەوانەکەی پیاوێکی یاساییە وەخۆی وای بەباش زانی کەناوی نەبەین.. قەیناکا بابە (سین) بانگی بکەین:

مستر (س) پاش ئەوەی کە پەیوەندی کرد بە پەیمانگاکەمەوە.. ماوەیەکی کەم بەسەریدا تێپەڕیبوو.. خۆیی و خێزانەکەی گەشتێکیان کرد بۆ (لونج ئیلاند) بۆ سەردانی هەندێ لە خزمەکانیان هەر کە گەشتنە ئەوێ.. یەکسەر چوونە سەردانی پورێکی پیری خێزانەکەی پاش کەمێ خێزانەکەی بەتەنها لەماڵ دەرچوو بۆ سەردانی چەند ماڵێك..

مستر (س)و ژنە بەساڵاچووەکە لەماڵدا مانەوە.. بەڵێ هەردەبوایە مستر (س) پاش ماوەو ئەنجامی بەسەرهاتی جێبەجێکردنی ڕێگای ئاشکرا کردنی ڕێزو گرنگی خەڵکی لەلای خۆیاندا.. بۆ قوتابییەکان لەپۆلدا باس بکردایە.. بۆیە دەست بەجێ بیری کردەوە لەگەڵ (داپیرەدا) جێبەجێی بکات..

مستر (س) سەیرێکی ماڵەکەی کرد و چاوێکی بەوردی بەماڵەکەدا گێڕاو ئەم لاو ئەولای کرد.. تا شتێکی وای بکەوێتە بەرچاو کەشایان بێت ئەم سەرسوڕمانی خۆی بەرامبەر دەربڕێت و گرنگی ئەم ژنەی پێ ئاشکرا بکات!..

بۆیە پاش کەمێ پرسیاری کرد لەژنەکە: ئایا ئەم خانووە لەساڵی (١٨٩٠)دا دروست نەکراوە؟ داپیرە وەڵامی دایەوە: بەڵێ بێکەم و زیاد لەوساڵەدا دروست کراوە!..

مستر (س) ووتی: پوریێ گیان ئەم خانووە ڕێك و پێکە خانووەکەی خۆمانم بیر دەخاتەوە کە تێیدا لە دایك بووم.. بەڕاستی جوان و ڕازاوەیە.. زۆر مەحکەم و بەهێزە.. زۆر فراوان و بەربڵاوە. ژوورەکانی زۆرن..

بۆنەگبەتی ئەمڕۆ خەڵکی گوێ نادەن بەم جۆرە خانوانە و بەم نەخشە جوانە خانوو ناکەن!..

داپیرەش لەگەڵمدا ووتی: ئەی چی ڕۆڵە هەروایە گەنجی ئەمڕۆژە گوێ نادەنە خانووی قەشەنگ ئەوەی ئەوان دەیانەوێت دەستەیەك خانو(شقە)ی تەنگەڵان و بێ حەوشەو سەلاجەیەکی کارەبایی و ئۆتۆمبیلێك کەبەیانی تائێوارە کەشخەی پێوە بکەن!..

پاشان بەدەنگێکی گڕو غەمناکەوە یادگاری یە خۆشەکانی دەهێنایەوە یادی خۆیی و دەیووت: ئەم خانووە کاتێ خۆی لەسەر خۆشەویستی بنیات نراوە.. خەونی چەند ساڵەی من و مێردەکەم بوو.. چەند ساڵێك لە خەیاڵمان پێوە دەکرد پێش ئەوەی دروستی بکەین.. خۆ ئەندازیار و شتمان بۆ نەگرت..بەڵکوو هەربەخۆمان هەردووکمان نەخشەکەیمان داڕشت.. پاشان هەستا و مستر(س)ی لەگەڵ خۆی برد بوو بۆ ئەوەی دەرماڵی خانووەکەی پێ پیشان بدات.. پاشان بۆی

باس کرد کە چۆن وەفادارو پارێزەرم بۆ ئەو یادگارییە جوانانەی مێردەکەم کەلەگەڕانەوەمان لەوولاتان بۆی دەکڕیم!.. هەر لە دەفری ستیل و زیووو تابلۆی ئیتالیێ و پەردەی ئاوریشمی کە ڕۆژانێك بووە بەکۆشکە مەزنەکانی فەڕەنسا وە هەلواسراوە!..

مستر(س)دەلێت: کاتێ لەگەڕان بووینەوە بەناو حەوشە و بالێنی مالەکەدا (داپیرە)پێشم کەوت و بردمی بۆ ناو باخچەڕازاوەکەیان کە گەراجەکەشیان هەر لەوێ بوو.. لەوێ ئۆتۆمبیلێکم بەدی کرد کە مۆدێل (باکارە) زلەکان بوو.. کەوا دیار بوو زۆر تازە بوو دەستی بۆ نەبرابوو!.. پوورێ بە شێوازێکی نەرم و لەسەر خۆ ڕووی تێ کردم و پێی ووتم: مێردەکەم ماوەیەك پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات.. ئەم ئۆتۆمبیلەی بۆ کڕیووم!.. وەلەو کاتەوەی کە کۆچی کردووە من پێم نەخستۆتە ناوی.

تۆش ئەی مستر(س)بەڕاستی ڕێزی شتی جوانت لەلایەو ئەوشتانەی یادگاری خۆشەویستن تۆ نرخیان دەزانیت دەی ئەم ئۆتۆمبیلە پێش کەش بێت . بە تۆ.. وە بۆ تۆ بێت لەگەلێ جوانترین و ڕازاوە ترین سلاودا!!..

ئەم دیارییە کوتوپڕنییە وەك لەبان بەرم بەنەوە وابوو بۆیە ووتم: ئاخر چۆن پوورێ گیان؟!.. لەگەلێ ئەوپەڕی ڕێزمدا بۆ دیاری یەکەت.. بەلام ناتوانم وەری بگرم.. من خزمێکی نزیکت نیم!.. وە تۆ خزم و کەسی نزیکت زۆرن.. بەئاواتەوەن ئەم ئۆتۆمبیلەیان دەست بکەوێت ..

(پیرەژن)هاواری لێ بەرز بویەوە وەك بێ نرخییەك بۆ خزمەکانی: خزم!!بەلێ من خزم دارم بەلام هەموو خەفەتێکیان ئەوەیە کەی بێ بمرم و ئۆتۆمبیلەکەم ببەن! هەی نەیخۆن تالە!..

پاشان پێم ووت: دەی باشە گەرناتەوێت بیدەیت بەکەسیان بۆ نایفرۆشیت؟!..

جارێکی تر هاواری کرد ووتی: بیفرۆشم؟.. ئایا حەز دەکەیت بیفرۆشم؟.. یان ئایا تۆ وا گومان دەبەیت کە دلم بڕوای دەدات کەنەناس سواری ئەم ئۆتۆمبیلە ببن و بەبەرچاومەوە بێن و بڕۆن؟. ئەم ئۆتۆمبیلە مێردەکەم بۆمنی

**کڕیوە(من)..منیش ئەی مستر(س)پێش کەشی تۆی دەکەم چونکە وادیارە تۆ دیاری و یادگاری باش دەپارێزی و نرخیان دەزانیت و لەلات بەڕێزن.. منیش بەهەر هۆیەك بوو ویستم وەری نەگرم و خۆمی لێ قوتار بکەم بەڵام چار نەبوو وەرم گرت.. چونکە لەوەدە ترسام هەستی برینداربێت.. ئەم پیرەژنە خاوەنی خانوویەکی فراوانی گەورە بوو.. کە پڕ بوو لەیادگاری خۆشەویستە لە دنیا دەرچووەکەی.. هەر ئەم ژنە زۆر بەپەرۆشەوە بوو بۆ ڕێز گرتنی و نرخ پێدانی و دان نان بەگرنگی لەلای خۆیدا..**

**چونکە ئەم پیرە ژنە کە ئێستا دەم و چاوی چرچ بووە و کەس لای لێ ناکاتەوە.. ڕۆژانێك بووە کە کچێکی شۆخ و شەنگ و نازداری ماڵی باوکی بووە و چەندان لاوو گەنجی ئەو سەردەمە حەیرانی بوون و سەرنجی هەموویانی بۆلای خۆی ڕادەکێشا.. وەئەم لەگەڵ مێردە سپۆرتەکەیدا ئەم خانووە گەورەو خۆشەیان دروست کردووە و بۆتە هۆی ووزەو گەرمای خۆشەویستی بۆ هەردووکیان.. وە پێکەوە تیایدا هەموو شتێکی سەنگین و کەم باووبەنرخیان لەووڵاتە ئەورووپییەکانەوە بۆ هێناوە..**

**بەڵام کاتێ خەزانی تەمەن سەری لێ دەدات.. گەڵاڕێزانی جوانی و بەنازی و خۆشەویستەکەی دەبینێت بەچاو.. ئیتر ناچارە دەردی سەری و ناخۆشی (تەنیایی) قبوڵ بکات.. بۆیە وای لێهاتووە بەپەرۆشەوەیە بۆچی؟.**

**بۆ ئەوەی کە جارێکی ترو سەرلەنوێ کەسی وا دەرکەوێت لێی کە ڕێزو نرخی جارانی پێ بداتەوە و هەست بەکەسایەتی خۆی بکات و ڕێزی تەواوی لێ بگرێت..**

**ئەوەتا ئێستا هەر کەڕێی کەوت لەو کەسەی کە ئەم ڕێزو نرخەی دەست بخاتەوە و دڵی خۆش بکاتەوە ئیتر بابەیاد خستنەوەیەکی کۆنە یادگاری یە خۆشەکانیشی بێت.. کە ئەو کەسەش مستر(س)بوو.. بۆیە زۆر ئاساییە و کەمیشە هێشتا.. کە دەگەڕێ لەو ئۆتۆمبیلی (باکارە)بەنرختری لا دەست ناکەوێت . تابەشایەنی مستر(س)ی بزانێت کە لە پاداشت و سوپاسیدا ئەم دیارییە بچکۆلەیەی پێ ببەخشێت..**

ئەمە چیرۆکی یەکەم بوو گوێ بگرە بۆ چیرۆکی دووەم:

(جۆرج ئیستمان) ناسراو بە( کۆداك) داهێنەری ئەو شریتە ناسکەیە کە بەهۆیەوە دەتوانرێت وێنەی فۆتۆگرافی بگرین.. هەروەها سنەمایشی پێهاتە کایەوە.. وەلەڕێگای ئەم داهێنانە (إختراع)ە گرنگەیەوە بوو بە خاوەنی سەروەتێکی وا کە خۆی دەدا لە (١٠٠)ملیۆن ڕیاڵ.. بە جۆرێ کە ڕۆشتە ڕیزی پیاوە دەوڵەمەندە خاوەن کارەکان..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەروەك من و تۆ چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە خەڵکی هەستن بە دەربڕینی ڕێزو نرخ زانینی..

چەند ساڵێك لەمەو بەر(ئیستمان) دەستی کرد بەدروست کردنی (قوتابخانەیەك بۆ فێر بوونی مۆسیقا بەناوی خۆیەوە کردیەوە.. هەروەها هەستا بەدروستکردنی(هۆڵێ کالبۆن)بۆ نمایش کردنی شانۆگەری.. وەك یادگاریەك بۆ پاراستنی ناوی کالبۆنی دایکی..

(جیمس ئادەمسۆن) کەبەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی کورسی و کاعیە دروست کردن بوو.. بۆیە زۆر حەزی دەکرد و و هەوڵێ دەدا کە دروست کردنی کورسی وتەختەکاری ئەو (هۆڵە) لەلایەن کۆمپانیاکەی ئەمەوە بگرێتە ئەستۆ.. بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی کرد بە ئەو (ئەندازیارەی) کە هۆڵەکەی (ئیستمانی) درابووە دەست.. داوای لەو ئەندازیارە کرد کە کاتێکی لە (ئیستمان)بۆ وەرگرێت تا چاوێکی بکەوێ پێی بۆ ئەو مەبەستە..

لەکاتی دیاری کراودا (ئادەمسۆن) گەیشتە بەردەرگای نووسینگەکەی (جۆج ئیستمان) لەوێدا چاوی کەوت بەئەندازیارەکە.. لێرەدا ئەندازیار بەشێوازێکی ترساندن پێی ووت: من چاك دەزانم کە تۆ هەوڵێ بەدەست هێنانی گەورە و پڕ قازانج دەدەی.. بەڵام ئاگادارت دەکەم کە (ئیسمان)سەری قاڵە و ناپەرژێ و هەروەها تورەو توند و تیژە.. لەبەر ئەوە (پێنج)دەقیقە زیاتر لە خزمەتیدا نەمێنێتەوەو بەکورتی قسەی لەگەڵ بکە.. (ئادەمسۆن)پەیمانی دایە کە بەسەرچاو وادەکەم..

کاتێ کە (ئادەمسۆن)و ئەندازیارەکە پێکەوە چوونە ژوورەوە بۆلای (ئیستمان)(ئادەمسۆن)سەیری کرد بینی وا بەڕێوە بەر لووتی داژەندوە بەسەر کۆمەڵێ وەرەقەی سەرمێزەکەدا.. و پاش لێ بوونەوە سەرێکی هەڵبڕی بۆلایان.. ئەندازیار پێ‌ی ناساند.. ئا لێرەدا ئادەمسۆن چاوێکی خشاند بە ژوورەکەدا و.. پاشان بەپەلە ڕووی کردە بەڕێوەبەر و ووتی: پێش هەموو شتێك دەمەوێت سەرسامی خۆم دەربڕم بەرانبەر جوانی و چاکی شت و مەکی تەختەکاریی (أثاث)ی ژوورەکەت..

خۆت دەزانیت من ئیش و کارم تەختەکاری شوێنە گەورەکانە.. بەڵام لەژیانمدا نەمدیوە کە تەختەکاری زۆر ئابەم چەشنە قەشەنگ و مۆدیل جوان بێت ! ..

(ئیستمان)ڕووی وەك گوڵ گەش بوویەوەو بەڕوویەکی خۆشەوە ووتی: تۆ شتێکت هێنامەوە یاد کە هەر لەبیریشکم نەمانوو. تەختەکاریەکی ڕازاوەو جوان وانییە؟.. ئەو کاتە جوان و ڕازاوە بوو (ئاخ بتدیایە)کەیەکەم جار دام مەزراند..

بەڵام ئێستا لەبەر سەر قاڵیم و نەپەرژانم کەم جار بۆم دەکرێت چاوێك بخشێنمەوە بەشت و مەکی ژوورەکەمدا..

(ئادەمسۆن)هەستا و دەستی کرد بە هاتوو چۆکردن بەژوورەکەدا و دەستی دەداله تەختەی پەنجەرەو دەرگاکەدا و دەیووت: ئەمە لە بەڕووی ئینگلیزی دروست کراوە وانیە؟..

هەر بەریقەو باقە جوانەکەی دیارە کە زۆر جوانترە لە بریقەوباقی تەختەی ئیتالی..

(ئیستمان)وەڵامی دایەوە، بەڵێ ئەیچۆن.. بەڕووی ئینگلیزەو لەوێوە هێنراوە.. هاوڕێ یەکم کە پسپۆڕە لەکاری تەختەدا بەتایبەتی بۆی هەڵبژاردووم..

(ئیستمان)هەستایەوەو لەگەڵ (ئادەمسۆن)دا بەژوورەکەدا دەگەڕان باسی ئەو کاتانەی بۆ دەکرد کە تیایدا دروستی کردوون و ڕێکی خستوون بە چەشنە..

کاتێ کە لەگەڵ (ئادەمسۆن)لای پەنجەرەکەدا وەستان و سەیری دەرەوەیان دەکرد(ئیستمان)ئامارەی کرد بۆ چەند کۆمەڵێ دەزگا کە بۆ خێر دروستی

کردوون‌و لەو ڕێگەیەوە ویستوویەتی خزمەتێك بەئادەمی یەکان بگەیەنێت.. وەك (زانکۆی پۆشتر) و (خستەخانەی گشتی)و (نەخۆشخانەی منداڵان)..ئالێردا ئادەمسۆن بە گەرمی دەستخۆشی و سوپاسی کرد لە سەر ئەو هەڵوێستە خێرخوازیەی ئەمەش لە پێناو کەم کردنەوەو نەهێشتنی ناڕەحەتی و باوکە ڕۆی ئادەمییەکان..

(ئیستمان)سنوقێکی شوشەی هێناو کردیەوەو ئامێرێکی وێنە گرتنی تێدا دەرهێنا. کە یەکەم کەس بوو یەکەم ئامێری لە پیاوێکی ئینگلیزی کڕیوە.. لێرەدا (ئادەسمۆن)ای‌ی پرسی لەبارەی یەکەمین خاڵی هەوڵ و تێکۆشانی لە نێوان زۆرانبازی ژیاندا..(ئیستمان)دەستی کرد بەباس کردنی دەست کورتی و نەبوونی‌و هەژاری کاتیی منداڵی.. وە چۆن بێوەژنەکەی دایکی سەرپەرشتی کارباری ماڵەوەی دەکرد.. ئەمیش خەریکی خۆرەنجاندن و کاربوو لەیەکێ لە کۆمپانیاکانی (مسۆگەر) کردنی ژیان بەڕۆژانەی(٢٠)قرش..(ئادەمسۆن)هەردەم بە پرسیار کردن بەرەو درێژە دان بەقسەکانی دەیبرد.. خۆیشی بەوردی و ژیرانە و هێمنی گوێی بۆشل کردووە و قسەی پێ نەبڕیوە.. بەتایبەت کاتێ کەباسی تاقیکردنەوەکانی وێنە گرتنی بۆ دەکرد لەسەر وەرەقەی ناسك (پۆسکارت)وە چۆن شەووڕۆژی دەدایە دەم یەك لەپێناوکاردا بەبێ ئەوەی کەبێ تاقەتی ڕووی تێ بکات.. جگە لە لەهۆش خۆ چوونێکی کورت نەبێت.. وەباسی ئەوەی بۆ دەکرد کە چۆن هەندێ شەو هەر بەجلەکانی خۆیەوە خەوتووە ئەمەش لەبەر ئەوەی کە کات نەکوژێت بە خۆگۆڕینەوە کاتێ لەخەوهەستان..

ئەندازیارەکە (ئادەمسۆن)ی ئاگادار کرد کە زیاتر لە (٥)دەقیقە نەمێنێتەوە لەلای.. کەچی وا(٢)کاژمێر ڕابووورد و (ئادەمسۆن )هەر لەلای (ئیستمان) ماوەتەوە.. بە ڵێ ئادەمسۆن هەر لە گوێ گرتندا بوو بەوردی بۆ (ئیستمان ) و ئەویش بەردەوام بوو لە سەر قسەکانی و ووتی :کاتێ لە یابان بووم لە کاتی گەڕانەوەمدا هەندێ قەنەفەو کورسیم کڕی و هێنامەوە بۆ خانووەکەم.. لە حەوشەکەدا دامنان بۆ دانیشتن.. بەڵام پاش ماوەیەك خۆر ڕەنگە جوانەکەی کاڵ

کردەوە.. منیش هەندێ بۆیەم کڕی و خۆم بۆیەم کردەوە.. ئایا حەز دەکەیت ببینیت کە چۆن بۆیەی کورسی یەکانم کردووە؟.. دەفەرموو با پێکەوە بچینەوەو نیوەڕۆش لەخزمەتتدا بم!..

بەڵێ (ئادەمسۆن)بەهەمو خۆشییەکەوە لەگەڵی ڕۆشتەوەو نانیان خواردو پاشان بردی بۆ حەوشەکەو کورسییە بۆیە کراوەکانی کەلە یابان کڕیبوونی پێ پیشان دا!!.. خۆ ئەو کورسی‌یانەی (ئیستمان یەکی ڕیالْ و نیوێکی نەدەهێنا بەڵام (ئیستمان)زۆر شانازی پێوە دەکرد چونکە خۆی بۆیەی کردبوون!..

هەر لەوێ ڕادەی دەست کەوتنی قازانج لەدروست کردنی تەختەو کورسی هۆڵی شانۆکە گەشتە (٩٠)هەزار ڕیالْ! تۆ بڵێیت کێ دەستی کەوتبێت؟.. بێگومان (جێمس ئادەمسۆن) دەستی کەوت!!..

باشە من و تۆ لە کوێوە دەست بکەین بە جێ بەجێ کردنی ئەم پەنا چاکە ئەفسوناویە کە (ڕێزلێنان)ە!!.. باشە بۆچی لە ماڵەکانی خۆمانەوە دەست پێ نەکەین؟. من وا نازانم کەجێ یەکی تر هەبێت لە ماڵەکانمان زیاتر پێویستی بەوە هەبێت و هەژارە لەلایەنی (ڕێزلێنانەوە)!!..

جارێکیان بۆ گەشتێکی ڕاوە ماسی ڕۆیشتم بۆ ڕووباری(میرامیش) لە (نیوبرۆنیسویك)لە وێ ڕۆژنامەیەکی ناو خۆیم کەوتە بەرچاو بۆ بێتاقەتی هەرهەموو باسەکانیم خوێندەوە تەنانەت بلاْو کراوە و ئاگاداریەکانیش !... ئەمەش بەمەبەستی بەسەربردنی کات لەو گەشتە دوردەستە دا هەر لەو ڕۆژنامەیەدا چاوم کەوت بە نوسینێکی نوسەری بەناو بانگ خانم (دووروپی دیکس) زۆر بەلامەوە خۆش و گرنگ بوو بەڕادەیەك کە دەورو پشتەکەیم بڕی و جیام کردەوەو هەڵم گرت.

خاتوو (دوروپی) لەوباسەیدا دەڵێت: من وەڕەس و بێزار بووم لەو ئامۆژگارییە مردوە بێکەڵکانەی کە دەیدەن بەگوێی بوك و زاوادا، وەشتێ زۆر زۆر لەوانە باشتر ئەوەیە کە پیاوێکی لێزان و ژیرو دنیا دیدە بووبێت . بەزاوا بڵێت: (ژن مەهێنە، یان شوو مەکە) پێش ئەوەی کە نەچیت بۆ ماچ کردنی بەردی (بلارنی)تا وەکو قسەی

نەرم نیان و ڕووی خۆشت لێ نەبڕێت. دەبزانە کە قسەی خۆش و قسەی نەرم و نیان لەگەڵ ژندا و پیا هەڵدان پێش مارە بڕینی بۆ ڕاکێشانی سۆزیەتی بۆلای خۆت بەلام قسەی خۆش و پیا هەڵدانی دوای مارەکردن و گواستنەوەی زۆر پێویستە بۆ بەردەوامی خۆشی و کامەرانی ناو خێزان چونکە ژیانی هاوسەری مەیدانێك نییە بۆ سەلماندنی دڵسۆزی و نیەت خۆشی ئەوەندەی کەمەیدانە بۆ لێزانی و پسپۆڕی لە بەڕێوە بردنی ماڵدا. ئەگەر دەتەوێت لە ژیانی هاوسەریتدا بێوەیی و بێ قڕە و کامەران بیت هەرگیز ڕەخنە مەگرە لەو جۆرو شێوازە تایبەتییەی لە خێزانەکەت گرتویەتیە بەر لەبەڕێوە بردنی ماڵەکەدا، یان بەراورد کاری مەکە لەنێوان ئیشەکانی ئەودا و کاری دایکت یان خوشکەکانت لەماڵەوە.

بەلام بە پێچەوانەشەوە.. هەر دەم بەکارەکانیدا هەڵبدە و وەسفی بکەو ئافەرینی لێ مەبڕەو پیرۆزبایی لەخۆت بکە کە ژنێکی وات دەست کەوتوە جوانی (نینۆس) و (ژیری مینیرفا) و کارزانی(ماری ئانی)لە خۆیدا کۆکردۆتەوە!!. تەنانەت ئەو گۆشتەش کە خێزانەکەت دەیخاتە بەردەستت ئەگەر وەك چەرم جیڕ بێت و ئەو نانەشی دەیخۆیت وەك چەو ڕەق بێت سکالا مەکە و بۆڵەبۆڵ و توڕەیی دەرمەبڕە بەڵکو دەتوانیت تێبینییەکی ئاسایی بدەیت پێی و بڵێت: (ئەم گۆشتە خۆشە بەلام لێنانەکەی نەگەیشتۆتە ڕادەی خۆیی و زۆر خۆش نییە)جا ئەو کاتە دەبینیت خێزانەکەت لە دڵی خۆیدا بڕیار دەدات کە هەموو هەوڵ و توانایەکی بخاتە کار کەبەو جۆری بۆت لێ بنێت. کە تۆ پێت. خۆشە و حەزت لێیەتی.

بەلام کت و پڕی و بێ پێشەکی و ڕێ خۆش کردن لەتووڕە بوون و گرژو هەڵچوون مەگۆڕێ بۆ ڕێز لێنان و نەرم و نیانی و لەسەر خۆیی، ئەگەر وا بکەیت ئەو کاتە خێزانت دەکەوێتە گومان لەپاکی نیازت و گومانی خراپت لێ دەکات کە خۆتت لێ گۆڕیوە، بەڵکو شەو کە گەڕایتەوە بۆ ماڵ (چەپکی گوڵ)یان(پاکەتی شیرینی)یان (لەمانەش باشتر بەڕوویەکی گەش و دەم بەپێکەنینەوە و بەچەند وشەیەکی پاکەوە)و دڵسۆزانە خۆت بکە بەماڵدا بەرەو ڕووی خێزانت دەری بڕە. مەڵێ بەخوا ئەم قسانە هەمووی ڕاستن و پێویستە کە بیان کەم بەڵکو یەکسەر بیان

کە. ئەگەر هاتوو زۆربەی ژن و مێردەکان بیان کردایە هەرگیز ڕووی نەدەدا کە لەشەش شایی بەلایەنی کەمەوە یەکێکیان تێك بچوایە و بەجیابونەوە کۆتای بهاتایە. کەواتە حەز دەکەیت بزانیت کە ئافرەت چۆن خۆشی بوێیت؟ دەباشە ئەوە نهێنییەکەیەتی وا پێت دەڵێت کە بیری خۆم نیە بەڵکو لە (دیکس)م قەرز کردووە کە دەڵێ: جارێکیان چاو پێکەوتنم کرد لەگەڵ (بەندی)یەکدا کە گیرابوو بەتاوانی ئەوەی زۆر ژنی هێناوە توانیویەتی دڵی (٢٣)ئافەرت کەمەندکێش بکات و مارەیان بکات و دەستیش بگرێت بە سەر چەك و پارەی هەموویان دا، کاتێ: لێم پرسی کە چۆن و چی دەکەیت لێیان وا دەکەونە دوای خۆشەویستیت؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی: هەرگیز فێل و دەست بڕین و خەڵەتاندنم نەکردووە بەڵکوو هەموو ئەوەی من کردوومە ئەوەیە کە بەوردی گوێم بۆ شل کردوون و بوارم پێداوون تا لەبارەی خۆیانەوە بەدرێژایی کات بدوێن. وەهەروەها ئەم پلانەش بەکار دێت لەگەڵ پیاواندا، (دزرائیلی) دەڵێت: گوێ بگرە بۆ پیاو با چی پێیە لەبارەی خۆیەوە بیڵێت.. پاشان ئەویش چەندان کاتژمێر گوێت بۆ دەگرێت. کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی خۆشیان بوێیت بڕگەی ژمارە (٦) جێبەجێ بکە..

**(ڕێزلێنانی تەواو ببەخشە بەبەرامبەرەکەت و وای لێبکە هەست بکات کە گرنگە)**

## بەشی دووەم

## شەشەم/ گرنگی بەحەزی براکەت بدە دەچیتە دڵییەوە

خوای گەورە لە قورئاندا گەورەترین و یەکسانترین بڕیاری دەرکردووە ئەویش ئەوەیە کە خەڵکی هەمووی لای خوا وەك یەکن وکەسیان لەکەسیان زیاتر نیە و چاکتر و بەرزتر و بەڕێزتر نیە لەخەڵکانیتر.. بۆچی؟

چونکە هەرهەموو بەدەوڵەمەند و هەژار و ژن و پیاوو زانا و نەزان و بەندە و ئاغا بەهەر زمانیٚ قسە بکەن و لەهەر تیرە و ڕەگەزێك بن هەموو منداڵییەك دایك و باوکن کە (ئادەم و حەوایە)( سەلامی خوایان لیٚبێت ).

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾(الحجرات ١٣).

سەیر بکە ئەوانەی ساڵەهای ساڵ بوو نرخ ڕێزیان لیٚ سەندرابوو بەچاوی سووكو پڕ جیاوازی سەیریان دەکرا وا ئەمڕۆ هەر کەزانیان نرخ و ڕێزی لەدەست چوویان لەم بەرنامەیەدا دەست کەوتەوە هەر ئەوەندەت زانی کۆیلە پێش ئاغا و هەژار پێش دەوڵەمەند و ڕەش پێست پێش سپی و ئافرەتان وەك پیاوان هاتن بەدەم ئەم بانگەوازەوە و ئاڵای (لا إلە إلا الله و محمد رسول الله) لەسەرشان و بازووی هەژار و کۆیلەی وەك (بلال و صهیب و زەنیرە و عمار و یاسر بەرزو شەکاوە بوو..) ئەم بڕیارە پڕ دادە مێژووییە هەر بەدەم و ووتەی سەر وەرەقە نەبووەو بەڵکو ئەوەی سەیری مێژووی ئیسلام بکات بەچاوی خۆی شوێنەواری ئەم بڕیارە دەبینێت.

لەم دەوڵەتە قورئانییەدا ئەوەندە مرۆڤ نرخی هەیە کە دەبێت ئەو کوڕە (قبطی)ییە یەك زللەی توند بدات لەبناگوێی کوڕی سەرکردەو پاشای میسر عەمری کوڕی عاص. یان ڕەش پێستێکی هەژاری وەك (عبادەی کوڕی صامت) بکاتە سەرۆکی وەفدێکی گەورە کە بچن بۆلای (مقوقس) پاشای میسر ئەمە چۆن بوو!؟..

کاتیٚ: وەفد گەیشتە کۆشك و گەشتنە لای پاشا یەکسەر پاشا هاواری لیٚ هەستاو

وتی ئەمەیان ڕەش و ناشرینە دووری بخەنەوە لێم وەفدەکە بەیەك دەنگ وتیان یانی چی؟ ئەمە گەورە و سەردارمان و لەهەمووما ژیرتر و چاکترە، مقوقس بەسەر سوڕمانەوە ووتی: باشە چۆن ڕازی بوون ڕەشێکی ئاوا سەرۆك وەفدبێت؟!.. ئەوانیش ووتیان با ڕەشیش بێت بەلاّم ئەو لەهەموومان ژیرتر و باش ترو پێینەترەو لەئایینی ئیسلامدا ڕەشی گرنگ نییە و بەعەیبە نەگیراوە، مقوقس ووتی دەقەیناکە بەلاّم تۆزێ لەسەر خۆ قسەم لەگەلْ بکە چونکە من زۆر لە ڕەشییەکەت ترساووم، عەبادە ووتی لەناوسوپاکەماندا هەزار ڕەشی تێدایە کە زۆر لەمن ڕەش ترن و من لەچاو ئەوانی دی سپییەکەیانم!!

ئائەمەیە هۆی ئەوەی کە ئیسلام لەماوەی چارەکە سەدەیەکدا ووڵاتان خۆشیان وویست و چووە ناو دڵیانەوە و کۆمەلْ کۆمەلْ گەلان بەئارەزووی خۆیان هاتنە ژێر سایەی ئیسلام.

ئەم باسەی پێشوو وانەیەکی گەورەی لێ فێر دەبین ئەویش ئەگەر دەتەوێت بچیتە ناو دڵی خەڵکی و خۆشەویست ببیت لە لایان و بچنە سەر قسەکانت ئەوا ڕێگا ناوازەکەی ئیسلام فەرامۆش مەکە.

ئایا دەزانیت ئەورووپا بەو هەموو دەسەلاّت و پێش کەوتنە و شارستانییەتەوە بۆچی گەلان خۆشیان ناوێت و ناچنە ژێر سایەیەوە (بەخۆشی خۆیان) چونکە بەچاوێکی سووك سەیری ووڵاتان دەکات و بەبیرێکی (گاوری و جووی) هەڵس و کەوتی : خۆی ئاغا و خەڵکیش ژێر دەستەیی دەجووڵێتەوەو بەبیرێکی سەرمایەداری پووچ فەقیرو بێنەوایانی کردۆتە قوربانی دەوڵەمەند و پارە داران.

یاخود ڕوسیای شیوعی کۆمەلْ دەکات بە چینایەتی و لەپێناوی خۆ بردنە نێو دڵی خەڵکی هەژار و پرۆلیتاریا بەچی؟ بەزوویرکردن و لەخۆکردنی چینێکی تری کۆمەلْ کە کارمەند و کاسبکاران و ناوی ناوون (بۆرجوان) هەمو گرنگی و ڕێزێکی لێ زەوت کردوون.من لێرەدا نامەوێت بڵێم بابای سەرمایەدار یان بابا شیوعی لەسەر هەڵەن، ئەم باسە لێکۆڵینەوەی ئابوری نییە بەڵکو دەڵێم لەسەر هەڵەن لەلایەنی خۆشەویست کردن و چوونە نێودڵی گەلان وەك بینیمان و دەشبینین کە زۆر گەلان

سنگیان لێ هەڵدەتەکێنن.هەوڵ بدە خەڵکی ڕازی بکەیت و لەو ڕێگایەوە کە خۆی پێی خۆشە بۆی بڕۆو خۆتی لەلاشیرین بکە، نەك لەو ڕێگایەوە کە خۆت قەناعەتت پێی هەیە و لەلات ڕاستە. نموونەیەك لەم بارەیەوە دەخەمە ڕوو کە چۆن بەبەکارهێنانی ئەم ڕێگایە سەرەك شورتەی خەلیفەی عەباسی (مهدی) خۆی لەسێدارەیەکی حەتمی ڕزگار کرد ئەمە چۆن بوو!؟؟

خەلیفە (مەهدی) پیاوێکی باش بوو حەزی دەکرد کە کوڕەکەشی چاك و لەخواترس بێت بۆیە هەموو جارێك بەسەرۆکی شورتەی دەووت: هاوڕێ خراپەکانی هادی کوڕم فەلاقە بکەو نەیەڵی لەگەڵیدا بگەڕێن، شازادە هادی بەمەی زانی ڕۆیشتەلای سەرۆك شورتە و پێی ووت: پەنجە نەبەیت بۆ هاوڕێکانم لێیان نەدەیت بەڵام لەلای باوکم بڵێ لێم داوون، سۆکی شورتە هەر گوێشی نەدایە و باشتر دەیکوتان.. پاش چەند ساڵێکی کەم، هادی بوو بە خەلیفەو جێی باوکی گرتەوە بۆیە دەست بەجێ فەرمانی دەرکرد کەسەرۆکی شورتەیش کەلەبچە بکەن و بیهێنن بۆلای، سەرۆکی شورتە ترسا و لەرزی لێ نیشت و ووتی: بەخوا بەزیندوویی نایەمە دەرەوە بۆیە هەستا بەکڕینی کفنی عەتراوی و خستیە بنی دسەتی و چوو بۆلای خەلیفە.

خەلیفە شمشێرێکی تیژی ئامادەکردبوو بۆی کاتێك ڕۆیشتە ژوورو سڵاوی کرد وەڵامی نەبوو پاشان پێی ووت: ئێستا چیت لێبکەم لەسەر بڕین زیاتر هەی بێگوێ؟.. سەرۆکی شورتە ووتی: پێش ئەوەی سەرم بڕن قوربان ڕێگام دەدەن قسەی خۆم بکەم خەلیفەش ووتی بڵێ بزانم بیانووت چییە؟ سەرۆکی شورتەیش ووتی گەورەم ئایا ئێستا تۆ حەز دەکەیت فەرمانێکم بەسەردا بدەیت و بڵێیت فلان شت بکە بیکەم یان نا؟ هادی ووتی: بێگومان حەز دەکەم بیکەی ئەویش ووتی: ئەی ئەگەر کوڕەکەت یان کچەکەت یان هەر خزمێکت ووتی: مەیکە و دوایی لای خەلیفە هادی بڵێ کردوومە چۆن حەز دەکەیت!؟ هادیش ووتی: دەبێت بەقسەیان نەکەیت و بەس بەقسەی من بکەیت ئەویش ووتی: دەی تۆ ئەوکاتە باوکت گەورەم بووئەگەر لەقسەی ئەو دەربچوومایە ئەوکاتە ئەوا ئێستاش ئاسانە خیانەت

لەجەنابتان بکەم بۆ کەسێکت لە قسەت دەرچم.. خەلیفە ئەم شێوازی قسەکردنەی زۆر پێ‌جوان دەبێت و شمشێرەکەی دەخاتەوە کێلان و لەپاڵ خۆیدا دای دەنیشێنێت و دەڵێ: بەڕێز تۆ هەر سەرۆکی شورتەم دەبیت و خەڵاتێکی باشیشی دەکات.

وردبەرەوە خوێنەری ئازیز ئایا ئەگەر بیوتایە ئێ من چی بکەم؟ نازام بەگوێی چەند کەسم بکردایە یان بیوتایە ئێ ڕۆڵە تۆ مندالْ بوویت ئەوکاتە.. یان دەی قوربان خۆ خراپم نەکرد هاوڕێکانت لارو بێ‌ڕەوشت بوون تۆشیان تێك دەدا.. خۆ ئەم قسانەی سەرەوە هەمووی راستە بەڵام نەك هەر خەلیفە زویر دەبوو بەڵکو سەری خۆیشی دادەنا چونکە لەگەڵ حەزی خەلیفەدا نەدەگونجان.زۆر جار ئەوکەسەی کە تۆ پێی دەگەیت (هەرکەسێك بێت) شتێکی وای تێدایە کەجێگای ئافەرین کردن بێت و لای تۆ گرنگ بێت و سەرسامی خۆتی بەرامبەر دەربڕیت و لەڕێگای پرسیارکردن لێی و گوێ گرتن بۆ وەڵامەکەی بەوردی وای لێبکە کە هەست بەشەخصیەت و گرنگی خۆی بکات.. ئەو مەیدانەی ئەو تێیدا پسپۆڕ و شارەزایە (هەر مەیدانێك هەیە) دیارە تا بەوجۆرە زۆ ماندووبوون و شەونخونی و دەرەدەسەری لەپێناودا چەشتووە کەچی تۆ هەرنرخی بۆ دانانێیت.. کەسێك دەناسم بەناوی ( ڕێناس علی )زۆر خۆی نارەحەت کردووە لەگەڵ (کەمانچە)یەکداو تانیوەی شەو دەنگی پڕۆڤەو خۆڕاهێنانی لەماڵە دراوسێکانی دەبیستران بێگومان ئەمە جێگای سوپاس و پێزانینە کە لەشارەکەماندا هونەرمەندێك مۆسیقا بۆ سروودە جوانەکان دابنێ، کەچی بەداخەوە هەندێك لەوانەی کەنیازیان نییە بیکەنە خۆیان و لەهونەری هاوەڵ گرتندا تێك شکاوون پێیان دەووت: ئەرێ نازانم بەشەو بەڕۆژ ئەم جیك و هوڕەت لەچییە؟!!...

یان ڕوودەدات شاعیرێك پێت دەڵێت با ئەم شیعرەت بۆ بخوێنمەوە: کە حەق وابوو تۆ بت ووتایە بۆم بخوێنەرەوە کەچی بەداخەوە بەساردییەکەوە گوێی بۆ دەگریت یان هەر دەڵێیت کوڕەکەی وەختی شیعر و میعرە سەرمان مەێشێنە ئائەم قسە وەك تیرە بۆ دڵی بەرانبەرەکەت و بەسە کەبەیەك جاری تۆ لەبەرچاوی

بکەویت و خۆشی نەوێیت.. دەی با هەموو کەسێکی موسڵمان بزانێت کە ئەم جۆرە هەڵوێستە لارانە لادانە لەڕێبازی (پێغەمبەر)ەکەیان و لەڕێبازی سەلەفی صالح. با لەم نموونە (پێغەمبەر)یە ووردببینەوە تا بزانیت کەچەندێك لەسوننەت لامان داوە.

شەوێکیان سەردارمان (ﷺ) دەدات بەلای ماڵی هاوەڵێکیدا کە ناوی (ئوبەی کوڕی کەعب) بوو سەیر دەکات وا دەنگێکی خۆش قورئان خوێندن لەم ماڵەوە دەبیستێت، بێدەنگ و لەسەرخۆ لەڕەوتی خۆی ناکات و دەڕوات بەلای کارەکەیدا سبەینێ کە دەیبینێت پێی دەڵێت: ئەم شەو دام بەلای ماڵتاندا بەڕاستی قورئانێکی خۆشت دەخوێند.. وادەزانم خوای گەورە لەبەهرەی دەنگ خۆشی داود (پێغەمبەر)ی هەندێ پێ بەخشیویت ,(ئەوبەی) لەخۆشیدا گەش بوویەوەو لەکامەرانی و بەختیاری ئەو قسەیەدا ووتی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا بەدایکم و باوکمەوە فیدات بم بەخوا بم زانیایە بەڕێزتان گوێم لێدەگرن زۆر خۆشتر دەمخوێند.

لەوەدەچێت من و تۆ گوێمان لێبوویایە قسەمان نەدەکرد یان بەڕەخنەوە دەمان ووت تۆزێ لەسەر خۆ بخوێنە خۆت کردووە بە (عبدالباسط) لێمان یان پێی دەوترا ئەمە چییە ئەڵێی لە تەعزێ دانیشتوویت.. کەهەموویان ووشەی دڵ ڕەنجێنەرن.

ئایا دەزانن ئەم شێوازە جوانە لەهەڵس و کەوت نەك بۆ هاوڕێ گرتن بەکەڵکە بەڵکو خۆی لەخۆیدا بانگەوازەو خەڵکیشی لەخراپە پێ لادەدرێت.. چۆن؟.

نموونەیەکی بچووك کەڕووداوێکی مێژوویییە بەکورتی جارێکیان (عبداللە ی کوڕی مەسعود) دای بەلای کۆمەڵێ گەنجی هەرزەدا کە چەپڵەیان لێدەدا بۆ کوڕێکی گەنج و ئەویش گەرمی کردبوو بە گۆرانی و سیاچەمانەی ناشرین، عبداللە چونکە قوتابی (پێغەمبەر)ی خوابوو وانەیەك لەوانەکانی دەروون ناسی فێربووبوو لێیەوە ئەو خۆشی و سەفایەی لێ نەبڕین و گوێی بۆ گرتبوون و لەنزیکیانەوە وەستا، کوڕەکە زۆری پێخۆش بوو کەزانایەکی وەك (إبن مسعود) گوێی گرتووە لەپاشان کە لێبوویەوە عبداللە ڕۆیشتە لایی و پیرۆزبایی ئەو دەنگە خۆشەی لێکردوو ووتی: دەك دەستت هەر خۆش بێت بۆ خۆت و دەنگە زوولاڵەکەت..

گەنجەکە وتی ئەوە بەڕاستە مامۆستاگیان توخوا دەنگمت بەدڵە!؟ عبدالله ش فەرمووی: بەڵێ زۆرم حەز لێکرد و بەڕاستی بەهرەی دەنگت پێبەخشراوە، بەڵام سەد خۆزگە لەخزمەتی ئەو کەسەدا بەکارت بهێنایە کەپێی بەخشیویت خۆزگە بەس قورئانت پێ بخوێندایە.گەنجەکە هەرلەوێدا بڕیار دەدات کە جگە لەقورئان مەرج بێت هیچی تری پێ نەخوێنێت.

ئائەم پیا هەڵدان و هاندانە بەلاشە ئاسانەو هیچی تێناچێت کەچی بەداخەوە هەندێك کەس لەدەستی خۆیانی دەدەن و خەڵك ناکەن بە هاوڕێی خۆیان و ناچنە دڵی کەسەوە، بەچی!؟ بەسووك سەیرکردنی کار و پیشەو هونەری خەڵکی و دەی شکێنن و ساردی دەکەنەوە..

دوو نموونەتان بۆ دەگێڕمەوە کەبەسەر خۆم هاتوون: یەکەمیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٤) و (١٩٨٥) کەمن لەدواناوەندیدا بووم تازە بووم بەخۆش نووس و – سەرەتای کاری هونەریم بوو– ئەتوانم بڵێم کەبەهاندان و پیاهەڵدانی هەندێ براو کەس و هاوڕێی دڵسۆزو هاورێگر من بووم بەخۆش نووس ڕۆژێك دەرسێکی شاغیرمان هەبوو قوتابییەکانی هاوڕێم داوایان لێکردم کە تابلۆیەکی جوان بنوسم لەسەر تەختە ڕەش و مامۆستا فلان بیبینێت و خەتی تۆی بۆ دەربکەوێت.. بەڵێ زۆر بەناڕەحەتی و خۆماندووکردن ئایەتێکم بەخەتی (ثلث) نووسی و بەجوانترین شێوە بۆم نەخشاند بەتەباشیری ڕەنگاو ڕەنگ، کاتێ مامۆستا هاتە پۆل و سەیرێکی کرد پاشان ڕووی کردە قوتابییەکان و وتی: خۆی خەت پێویست ناکات ئاوا خۆتی تێدا هیلاك بکەیت چونکە وەك عەرەب دەڵێت: (الخط مايقرأ) واتە: خەت هەر بخوێندرێتەوە، قوتابییەکان پێکەنین و منیش کەچاوەڕوانی ووتەیەکی وانەبووم بەتایبەت لەمامۆستایەکی وا کە کەم وێنەبوو لەدڵسۆزی و زیرەکیدا بۆیە سەرم داخست و زۆر ناڕەحەت بووم و تەنانەت ئەوهەڵوێستە واپشتی ساردکردمەوە ئەگەر هاندانی هەندێ براوهاوڕێ نەبوایە هەر بەتەواوەتی وازم لەجیهانی خۆش نووسی دەهێنا.

نموونەی دووەم: کاتی خۆی لەدواناوەندیدا بووین لە (دیراساتی ئیسلامی هەڵەبجە) من جاربەجار کزەبای شیعر و ئەدەبیات سەری لێ دەدام و شیعرم دەنووسی، ڕۆژێك شیعرێکم بۆ قوتابییەکانی هاوڕێم دەخوێندەوە کە ئەمەش دەست پێکردنەکەی بوو:

**ئێمە**

لەم ڕێیەدا بێ ڕابەرنین ئەویش کەسێکە (یاسینە)
بێ زیانە شوێن کەوتنی چون سەلمێنراوی دێرینە
واقیع سەلماندی بەگشت لا کەغەیری ئەو دەست بڕینە
کێ وتی یاسای گورگ بۆمەڕ قەلایەکی پۆلاینە؟
بایاسایە جوانیش دانێ خۆگۆشتی مەڕ هەر شیرینە
تاکەی دڵ و چاوبەستراوین دەوازبێنن ئەی خەڵکینە
مەیمون کەچاو لە دارتاش کا ئەنجامەکەی کلك بڕینە
ئەوەی ئیسلام بەرنامەی بێ سەرفرازی هەر دوو ژینە

لەڕاستیدا هەرچەند ئەم شیعرە کلاسیکی بوو بەڵام هەندێ لەهاوڕێکانم دڵیان خۆش کردم و ووتیان بەڕاستی مانا بەخش و جوانە، بۆیە من زۆر دڵخۆش بووم و ئەم وەڵامە زیاتر هاندەرم بوو بۆ شیعرنوسین.

بەڵام لەبیرمە هاوڕێیەکی بەشەخصیەت و زیرەکی پۆل کەپێم ووت ئەم شیعرەم نوسیوە چونکە مەبەستی هاوڕێ گرتن و خۆبردنە ناو دڵانی بەکارنەهێنا ووتی: توخوا فلان کەس ئەگەر واز لەشیعر و شت نەهێنی بەڕاستی لای من شیعر کاری بێئیش و گێلەکانە.. هەرئەوبرایە لەم دواییەدا هەڵوێستی گۆڕیوەو شیعر بەبەشێك لە خزمەتکردنی ئەدەبی ئیسلامی دەزانێت!.. گرنگ نییە بەلامەوە هەڵوێستی گۆڕیوە یان نا، بەڵام ئەوەندە هەبوو بەو وشەیەی کە خۆی هیچ قازانجی لێ نەکردو زیانی لێ کرد چونکە دڵی منی لێ بێزرا و لەبەرچاوکەوت و وەك جاران خۆشم نەویست بۆچی!؟.. چونکە ڕێزی حەزەکەمی نەگرت و ئارەزوومی شکاند.. چونکە

هیچ ئەوەندەی ئەوە ناخۆش نییە مرۆڤێك شتێكی خۆش بوێت و دەقی پێوەگرتبێت و لەدڵیدا جێگەی ببۆ ڕاخستبێت كەچی تۆ لەپاڵ خەڵكیدا بیشكێنیت و بەسووك سەیری بكەیت، بۆ نموونە زۆرێك لەموسڵمانی كوردی ئەم سەردەمە ئەم ڕێگا چاكەیان فەرامۆش كردووە كە (مەدحی) ئەوشتە بكە كەبەرامبەرەكەت حەزی لێدەكات)، بەپێچەوانەوە بزانێت كە من حەزم لە( پەیامی ڕاستییە) دێت لەلامدا ڕەخنەی لێ دەگرێت ئەمە بۆواوو ئەوە بۆوا، یان حەزم لەكاروانە كەچی لەلامدا زەمی دەكات یان كەسێك گۆڤاری ڕابەری بەدەستەوەیە ئەم ناڵێت بایان قسەنەكەم یان بەچاكە پێزانین بۆ هەوڵ و تێكۆشان ئەو بریانەی كە دەری دەكەن دەست بەقسە بكەم.

هەندێك كەس كەوتوونەتە ئەم هەڵەیەوە و دەیانەوێت خەڵكی بگۆڕن بۆ چاكەو بیدعەت نەهێڵن، بەڵام دێن ئەوكەسەی چەند ساڵە دەقی بەشتێكەوە گرتووە و خۆشی دەوێت ئەمان لە (كن فیكون)ێكدا دەیانەوێت بیگۆڕن و بیخەنە سەر ڕاكەی خۆیان و یەكسەر بەرەو ڕوو پێی دەڵێن ئەمەی تۆ دەیكەیت شیركە وە بیدعەیە و واز نەهێنیت كافر دەبیت!!..

لەبەر ئەوە باهەموو برایەك ئەم خاڵە ڕەچاو بكات و ئاگای لێبێت كەئەو بانگی خەڵك ئەكات بۆلای خوا بابەئارامی و لەسەرخۆ و ناڕاستەوخۆ خەڵكی بەرەو قورئان و سوننەت بگەڕێننەوە.


**سەرچاوەكانی ئەم باسە:**

١-قورئانی پیرۆزز

٢-صحيح البخاري و مسلم.

٣-صفة الصفوة/ إبن الجوزي.

٤-الطريق إلى القلوب/ الشيخ عباس السيسي.

٥-رجال الفكر و الدعوة/ أبو الحسن الندووي.

## (١٢) ڕێگا بۆ ئەوەی بەئاسانی خەڵکی بهێنیتە سەر بیروباوەڕو بۆچوونەکانت:

١-دەمەقاڵە و موجادەلە مەکە.

٢-ڕاستەوخۆ بەبەرامبەرەکەت مەڵێ تۆ هەڵەیت..

٣-ئەگەر هەڵەبوویت دان بەهەڵەی خۆتدا بنێ.

٤-پەنا بەرە بەر نەرمی و لەسەر خۆیی نەك توڕەیی و توندوتیژی.

٥-گەلێك پرسیار لەبەرامبەرەکەت بکە کە وەڵامەکانی (بەڵێ)بن.

٦-جوان گوێبگرە بۆ بەرامبەر بابەتەواوەتی قسەی خۆیت بۆ بکات.

٧-واز لەبەرامبەرەکەت بهێنە باوابزانێت بۆچوونەکەت هی خۆیەتی.

٨-هەوڵبدە لەڕوانگەی بەرامبەرەکەتەوە سەیری مەسەلەکە بکەیت.

٩-ڕێزدابنێ بۆ بۆچوونی بەرامبەرەکەت و میهرەبانی بنوێنە بەرامبەر حەزەکانی.

١٠-پەنابەرە بۆ هاوکاری جوان وشیاو.

١١-بۆچوونەکانت لە قاڵبێکی تەمسیلیدا بخەرە ڕوو.

١٢-مەسەلەکە بخەرە مەیدانی کێ برکێ و مونافەسە.

## ڕێگای یەکەم:
## (دەمەقاڵە مەکە)

ئاهەنگێك سازکرابوو بۆ ڕێزلێنان لە (روس سویس)منیش بانگهێشت کرام و ڕۆشتم، لەکاتی نان خواردنی ئێوارەدابوو، کابرایەك بەتەنیشتمەوەبوو بەدەم نان خواردنەوە چیرۆکێکی بۆ دەگێڕاینەوە کە بەکوتی باس لەیەك ووشە دەکات ئەویش: ئەوەیە (بمانەوێت و نەمانەوێت دەستێکی خودایی ژیان و پاشەڕۆژمان دەست نیشان دەکات).. ئەو پیاوە وای ئەزانی ئەم ڕستەیە لە -ئینجیلدا- هاتووە! بەڵام لەڕاستیشدا وانەبوو.

جا بۆئەوەی خۆم دەربخەم و گرنگیو لێهاتووبم بیسەلمێنم بەدەوروبەر.. هەرلەوێدا لیژنەیەکم پێك هێنا بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو هەڵەیە! بەڵام کابرا هەر لەسەر قسەی خۆی سوربوو بۆیە بەتووڕەییەوە نەڕاندی بەسەرمانداو ووتی: (چی!شکسبیر؟ ئەمە مەحاڵە... دەستەواژەی ئینجیلەو من لەمەدا بێگومانم)!.

ئەوەبوو لام کردەوە، بەلای چەپمدا کە مستر (فرانك جاموند)م بینی کەیەکێ بوو لەهاوڕێ دێرینەکانم و ساڵانێکی زۆری تەرخان کردبوو بۆ ئاشنابوون بەژیانی (شکسبیر).

بۆیە منیش و ئەو پیاوەش لەسەر ئەوە پێك هاتین کە مستر چاموند ببێتە دادوەرمان و بمانخات بەلایەکدا.. ئەوەبوو بەوردی گوێی بۆ هەردووکمان شل کرد، پاشان لەژێر مێزەکەوە نوکە شەقێکی دا لەقاچم و ووتی پێم: تۆ نەت پێکاوە! ئەم دەستەواژەیە لە ئینجیلدا هاتووەو بەس.!

منیش تێکەیشتم لەمەبەستەکەی بەڵام لەڕێگا لێم پرسی: (قوربان من زۆر دڵنیام کە ئەو دەستەواژەیە هی شکسبیرە نەك ئینجیل لەوەڵامدا ووتی: بێگومان لە (هاملێت)دا هاتووە، بەشی پێنجەم، دیمەنی دووەم.. بەڵام خۆشەویستم تۆ نازانی ئێمە لەوێ دەعوەت بووین، بۆچی دەتویست دڵی ئامادەبوویەك بشکێنی و تەریقی کەیتەوە؟! ئایا بەوکارە تۆ خۆشەویست دەبوویت لای؟ بۆ لێی نەدەگەڕای لەسەر

ڕایەکەی خۆی بەردەوام بێت؟ ئەو ئەو ڕایەی تۆی قبوڵ نەبوو.. ئامادەش نەبوو قبوڵی بکات، ئیتر بۆچی تۆ دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکەیت؟ بەڕێزم هەموو کاتێ خۆت بەدوور بگرە لەگۆشە تیژەکان (الزوايا الحاده)!..

(خاوەنی ئەم دەستەواژەیە (هەمووکاتێ خۆت بەدوور بگرە لەگۆشە تیژەکان) کۆچی دوایی کرد.. بەڵام پەندێکی وای دادام کە تائێستاش لەدڵما جێگیربووەو من زۆر زۆر پێویستم بەوانەیەکی ئاوا هەبوو.. چونکە من لەڕادە بەدەر ئارەزووی دەمە قاڵەم هەبوو، حەزم لێ دەکرد!..

کاتێ لاو بووم حەزم دەکرد لەهەموو شتێکدا دەمەقاڵە (مجادلە) بکەم. وەهەر ئەو حەزەش وای لێکردم کەبەشی (منطق) هەڵبژێرم لەزانکۆدا.. تا زیاتر یارمەتی دەرم بێ لەهونەری دەمەقاڵە و بەرامبەر شکاندندا!.. هەروەها بەشداریشم دەکرد لەهەموو کۆڕو سمیناره (دەمەقاڵەییەکاندا) ئیتر بالەهەر بابەتێکیش بوایە من دەمم بۆ دەکوتا.. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەبوو کە حەزم لە خۆدەرخستن بوو.. بەهەر نرخێك ببوایە ئەو لایەنەم تێر دەکرد!..

تەنانەت لەم دواییانەدا دەستم کرد بەخوێندنەوەی ئەو ڕێگایانەی باس لە بردنەوەی دەمەقاڵە دەکات و بەرامبەرەکەی پێ ببەزێنم، تاگەشتمە ڕادەیەك (شەرم دەکەم باسی بکەم) خەریك بوو لەوبارەیەوە کتێبێك بخەمە بازاڕەوە!..

پاش ئەم هەموو نارەحەتی و هەوڵ و تەقالایە گەیشتمە یەك ئەنجام: ئەویش ئەوەیە: (تاقە ڕێگایەك بۆ بردنەوەی دەمەقاڵە ئەوەیە تابۆت دەکرێت خۆتی لێدوور بخەرەوە وەك چۆن لە بۆرەمار و بومەلەرزەی وێران کەر خۆت بەدوور دەگریت).

بەڵێ هەرگیز ناتوانیت لەدەمەقاڵەدا سەرکەوتووبیت، چونکە تۆ براوەیت یان دۆڕاو هەر دوڕاویت، ئەزانی بۆچی؟

چونکە گریمان تۆ بۆچوونی بەرامبەرەکەت پووچەڵ کردەوە.. ڕاکەیت شکاند.. وتەکانیت بەدرۆخستەوە ئایا چی ڕوو دەدات؟ بێگومان جەنابت هەست بەجۆرە خۆشی و حەوانەوەیەکی دەروونی دەکەیت، بەڵام ئەی ئەو بەستە زمانەی بەرامبەرت هەست بەچی دەکات؟ هەست بە ڕق و کینەیەکی دەروونی دەکات

بەرامبەرت و دڵنیاش بەکە بە هیچ جۆرێك دان بەو سەرکەوتن و بردنەوەیەتدا نانێت... چونکە تۆ لەحەزو ئارەزوویت داوەو لەنرخ و بەهات کەم کردۆتەوەو لەناو هاوڕێکانیدا شکاندووتەوە..

پەندێکی پێشینەی کۆن هەیە دەڵێت (هەرکەسێك ناچار بکەیت لەهەڵگرتنی بیروباوەڕەکەتدا کەخۆی قەناعەی پێی نییە ئەوە هەر لەسەر بیروباوەڕی یەکەمی ماوەتەوە)!

(کۆمپانیای –بۆن– بۆمسۆگەر کردنی ژیان) سیاسەتێکی جوان و ناوازەی بۆسەرجەم کارمەندەکانی هەڵبژاردبوو کە بۆکەسیان نەبوو –بەملیم– لێی لابدەن ئەویش ئەوەبوو (هەرگیز دەمەقاڵە مەکە)!..

چەند ساڵێك لەمەوبەر پیاوێکی –ئیرلەندی– پەیوەندیکرد بەپەیمانگاکەمەوە، ئەو پیاوە زۆر ڕۆچووبوو لە ئارەزووی دەمەقاڵەو بەرامبەرکێدا.. کارەکەشی دەڵاڵی یەکێ لە کۆمپانیاکانی شت و مەك گواستنەوەبوو..

ئەم کابرایە هەرچی دەکرد و دەکۆشا سەرکەوتوو نەدەبوو لەڕاکێشانی کڕیاردا بۆ کۆمپانیاکەی، بۆیەش ناچار پەنای بۆ پەیمانگاکەی من هێنا، منیش بۆم دەرکەوت کەهۆی سەرنەکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیەی کە دەستێکی باڵای هەبوو لەدەمەقاڵەکردندا!.

بۆیە من بیرم لەوە نەکردەوە کە –باتریك ئوهیر– فێری چۆنیەتی قسەکردنی بکەم بەڵکو بیرم هاتە سەر ئەوەی کە فێری بکەم چۆن قسە نەکات.. بەڵێ مستر ئوهێر لە باش جێبەجێکردنی ڕێنومایییەکانم بۆی .. ئێستا لە لوتکەدایە لەنێوان سەرجەم دەڵاڵەکانی کۆمپانیای (هوایت)ی ئۆتۆمبیل لەشاری نیویورك.. لەدەڵاڵیدا کەس پێی ناگات، چۆن وای لێهات؟

ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە: ڕۆژێ ڕۆشتم بۆ نوسینگەی یەکێ لەو کەسانەی کە دەمویست قەناعەتی پێبکەم ئۆتۆمبیلی نوێمان لێ بکڕێت.. هەر ئەوەندە خۆش بوو تازانی بۆچی هاتووم یەکسەر قیراندی بەسەرمداو وتی:

چی؟ ئوتومبیلی (هوایت) باپێت بڵێم کەقەڵب ترین جۆری ئۆتومبیلە! و بەخۆڕایش بمدەنیٚ نامەوێت.. من بەنیازم لە کۆمپانایی (هوسێت) ئۆتۆمبیل بکڕم!..

منیش لەوکاتەدا لەسەر خۆ پێم گوت: (زۆر چاکە گەورەم، ئۆتومبیلەکانی (هواسێت) ناو بانگی چاکی و خۆڕاگرییان دەرکردووە. ئیٚ پاشان کۆمپانیای هوسێت زۆر چاکەو کڕیارەکانیشی ژیرو بەسەلیقەن)!

هەر کەئەمەم ووت خێرا توندو تیژییەکەی دامرکایەوە، چونکە بواری دەمەقاڵەم بۆ نەهێشتەوە و دانم نا بەبۆچوونەکەیدا! پاش ئەوە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لێم نەبیست باسی ئوتومبیلەکانی هواسیت بکات و بڵیٚ باشترین جۆری ئۆتۆمبیلە!.

بیٚدەنگ و مات بوو، منیش ئەو بیٚدەنگییەم بەهەل زانی.. دەستم کرد بەچاکی و بەپێزی ئۆتۆمبیلی -هوایت- بەوردی باسی خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئوتومبیلی -هویات و -هوسیت-کرد، تا وای لیٚهات پێش ئەوەی نووسینگەی بەجیٚ بهێڵم بەوبەیانی زووە ئوتومبیلێکم پیٚ فرۆشت!!.

لەوەوەبەر ئەگەر ووشەیەکی -دڵبریندارکەری وەك ئەو دەستەواژەیەی کابرای کڕیارم ببیستایە خێرا خوێنی دەمارەکانم ئەهاتنە خۆش و هێرشێکی ووشەی ناشرینم دەکردە سەری و شەرێکم پیٚدەفرۆشت، بەتوندی دادەبەزیمە سەر هواسێت و ئەو اتە ئەو زیاتر دەمارگیری دەیگرت و بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت ئوتومبیلی هواسێت بەڕاست دەزانی.. و هەتا من زیاتر و خەستر دەمەقاڵەم بکردایە لەگەڵیدا ئەو زیاتر پێی دادەگرت لەسەر کڕینی شت و مەك لەکۆمپانیاکەی بەرامبەرم!

(وە من هەر کاتیٚ سەیری ڕابوردوی خۆمم دەکرد سەرسام دەبووم کەچۆن توانیومە ئوتومبیل بفرۆشم! چەندانساڵی تەمەنم بەزایەداوە لەدەمەقاڵەو دەمە دەمەی بیٚ کەڵکدا).

(بنجامین فرانکلین) دەڵێت: (هەرکاتێك دەمەقاڵەت کرد.. ململانێت کرد.. قسەو بۆچوونەکانی بەرامبەرەکەتت پووچەڵ کردەوە.. لەوانەیە هەندیٚ کات هەندیٚ سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، ئەوەش بزانە کەسەرکەوتنێکی بۆشە.. چونکە

هەرچۆنی ببەیتەوە تۆ زیانی ئەوەت کردووە کە دۆستایەتی بەرامبەرەکەت لەدەست داوە، دەی کامیانت لەلاباشە: سەرکەوتنێکی کاتی و ووشك یان مانەوەی پەیوەندی خۆشەویستانەی ئەو کەسە؟ هەر وەك دەگمەنە مرۆڤ هەردووکیانی لەیەك کاتدا دەست بکەوێت!).

ڕۆژنامەی (بوستن ترانس کرییت) جارێك ئەم هەڵبەستە ڕەمزییەی بڵاوکردەوە: (ئالێرەدا لاشەی (ولیەم جرای) نێژراوە.. ئەوکەسەی لەسەر دەمەقاڵە ژیاو لەپێناویشیدا مرد.. خۆلەسەر هەقیش بوو.. هەردەم لەسەر هەق بوو.. بەڵام بۆیەکجاری مرد.. وەك ئەوی هەردەم لەسەر هەڵە بووبێ).

بەڵێ ڕوودەدات تۆ لەسەر راستی و هەق بیت لەو دەمەقاڵەیەدا، بەڵام بەوەی کە دەتەوێت بۆچونی بەرامبەرکەت پووچەڵ کەیتەوە ئەوا سەردەکێشی بۆ نەزۆکیو بێکەڵکی -کارەکەت- وەك ئەوەی تۆ لەسەر ناهەق بووبیت).

وەزیری دارایی دەوڵەتەکەی (ودروولسۆن)ی ئەمەریکی بەئاشکرا ڕایگەیاند: (لەماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوومدا کەلەمەیدانی سیاسەتدا بەسەرم بردوە بۆم دەرکەوتووە کە مەحاڵە مرۆڤ بتوانێت بەدەمەقاڵە کەسێکی نەزان ببەزێنێ)!.

(کەسێکی نەزان) بەڕاستی ئەی مستر (ماك ئادو) تۆ زۆر نەرمی لەبەکارهێنانی ووشەدا.. ئەگینا من تاقیکردنەوەکانی ژیان فێریان کردووم کەهەرشتێك بتەوێت بە هەوڵدان پێی دەگەیت جگە لەیەك شت نەبێت ئەویش گۆڕانی ڕاوبۆچوونەکانە لەڕێگای شەڕە قسەو دەمەقاڵەی بێتامەوە ئیتر با ئەو کەسە لەهەر ئاستێکدابێت)!

بوزایش دەڵێت: (قین بەقین لاناچێت بەڵکو قین بەخۆشەویستی لادەچێت) هەر وەك دەمەقاڵە بەدەمەقاڵە لاناچێت بەڵکو بەلێزانی و نەرمی و پاکی نیەت ڕوودەدات لە بۆچوونەکانت دابەزیت و بچیتە سەر بۆچوونی بەرامبەرەکەت یان بەپێچەوانەوە..

جارێکیان (لفکولن) بەئەسپایی سەرزەنشتی ئەفسەرێکی لاوی دەکردو پێی دەگووت: (ئەوکەسەی دەیەوێت ڕەوشتی بەرزو بیری ڕووناك بگەیەنێتە کەسانیتر، دەخیلە بەدەمەقاڵەی بێ کەڵك و وشك نەیکات، چونکە ناتوانێت لەسەر نارەحەتی و

ئاکامی دەمەقاڵەکە خۆی بگرێت، ئەمەشە بەبەڵگەی ئەوەی کەخۆی پێناگیرێ و ناتوانێت دان بنێت بەو ڕاستیانەدا کەبەڵگەی هەردوولا لەیەك ئاستادایە.. هەروەك ناتوانیت دان بنێی بەو شتانەشدا کەهیچ و بێ بایەخن ئیتر با بەڵگەکانی تۆش بەهێزتربن!.

چونکە ئێمە واباشترە بۆمان ڕێگا چۆڵ بکەین بۆسەگی هار تا بەبێ وەی تێپەڕ بێت و نەمانگەزێت نەك بمانگەزێت و پاشان بیکوژین، ئەو کاتە کوشتنەکەشی لەچاو گەستنەکەیدا زۆر بێبایەخەو هیچی لەئازارەکەمان کەم ناکاتەوە!.

کەواتە بۆئەوەی خەڵکی ڕابکێشی بۆلای بۆچوونەکانت ئەوا بڕگەی ژمارە (یەك) جێبەجێ بکە:

**(دەمەقاڵە مەکە، و بزانە باشترین ڕێگا بۆ بردنەوەی دەمەقاڵە ئەوەیە کە لێی دوور بکەویتەوە).**

## پاشکۆی یەکەم:
## ( دەمەقاڵە ( مراء ) لەقوتابخانەی ئیسلامدا )

شتێکی (فطری)یەو پەروەردگار مرۆڤی بە-کۆمەڵایەتی- دروست کردووەو تالەڕێگای قسەو گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەوە سوود بەیەکتری بگەیەنن، دەمەقاڵەش (مجادلە) جۆرێکە لەجۆرەکانی تاوتوێ کردنی بۆچوونەکان و گەیشتنە ڕای ڕاستو دروست و ئیسلام یاساغ و قەدەغەی نەکردووە بەڵکو مەرجی بۆداناوە لەو مەرجانە: ١-دەبێت بەجوانترین شێوە بێت و بەنەرم و نیانی ئەنجام بدرێت (وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ)(النحل ١٢٥) ٢-دەبێت ئەو دەمەقاڵەیە بۆ گەیشتن بەهەق بێت و بەنیەتی شکاندنی خەڵك و خۆهەڵنان نەبێت.

ئیمامی شافعی خوای لێی ڕازی بێ-دەڵێت: (هەرکاتێ دەمەقاڵەو بەرامبەرکێ-مناظرە-م لەگەڵ هەرکەسێکدا کردبێت، لەخواپاڕاومەتەوە هەق لەسەر دەستی بەرامبەرکەمدا بێنێتەدی تا من نەبمەهۆی شکاندی دڵی موسوڵمانێك و تکانی ئاوی دەموچاوی).

بەڵام ئەگەر ئەو دەمەقاڵەیە تەنها بۆسەرخستنی خۆت و دەرخستنی عیلم و لێهاتووی خۆت و شکاندن و دەرخستنی نەفامی و نەزانی بەرامبەرەکەت و تەریق کردنەوەی‌بێ، ئەوە ئیسلام حەرامی کردووەو هانی موسوڵمان دەدات لێی دوورکەونەوەو بەسزای سەختی قیامەت ئەیان ترسێنێت.

لەسورەتی الكهف ئایەتی ( ٢٢)دا خوای گەورە دەفەرموێت (فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا) واتە: سەبارەت بەژمارەی -اصحاب الكهف- دەمەقاڵە مەکە لەگەڵ جولەکەو گاورەکاندا مەگەر دەمەقاڵەیەکی ئاشکراو بەڵگەدار..

(پێغەمبەر)ی خوا _صلى الله عليه وسلم_ دەفەرموێت: (من طلب العلم ليجاري به العلماء و يماري به السفهاء او يصرف به وجوه الناس أدخله النار) (رواه الترمذي وابن ماجه).

واتـە: هەرکەسـێ هـەوڵی دەسـت خـستنی زانیـاری و زانـست بـدات بۆئـەوەی شانەخڕەی زانایـانی پێبکات و دەمەقاڵـەو دەمکوتی نەخوێندەوار و عـەوامی پـێ بکات و خەڵکی پێبکاتە خۆی ئەوا خوای گەورە ئەیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

کەواتە بەرنامە ناوازەکەی پەروەردگار ڕێگا نادات بەشوێن کەوتوانی کە سەنگەر لەیەکتر بگرن و دەست بکەنە شەڕەقسەو یەکتر بەزێنە یـان دەمەقاڵە بکـەن لەهەنـدێ مەسـەلەدا کـەدوو ڕو هەڵئـەگرێت یـان ڕای هـەرکامیان بێـت هـیچ لـە مەسـەلەکە ناگۆڕێت.. ئەم شێوە ووتووێژە (مراء)ە دەبێت موسوڵمان لێی دورکەوێتـەوە.. بـەڵام دەمەقاڵە و مێزگردو ڕاگۆڕینەوە ئەگەر بۆ گەشتن بـەڕای ڕاسـتی بێت و بـەجوانترین شێواز و ئادابی حیواربێت ئـەوە زۆر پێویـستە و ئەگـەر ئـەوە دروسـت نەبوایـە ئـەو کاتە عەقڵی موسڵمانەکان داخراو دەبوو نەکـەس لەبەرنامەکـەیان حاڵی دەبـوو وەنـە ئەوانیش لەبۆچوونی بەرامبەرەکانیان ئەگەیشتن..

کەواتە موسوڵمان دەبێت جیاوازی بکات لـەنێوان مەسـەلە گـەورەو ترسـناکە کـان داو نێوان مەسەلە بچوک و بێبایەخەکان.. لەیەکەمدا نابێت لەوە بترسێت لێـی زویـر دەبـن یـان نـا.. بـەڵکو دەبێـت بەرپەرچـی بداتـەوەو لەگـەڵی دابنیـشێ و مێزگـردیش بکەن وەك مەسەلەی بوونی خواو ڕۆژی دوایی و حەرام و حەڵاڵ و هتد.. چونکە لەم شـتە چـارەنووس سـازانەدا نابێـت لەلۆمـەی لۆمەکـەران بـاکی هـەبێت و لـەبڕینی موچەو پـاروە نانەکـەی بترسێت، بۆیـە (پێغەمبـەر)ی خـوا _صـلی الله علیـه وسـلم_ بەیعەتی لەهاوەڵە شیرینەکانی وەرئەگرت کەهەردەم هەق بڵێن و لەلۆمەی لۆمەکەران نەترسن.

بەڵام لەمەسەلە بچوك و کەم بایەخەکاندا —موسڵمان با سنگی فراوان بێت و بڵـێ دەقەینا بابێینە سەر قسەکەی تۆ.. یان تۆڕاست دەکەیت یـان دیـارە مـن نـەم پێکـا.. یان (بارك الله فيك) بەڕاستی بەڵگەکـەی تـۆ بـەهێزتربوو.. یـان قسەکەی هـەردوکمان ڕێـی تـێ دەچێت.. یـان ئـەتوانێت بـە هونـەرێکی ژیرانـە دەمەقاڵەکە کـپ بکـەرەوەو مەسەلەکە بگۆڕە..

بۆنموونە لەجێیەکدا یەکێ دەڵێ: سلێمانی خۆشترە لە هەولێر یان دانیشتوانی هەولێری غەریبیان زیاتر خۆش دەوێت تا سلێمانەییەکان! یان نێوان هەولێر و دهۆك (١٠٠)کیلۆ مەترە یان خەتی فارسی جوانترین خەتە.. یان فلاّن نووسەر لەهەموو نوسەرەکانیتر واقع بین ترە! یان ئەحمەد ئاوا ڕازاوەترە تا سەرچنار! یان کەلار خۆشترە لە چەمچەماڵ! یان هەنار لەمۆز خۆشترە! یان لەهۆڵەندە خۆشترە تا نەرویج! ئەوەو چەندان مەسەلەی تریش کەپێویست ناکات سەری خۆت بئێشێنی و کاتی خۆتی پێوە بکوژیت و دڵی خاوەنەکەشی لەخۆت بڕەنجێنیت..

لەنمونەی ئەو جۆرە مەسەلانەی کەهێنامەوە فەرموودەی (پێغەمبەر)ی خۆشەویست _صلى الله عليه وسلم_ هاتووەو دەفەرموێت: هەرکەسێ واز لە (مراء) دەمەقاڵەی بێهودە بهێنێ لەبەرخوا ئەوە من زامنی ماڵێکی بۆ دەکەم لەناوەڕاستی بەهەشتدا و هەرکەس وازی لێ بهێنێت لەکاتێکدا لەسەر هەقیش بێت ئەوا من زامنی کۆشکێکی بۆ دەکەم لەبەرزترین شوێنی بەهەشتدا.

عبدالله ی کوڕی عەباس خوای لێڕازیبێت دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من منداڵ بووم تازە پێدەگەیشتم عومەر خوای لێ ڕازی بێ لەگەڵ پیاوماقولانی ( بدر)دا لەدیوەخان دایدەنیشاندم.. جارێکیان پرسیاری لێ کردن دەربارەی تەفسیری سورەتی ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ﴾(النصر (١) هەموویان وتیان: کاتێ سەرکەوتنی خوا هات بۆتان سوپاس گوزاری بن و داوای لێخۆش بوونی لێبکەن.. عومەر فەرمووی ئەی کوڕی عەباس تۆ چۆنی لێ حاڵی دەبیت؟

عەبدوڵلا ووتی: مەبەستە سەرەکییەکی وانییە بەڵکو باسی مردنی (پێغەمبەر)ی خوا دەکات! عومەری کوڕی خەتاب ( خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی : منیش هەروای بۆ دەچم.

سەیرکە عەبدوڵلا قسەی پێنەبڕین بڵێت: نەخێر وانییە! ئێوە نازانن! لەخۆتانەوە تەفسیری قورئان مەکەن! لێگەڕێن بۆ بەندەکوڕی خۆتان! نا هەرگیز وانالێت چونکە مامۆستای دەروونناسان رسول الله _صلى الله عليه وسلم_ دەرسی داداوە چۆن دڵی پیاوانی بەدر دەڕەنجێنێ.. ئەگەر من و تۆ بوینایە خوێنەری بەڕێز چیمان دەکرد!!؟.

بەڕاستی زۆر جێگای خۆیەتی بانگەوازکارانی ڕێگای خوا ئەمەیان لەپێش چاو بێت و فەرامۆشی نەکەن.. قوتابیەك ئێمە بەهەزار نارەحەتیو فەلاکەت تا بەیارمەتی خوا توانیومانە بیهێنینەوە چوارچێوەی ئیسلام و ڕێگای مزگەوتی پێ ئاشنابکەین کەچی بابایەکی نیمچە خوێندەوار هەزار هەڵەی لێ دەگرێت و بەدرۆی دەخاتەوە.. ئەگەر ضمەیەك بە فتحە بخوێنێتەوە دنیای لێ حاڵی دەکات و تەریقی دەکاتەوەو دەڵێ: تۆ نازانی قورئان بخوێنی یان بۆ بەرسمێڵ ناکەیت! یان بۆ شەرواڵەکەت وا درێژە یان بۆ سیواکەکەت بستێك نابێت؟!!.

ڕۆژێ لەپرسەیەکدا بووم لەیەکێ لەدێهاتەکانی شارەزوردابووم، مامۆستایەك خۆی سورکردبوویەوەو بەو پەڕی توانا بەرگری لە -فاتحە- خوێندن دەکرد و هێرشی دەبردە سەر ئەوانەی کە نایخوێنن!. منیش لەوێ بووم ئاگام لێبوو گەنجەکان سەیریان ئەکردم بۆ ئەوەی ڕەدێکی بەهێزی بدەمەوە! منیش سەرم داخست و هیچم نەگووت، کاتێ گەڕاینەوە لەڕێگا ووتیان مامۆستاگیان خۆ دڵمان تەقی ئەوە بۆ بۆچوونەکانیت پووچەڵ نەکردەوە؟..منیش ووتم: ئەوە بەڕاستتانە.. یانی من لەناو ئەو پرسە قەرەباڵغەدا ئەوبرا دینییەم تەریق بکەمەوەو بڵێم: قسەکانت هەڵە بوون!. ئەتانوویست خۆمان بکەینە نمایشگای ئەو خەڵکە.. کەهەندێکیان ئاواتەخوازبوون ئیسلامییەکان دەمیان تێبگیرێو دەمەقاڵەبکەن.. ئێ پاشان ئەوبرا صوفیەم وەك من حەزی بە تەرەقیو بەرزی ئیسلامەو لەم کارەشیدا هەڵەی نەکردووە.. باسی خوێندنی فاتیحەی کردو لەلای ئەو ئەوڕایە جوانەکە دەڵێت قورئان دەگاتە مردوو.. لەلای تۆش ڕایەکی تر کە هەردووکیان ڕاو بۆچوونی زانا بەرزەکانی چوار مەزهەبی ئیسلامن!!..کەواتە بانگخواز نابێ بڵێت: هەقێکەو لەسەرمە بیگەیەنم.. دەبێ ئەو هەقە زەمینە سازی بۆ بکرێت و قوتابیو لایەنگری بۆ دروست بکرێت.. لەسەروی ئەمەشەوە ئێمە ئیشی زۆر گەورەمان بەم کۆمەڵگایە هەیە نابێت بەدووقسەی ساردو دوو دەمەقاڵێو بەرپەرچ دانەوە لەخۆمانیان بکەین و بیانکەینە ناحەزی خۆمان نەك هەر گوێمان بۆ نەگرن بەڵکو ناشیەڵن کەس و کاریان لێمان نزیك ببنەوە..

## ڕێگای دووەم:

## ( پێناسەیەکی هونەری هاوڕێ لەدەست دان )

(سەرۆك کۆماری ئەمەریکا -ڕۆزفلت- جارێکیان ئەم لێدوانەی داو ووتی: ئەگەر بمتوانیایە سێلەسەر چواری کاتەکان لەسەر هەق بومایەو هەڵەم نەکردایە ئەتوانم بڵێم گەشتومەتە ڕادەی کەماڵ)!.

ئەمە سنوری کەماڵ و تەواویە لە بۆچوون و دیری بەناو بانگترین پیاوی چەرخی بیست دا، ئەی دەبێت من و تۆ چۆن بین؟!.

ئەگەر ئەوەندە باوەڕت بەخۆت هەیە کە (١-٢)ی کاتەکان تۆ لەسەر ڕاستیت، یەکسەر ئەتوانیت بڕۆیت بۆ گەڕەکی پیشەسازان لە نیویورك (ول ستریت)و لەڕۆژێکدا یەك ملیۆن ڕیاڵت دەست کەوتایە و ئۆتۆمبیلی هەڵمی پێش کەوتووت بخستایەتە ژێر جوانترین ژنت بێنایە!

بەڵام ئەگەر تۆ باوەڕت بەخۆت نییە کەنیوەی کاتەکان هەڵەنەبێت و لەسەر هەق بێت، دەئیتر بۆ بەخەڵکی دەڵێیت ئێوە لەسەر هەڵەن؟.

تۆ لەباتی ئەو هێرشە ڕاستەوخۆ دڵبریندارکەرە بێ تامە! ئەتوانی بەلاچاوێ یان لاکردنە وەیەك یان ئیشارەتێکی ناڕاستەوخۆ تێ ی بگەیەنیت کە هەڵەیە ئەوە زۆر بەهێز ترو چاکترە لەبەکارهێنانی وشە و ئەوکاتە دەرکەوێت کە تۆ بەڕاستی بەلیغ و ڕەوان بێژی.

ئەگەر بەکەسێك بڵێیت تۆ لەسەر هەڵەیت، ئایا تۆ ئەتەوێت ای ی کەیەکسەر دان بەو هەڵەیە دا بنێیت و بڵێ تۆ ڕاستەکەی زۆر سوپاس؟ هەرگیز!! چونکە تۆ داوتە لەزیرەکی وژیری و گەورەی وڕێزی بەلێدانێکی توند و ڕاستەو خۆو لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانیت لەسەر ڕایەکەی خۆی دایبەزێنی، بەڵێ ئەتوانیت ئەو هەژارە نوقم بکەیت لەدەرایی مەنتیقی (ئەفلاتۆن) و (ئیمانویل) دا، بەڵام ناتوانیت لەڕاو بۆچوونەکەی لایبدەیت ما دامێك داوتەلە وە تەری حەساسی وگەورەیی یەکەیت بریندار کردوە.

بۆیە کاتێك قسە لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا دەکەیت هەرگیز ئەم ووشانەی لەگەڵدا بەکار مەهێنە: (من ئەمەت بۆ دەسەلمێنم!) ئەم ووشەیە وەك ئەوە وایە پێی بڵێی (من لەتۆ زیرەك ترو ژیرترم!یەك وانەی وات پێ دەدەم هەرچی لەمێشکدا هەبی پووچەڵی بکەمەوە!!)

ئەمە ئامۆژگاری و نیاز پاکی نییە! بەڵکوو ململانێ و (تەحەدایە)و سەرکەشیس ملەجەرێی لێ بەرپادەبێت و واشی لێ دەکات لەکاتی قسەکردنتدا بۆی ئەو خەریکی ڕێزگرتنی ووشەو بەڵگەیە لەدڵی خۆیدا بۆ بەرپەرچ دانەوەی بۆ چوونەکانت!.

ئەگەر ویستت شتێکی بۆ بسەملێنی (مەڵێ ڕاوەستە ئێستا پێت ئەسەلمێنم! بەڵکو بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت کە بۆی ئەسەلمێنی،ی بتوانە پێی بسەلمێنەو کەسیش هەست نەکات تۆ کردووتە!).

(لورد شێرفیلد)ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردو پێی دەووت: (تابۆت دەکرێت ژیر ترین و ڕاست ترین و زیرەکترین کەس بە.. بەڵام ئاگات لەوە بێت خۆت پێیان مەڵێ باخۆیان هەست بکەن).

من ئەمڕۆ وام لێهاتووە باوەڕم بە زۆر بۆچوونی ئەوسای خۆم نەماوە لەپێش (٢٠) ساڵ لەمەوبەر لەسەری بووم مەگەر خشتەی لێکدان-تەنانەت لەجەدوەلی زەربیشدا گومانم بۆ دروست بووەپاش ئەوەی کتێبەکانی-ئنشتاین-م خوێندەوە.. سەرسام مەبە ئەگەر بڵێم لەوانەیە (٢٠) ساڵی تر باوەڕم بەم وشانە نەمێنێت لەم کتێبەدا دەینووسم، من واخۆم ڕاهێناوە کە زۆر پێ دانەگرم لەسەر ڕاکانم-خۆپەرست نەبم- لەوانەیە ماوەیەکی تر ڕای بەرامبەرەکانم پێ جوانتر بێت لەڕایەکانی خۆم!.

(سوقرات) لەئەسینا بەقوتابییەکانی خۆی دەگووت: (من ئەوەندەی لەڕادەی نەزانینی خۆم دڵنیام، لەهیچ شتێکی تردا ئەوەندە دڵنیاو یەقین نیم)!.

ئەگەر بەرامبەرەکەت قسەیەکی کردو لەلای تۆ هەڵە بوو، لەڕاستیشدا هەڵە بوو، ئایا باشتر و جوانتر وانییە کە پێی بلێی: (من لەم مەسەلەیەدا بۆچونێکی ترم

هەیە.. هەرچەندە لەوەش دەچێت هەڵە بم –چونکە زۆر جار هەڵە دەکەم– ئەگەر هەڵـە بـووم تکایـە ڕاسـتم کـەرەوە.. دەی فـەرموو باپێکـەوە ڕاسـتیەکان هەڵسەنگێنین)!..

بەڕاستی بەکارهێنانی ئەم ووشانە ئەفسوناوین و کاری ئەفسوناویت بۆ فەراهەم دێنن: (لەوەش دەچێت هەڵە بم!)، (من زۆر جار هەڵە دەکەم)! (فەرموو با ڕاستیەکان هەڵسەنگێنین)! کێ ئەتوانێت ڕەخنە لەم ووشانەت بگرێت دڵنیابە هەرگیز ناکەوێتە گێژاوی شەرمەزاری و تەریق کردنەوە مادەم تۆ سەرەتا دان بەوەدا دەنێیت کە لەوانەیە هەڵە بیت، ئەمەش ڕێگایەکی مسۆگەرە بۆ ڕوو نەدانی دەمەقاڵە، هەروەك گیانی ویژدان خستنە کارو دادپەروەری لەبەرامبەرەکەتدا دەبزوێنێ، وای لێدەکات ئەویش هەمان هەڵوێستی تۆی هەبێت و دان بەوەدا بنێت کە بۆی هەیە هەڵە بێت..

لەپاش ئەم هەمووە تۆ هەر سوور بوویت لەسەر ئەوەی بەخەڵك بڵێیت هەڵەیت، دەی هـەموو بەیانییـەك پـێش بەرچـایی ئـەم بڕگەیـەی خـوارەوە بخوێنـەرەوە کـە لـەکتێبی (بـەدی هێنـانی ژیـری) (١) لەنووسـینی مامۆسـتا (جـیمس هـارفی ڕوبنسون)ەو دەڵێت:

(هەنـدێ جـار بـەبێ سەرئێـشەو نارەحـەتی هەڵـەی خۆمـان دەگـۆڕین.. بـەڵام هەرکاتێ ڕایەکمان دەربڕی و پێمان ووترا (ئەو ڕایـە هەڵەیـە) ئێمـەش خێـرا دەستی پێـوە دەگـرین بێـدوو دڵیـی لانـادەین، چـونکە بەئاسـانی و لەخۆمانـەوە دەرمـان بڕیوە.. سەرەتا کەمێك تێك دەچین بەڵام پاشان بەبێ سێ و دوو کردن باوەڕی پـێ پەیدا دەکەین و بەتەنها ڕێگایەکی ڕاستی دەزانین، وە مەحاڵیشە کەسێك بتوانێت لـەو ڕایـە دامانبـەزێنێت، هـۆی ئەمـەش ئەوەیـە کـە ئـەو ڕایـە بەبەشـێك لـەکیان و هەست و گرنگی خۆمانی دەزانین و لەیەك ترازوودا دایان دەنێین.

بـەکارهێنانی ڕانـاوی –مـن– گـرنگترین جوڵێنـەری مەکینـەی ئـیش و کارەکـانی خەڵکییـە..و گـەر بـەکارهێنانی ووشـەی (مـن) لەقسەکانماندا کـەم بکەینـەوە ئـەوە سەرەتای ژیریمانە، ئێمە زۆر گرنگ دەدەین بـەم ڕانـاوی قسەکەرە کە بریتییـە لـە –

(من) یان (م)–و دەینوسێنین بەکۆتایی ووشەو ڕستەکانمانەوە وەك: باوکی من.. براکەم –چیرۆکەکەی من– خانوەکەم , سەگەکەی من.. قوتابخانەکەی من..هتد.

کەسێ نابینی بەئاسانی دان بەوەدا بنێت کە کاتژمێرەکەی درۆ دەکات! یان ئۆتۆمبیلەکەی جوان نییە! یان.. یان کەم کەس هەیە بڵێ دەربارەی کەناڵەکانی دنیا شارەزاییم نییە یان بەهەڵە شتی لێ دەزانم.. یان بڵێ سوودەکانی حەبی (سالیسن)نازانم!..

ئێمەی مرۆڤ واین، حەز دەکەین ئەو شتانە بەڕاست بزانین کە باوەڕمان پێیەتی ئەگەر کەسێك بچوکترین گومانمان بۆ دروست بکات دەربارەی ئەو راوبۆچوونانەمان خێرا هەرچی ڕێگا هەیە دەیگرینە بەر بۆ پەیداکردنەوەی یەقین و خۆ هێشتنەوە لەسەر ئەو بۆچوونانە! لە (١٠٠٪) زۆری لەو شتانەی کە ناومان ناون ژیری کارزانی لەڕاستیدا بیانوو هێنانەوەیە بۆ بەردەوام بوونمان لەسەر ئەو بۆچوونانەی کە خۆمان پێمان خۆشە.

با بزانین ئایا ئەم فەلسەفەیەی باسمان کرد لەدونیای کارو کاسبیدا سوودی هەیە؟:

کاری (سترف. ماهونی) فرۆشتنی ئامێری باڵفتەکردن و پاکژکردنی نەوت بوو.. جارێك کڕیارێکی گرنگ دێتە لای و پێی ڕادەگەیەنێت کە ژمارەیەکی زۆر ئامێرم دەوێت و بۆم دروست بکە.. (ماهونی) لەناوچەی (لونج ئیلاند) خەریکی تەواوکردنی ئامێرەکان بوون و لەکاتی تەواوبووندا بوو لەپڕ چەند برادەرێکی ئەو کڕیارە هاتن و پەشیمانیان کردەوەو پێیان ووت تۆ خەڵەتاویت و ئامێری ئەوان زۆر بێ کەڵکە.. ئەویش زۆر پەست دەبێت و نارەحەت و موشەوەش دەبێت.. هەر لەوێدا تەلەفون دەکات بۆ (مستر ماهونی) و پێی دەڵێت ( قەسەم بەزاتی خوا هیچێ لەو ئامێرانەی بۆم دروست دەکەن نامەوێت و پەشیمانم!. )

(مستر ماهونی) خۆی چیروکەکە دەگێڕێتەوە دەڵێت: (من چاك دەمزانی کە هاورێکانی زۆر بەهەڵەدا چوو بوون لەم گومانەیاندا، بەڵام هەستم کرد کە زۆر ناشیاوە من ڕاستەوخۆ بێ پەردە بڵێم هاورێکانت نەزانن و بەهەڵە لەئامێرەکانی

ئێمە گەیشتوون! بۆیە هەستام و ڕۆشتم و بۆ (لونج ئیلاند) بۆ بینینی ئەو کڕیارە، هەر کەچوومە ژوورەوە یەکسەر ڕووی لێ وەرچەرخاندم.. بەبۆڵە بۆڵ و گلمە گلم دەستی کرد بەقسەکردن.. بەجۆری توندوتیژ بوو کە لەتووڕەییدا دەستەکانی لەگەڵ هەوادا شەڕیان دەکرد!

جنێوی بەخۆم و کارگەو پیشەسازیەکەشم دەدا، لەکۆتایی قسەکانیدا ووتی: (دە ئادەی پێم ناڵێی ئێستا چی بکەین؟.. منیش بەئارامی و لەسەرخۆ پێم ووت: قوربان من ئامادەیی تەواوم هەیە بۆ جێبەجێکردنی هەر شتێ تۆ بیدەی بەسەرمدا! پاشان بەردەوام بووم و ووتم: (تۆ پارە دەدەیت، مافی خۆتە ئەوەی خۆت بەدڵتە دەستت بکەوێت.. هەرچۆنێ ببێت خۆ دەبێ یەکێکمان لەم کارە بەرپرسیار بین و ئەو زیانە هەڵگریت، ئەگەر دەزانیت لەسەر هەقیت ئەوە بوارمان پێ بدە تا ئەو ئامێرانەت بۆ تەواو بکەین و بتدەینێ، ئەگەر ئامێرەکان بەو جۆرە نەبوون کە خۆت پێت خۆشەو بەدڵت نەبوون ئەوکاتە من ئامادەم کڕین و فرۆشتنەکە هەڵوەشێنمەوە!

هەرچییەکیشم تیا مەسروف کردووە قەیناکا با من زیانی ماڵی بکەم، بەمەرجێ دڵی تۆمان لێ نەڕەنجێت! بەڵام ئەگەر ئالەتەکان بەو جۆرە بوون کە تۆ دەتەوێت ئەوا دەبێت تۆ بەدڵت بێت و پارەکەشی بگریتە ئەستۆ!).

بەم ووشانەی ڕق و کینەی کابرا دامرکایەوە.. ووتی: زۆر چاکە بەڕێز بەردەوام بە لەسەر کاری خۆت.. بەڵام ئەگەر ئامێرەکان بەو شێوە نەبوون من دەمەوێت ئەوکاتە پێم بڵێ: تۆ هیچت لەسەر نییە! بەڵێ ئامێرەکان بەو جۆرە بوون کە ئەو داوای کردبوو نەك هەر بەدڵی بوو بەڵکو دوو داواکاری تریشی لێ کردم کە بۆی بکەین!!.

ئەم پیاوە کاتێك ڕێزی بۆ نەهێشتم و بەرەو ڕووی من بەهەوادا بۆکزی دەوەشاندو پێی دەگووتم: گوایە من لەم پیشەسازیەمدا تەپی لێ ناپێکم وەك پێویست، کە هەموو ئەمانە پێویستیان ئەکرد لەسەرم ئەوپەڕی توانام بخەمە کار بۆ ئەوەی هەوڵی بێ تاوانی خۆم دەر بخەم و ئۆباڵەکەی بگرمە ئەستۆی خۆی.

ئەمە زۆر سودی پێ گەیاندم، چونکە ئەگەر بهاتایەو پێم بگوتایە: هاوڕێ تۆ لەسەر هەڵەی و دەستم بکردایە بەدەمە قاڵەو دەمە دەمە لەگەڵیدا ئەوا سەرمان لەدادگاوە هەڵدەتەقی و زیانێکی مادی زۆریشم دەکرد.. نەك هەر کڕیارێکم لەدەست دەدا بەڵکو نەزۆك و بێ سود دەبوو پێم بگووتایە: وانییەو تۆ لەسەر هەڵەی و هاوڕێکانت گێل و ئەبڵەحن!.

کەواتە دەمەقاڵە لەگەڵ کەس مەکە و ڕووبەڕوو بەکەس مەڵێ هەڵەیت، بەڵکوو ژیری بەکار بهێنەو ژیرو لێزان بە چونکە ئەمە یارمەتی دەرت دەبێت بۆ دەستکەوتنی دڵی بەرامبەرەکەت..

ئەگەر ویستت خەڵکی ڕابکێشی بۆلای بۆچوون و ڕایەکانت ئەوا بڕگەی ژمارە (٢) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

**(ڕێز لەبۆچوونی بەرامبەر بگرەو ڕووبەڕووی مەڵێ تۆ هەڵەیت).**

## پاشکۆی ڕێگای دووەم
## (دیوار بەتۆمە پاسار گوێت لێ بێت)

ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر شێوازی ڕاستکردنەوەی بۆ چوونە هەڵەو خوارو خێچەکان گرتۆتە بەر، بۆ ئەم مەبەستە نەهاتووە دابەزێتە سەر موسوڵمانەکان و بڵێ ئێوە زۆر هەڵەن و ئیسلامەتی وانابێت.. بەڵکو زۆر زۆر حەکیمانە قورئانی پیرۆز بەناڕاستەوخۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕاست دەکردەوە ئەوەش بە باسکردنی ئوممەتەکانی پێشتر..

بۆ نموونە کە موسوڵمانەکان بەرگریان لەخراپە نەکردایە.. قورئان ڕاستەوخۆ پێی نەئەفەرموون: لەعنەتی خواتان لێ بێ بۆچی فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە ناکەن؟ بەڵکو بەشێوازێکی جوان و پڕ بەلاغەت دیوار بەتۆمەو پاسار گوێت لێ بێت موسڵمانەکان ئاگادار ئەکاتەوەو دەفەرموێت (بنی ئیسرائیل) وازیان لەو کارە هێنا خوایش نەفرینی لێ کردن وەك دەفەرموێت: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ () سوڕەتی المائدە: ٧٨-٧٩)(١).. موسڵمانەکان تێ گەیشتن و کاریان پێ کرد.

نمونە: خوای گەورە بەموسڵمانەکانی نەفەرموو هەی نەفامینە کارێکی باش نییە کە ئێوە خزمە کافرەکانتان خۆش دەوێت، بەڵکو ناڕاستەوخۆ باسی بەسەرهاتی نوح دەکات لەبەزەیی هاتنەوەی بەکوڕە کافرەکەیدا کە هاواری کرد: خوایەگیان ئەوە کوڕمەو لەمنە خوایش فەرمووی﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ (هود ٤٦) واتە مادەم کوڕەکەت کافر و خراپە حسابی کوڕی خۆتی بۆ مەکە ...

موسڵمانەکان تێگەیشتن و ئەوەبوو باوك و برای کافری خۆیان دەکوشت لەپێناوی ئیسلامدا.. سەیرکە، ئەگەر قورئان بیفەرموایە: باوکتان بکوژن، براتان

سەربڕن لەپێناوی ئیسلامداو ئەگەر وانەکەن (ولاء و براء)تان تەواو نییەو کافرن!!
ئەوکاتە ئەیان ووت: ئەمە چ ئاینێکە باوك و برای خۆمان پێ ئەدا بەکوشت!..

هەندێ کەس بەهەڵە لەقورئانی تێگەیشتوون وادەزانن هەر ناهەقیەکیان بینی دەبێ داباڕین بەسەریداو توانجی تێبگرن و پێی بڵێن: تۆ زۆر دوری لەئیسلام! یان تۆ لەئیسلام تێنەگەشتوویت! یان نەتپێکاوە! یان تۆ بیدعەچیت؟ یان تۆ حیزبیت یان تۆ لا حیزبیت!

ئیسلام فەرزی کردووە لەسەرمان کە ببینە سەنگی مەحەك و نەهێڵین کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێری گوناه و هەڵەو تاوان بڕوات بەڵام بەمەرجێك ڕاستیان بکەینەوە کە بەخۆیان نەزانن و شعوریان بریندار نەکەین و پێیان نەڵێین ئێوە لارن و وەك دەمی داس وان و ئێمە هەوڵ دەدەین ڕاستتان بکەینەوە. سەیری دوو قوتابی زانکۆکەی (پێغەمبەر)مان (ﷺ) بکەو بزانە چۆن و چیان کردووە تا بەجوانترین شێوە هەڵەی خەڵکی بگۆڕن..

(حسن و حسین) خوا لێیان ڕازی بێت ڕۆژێکیان لەدەستنوێژگرتنی پیاوێك وردبوونەوە دەبینین زۆر نەزانەو نازانێ دەستنوێژ بگرێت..هەردووکیان بڕیاریان دا ڕاستەوخۆ پێی نەڵێن: (دەستنوێژ کەی وا دەگیرێت!). بەڵکو پێیان ووت: مامەگیان ئێمە دوو کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالبین و نازانین دەستنوێژی کاممان ڕاستە بۆیە دەمانەوێت تۆ حەکەممان بیت!! صولحمان بکەیت! پاش ئەوەی پیاوەکە لەدەستنوێژی هەردووکیان ورد بوویەوە ڕووی تێ کردن ووتی: گیانی مامە، بەخوا دەستنوێژی کەستان عەیبی نییە، بەڵکو دەستنوێژی من ناتەواوەو زۆر سوپاسیشتان دەکەم کە فێرتان کردم!

خوێنەری خۆشەویست ئایا ئەگەر بیان ووتایە پێی دەستنوێژەکەت ناتەواوەو نوێژەکانت بەتاڵە وەرە با فێرت بکەین! چی ڕووی دەدا؟ بێگومان بەتوڕە بوونەوە یان بە گاڵتە پێ کردنەوە پێی دەگووتن ئێوە منالی دوێنێن بەتەمان من فێرکەن من قورسایی ئێوە غەزام دیوە؟

چەند ڕستەیەك لەناو گەلی کوردماندا تەشەنەی کردووە کە هەموویان دڵ بریندار کەرن و وا لەبەرامبەر دەکەن کە پێش ئەوەی قسەکەی بۆ بکەیت ئەو دەڵێ:

وانییە.. بۆ نموونە: بەبەرامبەرەکەت دەڵێی (ڕاست ناکەیت) یان (وانییە) یان (درۆ دەکەیت)، (تۆ لەو مەسەلەیە حاڵی نەبوویت تا ئێستا گوێ بگرە بۆت باس بکەم)، (با تێت بگەیەنم)، (لەو مەسەلەیەدا لەمن بپرسە)، یان (وەرە بزانین قسەی کاممان ڕاستە)!!

ئەم ووشانە واز لێبهێنە، بەڵکو زاناو لێهاتوو فەیلەسووف ئەو کەسەیە خەڵکی حاڵی بکات بەبێ ئەوەی پێیان بڵێ وەرن با حاڵیتان بکەم وەرن تا پێتان بسەلمێنم!.

ئادەی وەرن با ئەم ووشە هەنگوینیانەی خوارەوە لەگەڵ یەکتردا بەکار بهێنین بزانە کاری ئەفسوناوی نا کاتەسەربەرامبەرو دەست ناخاتە ژێر چەناکەی و گوێت بۆ شل ناکات؟!. بۆ نموونە: (ڕاستەکەیت بەڵام منیش بەجۆری تر لێی حاڵی بووم)و (زۆر جوانە قسەکەت منیش لەگەڵتم بەڵام من بەجۆری تر بیستوومە)، (ئەم وتەیەی جەنابت ڕای هەندێ لەکەڵە زانایانی ئیسلامە، بەڵام هەندێکی تریان ڕایەکی تریان هەیە)، (ئەو دێڕە شیعرەت لەکوێدا بینیوە زۆر جوانە، بەڵام من لە گۆڤاری پەیامی ڕاستیدا بەجۆرێ تر بینیومە)، (لەگەڵتام لەو ڕایەدا بەڵام ڕایەکی تریش هەیە)، خۆزگە ئەم ڕستانەمان لەبەردەکرد و لەکاتی دەمەقاڵەو لێکۆڵینەوەکانماندا بەکارمان بهێنایە لەگەڵ یەکتریدا.

ئیسلامی بێ گەرد داوامان لێ دەکات کە ئاوی دەم و چاوی براکانمان بپارێزین و تەریقیان نەکەینەوە.. هەروەها دڵی برایەك لەخۆمان نەکەین چونکە شەیتان لەڕێگای دەمهەڵچوون و شەڕە قسەوە لەیەکمان دەکات..

بۆیە خوای -عز وجل- کاتێ ئامۆژگاریمان دەکات کاتێ قسەمان لەگەڵ یەکتردا کرد بابە (جوانترین شێوەی قسە کردن) لەگەڵ یەکترد بدوێین) نەبادا شەیتان لەیەکمان بترازێنێت وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾ (١)(الأسراء ٥٣).

کەواتە ئەگەر قسەمان لەگەڵ یەکتردا کرد و قسەیەکی بەرامبەرەکەتت بەدڵ نەبوو بگەڕێ بۆ (جوانترین) ووشە ئەگەر جوانترینت دەست نەکەوت با ووشەیەکی (جوانی تێ بگریت) ..

## ڕێگای سێیەم:
## (ئەگەر هەڵە بوویت دانی پیا بنێ)

دارستانێکی چڕوپڕ و سەوز و ڕازاوە لەماڵەکەوە ماوە دەقیقەیەك دوورە.. ڕۆژانە جۆرەها گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەم دەکاتەوە، جۆرەها باڵندەی باڵ نەخشین هێلانەیان تێدا کردووە و بێچووەکانیان تێدا پەروەردە دەکەن، بەئاوازی جۆراوجۆر دڵی –سەیرانکەران– بۆخۆیان کەمەن کێش دەکەن.. سەوزەگیای ئەوەندە هەستاوە خەریکە چوارپەلی وڵاخ ون دەکات..

ئەم زەویەی کە ئاوا چەشنی بەهەشت ڕازاوەتەوە سروشتییە و دەستی چاك کردن و ڕازانەوەی دەوڵەتی پێنەگەیشتووە، ئەم باخچەیە ناوزەد کراوە بە (فورست پارك) و هیچی لەدارستانەکان کەمتر نییە، واش دەزانم لەوەتی (کولومجس) کە شوورەی ئەمەریکای دۆزیوەتەوە ئەم باخە وەك خۆی ماوەتەوەو نەگۆڕاوە.

منیش زۆرجار لەگەڵ تولە بچکۆلانەکەمدا کەناوی (رکس البولروج)، بوو بۆ سەیرو سەفاو هەڵمژینی هەوایەکی پاك ڕوومان تێ دەکرد، و لەبەر ئەوەی کە باخەکە چۆڵ و هۆڵ بوو بێخەم تولەکەمم بەرەڵڵا دەکرد تا ئەویش لەناو کەش و هەوای ئازاددا کەیف و سەفای خۆی بکات.

جارێك لەو جارانە پۆلیسێکی ئەسپ سوارم لێ تاین بوو و بەکوڵ دەیوویست دەسەڵاتی خۆیم پیشان بدات، بەشێوەیەکی توندوتیژ خوڕی بەسەرمداو ووتی: ئەمە چییە؟ ئەمە بۆچی وا ئەم سەگەت بەرەڵڵا کردووە بەبێ ئەوەی هیچ لغاو و پەتێکت بەدەستەوە بێت؟ ئەی نازانی ئەمە سەرپێچی کردنە لەیاسا؟.

منیش بەنەرمیەکەوە وەڵامم دایەوە ووتم: (بەڵێ قوربان ئەزانم بەڵام من وام گومان دەبرد کە دارستانەکە چۆڵە باوەڕ ناکەم ئازاری کەس بدات!). پۆلیسەکە بەشێوازێکی لاسایی کردنەوە ووتی: وام گومان دەبرد..)! گوێم لێ بگرە یاسا هیچ حسابێك بۆ گومان ناکات، چونکە ئەم سەگە لەوانەیە منالێك بگەزێت یان چۆلەکەیەك بکوژێت.. بۆیە ئەم جارە لێت دەبوورم و بڕۆ بەڵام خوا مەرگی داوییت

جارێکی ترو ئەو سەگە بەرەڵا بکەیت.. ئەوکاتە لەلای قازی دادگا بیانووبهێنەرەوەو خۆت دەرباز بکە!).

بەڵێ چەند جارێك بەگوێی پۆلیسەکەم کرد بەڵام -رکس- زۆر پەس بوو بەو کۆتەی قاچی و منیش ناڕەحەت بووم بۆی، بۆیە بڕیارمان دا ئەم جارەش هەمان قارەمانێتی تۆمار بکەینەوە!. لەسەرەتاوە هەردووکمان وامان زانی هەموو شتێکمان بۆ چووەتە سەر کەچی لەناکاو هەر ئەوەندەمان زانی کەوتینەوە داو!..

لەوکاتەی من و ڕکس بەسەرگردەکەی ناو باخەکەوە پێش بڕکێمان دەکرد، کابرای پۆلیس بەهەڵە داوان بەرەو ڕووم هات و زەنگی لێ دەدا! -رکس- نزیك بوویەوە لەپۆلیسەکەو مەسەلەکەم ئاشکرا بوو هیچ بیانوویەکم پێ نەبوو تا بیهێنمەوە بۆی!

هەر لەوێدا نەمهێشت پۆلیسەکە قسە بکات و پێم ووت: (بەڕاستی لەناو تاواندا گیرام و هیچ قسەیەکم پێ نییە! بەڕێزتان زووتر ئاگادارت کردمەوە کە دووبارەی بکەمەوە دەمبەی بۆلای قازی، بەڵام من گوێم نەدایە!).

ئالێرەدا کابرای پۆلیس بەشێوازێکی نەرم و لەسەرخۆ پێی ووتم: (من دڵنیام لەوەی کە بەرەڵاکردنی ئەم سەگەو هەڵبەزو دابەزی خۆ بکات جۆرە چێژو خۆشیەکت پێ دەدات ناتوانیت نەیکەیت!). ووتم: بەڵێ وایە، بەڵام ئەم کارەم یاسا شکاندنی تێدایە! ئەویش ووتی من وادەزانم ئەم تولە جوانکیلەت ئازاری کەس نادات وانییە؟ ووتم: بەڵام هەندێ جار چۆلەکە دەکوژێت!؟. ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی پێم: باشە بۆ شتێکت پێ نەڵێم ئەگەر بیکەی زۆر چاکە؟ ئەگەر حەزت کرد بەرەڵای بکەیت لەودیوی گردەکەوە بەرەڵای بکە با من نەتانبینم!..

لەبەر ئەوەی ئەم پۆلیسەش مرۆڤە، مرۆڤیش دیارە حەز دەکات هەست بەگرنگی بکرێت و نرخی بۆ دابنرێت بۆیە کاتێ خۆم تاوانبار کردو کۆتی تاوانباریم کردە ملم! بەم کارەم وام لێکرد هەست بەگرنگی و نرخی خۆی بکات ئەوە بوو خێرا

هەڵوێستی فەرمانڕەوایەکی بەسۆزی بەرامبەری من نواند کە لەکاتی دەسەڵاتدا لێبوردە بێت.

بەڵام وادابنێ من دەستم بکردایە بەمینجە مینج و بێ تاوانی خۆمم دەرخستایە لەڕێگای دەمە دەمەو دەمە قاڵەوەو خوێنەری بەڕێز ئایا هەرگیز دەمەقاڵەت لەگەڵ پۆلیسدا کردووە؟! کەواتە خۆت ئەنجامی دەمەقاڵە لەگەڵ پۆلیس دەزانیت کوێیە؟و بەچی دەگات؟!..

کاتێك دەزانین هەڵەیت و دەشکێیت و دەخرێیتەوە بەر درودا، ئایا ڕاسترو جوانتر نییە پێش ئەوەی بەرامبەرەکەمان پێمان بڵێت خۆمان بڵێین؟ ئایا ئەو شتانەی ڕەخنەمان دێننە سەر باشتر وانییە خۆمان باسیان بکەین پێش ئەوەی لەبەرامبەرەکانمانەوە بیبیستین؟!..

هەموو ئەو ناتەواوی و بۆشانەی کە بەرامبەرەکەت بەنیازە لەو ڕێگایەو چارت بکات و بتشکێنێ، تۆ خۆت بیڵێ و بواری پێ مەدە ئەو باسیان بکات، بەم کارەت تۆ هەوا لەچاوڕۆکەی بەلەمەکەی دەبڕیت، زۆر لەوەش دەچێت کە جوانترین هەڵوێستی هەبێت بەرامبەرت، بەسۆزو لێبوردنەوە لێت دێتە پێش و پارت ڕاست دەکاتەوە و نەنگی و هەڵەکەت لەسەر سوك دەکات و بێ بایەخیان دەکات وەك چۆن بابای پۆلیس لەدارستانەکە لەگەڵ مندا کردی!.

وێنەکێش (فردیناند وارین) هەمان شێوازی لەگەڵ کڕیارێکی کەللە ڕەقی توندو تیژی بێ ڕەوشتدا بەکار هێنا، فەرموون باگوێبگرین بۆ برای وێنەکێش خۆی بۆمان بگێڕێتەوە:

(ئەو وێنانەی کە بەتایبەت بۆ بڵاوکراوە یان بۆ هەر مەبەستێکی تری ڕۆژنامەوانی دروستمان دەکرد دەبوایە زۆر وردەکاریمان تێدا بکردنایە.. بەڵام سەرۆکەکەمان زۆر حەزی لە ڕەخنەگرتن و هەڵە دۆزینەوە بوو ! بۆیە هەر وێنەیەکمان دەکێشاو بۆمان دەهێنا خێرا بچوکترین هەڵەی تێدا دەدۆزیەوەو مێشکی وێنەکێشی پێ کون دەکرد.. بۆیە زۆر جار لەژوورەکەی دەهاتمە دەرەوە

زۆر پەست دەبووم، نەك لەبەر ڕەخنەو پێشنیارەکانی بەڵکو لەبەر شێوازی ناشیرینی لۆمەو سەرزەنشتەکانی کە زۆر زۆر بێ تام بوون).

جارێکیان وێنەیەکم خستە بەر دەستی کەڕای سپاردبووم دروستی بکەم، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت بە تەلەفون بانگی کردم و هەر کە چوومە ژوورەوە خێرا بە توڕەییەوە دابەزیە سەرم ووتی: چۆن کەوتیتە ئەم هەڵەیەو ئەو هەڵەیەو ئەو هەڵەیەوە؟! منیش توڕەیی و پەستی خۆمم خواردەوە بە هەلم زانی ڕێگای دان نان بەهەڵەداو خۆ شکاندن بگرمە بەرو تاقی بکەمەوە لەگەڵیدا: وتم گەورەم، ئەگەر ئەم هەڵانەی تۆ دەیانڵێیت ڕاست بن، ئەوا من زۆر هەڵەم و هیچ بیانوویەکیش نییە کە بیهێنمەوە لەسەر ئەو گەوجێتیانەی کە لەوێنەکەدا لەدەستم دەرچووە، بەڕاستی ئەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژە من لەخزمەت جەنابتانا وێنە دەکێشم و هەق وایە من زۆرلە بەئێستا پێشکەوتووتر بوومایە لەهونەرەکەمدا، بۆیە زۆر خەجاڵەتم و بێزم لەخۆم دێتەوە، ئەوەی زیاتر سەرسامی کردم -ئەوەبوو بەبیستنی ووتەکانم خێرا دەستی کرد بەبەرگری کردن لێم و ووتی: تۆ ڕاست دەکەیت! بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو هەڵانە ئەوەندە گەورە و بایەخدار نین.. ووتم: لەوێنەکێشاندا هەر هەڵەیەك بکرێت با کەمیش بێت هەر زۆرەو دەبوایە زیاتر وردەکاریم لەکارەکەمدا بکردایە!..

ئەوەبوو بەڕێوەبەر پەتی بەرگری کردنی بۆ شۆڕ کردمەوەو دەیویست فریای وەزعەکەم بکەوێت، بەڵام من نەم دەهێشت، چونکە بۆ یەکەم جار بوو ئاوا بەتاسەوە حەزم لە قسەکردن بوو لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەمدا.. بۆیە من بۆ زیاتر چێژ وەرگرتن زیاتر خۆم دەشکاندەوەو ڕەخنەم لەکارەکەی خۆم دەگرت و دەمووت:

-(من زۆر پێویست بوو کە زیاتر وردەکاریم بەخەرج بدایە تیایدا چونکە بەڕێزتان هەلی کارو کاسبیتان بۆ من ڕەخساندووە و منیش ئەرکی سەرشانمە هەرچی لەتوانامدا هەیە بیخەمە کار لەو بەرهەمانەی دەیخەمە بەردەستتان.. بۆیە پێویستە جارێکی تر دەست بکەمەوە بەدروستکردنەوەی ئەو وێنانە!.

ئەمەی قبوڵ نەکردو یەکسەر ووتی: نەخێر نەخێر، هەرگیز نەهاتووە بەخەیاڵمدا بەو شێوەیە دڵگران و نارەحەتت بکەم و وێنەکەت سەرلەنوێ پێ بکێشمەوە!

پاشان دەستی کرد بەپیاهەڵدانی هونەرەکەم و توانا و لێهاتوویم لەو بوارەداو دوو پاتی کردەوە کەمن تەنها چەند دەستکاریەکی سوك و سادەم دەوێت و هیچی ترا.

ئەو ڕۆژە دەروونم زۆر ئازاری دەچەشت وا بەو چەشنە نالەبارە دەمشکاندەوەو پشتم نەدەگرت.. ئەوەبوو لەکۆتاییدا بەڕێوەبەر بانگی کردم بۆ نانی نیوەڕۆ لەماڵی خۆیان! و پاش لەیەك جیابوونەوە چەند بەرهەمێکی نوێی خستە بەردەستم و داوای لێکردم بۆی تەواو بکەم!!).

هەموو گێل و گابڵحێك دەتوانێت بەرگری لەهەڵەکانی خۆی بکات و بیانوویان بۆ بتاشێت کە زۆربەی -گەمژەکان- وادەکەن.. بەڵام داننانت بەهەڵەکاندا چەندان پلەی بەرز بەسەر خەڵکیدا بەرز دەبێتەوە و هەست بەپێشکەوتن و بەرزبوونەوە دەکەیت.

(البرد هبارد) یەکێکە لەو نووسەرانەی کە توانیویانە یەك گەلی تەواو لەخۆیان بهروژێنن، زۆرجار ڕستەو دەستەواژەکانی دڵی خوێنەرانیان دەڕەنجاندو تووڕەیی و سەرکەشیان لێوە پەیدا دەبوون، لەگەڵ ئەو چارە ڕەشییەیدا کە نەیدەزانی هەڵسوکەوتی بەرز لە لەگەڵ خەڵکی بکات.. بەڵام زۆرجاریش دەیتوانی زۆری لەدوژمن و ناحەزەکانی بکاتەوە دۆست و لایەنگری خۆی!.

بۆ نموونە، جارێکیان خوێنەرێکی دڵگەرم و تووڕە بۆی نووسی بوو: (من لەگەڵ ئەو ڕایانەدا نیم لەفلان باسدا هێناوتە، لەکۆتایی نامەکەشدا قسەیەکی سوکی دابووە پاڵ -هبارد-! مستر هبارد هیچ تێك نەچوو ئەوە نەبێت بۆی نووسی: ئایا بەڕێزتان بۆتان دەکرێت سەرێکم لێ بدەن تا پێکەوەو لەنزیکەوە لەو ڕایانە بکۆڵینەوە؟! چونکە تەنانەت خۆشم لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا نەماوم کە کاتی خۆی نووسیومن، ئەوباسەی دوێنێ نووسیوومە مەرج نییە ئەمڕۆش هەمان ڕاو

بۆچوونم لەسەریان مابێت! بۆیە زۆر کەیف خۆش و مەسرور دەبم ڕای بەڕێزیشت لەو بارەیەوە بزانم)!.

پێم بڵێ -خوێنەری ئازیز- چی بڵێیت و چیت پێ دەکرێت لەبەردەم ئادەمیزادێکدا کە ئا بەو چەشنە بێت بەدەمتەوە و هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکات؟!.

ئەگەر زۆر زۆر دڵنیا بوویت لەخۆت کە لەسەر هەقیت، ئەوا بەجوانترین شێوەو لەسەرخۆو ژیرانە خەڵکی بۆلای ئەو هەق و ڕاستییە ڕابکێشە.

ئەگەر لەشتێکیشدا هەڵە بوویت -کە زۆرجار واین بەجۆرێك جێگای سەر سوڕمانە- دەی با خۆمان دانیان پێدا بنێین پێش ئەوەی بەرامبەرەکەمان وەك چەکێك بەکاری بهێنێ دژمان.

بەکارهێنانی ئەم ڕێگایە تەنها لەبەر ئەنجامە پڕ سوودو بەکەڵکەکەی نییە، بەڵکو جۆرە چێژو هەست بەحەوانەوەیەکی دەروونی و جەستەیی دەکرێت کە هەرگیز لەبەرگری کردن و خۆ بەبێتاوان داناندا بەدی ناکرێت.

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت ڕابکێشێت ئەوا بڕگەی ژمارە (٣) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

(**هەرکاتێك هەڵە بوویت دان بنێ بەو هەڵەیەدا**).

## پاشکۆی ڕێگای سێیەم:
## (دان نان بەهەڵەدا چاکەیە)

ئایینی پیرۆزی ئیسلام وا موسڵمان پەروەردە دەکات کە خۆ پەرست نەبن و دەمارگیرییان بۆ ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان نەبێت و بەشێوەیەك سوور بن لەسەری و بەموو لێی لانەدەن و ڕای کەسی تریان پێ قووت نەدرێت!.

تەنانەت لەئیسلامدا ئەگەر کەسێك گوناهێك بکات، بەڵام دان بەوەدا بنێت کە ئەمە گوناهە و هەق نەبوو بیکات زۆر بەڕێزترەو گوناهەکەی کەمترە لەکەسێك کە پاش تاوانەکەشی هەر خۆی بەهەڵە نەزانێت و هەر سوور بێت لەسەری و بەتاوانی نەزانێت..

سەیریکە.. ئادەم و حەوا ( سەلامی خوایان لێ بێت ) هەڵەیەکیان کردکە لەبەری درەختە قەدەغە کراوەکەیان خوارد شەیتانیش هەڵەیەکی کرد سەرپێچی فەرمانی خوای کردو سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد.

ئەوەبوو خوای گەورە لەئادەم و حەواخۆش بوو.. بەڵام لەشەیتان خۆش نەبوو.. چونکە ئادەم ژیرانە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کەوتن بەچۆکداو دەستیان کرد بەپارانەوەو داننان بەهەڵەکەیاندا ووتیان: ﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ (الاعراف ٢٣).

بەڵام شەیتان لەباتی ئەوەی دانبنێ بەهەڵەی خۆیداو داوای لێبوردن بکات کەچی هەستا بەبیانوو هێنانەوەو بەرگری کردن لەبۆچوونە لارەکەی خۆی ووتی: ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ (ص ٧٦). واتە: هەرگیز سوجدە بۆ کەسێ نابەم لەقوڕ دروستت کردووە و بەڵام من لەڕووناکی و ئاگر..

سەرەنجامەکەی لای هەموان ڕوون و ئاشکرایە..خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾(ص ٧٨). (پێغەمبەر)ی خۆشەویستمان (ﷺ) بەکردەوە هاوەڵانی تێ گەیاندووە کە جێگای ڕێزە موسڵمان لەڕای خۆی دابەزێت ئەگەر

ڕایەکی جوانتری لەبەرامبەرەکەی بیست و پێشی کەم ناکات ئەگەر وەری بگرێت و کاری پێ بکات ئیتر با بەرامبەرەکەشی ئاستی زۆر نزمتر بێت..

بۆ نموونە: لەجەنگی بەدری گەورەدا (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) جێگایەکی دیاری کردو کردی بەسەر بازگەی سوپای باوەڕ، لەم کاتەدا سەربازێکی سادەی ناو سوپاکە ناوی -حەبابی کوڕی مونزیر- بوو هاتە خزمەت سەر کردەو پێی ووت: ئەم جێگایەی هەڵت بژاردووە وەحی خوای گەورەیە یان ڕای خۆتانە؟ (پێغەمبەر)مان (ﷺ) فەرمووی: نەخێر ڕای خۆمە، حەباب ووتی: دەی ئەم جێگایە سەربازی نییەو با بڕۆینە سەر یەکەمین بیرو بیرە ئاوەکانی تر بکەونە پشتەوەمان و پڕیان بکەینەوە و قوڕەیش لەتینواندا شەڕیان بۆ ناکرێت!. (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ)ڕاکەی قبوڵی کردو لەجێگاکەی خۆی گوێستییەوە بۆ ئەو جێیە..

لەوانەیە سەرکردەیەکی ئەمڕۆ بوایە: خۆی لێ دەگۆڕاو پێ دەگووت تۆ سەربازێکی سادەیت و چیتە بەسەر داڕشتنی نەخشەی جەنگ و من قورسایی تۆ نەجمەم پێوەیە!!

کەچی ئەمڕۆ هەندێ لایەن هەیە ئەگەر ئەندامێکیان پێشنیارێك یان ناتەواویەك باس بکات لەناو لایەنەکەیدا.. گوێی بۆ ناگرن و پێی پێ دەکەنن و دەڵێن: سوپاست ئەکەین، بەڵام لەتۆ ژیرتر بیری لێ کردۆتەوە! ئەمە باشە، ئەگەر بەخەت مائیل و لادەرو دەم نەوەستاو نەیدەنە قەڵەم و نیشانەی پرسیاری لەسە دانەنێن!.بەڵکو یاسای لاری (بێخەم بە شێخەکەت مەعصومە) بەکار دەهێنن لەگەڵیدا!.

هەندێ گێل و گەوار وا تێ گەیشتوون ئەگەر خۆت بشکێنیتەوە لەڕایەکەت دابەزیت یان دان بەوەدا بنێیت کە نەتزانیوە، ئەوە گەورەترین عەیبەیەو ئاغای لەئاغایەتی پێ دەکەوێت و ماموستاو زانایان شورەییە بەکاری بهێنن!.. ئەوەتا پیاوێك لەلای ئیمام مالیك دەبێت و لەو کاتەدا هەندێ پرسیاری شەرعی ئاڕاستەی ئیمام دەکرێت و بۆ هەندێ پرسیار دەڵێت: نازانم پیاوەکە ووتی: ماموستا عەیب ناکات دەڵێت نازانم؟. کاتێ ئیمام ئەو قسە دەبیستێتەوە دەڵێ بۆم بانگ بکەن..

کاتێ دێتە خزمەتی پێی دەڵێت: (نەخێر عەیب ناکەم، بەڵکو شانازی پێوە دەکەم چونکە فریشتەکانی خوا عەیبیان نەکردو وتیان خوایە ئێمە نایزانین ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ (١). (بقرة ٣٢).

بۆیە نابینی یەك هاوەڵی (پێغەمبەر)مان پینەی هەڵەکانی خۆی کردبێت و بیانوویان بۆ بتاشێت، بەڵکو دانیان پیا ناوە ئیتر با گەورەترین زیانیش بکەن,بۆ نموونە ئەو سێ هاوەڵەی (پێغەمبەر)مان (ﷺ) توشی هەڵەی دواکەوتن بوون لەجەنگی تەبوکدا، بەڵام کاتێ (پێغەمبەر) گەڕایەوە لێی پرسین بۆ دواکەوتن؟ کەعبی کوڕی مالیك –ئەم ڕێگایەی بەکار هێنا– وتی: ئەم توانی وەك دوو ڕووەکان درۆ بکەم و خۆم ڕزگار بکەم، بەڵام ووتم ئەی (پێغەمبەر)ی خوا بەخوا پاشایەکی دنیا بوویتایە بەدوو قسەی لوس و درۆ خۆم دەرباز دەکرد، بەڵام هیچ بیانوویەکمان نییەو هەڵەیەکەو کردوومانەو داوای لێبوردن دەکەین.. ئەوەبوو پاش ماوەیەك خوای گەورە بەئایەتی قورئان بڕیاری لێبوردنی بۆ دەرکردن!.

خۆ ئەیانتوانی وەك هەندێ نەزان خۆیان تووڕە بکەن و بڵێن: دەی خۆ کفرمان نەکردووە و چەندان غەزامان کردووە با دانەیەك نەکەین خۆ دنیا ناڕوخێت!!

داننان بەهەڵەداو خۆشکاندنەوەو قبوڵ کردنی ڕای بەرامبەر، تەنانەت لەگەڵ سەرکردەو پاشاو حومڕاکانیشدا سودی هەبووە چ جای برایەکی خۆت بەرامبەرت بێت.

بۆ نموونە، لەسەردەمی عەباسیەکاندا پاش مردنی هارون الرشید (بەیعەت) دەدرێت بە (مأمون)ی کوڕی.. لەهەمان کاتدا ئیبراهیمی مامیشی کەنازناوی (ابن شکلە)ی هەبوو.. داوای خەلافەتی دەکردو هانی مەردومی دەدا تا بەیعەت بە (مأمون) نەدەن و بەیعەت بەئەو بدەن!..

کاتێ مأمون ئەمە دەبیستێ تووڕە دەبێت و فەرمانی گرتنی دەر دەکات و شورتەی ئەو سەردەمە دەیگرن و دەیهێنن بۆ کۆشکی خەلافەت لەبەغداد، مأمون

پێی دەڵێ: مامە، ڕاستە تۆ داوای خەلافەت و بەیعەتت کردووە؟ بۆ ویستوتە دووبەرەکی لەناو موسوڵمانانداندا دروست بکەیت؟.

(ئیبراهیم) لەدڵی خۆیدا بڕیاریدا بەرگری لەخۆی نەکات و بەهانە بۆ بۆچوونەکەی نەتاشێت و یاسای داننان بەهەڵەو خەتای جێبەجێ کردو ووتی: ئەی گەورەی موسڵمان خوا پایە بەرزتان بکات، ئەم کارەم هەڵەیەك بوو هات بەسەرمداو کردم!

کە دەبوایە نەمکردایە.. تۆش ئەگەر لێبوردن و گەورەیی خۆت بەکار بهێنی بەرامبەر مامی خۆت ئەوە چاکی خۆتانە.. و ئەگەر لەتۆڵەشدا بمکوژن ئەوە مافی ڕەوای خۆتانە!

مأمون سەری ڕێزی داخست لەئاستی ئەم دابەزین و خوشکاندنەداو زۆر دڵخۆش بوو، چونکە بەسە بۆی کە ئەوەندە گرنگی و ڕێزی هەبێت کە خەڵك لەخزمەتیدا داوای لێبوردنی لێ بکەن..

بۆیە ووتی: مامەگیان.. فەرموو وەرە تەنیشتم دانیشە تۆ ئەمڕۆ لێبوراویت مامەگیان!!.

خوێنەری بەڕێز ئایا ئەگەر (إبن شەکلە) بەرگری لەخۆی بکردایەو دەمەقاڵەو دەمە دەمەی بکردایە ڕاستی خۆی بسەلماندایەو بیگووتایە: کوڕم من برای گەورەی خەلیفەم.. لەتو دنیا یدەترم.. و خەڵکی خۆشیان دەوێم و بەیعەتم پێ دەدەن.. ئایا ئەزانی چی ڕووی دەدا؟ بێگومان ئاکامەکەی زۆر ئاشکرایە.. سەری لەلاشە جیا دەکرایەوە!!

کەواتە عەیب نییە، مەگەر لەلای گێل و گەمژەکان، ئەگەر بەبراکەتت ووت: (بمبورە تۆ ڕاستەکەیت)، (من لەمەوبەر وا تێ گەشتبووم)، (ئەزانی قسەکەی تۆ جوانە)، (ئەزانی قسەکەی تۆ دەرچوو)، (جار جار من لێم تێك دەچێت)، (باش بوو بیرت خستمەوە)و..هتد.

## بەشی چوارەم:
## (کورتترین ڕێگا بتگەیەنێتە دڵی کەسێك)

ئەگەر هاتوو زۆر توندو تیژو ڕقاوی بوویت و جامی توڕەییت بەسەر بەرامبەرەکەتدا ڕژاند بێگومان سەرت سوك دەبێت و هەندێ باری سەرشانت سوك دەکەیت..

ئەم سوودە بۆ خۆتە! بەڵام ئەی بەرامبەرەکەت تاوانی چییە؟!. ئایا تۆ بەسەر ئەو هەژارەوە دەروونت دەحەوێنیتەوە؟! ئایا شێوازی توندوتیژو دووژمن کارانەت وای لێ دەکات بێتەسەر بۆچوونەکانت؟!..

جارێکیان (ودرو وڵسون) ووتی: (هەرکاتێك هاتیت بۆلام و بۆ کزت خڕ کردبوو بۆ ناو دەمم، پەیمانت پێ دەدەم من زووتر خڕی دەکەم بۆ ناو دەمت، بەڵام ئەگەر هاتی بۆلام پێت ووتم: (ئاوەرە با ڕاگۆڕینەوەیەك بکەین)، تەنانەت ئەگەر جیاوازی کەوتە نێوانمان ئەوەندە نابات دەبینین ڕاکانمان زۆر لەیەکەوە دوور نین).

تا ئێستا نەمدیوە هیچ کەسێك وەك (جۆن روکفلر)ی کوڕ بەتەواوەتی مافی خۆی دابێت بەم مەسەلەیە، ئەوەبوو ساڵی (١٩١٥) گەورەترین مانگرتن هەر چوارچێوەی ولایەتی کۆلورادوی گرتەوە کە بەگەورەترین مانگرتن دەژمێررێت لەهەموو مێژووی پیشەسازی ئەمەریکیدا، خەڵکی ئەوەندە ڕقیان لە -روکفلر- بوو کە بەو ئەندازەیە ڕقیان لەکەسی تر نەبوو.. ئەم مانگرتنە کریکارەکانی کوورەی خەڵوز پێی هەستابوون کە سەربەکۆمپانیای کولورادو بوو کە روکفلر سەرۆکی بوو.. تەنها داواکاریشیان بەرزکردنەوەی ڕێژەی مووچەکانیان بوو..

لەکاتێکدا ئاگری ئەم شۆڕشە خەریك بوو گیان و سامانی خەڵکی بکاتە قەرەبرووت.. سنگی خەڵکیش پەنگی خواردبوویەوە لە ڕق و کینە بەرامبەر سەرۆکی کۆمپانیا -ئالەم کاتە ناهەموارەدا روکفلر ویستی ئاشتی و هێمنی سەقامگیر بکاتەوە.. بێگومان کردیشی! چۆن؟ ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

(روکفلر) چەند هەفتەیەکی تایبەت کرد بۆ سازپێژکردنەوەی نێوان خۆی و لێپرسراوی کریکارە شۆڕشگێڕەکان، بەتایبەت قسە ڕۆشتووەکانیان، پاشان هەموویانی کۆ کردەوەو وتارێکی بۆدان، هەرئەوەندەت زانی ڕق و تووڕەیی دامرکایەوە کە لەڕادەیەکدابوو خەریك بوو روکفلر دامالن.. بەلام ووتارە کە کەسانێکی زۆری کردە خۆی و بوونە دۆست و لایەنگری.. و تەنانەت مانگرتووەکان بەئەسپایی چوونەوە سەر کارەکانیان، بەبێ ئەوەی باسی مووچە زیادکردن بکەن کە مەبەستی مانگرتنەکەیان هەر ئەوەش بوو!.

ئەمەش سەرەتای ئەو ووتارە بەناوبانگەیەتی، وە لەبیرت نەچێت کاتێك ئەم ووتارە دەخوێنیتەوە –روکفلر ئەم ووتارەی لەبەردەم کەسانێکدا داوە کەتا ئەوساتەش پەتی سێدارەکەیان بەدارسێوێکەوە لەناوەڕاستی شاردا بۆ هەلواسیبوو!! هەرچەندە نەیتوانی بەتەواوەتی سۆزو خۆشەویستیان بۆخۆی ڕابکێشێ.

روکفلر وتارەکەی بەم شێوەیە دەست پێکرد: (بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکی پرشنگدارە لەڕۆژەکانی تەمەنم و کاتێکی بەپێزە لەکاتەکانی تەمەنم، کە تیایدا دەگەمە خزمەتتان ئەی نوێنەرانی کرێکاران، ڕێگام بدەن بەناوی خۆمەوە و بەناوی سەرجەم کارگوزارو لێپرسراوەکانیانەوە شانازی خۆمان دەربڕین بەرامبەر ئەم کۆبوونەوە مێژوییەی کە بەدرێژایی تەمەن یادی دەکەینەوە. ئەگەر ئەم کۆبوونەوەیەش پێش دوو هەفتە بگیرایە، وەك غەریبێك لەناوتاندا دەوەستام و نەمدەتوانی لەیەکتریتان جیا بکەمەوە، بەلام ئەوەبوو لەم دواییانەدا لەناو چادرو کابینەکاندا بەخزمەتتان شاد بووم و بەختەوەر بووم بەگفتوگۆ کردن لەگەڵ یەك بەیەکتاندا.. و لەماڵەکانیشتاندا چاوم بەماڵ و منداڵەکانتان کەوت، ئەڵێم: پاشان ئێمە ئەمڕۆ کۆبووینەتەوە لەگەڵ یەکتردا وەك دۆست و براو هاوڕێی یەکتر، چەند شادمان دەبم بەدووبارە بوونەوەی وێنەی ئەم جۆرە کۆبوونەوانە کە تیایدا لەهەموو مەبەستەکانمان بکۆڵینەوەو سوودەکانی هەردوولامان تێدا باس بکرایە.

هەرچەندە خۆی وا پێویستی دەکرد ئەم دیدارە لەنێوان بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاو نوێنەرانی کرێکارەکاندا ئەنجام بدرایە، چونکە من هەست دەکەم کاری من نییە و خۆم تێ هەڵقورتاندووە و شەنسم نەبووە لەیەکێ لەو دوو لایەنەدا بوومایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەی هاوڕێیان من وا هەست دەکەم پەیوەندیەکی بەتین بەرەوئێوەم کێش دەکات)!.

ئایا ئەمە نموونەیەکی قەشەنگ نییەو ئایا هیچ نموونەیەکی تری دەگاتێ لەهونەری: گۆڕینی دووژمن و ناحەزان بۆ دۆست و خۆشەویست و لایەنگر؟!

وا دابنێ روکفلر ڕێگایەکی تری بگرتایەتە بەر.. دابنێ دەستی بکردایە بەدەمە قاڵەو دەمە دەمە لەگەڵ کرێکارەکانداو ڕاستەوخۆ چەند ڕاستیەکی ڕەقی بدایە بەڕوویاندا.. دابنێ بەشێوازو ئیشاراتی بریقەدار پێی بسەلماندنایە هەڵەن، دابنێ بەهەموو بەڵگە مەنتیقی و ژیریانە پێی بسەلماندنایە کە گێل و گەمژەن لەم مانگرتنەیاندا، بێگومان شۆڕش کڵپەی دەسەندو ئاژاوەو کوشتاریش تەشەنەی دەکرد..

ئەگەر هات و دڵی کەسێك پڕ بوو لەڕق و کینە بەرامبەرت هەرگیز ناتوانیت بەرەو بەرنامەو بۆچوونەکانت ڕای بکێشی ئیتر با هەموو مەنتیقی دونیا هەیە بەکاری بهێنێ.

دەی با باوکە لۆمەبارێنەکان.. ژن و مێردە ڕەخنەگرەکان.. بەڕێوەبەرە سەرکەشەکان هەست بەم ڕاستیە بکەن و پەنا بەرنە بەر ئامۆژگاری و نەرمی و لەسەرخۆیی.

پێش سەد ساڵ لەمەوبەر لنکولن ووتوویەتی: (پەندێکی جوان هەیە دەڵێت: (دلۆپێك هەنگوین بۆکوشتنی مێش لە بەرمیلێك زەهر باشترە) !، دەی لەگەڵ ئادەمیزادیشدا هەر وایە: ئەگەر ویستت کەسێك بەرەو خۆت بهێنیت یەکەم جار دەبێت قەناعەتی پێ بکەیت کە تۆ هاوڕێو دڵسۆزی ئەویت، ئائەمەیە تکە هەنگوینەکە دڵی ڕاودەکەیت و ئەمەش نزیکترین ڕێگایە بۆ گەیشتنی بەدڵەکان.

لەوەدەچێت تۆ دووچاری مانگرتن و بڵاوەپێکردنی نەیەیت یان قسە لەگەڵ جەماوەرێکی گەورەدا نەکەیت، بەڵام خۆ هەندێ جار دەتەوێت بۆ نمونە کرێی خانووەکەت کەم کەیتەوە لەلای خاوەن خانوو ئایا قسەی نەرم و نیان و جوان کەڵکی هەیە:-

بابزانین: مستر (وب) ویستی خاوەنی خانوەکەی ڕازی بکات کەکرێی خانوەکەی لەسەر سوك بکات لەگەڵ ئەوەشدا کە کابرای خاوەن خانوو زۆر توندو تیژبوو قسە هەر قسەی خۆی بوو، کەچی سەریش کەوت لەم کارەیدا! (وب) خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، بۆخاوەن خانوەکەم نامەیەکم نووسی بەم شێوەیە: (نیازم وایە لەگەڵ تەواوبوونی ماوەی دیاری کراودا خانوەکە چۆڵ بکەم و بەجێی بهێڵم)! لەڕاستیدا نەمدەویست چۆڵی بکەم، بەڵکو ویستم ئەوە بکەم بەپێشەکی یەك بۆ ئەوەی داوای سوك کردنی کرێکەی لێ بکەم، بەڵام ئەوکارەم بێهیوایی‌و نائومێدی لێ بەدی دەکرا چونکە کرێچیەکانی پێشوویش هەمان ڕێگایان بەکار هێنا بەڵام لەگەڵ ئەو کەللە ڕەقەدا سودی نەبوو!.

لەوکاتەدا بەخۆمم وت: من چەند دەستورو بنەمام خوێندوە دەربارەی هونەری هەڵس و کەوت کردن و کارکردنە سەر دڵی خەڵکی کەواتە بۆچی ڕێگایەکیان تاقی نەکەمەوە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بزانم چی ڕوودەدات؟.

کابرای خاوەن خانوو هەر کەنامەی منی پێگەشتبوو خێرای خۆی و جێگرەکەی هاتن بۆ ماڵمان.. منیش بەسلاوێکی گەرمەوە بەرەو ڕوویان چووم و پێشوازیەکی جوانم لێ کردن. بەڕوویەکی گەشەوەو بەدەم زەردەخەنەوە فەرمووم لێ کردنە ژوورەوە).

پاش سلاو و چاك و چۆنی، دەستم کرد بە قسەکردن. بەڵام دەربارەی کێی خانوو نا بەڵکو هاتم باسێکی دڵگیری‌و خۆشی و بەختەوەری ئەو ماوەیەم بۆ کرد کە لەخانووەکەیدا بەسەرم بردووە. بەڕاستی من زیادە ڕەویم کرد لەو پیاهەڵدانەدا بەڵام بەڕاستی و دڵسۆزانە نرخ و ڕێزم بۆ دادەنا) پاشان سەرسامی خۆمم دەربڕی لەلێهاتوویی و بەتوانایی یەکەی لەبەڕێوەبردنی ئیش و کاری موڵکەکانیدا! پاشان

ووتم: ئاواتەخوازبووم بۆ ساڵێکی تریش لەم خانوەخۆشەدا بمامایەتەوە بەڵام داخی بەجەرگم توانام بەسەر کرێکەیدا ناشکێت!).

پیاوە بەڕوویەکی گەشەوە ڕووی تێکردم وەك بڵێی بۆیەکەم جارە لەژیانمدا کرێچی ئالەم جۆرە چاکەم بووبێت کە ئابەو چەشنەپێشوازیم لێ دەکات سەرسام بوو لەخۆشیدا نەیدەزانی چی بڵێت!.

خاوەن خانووەکە دەستی کرد بە قسەکردن و باسی ئەو نارەحەتی و دەردی سەریانەی دەکرد کە تووشی هاتووە بەدەستی کرێچی لارەوە. تەنانەت کرێچی یەکیان لەماوەی یەك مانگدا (١٤)نامەی بۆ ناردووەو قسەی ڕەق و دڵڕەنجێنەری تێدا نووسیوە! و یەکێکیتریان هەڕەشەی ئەوە دەکات کە ئەگەر ئەو ماڵە قاتی سەرەوە دەرنەکەیت ئەوا پەیماننامە هەڵئەوەشێنمەوە چونکە مناڵەکان زۆر چەقەچرۆو دەمەوەرن!.

پاشان ووتی: ئای کەبەختەوەرم کرێچییەکی وەك تۆم هەبێت!) بەبێ ئەوەی من داوای سوك کردنی کرێخانووەکەی لێ بکەم خۆی ڕازی بوو کرێکەی بەو جۆرە سوك بکات کە من پێم خۆشە!!). نەك هەر ئەوەندە بەڵکو کاتێ خواحافیزیم لێکرد پێی ووتم: چۆنە بەلاتەوە دەستێکی جوانکاری بهێنم بە خانوەکەتدا؟!.

ئەگەر بمویستایە بەوجۆرە کرێ کەی پێ کەم بکەمەوە کە پێشتر کرێچییەکانی تر کردویانە ئەوا منیش شایانی ئەو تێك شکانەی ئەوان دەبووم، بەڵام من بەئاسانی بەهۆی ڕووی خۆش و ڕێزی تایبەت و نەرم و نیانییەوە دەستم کەوت..

مناڵ بووم کاتێ لەلادێ بووم بەپێی پەتی کێڵگە و باخەکانم تەی دەکردو لەقوتابخانەکەی ڕۆژهەڵاتی مەیسوری قوتابی بووم چیرۆکێکی ئەفسانەیان بۆ باس دەکردین لەژێر ناوی (خۆر و ڕەشەبا) کە دەڵێت: جارێکیان خۆرو ڕەشەبا بووبە دەمەقاڵەیان، خۆر دەیگوت من بەهێزو توانا ترم.. ڕەشەبایش دەیگوت: من لەتۆ بەهێزترو بەتین ترم، پاشان با ووتی بەخۆر: ئەوپیاوە پیرە دەبینی کە ئەو پاڵتۆیەی لەخۆی پێچاوە.. ئەگەر ئازایت وای لێ بکە بەزووترین کات پاڵتوکەی داکەنێت و فڕێی بدات؟.

خۆر ئەم گرەوەی لەگەڵ ڕەشەبادا کردو پێی ووت: ئادەی ئەگەر ڕاستەکەی پاڵتۆکەی لەبەردا لابەرە؟ ئەمەی ووت خۆی خستە پشتی پەڵە هەورێکەوە.. باش بەهەموو هێزو توانا بەوە دەهات و دەچوو.. کابرایش زیاتر پاڵتۆکەی لەخۆی دەئاڵاندو توندتر دەیگرت..

ڕەشەبا ئەهات و دەچوو گڕی لەخۆی بڕی و خۆی شەکەت کرد تا گەشتە ئەوەی لەبەردەم خۆرا دەستەوستان بوو دانی نا بەناتوانایی خۆیدا!.

نۆرەی خۆر هات، خۆر بەهێمنی لەنێوان پەڵە هەورە ڕەشەکانەوە سەری دەرهێناو بەزەردەخەنەیەکەوە خۆی پیشانی پیاوە پیرەکەدا.. پیاوە پیرەکەش بەئەسپایی پاڵتۆکەی لەخۆی کردەوە و فڕێی دایە ئەولاوە!!. لەم کاتەدا خۆر بەڕەشەبای ووت: (نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی چەند قات کاری توندوتیژی و توڕەیی دەکات)!.

لەسەردەمی منداڵیمدا حەزم لەو چیرۆکانە بوو لەگۆڤارەکاندا بڵاودەکرانەوە- ڕۆژنامەی بۆستن- پڕ بوو لە بڵاوکراوەی پڕوپاگەندە بۆ ئەو بەناو پزیشکانەی کە خەڵکیان وادەست دەبڕی کە گوایە چارەسەری ئەو نەخۆشیانە دەکەن کە کوشندەو بێ دەرمانن کەلەڕاستیدا بریتی بوو لە ساختەچێتی و پارە کشانەوە لەو خەڵکە سادەو نەخوێندەوارانە!

ئەم دەست بڕانە نەخۆشەکانیان لەترس و بیمێکی هەمیشەییدا دەهێشتەوە لەبەر ئەوەی سەریان لێ بدەنەوە پێیان دەووتن: نەخۆشیەکەتان سەرهەڵدەداتەوەو هیچ داودەرمانێکیان پێ نەدەدان-ئەم دەسبڕانە زۆرکەسیان دووچاری مردن کرد بوو بەتایبەت ئەوانە یان منداڵیان لەباری ژنان دەبرد!

دانیشتوانی بۆستن لەم کارە زۆر پەست بوون.. وتاربێژو ئامۆژگارەکان نەفرینی خۆیان دەباراند بەسەریانداو قسەیان بەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەش دەگووت کە پڕوپاگەندەیان بۆ بڵاودەکەنەوەو لەخوادەپاڕانەوە کە دانیشتوان بپارێزێ لەشەڕو خراپەی ئەو دەست بڕانە، بەڵام بێسوود بوو دوکتور(ب) لەدواتر بووە قوتابی پەیمانگاکەی من، سەرۆکی ڕێکخراوی (لیژنەی هاووڵاتی باش) بوو کەسەر بە

(یەکێتی گاورانی بوستن بۆ هەوڵە سوپاس کراوەکان)بوو.. بەشداریان کرد لە وەستان بەرامبەر ئەم دەست بڕانە و بەڵام کاری ئەوانیش تێك شکا.. تامستر-ب- گەشتە ئەو باوەڕەی کەشەڕو بەرامبەر وەستان سوودی نییە لەگەڵ ئەو بەناو پزیشکانەدا، بۆیە بیری لەشتێك کرد، کەهەرگیز بەبیری کەسدانەهاتبوو.. کەبەکارهێنانی نەرم و نیانییە لەگەڵیاندا، ویستی ڕۆژنامەکان قەناعەت پێبکات بەخۆشی خۆیان واز لە پاگەندە کردن بهێنن بۆیان.

بۆیە مستر (ب) ڕۆشتە نووسینگەکەی خۆی و نامەیەکی جوان و ڕازاوەی نووسی بۆ (بوستن هوالدا) وتیایدا سەرسامی خۆی دەربڕی بەرامبەر لێهاتوویی ڕۆژنامەکەیان لەبواری چیرۆك و ئەدەب و هەواڵە سیاسی و وەرزشییەکان و لەدوایدا ووتی: بەڕاستی ڕۆژنامەکەتان شایانی ئەوەیە بچێتە ماڵە ناودارو بەڕێزەکان، وە، بەردەوام بوو ووتی:

(... بەڵام ئەوەندە هەیە هاوڕێیەکم بۆی باس کردم کەواکچێکی گەنجی هەیە: ئەم کچە باسی منداڵ لەباربردنی خوێندبوویەوە کە ئێوە پاگەندەتان کردبوو بۆ کەسێك، کچە لەباوکی پرسی و مناڵ لەباربردن یانی چی و چۆنە؟!!، ئەو هاوڕێیەم تەزوویەکی شەرم بەسەریدا هات و نەیزانی چی وەڵامی کچەکەی بداتەوە!).

بەڕێزان ڕۆژنامەکەتان دەچێتە بەڕێزترین ماڵ لەبوستندا، و ئەو هەواڵەی لەهاوڕێکەم ڕوویداوە کێ دەڵێ لەچەندان ماڵی تریشدا ڕووی نەدابێت؟! باشە ئەگەر بەڕێزتان کچێکی گەنجتان هەبێت و لەڕۆژنامەکەتان بپرسێت، ڕووتان دێت وەڵامی بدەنەوە؟ (چەند دڵگران و ئەسەفم -گەورەم- کەدەبینم ڕۆژنامەکەتان لەهەموو ڕوویەکەوە پێش کەوتنی پێوە دیارە کەچی ئەم تاکە ناتەواویە بەدی دەکەم کە باوکان هەرتێك دەچن کاتێ ڕۆژنامەکە بەدەست کچەکانیانەوە دەبینن! ئایا لەوەناچێت هەزاران خوێنەری تریش ئەم تێبینییەیان هەبێت؟.

ئەوەبوو مستر -ب- پاش دوو ڕۆژ نامەیەکی لەڕۆژنامەکە پێگەیشت -کەدکتۆر ب- نزیکەی (٢٥)ساڵە ئەو نامەیەی هەڵگرتووە!. وە من کاتێ ئەم باسە دەنووسم

ئەو نامەیەم لەبەر دەستایە کە مێژووی (١٣)ی ئوکتوبری (١٩٠٤) پێوەیەو ئەمەش دەقەکەیەتی:

(دوکتور أ.هـ.ب) بوستن ماساشوستس) ئەی بەڕێزو خۆشەویستم: (ئێمە زۆر قەرزار و شوکرانە بژێری تۆین لەسەر ئەو نامەیەی لەم مانگەدا بۆت ناردین، چونکە گەیاندمییە ئەوەی دوایین بڕیارم بوە لەمەسەلەی پروپاگەندەکاندا کە لەو کاتەوە بوومەتە سەرنووسەر بیری لێدەکەمەوە و نەمزانیوە چ بڕیارێکی لەسەر بدەم! لەڕۆژی دووشەممەی داهاتووەوە ڕۆژنامەی (بوستن هرالد) بەتەواوی خاڵی دەبێت لەبڵاوکردنەوەی ئەوشتانەی قسەیان دێتە سەر و سەرجەم بڵاوکراوەو پاگەندەکانی تایبەت بە ( پزیشکەکان) فڕێ دەدرێتە دەرەوەی ڕۆژنامەکەوە، تەنها پاگەندە سوود بەخشەکان دەهێڵینەوە کە ناکرێت لابرێن لەڕۆژنامەکە! لەکۆتاییدا شووکرو سوپاسی خۆم ئاراستەی جەنابتان دەکەم لەسەر ئەو نامەیەی کە بووبەهۆی دەرکردنی دوابڕیارم لەمەسەلەیەکی گرنگدا).

ئیمزا

دڵسۆزتان و. أ . هاسکل

کەواتە با قسەکەی لنکۆلنت یاد نەچێت یەك دڵۆپ هەنگوین بۆ کوشتنی مێش لەبەر میلێك زەهر باشترە). ئەگەر ئەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت بهێنی بڕگەی ژمارە (٤) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

**(پەنابەرە بەر نەرمی و لەسەر خۆیی نەك توڕەیی و توندو تیژی).**

## پاشکۆی ڕێگای چوارەم:
## (نەرم و نیانی هەمووی چاکەیە)

خوێنەری خۆشەویست.. بانگخوازی ماندوونەناس.. ئاگاداربن هیدایەتی خواو نوری قورئان و خۆشەویستی (پێغەمبەر) و ترسی ڕۆژی قیامەت جێگایان دڵەو دەبێت لەناو دڵدا جێگیر بکرێن، ئەگەر وانەبێت خوای گەورە نایەوێت هەموو جیهان نوێژ بکات بەڵام دڵیان لەباوەڕ خاڵیبێت.. بۆیە بەزۆر موسڵمان کردنی خەڵکی لەئیسلامدا قەدەغەیە بە ئایەتی ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ (البقرە ٢٥٦) و دەبێت خەڵکی بەقەناعەتی قەلبی خۆیان ببنە مۆم و بۆ ئەم دینە پاکە بسوتێن.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ﴾ (١)فصلت ٣٤).

واتە:(پێغەمبەر)ی خوایش دەفەرموێت (ان الله رفيق يحب الرفق في الامر كله) خوای گەورە نەرم و نیانە و لەسەر خۆیەو نەرمی و لەسەر خۆیشی دەوێت لەهەموو کاروکردەوەیەکدا.. موسڵمانیش دەبێت ڕەبانیو خوایی بێت و ناوەجوانەکانی خوا بەکردەوە لەخۆیدا بەرجەستە بکات ﴿صِبۡغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗۖ﴾ (البقرە ١٣٨).

لەمەدینەی مونەوەرەدا دوو خێڵی سەرەکی هەبوون بەناوی (اوس و خزرج) بۆ سەدان ساڵ دەرۆشت دوژمنایەتی و خوێن لەنێوانیاندا هەبوو.. ئیسلام هات و کردنی بە برای یەکتر بە ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ﴾ (الحجرات ١٠)، بەڵام جولەکەکان بەم برایەتییە زۆر پەست بوون و بۆیە هەوڵیان دا نێوانیان تێك بدەن و کردیشیان و ئاگری دوژمنایەتییە کۆنەکەیان هەڵگیرساندەوەو ئەوس و خەزرەجی برا دەستیان دایە چەك بۆیەکتری..

کاتێ (پێغەمبەر)ی خوا ﷺ ئاگادارکرا زۆر ناڕەحەت بوو.. بەڵام خۆی تێك نەداو بۆیە بەتوڕەیی و توندی یەوە هاواری نەکرد بەسەریانداو بڵێ: ئەی ئافەرین.. چاك برای دینی یەکترن! خۆش صەحابی! خۆش انصارو مهاجر! ئادەی بیانگرن یەکی

(٥٠) پیاویان لێ زیندان بکەن! تا ژیربین و بۆجارێکیتر نەخەڵەتابن دەست بکەن بەشمشێردا بۆ گەردنی یەکتری!

نەخێر ئەمە شێوازی پەروەردەی محمد المصطفی نییە -گیانم فیدای بێت- لەلایەن خواوە هونەری دڵراگیرکردن و بانگەوازی ژیرانە فێرکرابوو. بۆیە لەسەرخۆو بەئارامییەوە ڕۆشتە ناویان وتارێکی کاریگەری بۆدان و تیایدا ئیسلامو برایەتی بیرخستنەوە پاشان گلەییەکی دڵسۆزانەو پرسۆزو میهری لێکردن و فەرمووی: (ئایا دەست ئەدەنە سنگی یەکتری.؟ کەهێشتا من لەناوتاندا زیندووم! شێوازی نەفامی زیندوو مەکەنەوە بەڵێ هەردوولایان دەستیان کرد بە گریان و پاشان دەستیان کردە ملی یەك و بەخۆیاندا هاتنەوە.

دەبێت ئەم ئایەت و فەرموودانە تەحریف نەکرێن و بەجۆرێ مانا نەکرێن کە پەنا بەخوا بکرێتە بانگەوازێك بۆ وازهێنان لەتوندو تیژی بەرامبەر دوژمن و ناحەزانی بەرنامە شیرینەکەی پەروەردگارو دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت (کە ئەگەر توند ڕەوی زیانی هەبێت بۆ پاشەڕۆژی بانگەواز ئەوا لەبەرامبەریدا نەرمڕەویش بەوچەشنە مۆرکی ترسنۆکی و زەلیلی بۆ ئیسلام تۆمار دەکات).

تواندنی نەرم و نیانی لەگەڵ ئیسلامییەکانی براماندا هەتا زیاتر بەردەوامتربێت هێشتا هەر کەمە. بەڵام نواندنی لەگەڵ ناحەزانی ئیسلامدا ئەگەر کاتیبێ‌و لەبەر حیکمەتێ بێت قەیدی نییە بەڵام ئەگەر بەردەوام بەو شێوەبێت لەگەڵیان ئەوە (ولاء)ەو پەنا بەخوا (ولاء)یش پەنا بەخوا بۆ غەیری خواو بەرنامەکەی دروست نییە.

لایەنێکی ئیسلامی لەئەفغانستان لەلایەنێکیتر زویربوو، بەهێزو بازوی خۆیدا دەینازی، شەوێك هەڵی کوتایە سەر بارەگاکەیان و چی تێدابوو گرتیان و داگیریان کرد بەبێ هیچ بەرگریەك بەپێچەوانەوە ئەوانەی ناو بارەگاکە بەخێر هاتنیان کردن وتیان فەرموون وەرنە ژوورەوە.

هەندێ ئەندامە دڵ گەرم و سەربازیەکان دەیانووت باتۆڵەی خۆمان بکەینەوەو ئێمەش بارەگایەك یان سەیارەیەك یان هەندێ نەفەریان لێ بگرین بەڵکو وەك فشارێك بیخەینە سەریان تا بارەگاکەمان بۆ چۆڵ بکەن!

بەڵام سەرکردەکانی ئەم لایەنە ئەو ڕایەیان قبوڵ نەکرد و ووتیان ئەو کارەی ئەوان کردوویانە شەرعی نییە، کەواتە ئێمەش نابێت وەڵامی ناشەرعی بەناشەرعی بدەینەوە.. بەڵکو بەشێوازێکی لەسەرخۆو نەرم و نیان لەگەڵیان دەڕۆین تاخۆیان بیربکەنەوەو بیگەڕێننەوە بۆمان..

بەڵێ نوێنەریان ڕۆشت و پێیان ووتن: ئەو بارەگایەی ئێمە کەئێستا لەلای بەڕێزتانە لەلای ئێمە زۆر ئاساییەو ماڵی ئێمەو ئێوە جیانییەو ئەوکارەی ئەونەفەرانەی ئێوە کردوویانە، لەناوخەڵکدابۆتە عەیبو دەڵێن ئیسلامییەکان بەربوونەتە یەکتر! جائەگەر لەبەرئەوە نەبوایە ئەوا بارەگاکەمان دەکردە دیاری بۆتان!!

هەڵوێستی توندو تیژی بەرامبەر چۆن دانامرکێتەوە لەبەردەم ئەم ووتە جوانانەدا؟

ئەوەبوو ووتیان ئێمە بارەگاکەتان بۆ دەگەڕێنینەوەو هەرچی شتێکی تێدا نەماوە دەیبژێرین و ئەوانەشی ئەوەیان کردوە موحاسەبەیان دەکەین!.

خوێنەری بەڕێز وردبەرەوە ئەگەر ئاوا بەنەرم و نیانیو لەسەرخۆییو ژیرانەیان نەکردایە بەڵکو بەشێوازێکی ڕەق وەڵامی ئەو داگیرکاریەیان بدایەتەوە ئێستا خۆت چاك دەزانی چ خوێنێك دەکەوێتە نێوان دوولایەنی جیهادی ئەفغانییەوە پەنا بەخوا!..

نمونەیەکیتر لەدونیای بانگەوازو گۆڕینی خراپەدا: گەنجێك هەبوو خاوەنی ژیری و هۆش و زانست و ڕەوشتی جوانی ئیسلام بوو.. بەڵام لەناوکەش و هەوایەکدا گەورەبوو بوو کە هەندێ خڵتەی بیدعەو خۆرافاتی پێوەنووسابوو! خۆیشی بەشتێکی باشی دەزانیو کاری پێ دەکردن!..

بۆیە هەندێ برا زۆر توندوتیژبوون لەگەڵیداو هەروەك ڕووی خۆشیان نەئەدایەو سەلامیشیان لێنەدەکردو لەکاتی دەمەقاڵەو گفتوگۆکاندا بەناشیرین ترین شێوە دادەبەزینە سەر ئەو کوڕە چاکە.. کە لەڕاستیدا دەروونی زۆر پاك بوو. ڕەوشتی زۆر جوان بوو تەنها لەبەرئەوە یان بۆی نەڕەخساوە یان دەوروبەری نەیان ویستووە بگەڕێت بەدوای ڕاستیدا..

بێگومان ئەم کوڕە گەنجە لەداخی ئەو هەڵس و کەوتە وشك وناشیرینانەی ئەوان زیاتر سور دەبوو لەسەر ئەو بۆچوونانەی کەهەندێکیان زۆر دوربوون لەهەدی (پێغەمبەر)ی خوا ﷺ بەڵام پاش ماوەیەك برایەکی بانگخوازی لێزان دەبێتە هاوڕێی‌و خۆشەویستی خۆی دەباتە دڵییەوەو پاشانیش پێی دەڵێت:

(من هەندێ کردەوەم هەیە یان هەندێ تێگەیشتنم لەئیسلام دەست کەوتووە بەڵام نازانم تا چ ڕادەیەك لەشەرعەوە نزیکە و دور نیە لەسوننەتەکانی (پێغەمبەر)ی خواوە ﷺ! تالەسەر دەستی تۆداو بەپشتیوانی خوا واز لەوشتانە بهێنم بەڵێ پاش ئەوەی کەبۆیەکەمین جار گەنجەکانی ڕابوونی ئیسلامی ئاوا لەگەڵیدا دەدوان و دان بە زانیاری و لێهاتوویەکەیدا دەنێن پاش ماوەیەك لەزۆرێ لەبۆچوون و کارەکانی کە لەوەوپێش شانازی پێوە دەکردن وازی هێناو ئێستا -بعدالمشرقين- دوورکەوتۆتەوە لەهەموو بیدعەو پۆخڵەکانی سەدەکانی دوایی کەتێکەڵی کانیاوە سازگارەکەی ئیسلام بووە!..

## ڕێگای پێنجەم:
## (نهێنییەکانی سەرکەوتنی -سقراط-)

کاتێك دەتەوێت لەگەڵ کەسێکدا لەمەسەلەیەکدا گفتوگۆ بکەیت، لەباس کردنی ئەو شتانەوە دەست پێ مەکە کە دەزانیت هەردووکتان جیاوازن تیایدا، بەڵکو لەو شتانەوە دەست پێ بکە کە لەسەری کۆکن و هەردووك باوەڕتان پێی هەیە، وەتا دەتوانیت لەسەر ئەو شتانە سووربە، ئەوکاتە هەردووکتان هەوڵی گەیشتن بەمەبەست دەدەن، و تاکە جیاوازیەك لەنێوانتاندا بمێنێت لەشێوازی گەشتن بەمەبەستە نەك مەبەستەکە خۆی!.

لەسەرەتای ووتوێژەکەدا هەوڵ بدە بەرامبەرەکەت کۆمەڵێك بەڵێت بۆ بکات..

هەرچیت کردووە بوار مەدە شتانێك باس بکەیت بەرامبەرەکەت –نەخێر–نەء–ت بۆ بکات مامۆستا –ئوڤەر ستریت–لەکتێبی کارکردنە سەر سروشتی مرۆڤەکان(١)– دا دەڵێت:

(وشەی–نەخێر– لێژگاییەکی ناڕەحەتە زۆر بەئاستەم مرۆڤ لێی دێتە خوارەوە، چ کاتێك مرۆڤ– ووشەی نەخێری بەکارهێنا فیزو گەورەیی ولوت بەرزی وای لێ دەکات بەردەوام لەو (نەخێر)ەی خۆی دانەبەزێت! هەرچەند، هەندێ کات خۆیشی هەست دەکات کە نەخێر کردنەکەی لەجێگای خۆیدا نەبووە، بەڵام گەورەیی و لوت بەرزی ئەو هەستەی تێدا دەکوژێت و بەرگری لەنەخێرەکەی دەکات وەك ئەوەی زۆر ڕاست و بەڵگە نەویست بێت، بۆیە باشتر وایە لەسەرەتای وتووێژەوە لەو شتانەوە دەست پێ بکە کە لەسەری یەکن و بەتەواوەتی خۆت گێل بکە لەو شتانەی کەتیایاندا جیاوازن).

قسەکەری لێهاتوو و دانا ئەو کەسەیە لەسەرەتای وتووێژەوە ژمارەیەکی زۆر (بەڵێ)بۆ بەرامبەرەکەی بکات، ئیتر ئەوکاتە بەرامبەرەکەی بەرەولایەنە چاکەکان دەبات و ناتوانێت لێی لابدات وەك چۆن لەیاری بلیارددا تۆپەکەت بۆ هەرلایەك وەشاند لەدەستی تۆ دەردەچێت بۆکوێ دەڕوات، دەڕوات، کاتێك ئادەمیزاد دەڵێ

(نا) ئەوە تەنها دوو پیتی سادەی لەدەم دەرناچێت و بەس نا زۆر لەوە زیاترە: بەڵکو هەموو لەشی بەگشتی وەك لیك ڕژێنەکان و دەمارەکان و ماسولکەکان ناهێڵن خۆی بشکێنێتەوە، بەمانایەکی تر وای لێدەکەن بەرەو (نەخێر) کردن بڕوات..

بەڵام ئەگەر بیووتایە (بەڵێ) پێویستی نەبوو بەهیچ جۆرە چالاکییەکی بەشەکانی لەشی، بەڵکوو هەموو لەشی ڕووی دەکردە ڕازی بوون و بەرەوپێش چوون، ئالێرەوە هەوڵ بدە بۆ بەدەستکەوتنی ووشەی (بەڵێ) لەبەرامبەرەکەت، بەو هیوایەی کەم کەم بەرەو ئەو مەبەستانەی هەتە بیبەیت!!

قوتابیەکم ناوی (مستر جیمس ئیبرسون)ەو فەرمانبەرە لەبانکی (گرینتش) لەنیویۆرك، بەبەکارهێنانی پلانی -بەڵێ- کردن بەبەرامبەر توانی کڕیارێك بگەڕێنێتەوە بۆ بانکەکەی لەکاتێکدا نزیك بوو لەدەستیان دەربچێت!

مستر ئیبرسون دەڵێت: ئەم (مشتریە) هات بۆ بانکەکەمان تا دەفتەرێکی تایبەتی بۆ بکەینەوە، منیش فۆرمێکم پێدا تا پڕی بکاتەوە، ئەویش هەندێکی وەڵام دایەوە بەڵام هەندێ خانەی بەسپێتی هێشتەوەو سوریش بوو لەسەر پڕ نەکردنەوەی!.

منیش پێش ئەوەی لەهونەری هەڵسوکەوت کردن شارەزا ببم ئەگەر کەسێکی ئاوا بهاتایەتە لامان پێم دەگووت: (ئەگەر جەنابت ئەم فۆرمی زانیاریانە پڕ نەکەنەوە هەرگیز بەتەما نەبێت دەفتەرتان بۆ بکەمەوە؟!).

شتێکی ئاساییە کە ئەم جۆرە قسانە خۆشی و لەزەتێکی بەمن دەبەخشی، چونکە وام دەردەخست بۆ ئەو کابرایە کە من بەناوی بانقەوە قسە دەکەم، وەیاساو بڕیاراتی بانك نابێت بەهیچ شێوەیەك بشکێنرێت! بەڵام لەڕاستیدا ئەم هەڵوێستە دڵی ئەو کەسەی هاتبوو پارەمان لەلادابنێ خۆش و شادمان نەدەکرد!.

ئەو بەیانییە بڕیارم دابوو بەژیرانەو لێزانانە هەڵس و کەوت بکەم، بۆیە بڕیارمدا گوێ بۆ حەزو داواکانی کڕیار بگرم زیاتر لەیاساو بڕیارەکانی بانك، لەمەش زیاتر وام لێکرد بەردەوام بەووشەی بەڵێ وەڵامم بداتەوە، و لەسەر هەموو ڕاو بۆچوونەکانی ڕەزامەندیم دەردەبڕیو پێم گووت: ئەوخانانەی پڕت نەکردوونەتەوە زۆر گرنگ و پێویستن، پاشان پێم ووت: وادابنێ تۆ ئەم پارە زۆرەت لەبانق دانا،

پاش ماوەیەك –خوانەکردە– لەڕووداوێکدا تیاچوویت ئایا پێت خۆش نییە بانق پارەکانت بداتە دەستی یەکێ لەخزمە نزیکەکانت؟

لەوەڵامدا ووتی: بێگومان بەڵێ!، دەی کەواتە ئەوە فکرەیەکی چاك نییە کەناوی ئەوکەسەمان بێ بڵێیت کەدوای خۆت پارەکانی بگاتە دەست؟! ووتی: بەڵێ! کابرا لەو پرسیارانەی منەوە حاڵی بوو کە پڕکردنەوەی ئەو خانانە لەبەرژەوەندی خۆیەتی، بۆیە بەبێ داواکردن خۆی دەستی کرد بە زانیاری پێدانم لەبارەی خۆیەوە.

نەك هەرئەوەندە بەڵکو لەسەرداوای من دەفتەرێکی حسابیشی بۆ دایکی کردەوە چونکە میرات گری بوو دوای خۆی و هەموو زانیاریەکیشی دەربارەی دایکی پێدام!

بەوشێوەیەو بە (بەڵێ) پێکردنی توانیم خاڵە جیاوازەکانی نێوانمان لەبیر بەرمەوەو زۆر بەئاسانی هەرچی زانیاریەکم پێویست بوولێم وەرگرت!))

(جوزیف ئیلسون) لە ناوەندەکانی (دەڵاڵی) کۆمپانیای (وستنجهاوس) بوو بۆ فرۆشتنی بەرهەمە کارەباییەکان، ووتی:

لەشارەکەماندا (مشتری)یەك هەبوو کۆمپانیاکەمان زۆر حەزی دەکرد ڕای کێشێ بۆخۆی، ئەوەبوو پاش (١٣) ساڵ هەوڵ و تێکۆشانی بێ سوود، ئەوجا توانیمان شتێکی کەم لەبەرهەمە کارەباییەکانمانی پێ بفرۆشین و پاش ئەم سەودایە کتوپڕ قسەیەکی چاوەڕوان نەکراوی دا بەگوێماندا ووتی: ئیلسون تاماوم شتتان لێ ناکڕم!. ووتم: ئێ بۆچی، چی بووە؟!.

ووتی: چونکە مەکینە و ماتۆڕەکانتان زۆر گەرم دەبن و تەنانەت لەکاتی ئیش پێکردندا هەرناتوانم دەستی بۆبەرم!، لێرەدا بۆم دەرکەوت قسە و دەمەقاڵە سوودی نییە لەگەڵیدا بۆیە بەخۆم ووت: (بۆچی ڕێگای (بەڵێ) پێکردنی لەگەڵدا بەکار نەهێنم؟ پێم ووت:

ئەی( مستر سمس) ئەگەر ئەوەی بەڕێزتان دەیڵێت ڕاست بێت ئەوا هەق نییە لەم ڕۆبەدوا هیچمان لێ بکڕیت! چونکە مافی خۆتە مەکینەیەك بکڕیت پلەی گەرماکەی

لـەو ڕێژەیـە تێنەپـەڕێت کـە یـەکێتی نیـشتمانی بەرهەمـە کارەباییەکانـە بڕیاریـان لەسەرداوە، ئایا وانییە؟ ووتی: بەڵێ وایە!

دیـسان پـێم ووت: بێگومـان ئـەم یەکێتییـە بڕیاریداوەگـەرمایی ماتۆڕەکـان لـە (٧٢)پلە (فهرنێـت) زیـاتر نـەبێت ئەمـەش جگـە لەگـەرمایی ئـەو ژوورەی ماتۆڕەکـەی تێدا کار دەکات وانییە؟

ووتی بەڵێ! بەڵام ماتۆڕەکانی ئێوە زۆر لەوڕادەیە زیاترە!

من لێرەدا دەمەقاڵەم لەم بارەیـەوە بەچاك نـەزانی لەگەڵیدا، بۆیـە پـێم ووت: ئایا پلەی گەرمای ژوورەکە چەندە؟ ووتی: نزیکەی (٧٥) پلەی فهرنێت ە، منیش ووتم: ئەگـەر پلـەی گـەرمای ژوورەکـە (٧٥)پلـەبێت بەگـەرمی پێـو؟ وە (٧٢)پلـەی تـریش بڕواتـە سـەری دەکاتـە (١٤٧)پلـە. ئایـا دەسـتت ناسـوتێ ئەگـەر دەسـت بخەیتـە نـاو ئاوێکیشەوە کەپلەی گەرماکەی (١٤٧) پلەی گەرمابێت؟ ووتـی (بـەڵێ)! پاشـان وەك پێشنیارێك پێم ووت: ئەی باشە واباشتر نییە لـەکاتی ئـیش پێکردنـدا دەسـت نزیـك نەکەیتەوە لەماتۆڕەکە؟

پاشان پێی گوتم: واگومان دەبەم تۆ لەسەر هەقیت!

هـەر ئـەو ڕۆژە پـێش ئـەوەی لەیـەك جیاببینـەوە داوای لێکـردم بـایی (٣٥،٠٠٠) ریاڵ ئامێری نوێی بۆ دروست بکەم!!.

(سوقرات) زۆر هەڵکەوتوو عەبقەری بووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا پێپەتییـەکی کەچـەڵ بـووە و زۆریـش ناشـرین بـووە کەچـی لەتەمـەنی چـل سـاڵیدا کـچێکی (١٩) سـاڵی هێنـا!! ئەمـەش بـەهۆی ئـەوەوە کـە ڕێگایـەکی وای گرتەبـەر کـەس ڕێگـای وای بەخەیاڵدا نەهاتبوو بەکاری بهێنێ ئەوەبوو بەهۆی گۆڕینی زۆرێ لەبیرکردنەوەکانی خەڵکی!..

ئەم سـوقراتە پـاش (٢٣)سـەدە بەسـەر مردنیـدا تائێـستا بـەژیرترین فەیلەسـوفی دونیـا ناودەبرێـت، هەڵکـەوتووترین کـەس لـەبواری ژیربێـژی –منطـق–دا یەکـەمین کەسە کەئەم دونیا سەرکەشە بەخۆیەوە دەبینێت.

ئایا کام ڕێگای بەکاردەهێنا بۆ ڕازی کردنی خەڵك و قەناعەت پێکردنیان؟ ئایا ڕوبەڕوو پێی دەوتن ئێوە لەسەر هەڵەن؟ نەخێر هەرگیز سوقرات شتی واناکات! بەڵکو چەندان پرسیاری ڕووبەڕووی بەرامبەرەکەی دەکرد کە وەڵامەکانی (بەڵێ) نەبێت هیچ شتێکی تر نەبوو!

سوقرات بە هێمنی ئەمە پیشەی بوو تالەکۆتایی وتووێژەکەدا بەرامبەرە هەژارەکەی ناچار دەکرد بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت (بەڵێ)بکات بۆ ئەو شتانەی کە ماوەیەکی کەم لەوەوبەر باوەڕی پێیان نەبوو!

لەداهاتوودا، ئەگەر ئەتویست بەسەرکەسێکدا سەربکەویت و بەرەو بۆچوونەکانی خۆتی ڕابکێشی پێی نەڵێیت: تۆلەسەر هەڵەیت!! بەڵکو سوقراتە پێ پەتییە کەچەڵ بخەرەوە یادی خۆت و کۆمەڵە پرسیارێك ئاراستەی بەرامبەرەکەت بکە وەڵامەکانیان (بەڵێ) بێت! نەك نەخێر!!.

چینییەکان پەندێکی زۆر جوانیان هەیەو بەڕاستی پێکاویانە دەڵێت:( ئەوەی سوك بڕوات زۆر دەڕوات)! چینییەکان ئەم پەندە دێرینەی ڕۆژهەڵاتیان بە هەوانتە نەوروتووە بەڵکو پاش تاوتوێ کردنی سروشتی مرۆڤایەتی بۆ ماوەی (٥)هەزار ساڵ!.

ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بخەیتە سەر بۆچوونەکانی خۆت برگەی ژمارە (٥)جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

**(کۆمەڵە پرسیارێك لەبەرامبەرەکەت بکەوەڵامەکانیان ( بەڵێ) بن).**

## پاشکۆی ڕێگای بەشی پێنجەم:
## ( لەسەرەتای وتووێژەوە براکەت توڕە مەکە )

بانگەوازکردن بۆلای بەرنامە ناوازەکەی قورئان زۆر زۆر گرنگەو شتێکی ئاسانو بێبایەخ نییە بەڵکو بۆلای خوا بانگی دەکەیت و لەسزای هەتا هەتایی ئاگری جەهەنەم دوری دەخەیتەوە بۆیە نابێت وابیربکەیتەوە بڵێیت دێت بەدەممەوە یان نایەت چش، چاویان دەردەهات! چیبکەم ئەوە (١٠)جار پێم ووتن کەنایەن با هەر نەیەن!!

نانا وامەکە برای بانگ خوازم، ئەی ( بانگخواز ) ئەی گڵۆپە هەزاریەکەی کاروانی ئیسلامەتی ئاگاداربە خۆ تۆ خەڵك بۆشتی سادەو ساکار بانگ ناکەیت تا گرنگ نەبێت بەلاتەوەبێت یان نەیەت!

بۆنموونە، کەسێك بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ یان بانگێشتی بکەیت بۆ کۆڕێکی مەعریفی یان ئەدەبی یان پێشانگایەکی هونەری یان بۆسەفرەیەکی بەهاران یان سەردانێکی کۆمەڵایەتی یان بەشداری خولێکی خۆشنوسی یان کۆمپیوتەر یان خەیاتی..هتد.. ئەمانە شتانێکن ئەگەر خەڵکی نەشیەن بەدەمتەوە زۆر گرنگی نییەو زیانەکەی کەمەو ترسناك نییە.. بەڵکو تۆ خەڵکی لەئاگری بڵێسەداری جەهەنەم ڕزگار دەکەیت و بەهەشتی پان و بەرین و پڕ لەخۆشیو شادی و ئاسودەیی هەتا هەتایی بانگ دەکەیت! کەواتە جوانترین شێوازی تێکەڵی خەڵکی و بانگردنیان بەژیرانەو لێزانانەو دڵسۆزانە ئەرکێکی زۆر مەزنی سەرشانی هەڵگرانی ئەم بانگەوازە قورئانییەیە..

سەیرکە، جولەکەو گاوری کەللە ڕەق و دوژمن بەهەموو قیەمێکی ئینسانی و ئیسلامی.. خوای گەورە ڕێنمایی (پێغەمبەر)ە نازدارەکەی دەکات کە ئەگەر ئەوانە موسڵمان نابن و شایەتومان ناهێنن لێیان گەڕێ خۆیان زەرەر دەکەن بەڵکو پێیان بڵێ ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان وەرن با لەچەند خاڵێکی هاوبەشدا یەکبگرینەوە ئەویش ئەوەیە هەردوولامان یەك خوابناسین ئەویش (الله)یەو

هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەین و هەندێکمان هەندێکی ترمان نەکەین بەخوا و وەك خوا سەریان نەکەین وەك دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ (١) (ال عمران ٦٤).

چەند ژیرانەیە بانگەوازکاران بەگاورێك بڵێن: ئەی بەڕێز، ئەی شوێن کەوتەی عیسا (پێغەمبەر) ﷺ ئەزانیٚ ئێمەو ئێوە یەك سەفەرمان لەڕێدایە، یەك ئامانجمان هەیە ئەویش هێنانە دی خواناسی و گرتنی ڕێبازی ئایینە و ئێمەو ئێوە توانیومانە لەژیانی مادە پەرستییەوە کۆچ بکەین بۆ دەست گرتن بە ئایین و هیوای بەهەشتو هەروەك هەردوولامان یەك دوژمنمان هەیە ئەویش شەیتان و عەلمانیەت و چەپڕەوو مارکسییەکانن!. پاش ئەم نزیك بوونەوە ڕۆحییە برای بانگخواز ئەتوانیٚ دواپەیامی پەروەردگاری بۆ ڕوون بکاتەوەو دڵنیاش بن گوێی بۆ دەگرێت!.

ئەمە باشە نەك بەگاورێك بگوترێت: ئێوە سیٚ خوا ئەپەرستن و موشریکن و هەمووتان ئەچنە ناو دۆزەخەوەو نە عیسی و نەدایکی فریاتان ناکەون. هەی خاچ پەرستە خوێن ڕێژەکانی سەدەکانی ناوەڕاست!! ..

لەتاران بووم لەمەیدان ولی عصر.. شەوێکیان وتوویژێك کەوتە نێوان من و برادەرێکی شیعەی تورکمانی خەڵکی ئەردەبیل دا. ناوی –اغا واحدی–بوو.. باس هاتە سەرباسی شیعەو سوننە.. دەبینم زۆر توندە لەئەهلی سوننەو خراپ حاڵیان کردبوو. بەموسڵمانی تەواوی نەدەزانین.. منیش بۆم دەرکەوت بەرگری کردن لەسوننە و دەمە قاڵە کردن لەوبارەوە مەسەلەکەی بەرەو تێکدان دەبرد و ترسیشم هەبوو پەیوەندیە بەتینەکەی نێوانمان تێك بدات و زیانەکە بێتە دینی و دونیایی!. بۆیە ووتم ئەی بۆچی بەرنامەی باس کردنی خاڵە کۆکەکانی نێوانمان بەکار نەهێنم کۆمەڵیٚ بەڵیٚ و( اشهد)ی پیٚ نەکەم!..

ووتم: ئایا هەردوولامان خاوەنی یەك قورئانی پیرۆز نین.. بەڵام ئەوەیە ئێمە پێی دەڵێین قورئانی کەریم و ئێوەش پێی دەڵێین قورئانی مجید..وانییە؟

ووتی: بەڵێ وایە! ووتم: یەك خوا دروستی نەکردووین و هەر ئەویش ناپەرستین ووتی بەڵێ وایە! ووتم: یەك قیبلەو یەك (پێغەمبەر) و یەك بەرنامەمان نییە لەژیاندا؟

ووتی: بەڵێ؟ ووتم: هەردوولامان وازمان نەهێناوە لە تولەڕێو حیزبە عەلمانییەکان و هەردووکمان یەك دوژمن لەکەمیندانییە بۆمان؟ ووتی: بەڵێ وایە!!.

ووتم: ئایا نەزەری تێڕوانین هەردوولامان وانییە کە دەبێت خواو (پێغەمبەر)مان لەهەموو کەسێ خۆشتر بووێت؟ ووتی بەڵێ وایە! دەی هەر بەم قسەیە بۆم سەلماند کە ئێوە ئەوەندەی بۆ حسین دەگرین ئەوەندە بۆ زکریا (پێغەمبەر) ناگرین کەبەمشار کردیان بەدووکەرتەوە.. بۆ عمرو و عوسمان و علی ناگرین کەبەدڕندانە ترین شێوە شەهید کران.. بەلام ئەمانەم بەم زەقییە پێنەوت بەڵکو خۆی تێگەیشت!.. لەوڕۆژە بەدواوە منی زۆر لەجاران زیاتر خۆش دەویست رقیشی لەناوەکەم نەبوویەوە !!

دەی ئەگەر بمگوتایە ئێوە یەك نوێژتان قبوڵنی یە چونکە قاچ ناشۆن و سیغە حەلاڵە لەلاتان لەکاتێکدا لەلای ئێمە زینایە! و ئێوە ئال و بەییت بە بێ گوناه – معصوم– دەزانن لەڕاستیدا بێجگە خواو (پێغەمبەر) کەس معصوم نییەو شەیتان بەهەمووی دەوێرێ و ئیجتهادی ڕاست و هەڵەش هەر هەیەو ئێوە لەنوێژدا دەست ناگرن لەسووننەت لاتان داوە چی ڕووی دەدا؟ بێگومان خوێنەر خۆی باش دەزانێت!..

لە بەغداد بووم لەگەڕەکی( کەڕادە مەریەم ) لەماڵی پیاوێکی دەوڵەمەندی خواناس میوان بووم و ئەم پیاوە ناوی حاجی حسین بوو شیعەبوو، ڕووی تێکردم ووتی: ها کاکە عمر، ئێمە ئیمامی عەلیمان زۆر خۆش دەوێت یان ئێوە؟ ئەم پرسیارە زۆر شتی لەژێر خۆیدا حەشاردابوو.. لەوێدا بۆم دەرکەوت سوودی نییە بڵێم ئێمە زیاتر خۆشمان دەوێت و ناشبێت هێرش بکەمە سەری و بڵێم ئێوە وەك ئێمە خۆشتان ناوێت!

بۆیە ووتم: حاجی، ئیمامی عەلی ئامۆزای (پێغەمبەر)ەکەمانەو خەلیفە چوارمی ئیسلامەو ژیانی پڕە لەخزمەت و جیهاد بۆبەرزی ئیسلام و خاوەنی ئالاّی (پێغەمبەر)ی خوابووە لە جەنگی خەیبەردا. وانییە؟

ووتی: بەڵێ وایە!، ووتم: وادەزانم ئێمەش و ئێوەش خۆشمان دەوێت بەلاّم سەر بەرزی و ئافەرین بۆ ئەو موسڵمانانەیە لەبەرخاتری خوای گەورە خۆشی بووێن وانییە؟ ووتی: بەڵێ، بەلاّم وانازانم ئێوە خۆشتان بوێت! ووتم بەچیا دەزانیت؟

ووتی: ئەی بۆچی خستانە دوایین خلفای ڕاشدین؟ ووتم: ئەمەش دەلیلە لەسەر خۆشەویستیمان بۆی! ووتی: چۆن؟ ووتم: (پێغەمبەر)ی خوا ﷺ لەهەموو (پێغەمبەر)ەکانی برای خۆشەویست تر نییە لەلای خوا؟ ووتی: بەڵێ! ووتم: دەی خوا کردویەتی بە ئاخرین (پێغەمبەر) و خستوویەتییە دوای دواوە وانییە؟

ووتی بەڵێ.. بەڕاستی ئێمە هەق وایە لەدورەوە لەیەك حاڵی نەبین و پێویستە لەنزیکەوە گفتوگۆ بکەین! لەکۆتاییدا ووتی: تۆ نیوەڕۆ لەلای خۆم دەبیت و پێکەوە زیاتر حەز دەکەم لەم مەسەلە گرنگانە بکۆڵینەوە!!.

## ڕێگای شەشەم:
## (چاکترین چارەیە بۆ کۆسپ و تەگەرەکان)

زۆرێك لەخەڵکی وابیر دەکەنەوە باشترین ڕێگا بۆقەناعەت پێکردنی خەڵکی و ڕاکێشانیان بۆلای بۆچوونەکانیان ئەوەیە بواری کەس نەدەیت جگە لەخۆت قسە بکات؟ زۆربەی ئەوانەی کەوتوونەتە ئەم هەڵەیەوە ئەوانەی خەریکی کڕین و فرۆشتن و بازرگانین بەڵکو چاکتر وایە سەری گوریسی قسە بدە دەستی بەرامبەرەکەت و وازی لێ بهێنە تاچی پێیە دەری ببڕێت!، لەڕێگای پرسیارکردنەوە وای لێبکە چی لەناودڵ و دەروونیدا هەیە بۆت بخاتە سەر پشت!

جاری واهەیە پێویستە قسەکەی پێ ببڕیت.. بەڵام نەکەیت، مادەم ماویەتی باقسەی خۆی تەواو بکات!

بەڵکو بەئارامییەوە گوێی بۆ شل بکەو دەست بخەرە ژێر چەناگەت!. هانی بدە تا سەربەستانە ڕاو بۆچوونەکانی خۆیت بۆ ئاشکرا بکات.

ئایا ئەم ڕێگایە سودی هەیە لەدونیای کاروکەسابەتدا؟ فەرموو لەگەڵ بەسەرهاتی پیاوێك کە ناچاربووە ئەم ڕێگایە بەکار بهێنێ:

چەندساڵێك لەمەوبەر، یەکێ لەکۆمپانیاکانی ئوتومبیل ویستی کارگەیەك ڕازی بکات کەسەرجەم پێداویستییە ئامێرەکانی بۆ دروست بکات، بەڵێ هەموو کارگەکان نمونەو کەتەلۆکی خۆیان نارد بۆ کۆمپانیاکە، پاشان کۆمپانیا سەرجەم کارگەکانی ئاگادارکردەوە. تالەڕۆژی دیاری کراودا هەریەکەو نوێنەرێك بنێرێت، بۆئەوەی هەر نوێنەرێك هەستێت بەباس کردنی ئامێرەکانی کارگەکەی.. بڕیاریدا لە کۆتاییدا کام کارگەیان بەدڵ بوو (عقد)ی لەگەڵدا پڕدەکاتەوەو مامەڵەی خۆی بەردەوام لەگەڵدا بکات..

نوێنەری یەکێ لەکارگەکان ناوی (ج.ب.ر)بوو لەڕۆژی دیاریکراودا ئامادەبوو بەڵام سەرمای بوو بوو توشی قورگ ئێشەیەکی –پیس– بوو بوو بەجۆرێك کەقسەی بۆ نەدەکراو دەنگی دەرنەدەهات، مستر (د) خۆی دەیگێڕایەوە بۆ قوتابیەکانم:

کاتێك کەسەرەی من هات لەو کۆبوونەوەیەدا قسەی خۆم بکەم سەبارەت بە چاکی و بەتوانایی ئامێرەکانی کارگەکەمان. هەموو خەڵك بەدەوری مێزەکەدا خڕبووبوونەوە، منیش لەسەر وەرەقەیەك نووسیم:

(ئامادەبوانی بەڕێز، من توانای قسەکردنم نییەو قورگم گیراوەو دەنگم دەرنایە)!
کاتێ سەرۆکی کۆمپانیا وەرەقەکەی بینی ووتی: قەیناکا من لەباتی تۆ قسەدەکەم. پاشان هەستایەسەرپێ و هەموو ئەو نمونانەی لەگەڵ خۆم هێنابووم یەك یەك پیشانی ئامادەبوانی دەداو لایەنە چاکەکانی باس دەکرد!

ئەوەبوو دەمەقاڵەو قسەی زۆر کرا سەبارەت بەونموونانە بەڵام لەبەرئەوەی سەرۆکی کۆمپانیا بەناوی منەوە قسەی دەکرد ئاسایی بوو کەلایەنی منی دەگرت و منیش بەهەندێ زەردەخەنەوو ئاماژەکردنەوە بەشداریم دەکردن.

بەڵێ ئاکامی کۆبونەوەکە ئەوەبوو من (عقد)ەکەم دەست کەوت کە تیایدا بڕیاربوو ڕووبەری یەك ملیۆن یاردە ئامێریان بۆ دروست بکەم کە بایی (١٦،٠٠٠)ڕیاڵ بوو!!.

من دڵنیام ئەگەر دەنگم لەدەست نەدایە ئەو دەست کەوتە چاکەم نەدەبوو وە من تەنها بەڕێکەوت ئەمەم بۆ دەرکەوت کە چەند سوود بەخشە واز بهێنی لەبەرامبەرەکەت قسەی خۆی بکات!.

دیسان (جوزیف وب) لەکۆمپانیای (فیلادلفیا) ئەم ڕاستییە گرنگەی دۆزیەوە جارێکیان ئەم (جوزیف)ە لەگەڵ نوێنەری ئەو هەرێمەدا لەگەشتێکی پشکنین دا دایان بەلای خانوویەکی سپۆرتدا کە زۆر جوان نەخشەی کێشرابوو، لەنوێنەری هەرێمەکەی پرسی: ئەوەچییە وا ئەو ماڵانە کارەبایان نییە؟ نوێنەری هەرێم بەبێزاریەکەوە ووتی: ئەو ماڵانە لەڕادەبەدەر دژی ڕاکێشانی کارەبان و کۆمپانیاش زۆر هەوڵی داوە ڕازیان بکات بەڵام بێ سوود بووە چونکە کارەبایان ناوێت!.

ئەوەبوو (وب) بڕیاریدا خۆی هەوڵیان لەگەڵدا بدات تەقەیدا لەدەرگای ماڵێکە وە لەکونێکی بچکۆلەوە خاوەن ماڵەکە سەری دەرکەوت. (مستر.ب) خۆی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە دەڵێت: هەر کە خاوەن ماڵ کە خانمێك بوو کە ناوی سزدر

کنبورد-بوو- زانی لەلایەن کۆمپانیای کارەباوە هاتووم بەتوندی دەرگاکەی لەڕوودا داخستمەوە!!

بەڵام من جارێکی تر لەدەرگام داو دەرگاکەی بۆ کردمەوە یەکسەر پێی پەردەچی لەدڵدا بوو بەرەو ڕوو پێی ووتم بەرامبەر کۆمپانیای کارەبا و پاش کەمێ ئێور بوونەوەی تورە بوونەکەی پێم ووت: ببورە کە نارەحەتمان کردی! من بۆ هیچ شتێك نەهاتووم لەو بارەیەوە بەڵکو هاتووم هەندێك هێلکەتان لێ بکڕم!.

زیاتر لەجاری پێشوو دەرگاکە بۆ کردمەوە -هێشتا هەر بەگومانەوە دەیڕوانی بۆم- منیش لەوێدا پێم ووت: وادەزانم مریشکەکانی ئێوە لە ڕەگەزی دوو مەنیکن، بۆیە ئاواتەخوازم یەك دەستە (طبق) لەو هێلکانەم دەست بکەوێت و بیکڕم..

بەسەر سوڕمانەوە لێی پرسیم چۆن زانیووتە مریشکەکانم لەجۆری دوو مەنیکن؟ ووتم: منیش لەماڵە مریشك ڕادەگرم بەڵام ئەوی ڕاستی بێ لەم جۆرە مریشکانەی ئێوەم نەدیووە!

بەکەمێ سەرسامییەوە پێی ووتم: بۆچی تۆ هێلکەی مریشکەکانی خۆتان ناخۆیت؟ ووتم: مریشکەکانی من لەڕەگەزی (لیجۆرن) بێگومان تۆ باشتر دەزانیت کە چەند جیاوازن لەتام و چێژدا! ئەوەندەی نەبرد بەڕوویەکی خۆشەوە هاتە دەرەوە بۆلامان و هەڵوێستی نەرم و نیانی نواند بەرامبەرمان، ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشت لەناو ماڵەکەیدا ئەوەبوو دەزگایەکی بچوکی تێدا بوو بۆ بەرهەمەکانی شیرو ماست! بۆیە پێم گوت:

گرەوتان لەگەڵ دەکەم کە ئەوەی تۆ دەستت دەکەوێت لەقازانجی ئەم مریشکانەدا زۆر زیاترن لەو قازانجەی مێردەکەت دەستی دەکەوێت لەم دەزگای شیرو ماستە!.

ئەی خوا ئەم قسەیەی منی چەند پێخۆش بوو! کەهەمان ڕای منی دووپات کردەوە و ووتی: بەڵام چی دەڵێیت لەگەڵ مێردەکەمدا کە دان بەم ڕاستییەدا نانێت!

پاشان فەرمووی لێ کردین و بەحەوشەی ماڵەکەدا گەڕاندینی و کولانەی مریشکەکانی پێ پیشان داین.. و پێشنیاری جۆرە خواردنێکی دانەوێڵەم بۆ کرد

بۆ مریشکەکانی و هەروەك پێم ووت پلەیەکی گەرمای گونجاویان بۆ بڕەخسێنیّ.. ماوەیەکمان بردە سەر بەقسەی خۆش و دڵگیر تا ئەوەندەی پیّ نەچوو ووتی: هەندیّ لەدراوسێکانم کارەبایان ڕاکێشتووە و زۆریش دڵخۆشن پێی!.. پاشان داوای ڕای منی کرد لەڕاکێشانی کارەبادا کە تا چ ڕادەیەك تۆ بەباشی دەزانیت؟ ئەوەبوو دوو هەفتە تێپەڕی نەکردبوو مریشکەکانی ئەو خانمە لەبەر ڕووناکی کارەبادا هەڵقونگەیان دەکرد!!.

ئەوەی من مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە ئەگەر بوارم بەم ئافرەتە نەدایە تا لەبارەی ژیان بژێوی و شتە گرنگەکانی تریەوە قسەی تەواوی خۆی بکردایە نەم ئەتوانی بیبەم بەرەو حەزو ئارەزووەکانم.

ڕۆژێکیان یەکیّ لەپیاوانی کارو کاسپی –رجال الأعمال– لەلاپەڕەی تایبەت بە بڵاوکراوە داراییەکانی ڕۆژنامەی (نیویورك هوالدتربیون)دا بڵاوکراوەیەکی بڵاو کردەوە کە داوای پیاوێکی خاوەن ژیری و شارەزایی و توانایەکی لەڕادەبەدەر، دەکات.. (تشارلس جو پیلیسد) ڕۆشتە پێشەوە و خاوەنی کاریش داوای بینینی کرد).

(تشارلس) بەرەو گەڕەکی (وڵ سترێت)ی گەڕەکی دەوڵەمەندەکان کەوتە ڕێ، کە چەند ڕۆژێك لەوەوبەری تەرخان کردبوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو کارمەندە گەورەیە پاشان لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا بە (کارمەندەکەی ووت: چەند بەختەوەر دەبم کاتیّ دەبمە خزمەتکاری کۆمپانیایەك کە خاوەنی سجیلێکەکە لەمێژووی هەوڵ و تێکۆشاندا!).

من دڵنیام یەکەم جاریش (٢٨) ساڵ لەمەوبەر دەست بەکاربوون خاوەنی تاقە ژورێك و یەك کاتبیّ گەڕۆك بوو، بەڵیّ هەموو پیاوێکی سەرکەوتوو پێویستە یادگاریە پڕ هەوڵ و تێکۆشانە بیّ وچانەکانی سەرەتای ژیانی بهێنێتەوە یادی خۆی.

بەڵیّ ئەم پیاوەش وەك هەموو خەڵکی تر وایە و سروشتی جیا نییە لەوان، بۆیە ئەمیش بەدوورو درێژی دەستی کرد بەهەوڵ و تێکۆشانەکانی سەرەتای ژیانی

کارو کاسپی و کە چۆن خاوەنی تەنها (٤٠٠) ڕیاڵ زیاتر نەبووە! بەڵام ئەندێشەی دەوڵەمەند بوون و دڵ و دەروونی داگیر کردبوو! وە باسی دەکرد کە چۆن لەگەڵ بێ هیواییدا جەنگاوەو ( یەئسی) کوشتووە لەخۆیدا)!.

باسی کرد کە بەردەوام کاری کردووە تەنانەت ڕۆژی یەك شەممان و ڕۆژە پشوەکانیش (١٢) تا (١٦) کاتژمێر کاری کردووە، وە باسی ئەوەی کرد کە چۆن سەرکەوتووە بەسەر ئەو تەنگ و چەڵەمانەی کە هاتوونەتە ڕێی و وا ئەمڕۆ بۆتە ڕووگەی پیاوانی (وڵ ستریت) و لەمەسەلە ئاڵۆزەکاندا لەمن دەپرسن! ئەم پیاوە لەڕادەبەدەر شانازی دەکرد بەو ڕۆژە پرشنگدارانەی هەوڵ و تێکۆشانی ژیانی ڕابووردووی و خۆشحاڵیش دەبوو کەسێ ئەو لاپەڕانەی سەرلەنوێ هەڵبدایەتەوە و باسی بکردایەتەوە! پاش ئەم هەموو پێشەکیەی ئەوجا پرسی دەربارەی لێهاتوویی و شارەزاییەکەم!! پاش کەمێ لەجێگرەکانی بانگ کردوو پێی ووت: (وا هەست دەکەم ئەمە ئەو پیاوە بێت کە من بۆی دەگەڕێم)!!..

(جوبیلس) زۆر شەکەت و ماندوو بوو تا ئەو هەمووە زانیاریانەی دەربارەی سەرۆکی داهاتووی کۆی کردەوە و گرنگی و خۆشەویستی خۆی دەربڕی بۆ ئەو پیاوە و ژیانی ئەو پیاوە! وەهانی دا تا زۆربەی قسەکان ئەو بیکات و تاوای لێ کرد خۆی بردە دڵیەوە.

لەڕاستیدا زۆربەی خەڵکی ئەوەیان پێ خۆشە گوێیان بۆ بگیرێ تا دەربارەی کارو چالاکی خۆیان باس بکەن نەك ئەوان گوێ بگرن بۆ خەڵکی تا باسی خۆیانیان بۆ بکەن و کارو لێهاتوویی خۆیانیان بۆ باس بکەن!.

فەیلەسوفی فەرەنسی (لارد شفرکو) دەڵێت: (ئەگەر دەتەوێت دووژمن بۆ خۆت دروست بکەیت ئەو خۆت بەرزتر سەیر بکە لەهاوڕێکانت، بەڵام ئەگەر دەتەوێت هاوڕێت زۆر ببێت ئەوا بهێڵە با هاوڕێکانت خۆیان بەرزتر بکەنەوە بەسەرتدا و خۆیانت لێ جیا بکەنەوە))

ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە کاتێ هاوڕێکانمان خۆیان بەسەرماندا هەڵدەنێن هەست بەڕێز و گرنگی خۆیان دەکەن، بەڵام کاتێ ئێمە خۆمان هەڵدەنێین

بەسەریاندا ئەوان هەست بەکەمی و ناتەواوی خۆیان دەکەن و پاشان حەسودی و بێ ئەدەبیان تێدا دروست دەبێت!.

ئەڵمانیەکان ووتەیەکی جوانیان هەیە دەڵێن: (خۆشترین شادی دێت بەسەرماندا ئەوکاتەی دەبینین بێ بەختی ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی ئێمە حەسوودیان پێ دەبەین)!

بەڵێ بە دووری مەزانە کە هەندێ لەهاورێکانت زۆر کەیف خۆش و بەختیار دەبن کاتێ دەبینی تا ببنە قاقات لەناو گێرەو کێشەدا چەقیویت!. یان قەیرانێك ڕووی تێ کردوویت). تۆزێ لەگەورەییت کەم کەرەوەو لەفیزو لوت بەرزی وەرە خوارەوە و خۆ بەکەم دانان –تواضع– بنوێنە، بوار بدە با هاورێکانت کەمێ خۆیان بەسەرتدا هەڵبنێن!..

نووسەری بەناوبانگ (ئورفەن کوب) جارێکیان گیرابوو لەبەردەم دادگادا وەستابوو یەکێ لەپارێزەرەکان لێی دەپرسێ: (من دەزانم تۆ یەکێکی لەهەرە نووسەرە مەزنەکانی ئەمەریکا ئایا ئەمە ڕاستە؟ کوب وەڵامی دایەوە: لەوانەیە لەڕادەبەدەر شادمان بوومایە ئەگەر وابوومایە کەتۆ دەیلێیت)!.

ئەو شتانەی وات لێ دەکات خۆت بەنزم سەیر بکەیت و لوت بەرزی خۆت نەهێڵێ ئەوەیە کە بزانیت ئێمە هەموومان لەڕاستیدا یەکسان نین بەهیچ! منیش و تۆش پاش ماوەیەکیتردەبینە دەنگ و باس و بەلایەنی زۆرەوە پاش سەدەیەك کەسمان نامێنێت.

پرشنگی ژین و جوانیەکەی بەزایە مەدە بەباس کردنی لێهاتوویی خۆت و شارەزایی و دەست و کار ڕەنگینیت چونکە حەسودی خەڵکی بۆخۆت مسۆگەر دەکەیت، بەڵکو هانیان بدە پاڵەوانی و لێهاتوویی خۆیانت بۆ باس بکەن ئەوکاتە سۆزو خۆشەویستیان بۆخۆت دەستە بار دەکەیت)!.

ئایا دەزانیت هۆی چییە تۆ نەچوویتەتە ڕیزی گێل و گەمژەکان؟ یەك تکەیەو لەدوو ملم یود زیاتر نییە کە لە (لیك رژێتی دەرەقیتەوە) دەردەچێت! ئەگەر

دکتۆرێك بۆی بکرێت ئەو تکەیە لەو لیك ڕژانەدا دەربهێنیٚ تۆ دەگۆڕێیت بۆ گەمژە! کەواتە بەڕای من ئەوە ناهێنیٚ شانازی بکەیت بەسەر خەڵکیەوە پێی!).

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت بهێنی ئەوا بڕگەی ژمارە (٦) جێبەجیٚ بکە کە دەڵێت:

**(واز بهێنە لەبەرامبەرەکەت با قسەی خۆی بەتەواوی بکات)**.

## پاشكۆی ڕێگای شەشەم:
## ( بێ دەنگی دەئبی صاڵحانە )

بێدەنگ بوون و بەئەدەبەوە گوێ شل كردن بۆ بەرامبەر تا چی پێیە پێشكەشی بكات و شاراوەكانی ناو دڵ و دەروونی بخاتە سەر پشت بۆمان ئەوكاتە دوو كەڵكمان دەست دەكەوێت:

یەكەم/ زانیاری تەواوت لەبارەی بەرامبەرەوە و لەڕێگای خۆیەوە دەست دەكەوێت.

دووەم/ خۆشەویستیت دەچێتە دڵی بەرامبەر چونكە هەموو كەس ئاواتی ئەوەیە گوێگرێكی چاكی دەست بكەوێت تا دەردی دڵی خۆی لەلا باس بكات.

سەیر بكە (پێغەمبەر)ی ئازیزو خۆشەویستمان (ﷺ) تەنانەت لەگەڵ كافرو خوانەناسەكانی قورەیشدا بەكاری هێناوە ــ چ جای لەگەڵ برا موسڵمانەكەتدا تۆ زیاتر دەبێت جێ بەجێ ی بكەیت:

لە (صلح الحديبيه)دا سوپای (پێغەمبەر)(ﷺ) و سوپای قورەیش ڕازی بوون ئاشتی نامەیەك مۆر بكەن ئەوە بوو (پێغەمبەر)مان بواری تەواوی دا بە قورەیش تا چەند مەرجیان هەیە بیڵێن تا بیكەینە خاڵی ئاشتی نامەكە!

قورەیش زۆر خۆشحاڵ بوون و دانیشتن (١٠ ) مەرجیان دانا كە تیایدا ڕەچاوی بەرژەوەندی خۆیانیان تێدا كردبوو بەس!! (پێغەمبەر)مان كاتێ لەخاڵەكانی ورد بوویەوە دەبینێ بەرواڵەت لەبەرژەوەندی كافرەكانە، بەڵام لەناوەڕۆكەوە هەمووی لەبەرژەوەندی ئیسلام و سوپای باوەڕە! بۆیە یەكسەر مۆری كرد.

موسڵمانەكان زۆر زۆر پەست بوون و خەریك بوو لەداخا خۆیان دەكوشت تەنانەت عومەری كوڕی خەتاب –خوا لێ ڕازی بێت– بە(پێغەمبەر)ی فەرموو: (ئەی (پێغەمبەر)ی خوا ئەم نزمی و سەرشۆڕییە لەدینەكەماندا بۆ قبوڵ بكەین لەكاتێكدا ئێمە سەركەوتووین!)..

(پێغەمبەر)مان تێی دەگەیەنێت کە خێری تێدایە بۆ ئیسلام.. (پێغەمبەر) لایەنی دەروونی و دەرونناسی لێك داوەتەوە و گەورەیی و سەرداری قورەیشی نەشکاندو وای لێکردن هەست بکەن کە محەممەد نایەوێت ئاوی دەم و چاویان بتکێت! چونکەدەیزانی ئەو غیرەت و سوارچاکییەی لەناو قورەیش دا هەیە کەم وێنەیەو ڕۆژێ هەردێ بۆ خزمەتی سوپای باوەڕبەکاری بهێنن و لەئاکامیشدا هەر وابوو..

زۆر جار پێویست دەکات لەسەر بانگەوازکاران –کە ئەم شێوازە بەکار بهێنن و ئیتر نەفسی خۆشیان ئەوەی پێ ناخۆش بێت– گوێی پێ نەدەن– فەرموون با سەیرێکی ئەم نموونە ناوازەیە بکەین لەکۆشکی دەستەلاّت ڕوویداوە لەنێوان ئەمیرو وەزیرەکەیداو وەزیر لەئاکامدا توانیوویەتی چی دەوێت و بە (أمیر المؤمنین)ی بکات بەبێ هیچ دڵ زویر بوون و زۆر کاریەك!.. لەئاکامدا ئەم کارەی وەزیر بوو بەخێرو خۆشی و ڕژا بەسەر وولاّتی پان و پۆڕی ئیسلامدا، ئەمەش بەسەرهاتەکەیە:

(رجاء کوری حیوه) –ڕەحمەتی خوای لێ بێت– یەکێك بوو لەوەزیرەکانی چەند خەلیفەیەکی ئەمەویەکان هاوڕێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە , (مکحول) ئەگەر پرسیارێکی شەرعی لێ بکرایە ئەیفەرموو لەمامۆستاو گەورەمان رجاء بپرسن! ئەم رجایە لەساڵی (١١٢)ی کۆچیدا کۆچی دوایی فەرموو. ڕەجاء خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

(هەر کەبیستم خەلیفەی موسڵمانان –سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك–لە سەرەمەرگدایە و نەخۆشیەکی قورس سەری لێ داوە و حاڵی پەشێو بووە و یەکسەر خەلیفەیەکی دوای خۆی دیاری کردو بەپەلە گەشتمە لای دەبینم –ئەییبوی کوڕی خۆی داناوە کە منداڵێکی بچوکی بێ تەجەرەبەیە و بێ زانیاریە!– ووتم: گەورەم وام پێ خۆش بوو کەسێکی صالح و لەخواترس و ژیر بخەیتە جێگای خۆت تا خوای گەورە لەقەبرەکەتدا فریات بکەوێت)!.

ئەم ووتەیەم کاری کردە سەر دەروونی و وەرەقەی وەسیەنامەکەی دڕاند ووتی: ئەی بۆ داودی کوڕم چی دەڵێیت؟ ووتم: قوربان ئەو ئێستا لێرە نییەو لەبەرەکانی

جەنگە کێ دەڵێ ماوە یان نا؟!. سولەیمان ووتی: ئەی تۆ کێ بەگونجاو دەزانی؟ منیش یەکسەر ووتم: گەورەی موسوڵمانان تۆ ناوبەرە من ڕای خۆمت پێ دەڵێم دەربارەیان!

خەلیفە ووتی: ڕەجاء ,عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چۆنە؟ خێرا ووتم: وەڵڵاهی من بەپیاوچاکێك و موسوڵمانێکی کامڵ دێتە بەرچاووم! خەلیفە ووتی: وەڵڵاهی بەو جۆرەیە تۆ دەیڵێیت.. ڕەجاء تۆ شاهیدبە وەڵڵاهی دەبێت لەدوا ساتەکانی تەمەنمدا شتێکی وا بکەم کە شەیتان بێجگە لەزیان هیچی لێ دەست نەکەوێت.

خەلیفە بەئێش و ئازارێکی زۆرەوە لەسەرەمەرگدا نووسی: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان لەبەندەی خوا -سولەیمان کوڕی عەبدولمەلیك بۆ بەندەی خوا-(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) ئەوا تۆم کردە بەجێگری خۆم و خەلیفە موسوڵمانانی دوای خۆم دوای تۆش یەزیدی برام، گوێڕایەڵی بن و لەقسەی دەرمەچن تا جیا نەبن و دووژمنان تەماحتان تێ نەکەن)!..

سەیرکە رجاء چەند ژیر بوو.. دەیزانی ئەم دوانی خەلیفەی ڕەفز کردووە و ئەگەر ناو ببات دەمارگیری و گەورەیی وا لەخەلیفە دەکات کە بڵێ: ئەم وەزیرەم دوانی منی قبوڵ نەکرد منیش ئەو هەرکەسێك ناو ببات قبوڵی ناکەم!تانەبین بە دوو بە دوو. بۆیە ژیرانە سیاسەتی گوێ گرتنی گرتەبەرو ئەو فەزڵەی دایەوە بە ئەمیری موئمینین و پێی ووت: من ناو نابەم جەنابت ناو بەرەو من پێت دەڵێم چۆنن!!

کەواتە بوار بدە با بەرامبەرەکەت گوریسی قسەی لێ ڕاخات و تۆش بەتاسەوە گوێی بۆ بگرە پێش ئەوەی داوای لێ بکەیت بێتە قوتابیت و بۆچوونەکانتی پێ بدەیت..

## ڕێگای حەوتەم:
## (چی بکەین گیانی یارمەتی دا نمان دەست کەوێت؟)

ئایا شانازی و خۆشحاڵ نیت بەو ڕاوبۆچوونانەی خۆت زیاتر لەڕاوبۆچوونی خەڵکانی تر ئیتر با لەچوارچێوەیەکی ئاڵتوندا بخرێتە بەردەستت؟.

دەی کەواتە ئیتر بۆ ڕاوبۆچوونەکانت وەك ژەمی دەرمان بەزۆر دەیکەیت بەقورگی بەرامبەرەکەتدا؟ ئایا جوانتر وانیە لەڕێگای پێشنیارەوە پێی بگەیەنیت و بەس؟ وازی لێ بهێنی تا بەئارەزووی خۆی بگاتە ئەو ڕاوبۆچوونانەی تۆ؟.

ڕۆژێك (مستر ئەدولف سلتن) لەفیلادلفیا ناچار بوو ئەم ڕێگایە بەکار بهێنێ بۆ دروستکردنەوەی گوڕو تین لەکۆمەڵێ کرێکاردا کە بێ هیوایی خەریك بوو گشت چالاکییەکی دەکوشتن!

هەستا کۆبوونەوەیەکی پێ کردن و لەو کۆبوونەوەیەدا پرسیاری لێ کردن: چ داواکاریتان هەیە بەبێ پێچ و پەنا بیڵێن تا بۆتان بهێنمەدی؟. خۆیشی یەك یەك داواکاریەکانی لەسەر تەختە ڕەشەکە دەنووسی.. کاتێ داواکاریان نەما –سلتن– ڕووی تێ کردن ووتی: (زۆر چاکە.. هەموو ئەم داواکاریانەتان جێبەجێ دەکەم، بەڵام لەبەرامبەردا ئەزانن چیم دەوێت لێتان؟.

هەرکەسێك وەڵامێکی دەدایەوە وەك: (دڵسۆزی)، (دەستپاکی)، (گوڕو تین)، (گەشبینی)، (هەشت سەعات کاری ڕۆژانە)، تەنانەت پیاوێك خۆی تەرخان کرد کە ڕۆژی ( ١٤) چواردە سەعات کار بکات، ئەگەر ئەم و ئەو داواکاریانە بێنێتەدی بۆیان!.

کۆڕەکە بڵاوەی کردو کرێکارەکان گیانێکی پڕ لەهیوایان تیادا دروست بوو، گوڕوتینێکی گەممان تێکەوت، لەئەنجامی ئەوەدا بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا بەرهەم لەزیادکردندابوو!.

( مستر سلتن) پاش ئەوەی ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە پێی گووتم: لەنێوان من و کرێکارەکاندا مامەڵەیەکی ئەدەبیمان دروست کردبوو، من چەندێ لەو داواکاریانەم

جێبەجێ بکردایە ئەوانیش ئەوەندە لەو بەڵێنانەی خۆیانیان دەبردە سەر!..
ئەوەبوو ڕاوێژو پرس و ڕاپێکردنیان بەجۆرێ دایچڵەکاندن گەرم و گوڕی و چالاکیان لەڕادەبەدەر تیایدا دروست بوو!.

کاتێ کە (ثیودور ڕۆزفلت) پارێزگاری نیویۆرك بوو، شتێکی وای کرد ئەتوانم و بڵێم وەك موعجیزە وا بوو! ئەویش ئەوەبوو توانی نێوان خۆی و حیزبەکەی بەکۆکی بهێڵێتەوە و توانیشی حیزب ڕازی بکات –لەگەڵ بوونی زۆر نەیاردا– بەهەستانی بەهەندێ چاکسازی لەناو حیزبدا! ئەمەی چۆن بۆ دەچووە سەر؟

هەرکاتێ شوێنێکی گرنگ چۆڵ ببوایە و پێویستی بەکەسێکی شیاو هەبوایە بۆ پڕکردنەوەی سەرجەم سەرکردایەتی حیزبەکەی بانگ دەکرد تا هەریەکەو ڕای خۆیان بڵێن کە کێ باشە بۆ ئەو شوێنە؟.

(روز فلت) دەڵێت: (لەسەرەتادا کەسێکیان پێشنیار دەکرد کە ماف خوراو بێت لەناو حیزبدا! منیش دەمووت بەڕێزان مادەم جەماوەر لێی ڕازی نییە هەق نییە هەڵبژێررێت و شتێکی ژیرانە نییە!

پاشان کەسێکی تریان پێشنیار دەکرد کە وەك کەسی پێشوو خراپ نەبوو، بەڵام هەر لەو باشتریش هەبوو بۆ ئەو جێگایە، بۆیە دەمووت: ئەم پیاوە باشە، بەڵام ئەوە نییە کە مەبەستمانە و زۆر چاك بێت! سێیەمیان دەست نیشان کرد ووتم: پیاوێکی گونجاوە، بەڵام لەویش باشتر هەیە! بەوردی و لێزانانە داوام دەکرد لێیان کەسێکی تر بڵێن؟ یەکسەر من چوارەمم بەدڵ دەبوو! بۆیە دەمووت من زۆر لەمەیان ڕازیم ئیتر نازانم بۆ ئێوە!!.

بۆچی: چونکە لەجاری چوارەمدا ئەو کەسەیان دەستنیشان کرد کە من پێشتر لەخەیاڵمدا دامنابوو هەڵیبژێرم، ئەوکاتە ئەوپەڕی ڕێزو سوپاسم دەردەبڕی بۆیان کەیارمەتیان داوم پیاوێکی شیاو لەو جێگایەدا دابمەزرێنم، و ئازایەتی یەکەم هەمووی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوان!..

خۆ بنیتان تا چ ڕادەیەك (ڕۆز فلت) بەڕێگای ڕاوێژکردن بەبەرامبەر و ڕێز گرتن لەڕاوبۆچوونەکانیدا دەڕۆیشت؟ جێگایەکی گرنگی پڕ دەکردەوە بەپیاوێك کە

خۆی زووتر بەدڵی بوو، بەڵام وا سەرکردایەتی خۆی حاڵی دەکرد کە ئازایەتیەکە هی خۆیانەو خۆیان خاوەنی فیکرەکەن!!.

یەکێ لەخاوەن پێشانگاکانی ئۆتۆمبیل لە (لونج ئیلاند) توانی لەم ڕێگایەوە ئۆتۆمبیل بفرۆشێت بەپیاوێکی ئوسکلتەندی! بەم شێوەیە:

ئەم پیاوە ئۆتۆمبیل لەدوای ئۆتۆمبیل، یەك یەك پیشانی ئەم کڕیارەی دەدا، بەڵام کابرای ئوسکتلەندی بۆ هەموو دانەیەك ناتەواویەکی تێدا دەدۆزیەوە!!.

بەڵێ ئەم بازرگانە لەپەیمانگاکەمدا قوتابی بوو، ئەم مەسەلەیەی خستە بەرچاوی قوتابیەکان تا چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە، ئێمەش ئامۆژگاریمان کرد کە ئەم شت نەداتە بەسەر کڕیاردا بەڵکو کڕیار وازی لێ بهێنی تا خۆی دانەیەك دیاری دەکات!

پێمان ووت: (پێش ئەوەی بڵێیت کامەت دەوێ وازی لێ بهێنە با ئەو بڵێ ئەمەم دەوێت و وای لێ بکە هەست بکات فیکرەکە فیکرەی خۆیەتی!).

خاوەن پێشانگا ئەم ڕێگایەی تاقیکردەوە.. پیاوێك هات و داوای کرد لێی ئۆتۆمبیلەکەی بۆ بگۆڕێتەوە بەئۆتۆمبیلێکی تازە، لەم کاتەدا بۆی دەرکەوت کە ئەم ئۆتۆمبیلە کۆنە ئەوەیە کە کابرای ئوسکوتلەندی حەزی لێیەتی!. خێرا تەلەفونی بۆکرد کە بەڵکو ئامادەبێت تا ڕاوێژی پێ بکات لەشتێکی گرنگدا!

ئوسلەندی هات و کابرا پێی ووت: شارەزایی و وردەکاریەکی چاکم تیا بەدی کردوویت دەربارەی چاکی و خراپی ئۆتۆمبیل! بۆیە حەز دەکەم سەیرێکی ئەم ئۆتۆمبیلەم بۆ بکەیت و تاقیبکەیتەوە و پاشان پێم بڵێی بەچەند بیفرشم باشە؟

هەر ئەوەندەم زانی کابرا لەخۆشیدا لێوەکانی پێ دەکەنی وەك بڵێ: ئەمە منم داوای ئامۆژگاریم لێ دەکەن؟! چونکە مانای ئەوەبوو دانی ناوە بەژیری و لێزانیەکەیدا!

ئەم پیاوە لەشاری (کونیز بولیفارد)ی جامیکاوە هەتا (فورست هیلن) ئۆتۆمبیلەکەی لێ خوڕی پاشان بەخاوەن پێشانگای ووت: بە(٣٠٠) دۆلار کەمتر نەیفرۆشیت؟!

لێرەدا پێی ووت: ئایا بەڕێزتان ئامادەن ئەو پارەیەی پێ بدەن؟ بێگومان ووتی دەمەوێت ! چونکە ئایا فیکرەی خۆی نەبوو.. کڕین و فرۆشتنەکە ڕوویدا!!.

کولونیل (ئیدوارد هاوس) دەمڕاس و دەسەلاتداریەکی باشی هەبوو لە ئیش و کاری ناو خۆو دەرەوەی ئەمریکادا لەسەردەمی سەرۆکایەتی (ودرۆ ولسون)دا و سەرۆکی ولاَت لەزۆریَ لەئیش و کاری دەوڵەتدا ئەوەندەی پشتی بەئامۆژگاریەکانی کولونیل دەبەست ئەوەندە گوێی بۆ ئەندامانی حکومەتەکەی نەدەگرت! دەی با بزانین ئەو پلانانە چی بوون کە لولونیل بەکاری دەهێنان بۆ کارکردنە سەر سەرۆکی ئەمریکا؟.

خۆش لەوەدایە کە ئێمە ئەو ڕێگایەی ئەو دەزانین کە بەکاری هێناوە چونکە خۆی بۆ هاوڕێیەکی باس کردبوو هاوڕێکەشی لەڕۆژنامەی ئیڤینج بوست)دا وەك باسێك بلاوی کردەوە..

هاوس دەڵێت: پاش ئەوەی لەنزیکەوە سەرۆکم ناسی، بۆم دەرکەوت کە باشترین ڕێگا بۆ گەیاندنی فیکرەیەك پێی ئەوەیە کە فیکرەکە بەشێوەیەکی سەرزارەکی بدەم بەگوێیداو پاشان کەم کەم خۆی بیری لێ بکاتەوە و پاشان خۆی دەری ببڕێت وابزانێت بۆچوونی خۆیەتی! وە من بەڕێکەوت هەستم بەم ڕاستیە کرد تیایدا:

جار بەجار سەرم لەسەرۆك دەدا لەماڵەکەی خۆیدا، ڕاستەوخۆ ئامۆژگاریم دەکرد بۆ پیادەکردنی سیاسەتێکی دیاری کراو.. بەڵام ئەو پێی ڕازی نەدەبوو!.

ئەوە بوو پاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك بەسەر پێشنیارەکەمدا –جارێکیان پێکەوە نانمان دەخوارد– زۆر سەرسام بووم– کاتێ دەبینم هەمان پێشنیاری پێشووی من دەڵێتەوە وەك بلێی بیرو بۆچوونی خۆیەتی!).

ئایا بینیت (هاوس) قسەکەی پێ ببڕێت (ئەم پێشنیارە بیرو بۆچوونی تۆیە؟ نەخێر بۆچوونی منە من! نەخێر، هاوس زۆر لەوە ژیرتر بوو کە گرنگی بەوە بدات ئەم بۆچوونە هی خۆیەتی یان نا؟! گرنگ ئەوەبوو لەلای کە بۆچوونەکەی جێی

خۆی بگرێت، لەمەش زیاتر بەڵکو بەئاشکرا ئافەرینی کردو پیرۆزبایی لێکرد لەسەر دۆزینەوەی ئەم بۆچوونە جوانە ڕوناکەی!!

کەواتە بیرت نەچێت کە ئەو کەسانەی تۆ پێیان دەگەیت هەر ئەم سروشتەی ولسن یان هەیە، دەی هەمان نەخشەی (کولونیل)یان لەگەڵدا بەکار بهێنە.

جارێك پیاوێك ئەم ڕێگەیەی لەگەڵ خۆمدا بەکار هێناو ئەوەی ویستی لێم دەستی کەوت! ئەمە چۆن بوو؟

ڕۆژێکیان نیازم کرد هەستم بەگەشتێکی دەریایی لە (نیویۆرك) بەمەبەستی ڕاوەماسی!

بۆیە نامەم بۆ سەرجەم نووسینگەکانی گەشت و گوزار نووسی کە زانیاری پێویستم پێ بدەن لەو بارەوە. لەوانەیە ناونیشانی تەواوم لەڕێگای بەرید گەشتبێتە هەموو ئەوانەی کە مەبەستیانە، چونکە هەر ئەوەندەم زانی کۆڵێ نامەو نوسراو دابارین بەسەرمدا لەلایەن خاوەن سەیرانگەو ڕاوگەو سەربازگەی حەوانەوەکانەوە لەشاری (نیو برونسویك) وە بۆیان ناردبووم تا وام لێهات سەرسامو دەسەوسان بووم نەمدەزانی کامەیان هەڵبژێرم!

یەکێ لەو نامانە شتێکی زۆر گرنگی کردبوو: ئەوەبوو لەگەڵ نامەکەدا ناوی چەند کەسێکی لەنیۆیۆرك بۆ نووسیبووم لەگەڵ ئاماژە بەژمارە تەلەفۆنیان کەوەختی خۆی ڕۆشتبوون بۆ ئەوێ خزمەتێکی باش کرابوون..! و ووتبووی کە خۆت دەتوانیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت تا بۆت دەربکەوێت ئاستی خزمەتگوزاری ئامادەکراوی ئێمە بۆ میوانەکان!.

دەبینم لەنێو ئەو ناوانەدا ناوی ناسراوێکی خۆمی تێدابوو خێرا تەلەفۆنم بۆ کردو ئەویش زۆر وەسف و سەنای ئەو خاوەن ئوتێلەی کرد، ئەوەبوو منیش بەبێ سێو دوو کردن بەو پیاوەم ڕاگەیاند لەفلان کاتی نزیکدا دەگەمە لاتان!.

دەلالەکانی تر دەیانوویست بەزۆر ڕام بکێشن بۆلای خۆیان بەلام ئەو پیاوە وازی لێ هێنام تا بەئارەزووی خۆم هەڵیبژێرم و سەرکەوتنیش بۆ ئەو بوو!.

پێشتر لە (٢٥) سەدە لەمەوبەر ووتەیەکی زۆر جوان لەسەر زاری داناو حەکیمی چین ووترا کە خوێنەرانی ئەم سەردەمەی خۆمان ئەتوانن ئیشی پێ بکەن و باشترین ئەنجامیشیان دەست بکەوێت دەڵێت:

(پیاوی ژیر ئەو پیاوەیە ئەگەر بیەوێت لەهەموو خەڵکی بەرزتر بێت ئەوا خۆی بەخوارترین کەس دادەنێت، ئەگەر بیەوێت سەرقافڵەیان بێت ئەوا دەچێتە دوایانەوە، ئایا سەیری دەریات نەکردووە کە چۆن سەرانە لەسەدان زێ و جۆگە و دەریاچەکان و وەردەگرێت لەکاتێکدا لەهەموویان نزم ترە؟!).

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت ڕابکێشی برگەی ژمارە( ٧ ) (حەوت) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

(**واز لەبەرامبەرەکەت بهێنە با وا بزانێت بۆچوونەکە بۆچوونی خۆیەتی**).

## پاشکۆی ڕێگای حەوتەم:
## (شورا، واتە ڕێز لەبۆچوونەکان)

ئیسلامی بێگەرد شوێنکەوتوانی وا پەروەردە دەکات کە حەزی خۆ دەرخستن و من من کردنیان تێدا نەمێنێت و بەزاراوەی ئەمڕۆ -دکتاتۆر-نەبن.

بۆیە خوای گەورە هانی (پێغەمبەر)ەکەی دەدات کە ڕای خۆی نەسەپێنێت بەسەر هاوەڵاندا، بەڵکو ڕاوێژیان پێ بکات و کام ڕایەی لەلای جوان بوو هەڵیبژێرێت!

نەک هەرئەوەندە بەڵکو ڕاوێژکردنی کردۆتە (فرض)پێویست لەسەر (پێغەمبەر)ەکەی و پێی دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ (١)(ال عمران ١٥٩)، هەروەك بەهەموو موسوڵمانانیش دەڵێت ئاوابن وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (٢) (الشورى ٣٨).

خوێنەری خۆشەویست وردبەرەوە (پێغەمبەر)ێك کە چاودێری وردی خوای بەسەرەوە بێت و هەرگیز نەیهێشتبێت بکەوێتە هەڵەوەو بەوەحی ڕاستی کردبێتەوە! کەچی دەبێت ڕاوێژ بکات بەموسوڵمانەکانی دەوروبەری! ئەی دەبێت من و تۆ چەند گێل و نەفام بین ئەگەر وابزانین ڕاکانی خۆمان حەکیمانەن و پێویستمان بەڕاوبۆچوونی بەرامبەر نییە!!).

(پێغەمبەر)ی خوا لەساڵی دووی کۆچیدا، لەجەنگە مێژووییەکەی بەدردا چەند دیلێکی گرت لەسوپای کافرەکان، (پێغەمبەر)ی خوا زۆر بەبەزەیی و بەسۆز بووە تەنانەت لەگەڵ ناحەزو نەیارەکانیشیدا، بۆیە خۆی بەنیاز بوو ئەم ئەسیرانە نەکوژێت و بەزەییان لەگەڵدا بنوێنێت، بەڵام نەیویست ئەم ڕایەی خۆی بسەپێنێ بەڵکو هاوەڵانی کۆ کردەوە و ڕاوێژی پێ کردن (دەربارەی پاشەڕۆژی ئەسیرەکان!

عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێت- فەرمووی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا بدە لەملیان ئەمانە پێشەوایانی کوفرن و دوژمنی خوان لەناویان بەرە! (پێغەمبەر)ی خوا فەرمووی: ڕایەکەت جوانە، بەڵام حەز دەکەم ڕای ترم گوێ لێ

بێت؟ ئەبو بەکر -خوا لێی ڕازی بێ- فەرمووی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا ئەمانە خزمو کەسی خۆتن، پشتی خۆتن مەیانکوژە، هەر ڕۆژێ دێت بیر بکەنەوە! (پێغەمبەر)ی خوا بۆچوونەکەی ئەبوبەکری بەدڵ بوو و قبوڵی کرد چونکە لەگەڵ ڕایەکەی خۆیدا دەگونجا!.

کەواتە بەشداری پێ کردنی کەسانی چواردەورمان لەمەسەلە جیاجیاکاندا ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێز لەعەقڵ و ژیریان دەگرین ئیتر با ڕاکانیشیان پەسەند نەکەین خۆ وامان لێ کردن هەست بەگرنگی خۆیان بکەن!.

بۆیە دەبینی ئەندامی ڕێکخراوێك بەناوی هەموو حیزبەوە (تصریح) دەدات و دەڵێت ئەو بڕیارەمانداو فلان شتمان کرد! خۆ لەوانەیشە ڕایەکەی ئەم هەر قبوڵیش نەکرابێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە پرسی پێ کراوە!.

لەسەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا -خوا لێی ڕازی بێت- و لەجەنگی یەمامەدا لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا زۆر لەو موسوڵمانانە شەهید بوون کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو.. بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێت- کە وەزیری دەوڵەتەکەی بوو -هەستی بەم مەترسیە گەورەیە کردو لەپاشە ڕۆژی قورئان ترسا کە بفەوتێت و نەمێنێت! بۆیە بیری کردەوە لەوەی قورئان بنوسرێتەوە تا بەشەهیدبوونی هاوەڵان قورئان وەك خۆی بمێنێ و نەفەوتێت! بەڵام خۆ دەبێت خەلیفە قەناعەت بکات بەم بۆچوونە وەگەرنا جێبەجێ ناکرێت.

بۆیە عومەر ڕۆیشتە خزمەت خەلیفەو پێی گووت: ئەی گەورەی موسوڵمانان تۆ وا نابینی کە ئەوانەی قورئانیان لەبەرە زۆریان شەهید بوون، ئەبو بەکر فەرمووی بەڵێ وایە. عومەر فەرمووی: ئەی ئەمە مەترسی ئەوە نییە کە قورئان لەناو موسوڵماناندا کەم ببێتەوە و نەمێنێت؟ ئەبوبەکر فەرمووی: بەڵێ ترسم هەیە! عومەر فەرمووی: دەی من وا بەباش دەزانم قورئان بنووسرێتەوە و لەناو سنگەکانەوە بخرێتە سەر کاغەز!. ئەبوبەکر فەرمووی: خۆ ڕایەکی جوانە، بەڵام من چۆن شتێك بکەم (پێغەمبەر)ی خوا نەیکردبێت؟!..

عومـەر بـۆی دەرکـەوت ڕایەکـەی قبـوڵ ناکـات.. بۆیـە ویـستی باسـی سـوودو چاکیەکانی ئەم بۆچوونەی بۆ بکات تا بەڵکو ڕایەکە ببێتە ڕای ئەو! پاشان ماوەیەك مۆڵەتیدا تا بیر بکاتەوە لەو کارە مەزنە.

بەڵێ پاش چەندین ڕۆژ بۆی دەرکەوت ئەو بۆچوونە زۆر پێویستە بۆ پارێزگاری قورئان لەفەوتان و بوو بەبۆچوونی خۆی ئیتر عومەری بانگ کردو پێی وتن دەست بەکار بن.

تەماشاکە عومەر نەیووت: گەورەی موسوڵمانان ئەم کارە زۆر پێویستەو دەبێت هەر بیکەی ئەگینا تۆ دۆست و دڵسۆزی قورئان نیت و خەمی ناخۆیت!!

نەخێر بەڵکو وای لێ کرد هەمان بۆچوون بێتە بۆچوونی گەورەی موسوڵمانان..

## ڕێگای هەشتەم:

## ( دەستەواژەیەك شتی زۆرسەرسوڕهێنەرت دەست دەخات )

وا ڕێك دەکەوێت بەرامبەرەکەت هەڵە بێت، بەڵام ئەو هەرگیز دان بەهەڵەی خۆیدا نانێت، دامەبەزە سەری و سەرزەنشتی مەکە، -چونکە هونەری سەرزەنشتکردن هەموو گەوجێ ئەتوانێت پێی هەستێت، بەڵکو هەوڵ بدە تێی بگەیەنیت ئەمەش ئارامیەکی باشی دەوێت.. پاشان وردە وردە بۆت دەردەکەوێت کە هۆیەکی شاراوەی تێدایە وای لێ کردووە بەو جۆرە بیر بکاتەوە یان بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکات- هەرکاتێ ئەو هۆکارەت بۆ ئاشکرا بوو دڵنیابە کلیلی کەسایەتی ئەو مرۆڤەت دەست کەوتووە!.

زۆر دڵسۆزانە هەوڵ بدە ئەو لەجێگای خۆت دابنێیت بەخۆت بڵێ: (باشە چیم دەکردو چۆن بیرم دەکردەوە ئەگەر من لەجێگای ئەودا بوومایە؟) جا ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێت کە چۆن کاتێکی درێژت کورت کردۆتەوە و کارەکەت لەسەر خۆت ئاسان کردووە! سەرەڕای ئەوەش تۆ شارەزایی و کارامەییەکی باشت دەست دەکەوێت لەهونەری هەڵسوکەوت کردندا لەگەڵ خەڵکی.

(کنیس جودی) لەکتێبی (چۆن خەڵکی بگۆڕێن بۆ ئاڵتوون)(١)دا دەڵێت: (ساتێك هێواش بە، پاشان بەراوردێکی ورد بکە لەنێوان ئەو گرنگیدانەی بەخۆت و ئیش و کارەکانتی دەدەیت و نێوان گرنگی دانت بەئیش و کارەکانی خەڵکی تر، ئەوکاتە بۆت دەرکەوێت بێ کەم و زیاد هەموو کەسێك لەم ژیانەدا ئەم هەستەی تۆیان هەیە! کاتێ ئەمەت بۆ دەرکەوت ئەوکاتە هەڵئەکەویت لەهونەری پەیوەندی و هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤەکاندا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە سەرکەوتنی مرۆڤ لەهونەری هەڵسوکەوتکردندا، بەندە بەدوو شتەوە یەکەم تێگەشتنی تەواوی بۆچوونەکانی بەرامبەر، دووەم بەچاوی سۆزەوە بڕوانیتە بۆچوونەکانی)!.

من خۆم لەڕێگای گەڕان و پیاسەکانم بەناو سەیرانگەو جێگا گشتیەکاندا زۆر شارەزاییم سەبارەت بەسروشتی بەشەرەکان دەست کەوتووە، لەنزیکیماڵەکاندا

باخێك هەیە و منیش بەش بەحاڵی خۆم دار بەڕووم زۆر خۆش دەوێت بۆیە زۆر ناڕەحەت دەبم كاتێ دەبینم لەڕێگای جگەرە خۆرە كەمتەرخەمەكانەوە جار لەدوای جار ئاگریان تێ بەردەبێت و دەسوتێن و زۆر جاریش لەڕێگای ئەو منالّ و مێرد منداڵانە دەكەوێتەوە كە دەیانەوێت چاو لەئاگركردنەوەی باوباپیرانیان بكەن و لەژێر لق و پۆپی درەختەكاندا بەدارو چیلكە چێشتەكانیان لێ دەنێن!.

تابلۆیەك لەو باخەدا داكوتراوەو لێی نووسراوە (ئاگر كردنەوە قەدەغەیەو غەرامەی (٥٠)ریاڵی لەسەرە، بەڵام لەجێگایەكدا داكوترابوو كە كەم كەس دەیبینیو دەكەوتە بەرچاویان! ئەسپ سوارێكی پۆلیس دانرابوو بۆ ئاگاداری ئەو باخە، بەڵام ئەو كارەكەی بەتوندی نەگرتبوو زۆر گوێی بەو منالانە نەدەدا بۆیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەردەوام ئاگر دەكەوتەوە!.

جارێكیان ئاگرێك كەوتەوە منیش پێم زانی و بەهەڵە دەوان خۆم گەیاندە پۆلیسە ئەسپ سوارەكەو پێم ووت: ئاگر كەوتۆتەوە لەناو باخەكەدا بەڵكو بنێری بەدوای پیاوانی ئاگر كوژێنەوەدا؟ بەڵام زۆر بە بێتامی و وشكیەوە وەڵامی دامەوە كە: ببورە ئاگرەكە لەسنوری كاری مندا نەكەوتۆتەوە!.

بێ هیوایی ڕووی تێ كردم.. بۆیە پاش ئەو ڕووداوە بیرم لەوە كردەوە خۆم دەست بەكاربم و خۆم تەرخان بكەم بۆ ئەو مەبەستەو وەك ئەوەی لە (لیژنە)یەدا بم بۆ پارێزگاری لەبەرژەوەندیەكانی جەماوەر..!.

ڕاستیەكەی لەسەرەتاوە من گوێم بەحەزو ئارەزوو بیرو بۆچوونی منداڵەكان نەدەدا! چونكە هەر كە ئاگرەكەم دەبینی -چاوم دەپەڕیە تەوقی سەرم- و بەڕاكردن بەرەو سەرچاوەی ئاگرەكە دەڕۆیشتم، و لەمنداڵەكان زۆر تورە دە بووم و پێم دەوتن: ئەگەر بەزووترین كات نەیكوژێننەوە پۆلیستان بۆ بانگ دەكەم!.

بەڵێ لەبەر خاتری ئەو بارە قورسەی خستبوومە سەرشانی خۆم بەرامبەر كوژاندنەوەی ئاگرەكە گوێم بەهەست و نەستی منداڵەكان نەدەدا! دەی ئەنجامەكەی چی بوو؟

بەڕواڵەت بەگوێیان کردم، بەڵام ناوچاویان دابوو بەیەکدا وادەردەکەوت پاش پشت هەڵکردنم ئاگرەکەیان خۆش بکردایەتەوەو ئاواتەخوازیش بوون هەموو باخەکە بگرێتەوە!!

بەمروری زەمەن هەندێ شارەزاییم دەستکەوت دەربارەی سروشتی مرۆڤەکان لەگەڵ هەندێ وریایی و ژیریدا.. هەندێ حەزم تێ کەوت کە لەڕوانگەی بەرامبەرەکەمەوە بۆ شتەکان بڕوانم، لەوکاتەوە وازم لەفەرمان دەرکردن هێناوە.. بەڵکو لەباتی ئەمەدا بە ئەسپایی بەرەو منداڵەکان ڕۆیشتم و پێم دەگوتن:

(منالان وا دیارە سەیرانەکەتان زۆر خۆشە! ها چیتان لێناوە بۆ نیوەڕۆ؟ منیش کاتێ لەتەمەنی ئێوەدا بووم زۆر حەزم لەوە دەکرد چێشتەکەم بەچیلکەو دار لەژێر لق و پۆپی درەختەکاندا لێ بنایە! وە تا ئێستاش هەر حەزی لێ دەکەم.. بەڵام ئەزانن چ مەترسیەکی گەورە ڕوو دەکاتە ئەم دارستانە جوانە؟ خۆ من چاك دەزانم ئێوە نیازتان پاکە! بەڵام هەندێ منالی چەقاوە سور! وەك ئێوە دێن بۆ سەیران و ئاگر دەکەنەوە بەڵام پاش گەڕانەوەیان وەك ئێوە نایکوژێننەوەو ئاگرەکەش بەناو دارو درەختەکاندا تەشەنە دەکات و هەموو دارستانەکە دەگرێتەوە..

بەڵێ ئەم ئاگرەی ئێوە پێچەوانەی تا بلۆ هەڵواسراوەکەی ناو دارستانەکەیە بەڵام من نامەوێت ئەم خۆشیەتان لێ تێك بدەم و دەزگایەکی فەلاقەتان بۆ دابنێم! بەڵکو ئەوکاتە دڵخۆشم لەکاتێکی بەختەوەردا دەتانبینم!).

خوێنەری بەڕێز، ئایا چ جیاوازیەك بەدی دەکەیت لەنێوان ئەم شێوازەو شێوازەکەی پێشوودا، ئەم ڕەفتارەی دواییم وای لەمنالەکان کرد بەحەزی خۆیان گوێرایەڵم بن! دەم و چاویان سیمای ناڕازی و ئێسك تاڵی پێوە دیار نەبوو! چونکە بەشەق ملیان نەقەوچێنرابوویەوە بۆ ئەو کارە! ئابڕوویان بەتەواوەتی پارێزرا بوو، من زۆر هەستم بەحەوانەوە دەکردو هەروەها ئەوانیش، چونکە بەشێوازێك چارەسەری کێشەکەم کرد کە ڕێزیشم بۆ حەزو بۆچوونەکانی منداڵەکانیش دانا!..

سبەینێ پێش ئەوەی داوای ئاگرکوژاندنەوە لەکەسێك بکەیت یان زاهییەکت بۆ بکرێت یان داوای لێ دەکەیت هەندێ پارە ببەخشێت بەدەزگایەکی خێرخوازی،

بۆچی کەمی ڕاناوەستی و چاو بنوقێنی ئەوجا هەوڵ بدەیت هەڵویستەکە بەپێی بۆچوونی بەرامبەرەکەت پیشان بدەیت؟

لەخۆت بپرسە ئایا نیازی چییە وا بەو کارە هەڵدەستێت؟ بەڵێ ڕاستە ئەمە کاتی دەوێت بەڵام چەندان هاوڕێت دەست دەخات و بەکەمترین زیان لێکەوتن ئەنجامی باش و سەرسوڕهێنەرت دەست دەخات!.

(ونهام) عەمیدی کۆلیجی هارفاردی بازرگانی وتوویەتی: (من وابەباشتر دەزانم کە ماوەی چەندان کاتژمێر لەبەردەمی نووسینگەی کەسێکدا بووەستم و بێم و بچم پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە بۆلای، نەك ئەوەی کتوپڕ خۆم بکەم بەژووردا بەبێ ئەوەی ئەو بیروبۆچوونانەی دەمەوێ بیڵێم لەخەیاڵمدا ئامادەی نەکەم! یان تێبینی ئەو وەڵامانەبکەم کە لەوە دەچێت بمداتەوە!)..

ئەگەر تۆ لەم کتێبە تەنها یەك شت فێر بیت.. ئەویش ئەوەیە حەزێکی پڕ تاسەت تیا دروست ببێت لەڕێزگرتنی بۆچوونی بەرامبەرەکەت و سەیری مەسەلەکان لەگۆشەنیگای ئەوەوە سەیر بکەیت! ئەگەر ئەمەت کرد، دەی ئەمە زامنتە کە ببێتە بەردی بناغەی دروستکردنی دواڕۆژێکی سەرکەوتوو لەژیانتدا)!.

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت ڕابکێشی بەبێ ئەوەی دڵی ئازار بدەیت ئەوا بڕگەی ژمارە (٧) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

**(هەوڵ بدە لەڕوانگەی بەرامبەرەکەتەوە سەیری مەسەلەکان بکەیت).**

## پاشکۆی ڕێگای هەشتەم:
## (بیانوو بۆ کاری براکەت بدۆزەرەوە)

ئیسلام ئەیەوێت یەك شتی زۆر گرنگ فێری مرۆڤایەتی بکات ئەویش ئەوەیە چیت بۆ خۆت پێ خۆشە بۆ براکەشت پێت خۆش بێت.. دەی هەروەك خۆت کاتێك هەڵەیەك دەکەیت پێت خۆشە کەس پێتا هەڵنەشاخێ و نەتدەنە بەر دەستڕێژی لۆمەو سەرزەنشتی بێ تام، بەشێوازێکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی و ئەدەب پێت بڵێن, وایە؟ دەی خەڵکیش بەهەمان شێوە چونکە هەموو وەچەی یەك باوك و دایکین!.

کۆمەڵێ لەهاوەڵە شیرینەکانی (پێغەمبەر)مان (ﷺ) هاتن بۆ ماڵی عائیشە ووتیان باسی ڕەوشتی (پێغەمبەر)مان بۆ بکە لەگەڵ خواناسیەکەیدا؟ بەڵێ عائیشە بۆی باس کردن، بەڵام ئەوان زۆر بەکەمیان زانی ووتیان ئەو (پێغەمبەر) بووە ئێمە کەی دەگەینە ئەو؟

وەرن با ئێمە هەرگیز ژن نەهێنین و هەموو ڕۆژ بەڕۆژوو بین و شەوانیش بەردەوام شەونوێژ بکەین!!

خۆ (پێغەمبەر) دەیتوانی ئێمە ئاسایی ئەوەندە لۆمەو سەرزەنشتیان بکات و بڵێت دەی وەرن ئێوە دینمان فێر بکەن! جارێکی تر شتی وا بێت بەدەمتانا، ئەدەم لەملتان هەی بیدعەچیەکان!..

نەخێر ئەمە ڕەوشتی مامۆستای ڕەوشت بەرزان نییە، چونکە (پێغەمبەر) (ﷺ) زۆر مەبەستی بووە دڵی خەڵکی ڕاگیر بکات و ئاوی دەم و چاویان بپارێزێت.

بەڵکو بەسۆزێکی باوکانەوە نەرمە گلەییەکی ناڕاستەوخۆی لێ کردن و فەرمووی: من لەخواترسترین کەستانم و لەهەموو شتان زیاتر لێی دەترسم کەچی واش ناکەم کە ئێوە دەیڵێن! ژنیش دەهێنم! بەڕۆژوو دەبم و دەشی شکێنم! شەونوێژیش دەکەم دەشخەوم!

دەی -براینە-با من و تۆی قوتابی قوتابخانە بەرزەکەی ئیسلام هەر بەو چەشنە بین و کاتێ براکەمان بۆچوونێکی تری پێیەو ئێمە بەهەڵەی دەزانین، با خۆمان بەرینە ڕیزی ئەو بزانین ئەگەر ئێمە ئەو بۆچوونەمان هەبوایە -حەزمان دەکرد بە چ شێوازێك بمانگۆڕن؟ بەڵکو ناڕاستەوخۆ (پێغەمبەر) ئاسایی پێی بڵێین: من بۆچوونێکی ترم هەیە! من وا بەباش دەزانم! من خۆم بەجۆرێکی ترم!

ئەم دەستەواژانەی سەرەوە کەف و کوڵی توڕە بوونی بەرامبەرەکەت دادەمرکێنێتەوە و وای لێ دەکات گوێت بۆ بگرێت و دەست بخاتە ژێر چەناکەی و سەربلەقێنێ بۆت!.

مامۆستا سەعید نەورەسی -زانای پایەبەرزی کوردستانی تورکیا- بەڕەحمەت بێت جارێکیان لەگەڵ دەستەیەك لەقوتابیەکانیدا بۆ جێگایەك دەڕۆیشتن لەڕێگا قوتابیەکی بۆقێکی بەستەزمانی کوشت!! کاتێ مامۆستا نەورەسی ئاگادار کرا زۆر لەبەر دڵی گران بوو، لاوەکەی بانگ کردو پێی ووت: برای عەزیزم فەرموو دانیشە با پێکەوە لەو کارەی کردت بکۆڵینەوە بزانین کێ لەسەر هەقە؟

ئایا زیندەوەرە پەلاماری دایت؟ نەخێر، ئایا شتێکی لێ فڕاندیت؟ نەخێر، ئایا تۆ دروستت کردووە؟ نەخێر، ئایا تۆ ڕۆزی دەدەیت؟ ووتی: نەخێر، ئایا خوا بۆ ئەوە دروستی کردووە تا بیکوژیت؟ ووتی نەخێر مامۆستا گیان.. مامۆستا ووتی: دەی برای خۆم لەو گیاندارە ورد بەرەوە هەزار حیکمەتی خوا بەدی دەکەیت تیایدا، دەی با جارێکی تر دەستیان بۆ درێژ نەکەین!..

دەی برای خوێنەر -بیر بکەرەوە- ئەگەر -بدیع الزمان- وانەی دەروونناسی ئیسلامی نەزانیایە چی پێ دەووت: کێ کوشتوویەتی ئەو گیانلەبەرە بێ زیانە؟ دەك دەستی بشکێ! با بڕوات جارێکی تر لەگەڵماندا نەیەت قوتابی ئاوا؟

شایانی ئەوە نییە لەگەڵ کاروانی -نور-دا هەنگاو بنێت.. دەریکەن با بڕوات! ئایا ئەوکاتە دڵی ئەم لاوەی لەدەست نەدەداو نەفرینیشی لەو دەستەیەش نەدەکرد کە ئاوا ئابڕوویان برد لەسەر شتێکی کەم؟ بێگومان..

با بزانین لەمەیدانی سیاسەت و فەرمانڕەواییدا ئەم ڕێگایە دەوری هەیە؟ بەڵێ با پێکەوە بچینە خزمەت خەلافەتی ئیسلامی و سەیری ئەم نموونە بکەین:

-سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم- دواین خەلیفەی (ئالی عوسمان) بوو.. زۆر دڵنەرم و بەبەزەیی بووە لەگەڵ ژێردەستەکانیدا دڵی نەدەهات فەرمانی لەسێدارەدان دەر بکات! بەڵکو زیندانی، دەرکردن، دوورخستنەوە، گەورەترین سزای بووە تەنانەت ئەوانەشی کە هەوڵی کوشتن خۆیشیان دا هەموویانی ئازاد کرد پاش ئاشکرابوونی کودەتاکەیان!

کار گەشتە ئەوەی خەریك بوو دزو جەردەو تاوانباران ترسیان بشکێت و وڵات پڕ بکەن لەفەسادو دڵە لەرزەش بخەنە ناو موسوڵمانان، ئەمەیش هەڵەیەکە و سوڵتان خۆیشی دانی پێدا ناوە.

ئەوەبوو -شیخ الإسلام-ی ئەو سەردەمە دەچێت بۆ کۆشکی سوڵتان و پێی دەڵێت: (ئەی سەرداری موسوڵمانان بەڕاستی بەچاوێکی ڕێزو گەورەییەوە دەڕوانمە ئەم سۆزو نەرمی و میهرەبانیەتان بەرامبەر گەل و لەخواش داوا دەکەم زیاتر دڵنەرمتان بکات!. بەڵام قوربان ڕێزم هەیە بۆتان کاتێ دەڵێم ئەگەر پیاو کوژو جەردەو خراپەکار لەسێدارە نەدرێت ئەوا کەس شەرم لەم دەوڵەتە ئیسلامییە ناکات و خۆی لەسەرپێچی یاسا لانادات)!.

سوڵتان ئەمە دەبیستێ یەکسەر دان بەهەڵەی خۆیدا دەنێت و بۆ جوبرانی ئەو هەڵەیە هەر ئەو ڕۆژە فەرمانی لەسێدارەدانی خوێنڕێژێك دەردەکات و لەمەیدانی (بێشکەتاش) لەئەستەنبوڵ ملی دەکرێت بەپەتدا!.

ئەگەر شێخ الإسلام بەڕاستەوخۆ بیووتایە: تۆ کەی سوڵتانی! بۆ دڵت نایە کەس بکوژێت! ئەمە لادانە لە (قصاص)ی ئیسلامی و ڕێبازی (ئالی عوسمانت) پێشێل کردووە! ئایا سوڵتان بە قسەی دەکرد؟ بێگومان نەك هەر نەخێر بەڵکو بەپشتەملەش لەکۆشك دەکرایە دەرەوە..

کەواتە هەر لەسەرەتای وتووێژەکەوە مەدە لەوەتەری حەساسی بەرامبەرەکەت و تورەی مەکە تا گوێت لێنەگرێت ئەمەش لەوەوە ڕوو دەدات کە شارەزاییمان نییەلەحاڵ و بیروبۆچوونەکانی بەرامبەرەکانمان.

کەسێك هەیە –لەدەوروبەرێکی ناحاڵی لەئیسلامدا ژیاوە–و نازانێ مانای تەواوی موسوڵمانەتی چییە! بەڵکو وایان تێ گەیاندووە کە ئەگەر نوێژو ڕۆژوو بگرێت ئەوە موسوڵمانە ئیتر با لەحیزبێکی دوور لە دینیشدا بێت و عەلمانی بێت! یان ئافرەتەکە وا تێ گەیەنراوەئەگەر نوێژو ڕۆژو بگرێت ئیتر قەیناکا سەرو مل و باڵی ڕووت بێت!!..

بێگومان ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەو دەبێت مرۆڤ بەتەواوەتی گوێرایەڵی خوای پەروەردگار بێت نەك نیوە چڵی! بەڵام کەسێك دەڕواتە لایان و پێیان دەڵێت: جا تو خوا پێم ناڵێن نوێژی چی دەکەن، تۆ بیرو باوەڕی کوفرت هەڵگرتووە! یان تۆ ئایەتی حیجاب بەدرۆ دەخەیتەوەو ئیشی پێ ناکەیت کەواتە موسوڵمانێتیت وەرناگیرێ وەك بەرازی دەم بەسراو ڕۆژوو دەگریت؟!!.

بەڵام کەسێکی دڵسۆزو ژیر بەحەکیمانە دێتە لایان و دەڵێت من زۆر خۆشحاڵم کە تۆ نوێژ دەکەیت و ڕۆژووش دەگریت ئەمە بەڵگەیە لەسەر فیترەتی پاکت و باوەڕی بتەوت بەخواو ئەم ئایینە پاکە!.. بەڵام پێم خۆشە پێکەوە دیراسەی ئیسلام بکەین و وردە وردە لێی حاڵی ببین ( إن شاء الله) !..

ئەم باسەی ئێمە زۆر دژی ئەو بیرۆکە سیس و لاوازەیە کە هەندێ موسوڵمان گرتوویانەبەر کە دەڵێت: (قل كلمتك وامش) ووشەی هەق بگەینە ئیتر وەری دەگرن یان نا (ما على الرسول الا البلاغ) گرنگ نییە تۆ بەس بیگەیەنە ئەم هەڵەیەش وا دەزانم کۆمەڵەی (التبليغ) تێی کەوتووە و هەندێ بانگخوازی لای خۆشمان لەم حاڵەتەدا دەژین باوەڕیان بەکاری جەماعی نییە بەڵکو وا دەزانن کاری ئیسلام بەوتارێکی هەینی یان وتارێکی پرسە تەواو دەبێت..

## ڕێگای نۆیەم:
## (ئەو شتەی هەموو کەسێك دەیەوێت)

ئایا ئەتەوێت دەستەواژەیەکی ئەفسوناویت پێ بڵێم کە صافی و بێگەردی و دور لەلێڵی دانیشتنەکەتان بپارێزێت و گیانی لەخۆ بوردن باڵ بکێشێ بەسەریداو واش بکات لەبەرامبەرەکەت بەوردی گوێت بۆ شل بکات؟.

ئا ئەمەیە: بەبەرامبەرەکەت بڵێ: (من ئەوەندەی مسقاڵە زەڕەیەك سەر زەنشتت ناکەم لەسەر ئەم بۆچوونەو ئەو بۆچوونەت چونکە ئەگەر منیش لەو جێگایەی تۆ بوومایە هەر هەمان بۆ چوون و هەمان هەڵوێستم دەبوو!).

دەستەواژەیەکی ئا بەو جۆرە بەسە کە توندترین و گێل ترین و دەمەقاڵەکەرترین کەس هێمن بکاتەوە! وە بۆشت هەیە ئەم دەستەواژەیە لەهەموو دڵێکتەوە و بەدڵسۆزی دەری ببڕیت کە ئەگەر تۆ لەجێگای ئەو بوویتایە وات ئەکرد..

دەفەرموو با یەك نموونەت بۆ بهێنمەوە: (ئال کابوونی) پیس ترین تاوانبار، وا دابنێ تۆ لەجێگای ئەودا بوویتایە ئەو لەش و دەماغە بەتۆوە بوایە، واش دابنێ کە تۆش هەمان دەوروبەرو هەمان تاقیکردنەوەت ببوایە پڕاوپڕ وەك ئەو دەرنەدەچوویت؟!.

ئەو حاڵەتە چاکەی تۆی تێدایە -ئێستاکە- ئازایەتی خۆت نییە مەگەر کەمێکی نەبێت! دەی با ئەمەت زۆر چاك لەیاد بێت دەبا لەبیرت بێت کە ئەو کەسەی بەتوڕەیی و مۆنی و قیرە قیڕەوە دێتە لات و فوی کردۆتە خۆی، شایانی ئەو سەرزنشتەو لۆمە بارانە نییە کە پێی دەکەیت، بەڵکو شایانی خەفەت بۆ خواردن و شیوەن بۆ کردنە! چونکە ئەو حاڵەی ئەو تێیدایە هیچ ئازایەتیەکی خۆی تێدا نییە، کەواتە بەزەییت پێیدا بێتەوە و بیانووی بۆ بهێنەرەوەو بەهەستێکی بەرزو ڕەوشتێکی پاکەوە بەرامبەری بووەستە.

(٣-٤)ی ئەو کەسانەی سبەینێ تۆ پێیان دەگەیت، پێویستیان بەسۆزو ڕێز لێنانی تۆیە، دەی تۆش -بەخیل- مەبەو ئەو تینوێتیانەیان بشکێنەو ئەوانیش لەپاداشتیدا دڵیان دەبەخشن پێت!.

جارێك لەڕادیۆدا وتارێکم بڵاو کردەوە دەربارەی (لویزامای ئەلکوت) نووسەری کتێبی (ئافرەتە بچوکەکان)(١). بێگومان من دڵنیابووم لەوەی کە ئەم ئافرەتە لە (کونکورد)ی سەر بەویلایەتی (ماساشوستس) دەژی و هەموو شاکارە نەمرەکانی لەوێ نووسیوە! بەڵام من لەوتارەکەمدا باسی ئەوەم کرد کە خۆم چوومەتە ماڵەکەی لەکونکوردی سەر بەویلایەتی (نیوهام بشیر)! ئەگەر ئەم هەڵەیەم یەکجار بکردایە باش بوو، بەڵام نەگبەتی لەوەدابوو دوو جار (وشەی نیوهام بەشیریم بەکار هێنا!).

هەر ئەوەندەم زانی یەك لافاو نامە و تەلەفونی گاڵتەجاڕی باری بەسەرمدا! کە ڕستەکانیان وەك زەردەواڵە بەلای گوێمدا دەیگیزاند! زۆربەیان ناڕەزاییان دەربڕی بوو بەلای کەمەوە نەرم ترینیان هەستی پیاوی بریندار دەکرد!

یەکێ لەو نامانە لەئافرەتێکەوە هاتبوو لە -کونکورد-ی سەر بەولایەتی ماساشوسش) دەژیا، چۆن نامەیەك؟! جامی توڕە بوونی خۆی ڕشتبوو بەسەرمدا، سوێندم بەخوا ئەگەر بشمووتایە (الکوت) خەڵکی غینیایی تازەیە لەگۆشتی مرۆڤ خۆرەکانە، لەوە خراپتری پیێ نەدەگوتم!

هەر کەنامەکەم خوێندەوە خۆم بۆ پیێ نەگیراو لەتوڕەبووندا وتم سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم ئافرەتەی نەکردۆتە ژنم!. لەوکاتەدا زۆر حەزم دەکرد وەڵامی بدەمەوەو بڵێم: ڕاستە من هەڵەیەکی جوگرافیم کرد بەڵام تۆ هەڵەیەکی گەورە ترت کرد لەنەزانینی شێوازی قسەدا!

خەریك بوو نامەکە بەو ڕستەیەی سەرەوە دەست پێ بکەم و قۆڵی لێ هەڵبکەم و دەست بکەم بەتوانج تێکرتنی و کەمێ بەگاڵتە جاڕی پێی ڕابوێرم بەڵام وام نەکرد، پاش دامرکانەوەی توڕە بوونەکەم بۆم دەرکەوت هەموو گەوجێك دەتوانێت پێی هەستێت زۆربەی گەوجان پێی هەڵدەستن و منیش ویستم خۆم لەپێڕی گەوجان

بەرزتر بگرم، نیازم کرد ئەو دووژمنایەتییە سەختەی بگۆڕم بۆ دۆستایەتیەکی بەتین! -کە ئەمەش لەلای من- جۆرێکە لەوەرزشە ئەدەبییە سود بەخشەکان.

کاتێ چووم بۆ فیلادلفیا -پاش ڕووداوەکە- بۆ ماڵی ئەو خانمە، بە تەلەفوون وەرم گرت و ئەم گفتوگۆیە کەوتە نێوانمان و ووتم (مستر..) بەڕێزتان پێش چەند هەفتەیەك نامەکەتان بۆ ناردووم و دەمەوێت سوپاست بکەم! ئەویش بەشێوازێکی پڕ لە ڕۆشنبیرییەوە ووتی: تۆ کێی وا من بەختەوەرم بەقسەکردن لەگەڵیدا!؟.

ووتم: من زۆر غەریبم بەئێوە، ناوم (دیل کارنیجی)یەو بێگومان گوێتان لەبەر ناکەمەم گرتووە دەربارەی ژیاننامەکە (الکوت) قسەم کردوو، و تیایدا هەڵەیەکی زەبەلاحی وام کرد شایانی لێ بوردن نییە! هەڵەیەکی زۆر گەوجانە بوو کەووتم (الکوت)، خەڵکی نیوهامبشیرەو داوای لێبوردن دەکەم لەبەڕێزتان! وە زۆر جوان و جێگای خۆی بوو ئەگەر لەکاتی بەڕێزتان بگرم و پێکەوە ئەو هەڵەیە ڕاست کەینەوە!؟.

ئەویش ووتی: داوای لێبوردنت لێ دەکەم مامۆستا دیل کە بەو چەشنەو بەتوندوتیژی نامەکەم بۆ نووسیت بەدەستخۆم نەبوو خۆم پێ نەگیرا من قەرزاری لێبوردنی تۆم!

ووتم: نەخێر من داوای لێبوردن دەکەم چونکە من هەڵەیەکی وام کرد کە منداڵێکی قۆناغی سەرەتاییش هەڵەی واناکات! هەرچەندە من یەك شەممەی ڕابوردوو پۆزشم بۆ گوێگران هێنایەوە.. ووتی: مامۆستاگیان ئەم خێزانەی ئێمە بۆ نزیکەی دوو سەدەیە لە-کونکورد-دا دەژین و لەبنەماڵە ناودارەکانی ئەم ناوچەیەین و من زۆر شانازی بەو ویلایەتەوە دەکەم کە تیایدا گەورە بووم، زۆر زۆر تێکچووم کە (الکوت)تان کرد بەخەڵکی نیو هامبەشیر! بەڵام من ئێستا پڕ بەدڵ هەست بەخەجاڵەتی دەکەم لەوەی بۆم نووسیت!.

پاشان ووتم: ئەو توڕە بوونەی تۆ دەیەکی توڕە بوونەکەی من نەبوو، چونکە ئەم هەڵەیە ئەوەندەی ئازاری منی داوە باوەڕ ناکەم ئەوەندە ئازاری (ماساشوستس)ی دابێت!

خۆزگە هەموو ئەو ڕۆشنبیرو پلەو پایەدارەکانیش وەك تۆ کاتیان هەبوایە و هەڵەی کەسانێکی وەك منیان ڕاست کردایەتەوە! چەند بەختەوەر دەبم کاتێك کە لەئێزگەکەوە هەڵەیەکم بکردایە یەکسەر تۆ ڕاستت بکردمایەتەوە!

ووتی: بەڕاستی من سەرسامی ئەو دڵفراوانییەی ئێوەم کە ئا بەو چەشنە ڕەخنە قبوڵ دەکەن، وا دیارە مرۆڤێکی زۆر نەرم و بەسۆزی بۆیە حەز دەکەم زیاتر لەنزیکەوە بتناسم!

لەو کارەمدا بەبەردێك کۆمەڵێك نیشانەم پێکا: لەوانە ئەو خانمەم وا لێ کرد داوای لێبوردنم لێ بکات و ڕێزیش لەبۆچوونەکانم بنێت! هەروەها وام لێهات لەخۆم ڕازی بم کە ئەتوانم پاداشتی خراپە بەچاکە بدەمەوە! هەروەها هەستم بەخۆشی و شادی دەکرد کاتێ کە باسی نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی منی دەکرد!.

(س.هوروك) ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق بەڕێوەبەری بەرهەمەکانی هونەرمەندانی وەك (شالیابن) و (ئیزادروا دتکان)، (بافلوفا) بوو، مستر هوروك خۆی بۆی باس کردم و ووتی: باشترین دەرسێك وەرم گرتبێت لەماوەی ژیانمدا لەگەڵ ئەو هونەرمەندە هەست ناسکانەدا، ئەوەیە کە زۆر پێویستە نەرمی بنوێنیت لەڕوویانداو سۆزو ئەوین ببارێنیت بەسەریاندا!.

ئەم بەڕێوەبەرە سێ ساڵ بەڕێوەبەری بەرهەمەکانی (تیودور شالیا بن) بوو ئەو گۆرانی بێژەی کە توانی لەیانەکانی (ألترو بولینان)دا دڵی جەماوەری ئەمەریکی بۆخۆی کەمەندکێش بکات.. دەڵێ هەرگیز لەژیانمدا ناز و نوك کەری وەك شالیا بنم نەدیوە کە بەڕاستی پارچەیەك بوو لەدۆزەخ)!!.

بۆ نموونە، جارێکیان شالیابن لەدوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو ئاهەنگێکی گۆرانی ساز بکات، لەناکاو تەلەفونی کرد بۆ (هوروك) ووتی: بەتەمای مەبن من ئەمڕۆ قوڕگم ئێش دەکات! گەرووم وەك تەختە وشك بووە، مەحاڵە ئەمشەو بتوانم گۆرانی بڵێم!.

ئایا مستر (هوروك) دەستی کرد بەدەمەقاڵەو شەڕە قسە لەگەڵیدا؟ نەخێر بەڵکوو خێرا خۆی گەیاندە لای لەئوتێلەکەو بەشێوازێکی سۆزو میهرەبانیەوە پێی ووت: (زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەتم بۆت ئەی هاوڕێ داماوەکەم!).

وە بێگومـان ئـەم شـەو نابێـت گـۆرانی بڵێیـت! هـەر ئێـستا ئـەم ئاهەنگـە هەڵئەوەشێنمەوە.. ڕاستە تۆ دوو هەزار ریـال لەدەسـت دەدەیـت، بەڵام ئەم زیانـە ناگاتە ئەو زیانەی لەشورەت و دەنگە زوڵاڵەکەت دەکەوێت!

شـالیابن لەخۆشی ئەم قسانەدا هەناسەیەکی خۆشی هەڵمـژی ووتـی: بەچاکی دەزانم دوای نیوەڕۆ سەرێکی ترم لێبدەیتەوە لەوانەیە بەرەوباشی بڕۆم!!.

کاتـژمێر (٥)ی ئێـوارە خـۆی گەیاندەوە لای و بەشێوازێك کە سۆزی لێ دەبـاری، بۆی دووپات کردەوە کە هەر سوورە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئاهەنگەکە!

شالیابن سەرلەنوێ خۆی گیڤ کردەوەو ووتی، بەڵکو کاتژمێر (٧) سەرێکی تـرم لێ بدەیتـەوە؟ کاتـژمێر (٥،٧) ئەم گۆرانی بێژە جیهانییـە ئامـادە دەبێت ئاهەنگەکە ساز بکـات، بـەڵام بەمـەرجێك لـەپێش ئـەوەی خـۆی بـچێتە سـەر تەختـەی شـانۆکە (مـستر هـۆروك) بەجـەماوەر ڕابگەیـەنێت کـە شـالیابن سـەرمایەکی پیـسی بـووە و ناتوانێت گۆرانی بڵێت و ناساغە!! ئەوکاتە هوروك بەدرۆ دەخرێتـەوە.. هـۆروك ئەم مەرجەی بۆجێبەجێ کردا.

دوکتـــور (ئارســـەر جیـــنس) لەکتێبـــە نایەبەکەیـــدا بـــەناوی (دەروونناســـی پەروەردەیی)دا دەڵێت:

(ڕەگـەزی ئـادەمی بەگـشتی هەڵپـەی دێ بـۆ سـۆز، منـداڵ کاتێـك ئـازارێکی پـێ دەگات هەوڵ دەدات دەری بخات تا گرنگی پێ بدرێت و سۆزی لەگەڵدا بنوێنرێت، بــەڵکو جـاری واش هەیــە خــۆی تووشــی ناڕەحــەتی و ئــازار دەکــات بــەهیوای دەستخستنی سۆزو بەزەیی چواردەوری!

تەنانـەت مێـرد منداڵـەکانیش –بـالغین– لێـرەو لـەوێ باسـی ئـەو ناڕەحەتیەیانـە دەکەن کە بەسەریان هاتووە، و نەخۆشیەکەی لێرەو لەوێ باس دەکاتـەوەو بەگوڕو تینەوە نەشتەرگەریەکەی بۆ ئامادەبوان دەگێڕێتەوە تا سۆزو بەزەییان پێدا بێتەوە!

دەربڕینی سۆزو میهرەبانی بەرامبەر ئەو ناڕەحەتیانەی دێن بەسەر مرۆڤدا –ئیتر با ئەو ئازارەی هەبێت یان هەر خەیاڵی بێت– شتێکی زۆر بلاوەو کەس لێی بێ بەش نییە!

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بۆلای بۆچوونەکانت ڕابکێشیت بڕگەی ژمارە (٩)جێبەجێ بکە:

**(ڕێز دابنێ بۆ بۆچوونی بەرامبەرەکەت و سۆزو میهرەبانی بەرامبەر حەزەکانی بنوێنە).**

## پاشكۆی ڕێگای نۆیەم:
## (نەفرین لەتاریكی مەكە بۆت كرا چرایەكی تیا هەڵكە)

لەئیسلامدا شوێنكەوتوان -حاڵی دەكرێن كە ئەو ڕەوشت بەرزی و هیدایەت و چاكەخوازیەی گرتوویانەتە بەر- نابێت زۆر خۆیان پێوە هەڵبنێن و منەت بەسەر خوداو بەندەكانییەوە بكەن وەك قورئان دەفەرمووێت: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ (١)(الحجران ١٧).

بۆیە دەبێت بانگخوازان زۆر بەسۆزو میهرەبان بن لەگەڵ مرۆڤە سەرگەردانەكانداو بەزەییان بێتەوە پیایانداو هەوڵ بدەن لەئاگری بڵێسەداری جەهەننەم ڕزگاریان بكەن نەك گاڵتەیان پێ بكەن و بیرو بۆچوونەكانیان -پف- لێبكەن و وایان لێ بكەن -باطل-ەكەیان لەلا خۆشەویست بێت و وازی لێ نەهێنن.. ئەمە زۆر گرنگەو ئەگەر-داعی- ئەمەی لەیاد بچێت میللەتی سەرگەردان دوو ئەوەندەی تر سەرگەردان دەكات.

هەروەها نابێت قێز لەدوور لەخواو ڕەوشت نزمەكان بكەنەوەو بەدڕندەو بەدئەخلاق و كافر بیاندەن لەقەڵەم و بەگڵاویان بزانن و لێیان نزیك نەبنەوە، یان خۆیان هەڵنێن بەسەریانداو كەشخەییان بەسەرەوە بكەن.. بەڵكو لێیان نزیك ببنەوە و هاوڕێیەتیان بكەن، بەڵام بەمەبەستی ڕێنموونی و قسەی خێر كردن بۆیان.. ئەگەر پاش ماوەیەكی درێژ قسە سودی نەبوو لەگەڵیدا و خوای گەورە مۆری ڕەشی دابوو لەدڵی! ئەوا بەشێوەیەكی جوان لێی بكشێتەوەو كاتی لەگەڵدا نەكوژێت و (ولاء)ی خۆی لێ بسەنێتەوە.

بۆیە خوای گەورە پێیان دەفەرموێت ئێوەش گومڕا بوون خوا دەری هێنان لەزۆنگاوی گومڕایی و كوفر ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ (النساء ٩٤)!!

هەر ئەمەشە وای كردووە لە(پێغەمبەر)مان ﷺ بەچاوی سۆزەوە بڕوانێتە بەرامبەرە كافرەكانیشی و دووعای هیدایەتیان بۆ بكات وەك دەفەرموێت: (اللهم اهد قومي فانهم لا يعلمون)!

ئەم جارە تاوانبارو باوەڕ لاوازێکت بینی، یان خوشکێکی موسوڵمانی سفورت بینی.. نەفرینی خوای لێ مەکە بەڵکو بەچاوێکی سۆزەوە بۆی بڕوانە، وە بشزانە کە ئەو جەوە پاکەی بۆتۆ هەڵکەوتووە و ئەو مامۆستا دڵسۆزەی خەریکی تۆ بووە و لەئیسلامی بێ گەرد حاڵی کردوویت بۆ ئەویش هەڵبکەوتایە ئێستا ئەویش لەناو گوڵزاری قورئاندا –وەك تۆ– گوزەری دەکرد!.

یان ئەگەر ئەو جەوەی بۆ ئەو کەسە هەڵکەوتووە تیایدا خوای لەبیر براوەتەوە یان حیشمەت و پۆشتەیی تێدا عەیبە بووبێت.. بۆتۆش هەڵبکەوتایە و تیایدا گەورە ببویتایە.. ئێستا تۆش گاڵتەت بەمزگەوت و ریش و سیواك دەکرد! یان –ئەگەر ئافرەتیت– ئێستا تۆش دەتگوت: چۆن ئەم ئیسلامیانە لەناو ئەم حیجابەدا ناتەقن ,ویش! وەڵلا ڕۆژێ دەرمان نەکەم خۆم بەمرۆڤ نازانم!!..

من لەو باوەڕەدام –کە ئەو کەش و هەواو دەوروبەرە بۆگەنەی بۆ (عبد الحلیم حافظ) دروست بوو کە ئەو دەنگە خۆشەی– کە ماوەی چارەکە سەدەیەك عەرەبی سەرسام کردبوو– بە گۆرانی بێ تام و مێ بازی.. هەمان کەش و هەوا بۆ (عبد الباسط عبد الصمد)هەڵبکەوتایە ئەوا قورئان خوێن دەر نەدەچوو، بەڵکو لەئاسمانی هونەری دابەزیوو( الغن الهباط ) دا–ئەستێرەی خۆی بەدی–دەکرد!.

پیاوێك زۆر غەیبەتی (حسن البصری)دەکرد –خوا لێی ڕازی بێت.. حسن البصری زۆر بەزەیی پیادا هاتەوەو هەستاو سینیەك شیرینی بەدیاری بۆ برد..

پێی ووت: تۆ بەغەیبەت کردن– چاکەکانی خۆتت بەمن دەدەیت منیش سوپاست دەکەم و ئەم دیاریەم بۆ هێناویت لەپاداشتیدا.. کابرا شەرم گرتی و پەشیمانی دەربڕی و وازی لەغەیبەت هێنا بەیەکجاری!.

ئەو ئافرەتەی سفورەو پۆشتە نییە، سەرو مل و باڵ و قاچی دەرخستووە بۆ پیاوان! بەهەشت و بۆنی بەهەشتیش لەدوورەوە ناکەن! نابێ ئەم قسەیەی پێ بگوترێت بەزەقی: تۆ بەنەصی فەرموودە: دەچیتە ناو جەهەننەم! تۆ بێ ڕەوشتی.. تۆ کڕیار بۆخۆت ڕادەکێشی! نا..نا ئەمانە هیچیان شێوازی ژیرانەی بانگخوازان

نین، بەڵکو هەوڵ بدەیت خوای لەلا خۆشەویست بکەیت پاشان بەقسە دەکات و لەزۆنگاوی سفوری خۆی ڕزگار دەکات:

سەیری ئەم نموونەیە بکە کە بەسەر خۆم هاتووە.. لەسەرەتای ساڵەکانی نەوەدەوە لە-دواناوەندی هەڵەبجەی کچان- بەمامۆستا دامەزرام.. وانەی (پەروەردەی ئیسلامیم دەگوتەوە -لەگەڵ زمانی عەرەبیدا- کاتێ باسی ئیسلامم بۆ کچەکان دەکرد هەستم دەکرد زۆر بەپەرۆشەوە گوێم بۆ دەگرن و تەنانەت ئەگەر زەنگی پشووشی لێ بدایە ئەیان ووت توخوا مامۆستا مەڕۆ، قسەکانت تەواو بکە بۆمان!!

بەڵام لەبەرامبەردا هەندێ لەو قوتابیانەی کە وەك ووتم کەش و هەوای بۆگەنی دەوروبەریان لەئیسلام دووری خستبوونەوەو کەس و کاریان هەڵگری تولەڕێی عەلمانیەکان بوون زۆر قاڵس بوون بەدەرسەکەم و لەناو قوتابیەکاندا زەمی منیان دەکرد -منیش پێم دەگەیشتەوە- کە دەیگوت: ئیسلام ئێجگار واش نییەو بەو ڕەقی و وشکییەی مامۆستا عومەر باسی دەکات.. وادەزانێ ئەوەی سەرپۆش و حیجابی لەبەردا نەبێت کافر بووە و دەچێتە جەهەننەم!.

لەسەرەتاوە ویستم -بانگی بکەم بۆ ئیدارەو لەبەردەم مامۆستاو بەڕێوەبەردا- لێی توڕە ببم و بیشکێنم-بەڵام ئەمە ڕێنموونی قورئان و کارێکی پەروەردەیی نەبوو- هەرچەندە هەندێ مامۆستای -عەوام- بۆخۆهەڵنان و دەرخستنی دەسەڵاتی خۆی پەنا بۆ ئەم کارە دەبات، بەڵام من مەبەستم بوو دڵی ئەو خوشکانە ڕاگیر بکەم تا بەڵکو خوای گەورە نوری هیدایەت بباتە دڵیانەوە -هەرچەندە ئێستا زۆربەی زۆریان سوپاس بۆخوا- پۆشتەن و قوتابی قورئانن.

بۆیە لەساحەکەدا یەکێ لەو خوشکانەم بانگ کردو هەندێ وەصفی ئەدەب و زیرەکی و ڕەوشت بەرزیم کرد و سوپاسی هەستی ناسکیم کرد!! -زۆر خۆشحاڵ بوو- وە پێم ووت ڕێزت لەلام لەڕێزی هەندێ حیجاب لەبەر زیاترە! چونکە هەندێکیان نازانن بۆچی و بۆکێ حیجابیان کردووە، من بیستوومە تۆ لەماڵەوە

لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندا نوێژی سوننەتیش دەکەیت وایە؟ ووتی: بەڵێ ماموستا گیان!

ووتم: ئەم ڕەمەزانەش بینیم بەردەوام بەڕۆژوو بوویت؟ ووتی: بەڵێ هیچم لێ نەخواردووە! ووتم: بەوەی کە لەپۆلدا قورئان زۆر جوان دەخوێنیتەوە بۆم وا دیارە لەماڵەوەش قورئان دەور دەکەیتەوە؟ ووتی: بەڵێ هەموو دوای نوێژی بەیانیانێك ناخەومەوە قورئان دەخوێنم!!.

پێم گووت: لەلای من هەر بەوەی تۆ حیجابت لەبەردا نییە -کە إن شاء الله ڕۆژێ هەردێ لەبەری بکەیت! وە من لەزۆر حیجاب لەبەر زیاتر ڕێزی تۆم لەلایە..

ئەو خوشکە لەخۆشیدا نەیدەزانی چی بکات هەرئەوەندەی پێکرا ووتی: ماموستا (...) لێمان بوورە بەهەڵە لەتۆ گەیشتبووم!! بۆ مەسەلە -حیجابیش- پەلە ناکەم بیرێکی لێ دەکەمەوە بزانم چۆن دەبێت!

دەی خوێنەری ئازیز من بەم کارەم چ زیانێکم کرد؟ چیم لێ کەم بوویەوە؟ بەڵێ ئەوەم زەرەر کرد نەفسی سەرکەشی خۆم شکاند کە حەزی دەکرد ئەو قوتابییە بشکێنم و تەریقی کەمەوە!! بەلام توانیم خۆم بگرم و تۆڵەی خرابە بەچاکە بدەمەوە..

لەلایەکی ترەوە چەند سوودێکم وەرگرت لەوانە: خوای گەورە لەسەر دەستی مندا هیدایەتی ئەو خوشکەی داو ئێستا موحاجەبەیەو لەلایەنێکی ئیسلامییە لەم کوردستانەدا[٤] وخزمەتی قورئانی پیرۆز دەکات سوپاس بۆ خوا.

خۆ ئەگەر واشی لێ نەهاتایە من هەر ئەوەم دەست دەکەوت کە ئەم قوتابییە لەپۆلدا زەمم نەکات و لەم لاولا نەم شکێنێ!

یان ئەوەم دەست کەوت: کە کارێکی وام نەکرد ئەم خوشکە لەداخی من وازیشی لەنوێژو ڕۆژووەکانیشی بهێنایە بەیەکجاری.

کەواتە با بزانین هەموو توڕە بوون و نەفرین باراندنی دونیا هەیە هەر هەمووی توانای دەنکە شقارتەیەکیان نییە لەڕووناک کردنەوەی دەوروبەردا، بۆیە مامۆستا حسن البنا ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت (لا تلعنوا الظلام واوقدوا الشموع)..نەفرین لە تاریکی مە کە بۆت کرا مۆمێکی تیا هەڵبکە .

## ڕێگای دەیەم:
## (هاوارێك دەست دەگرێت بەسەر دڵی هەموو کەسێکدا)

لەسەر سنوری شارەکەی (جیسی جیمس) بووم کە ئەو پیاوە ناوبانگی دەرکردووە بە (دزی پاك) یان (دزی نیاز پاك) کە شورەتی هەموو دنیای گرتەوە!

منیش زۆرجار سەردانی ئەو کێڵگەیەم دەکرد کە -جیمس- خاوەنیبوو- کە کوڕەکەی تا ئەمڕۆش لەژیاندایە- بە وردی گوێم دەگرت بۆ ژنەکەی بەسەرهاتی پاڵەوانێتیەکانی هاوسەرەکەی بۆ باس دەکردم کە لەپێناوی هەژارو نەدارانـدا! بەسەری هاتوون و وەچۆن چەندان جار گیانی کەوتۆتە خەتەرەوە لەکاتی دەستگرتن بەسەر شەمەندەفەر یان بانکێکدا ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە بوو ئەو پارانە دابەش بکات بەسەر جوتیارو پاڵەو کرێکارە دەست کورتەکاندا تا قەرزەکانیان پێ ببژێرن.

گومانی تێدا نییە کە (جیسی جیمس) لەقوڵایی دەروونییەوە ئەوە چەسپا بوو کە پیاوێکی پاك و نموونەییە! هەروەك چۆن -بێ زیادو کەم- پیاوانی وەك (شوڵتزو دەبل دەمانچەو ئال کابوونی)یش دوو (نەوە) دوای ئەو هاتن و هەمان باوەڕیان هەبوو.

جا بۆنا؟! هەرکەسێ تۆ پێی دەگەیت -تەنانەت ئەو کەسەشی لەئاوێنەدا بەرامبەرت وەستاوە کە خۆتی- ڕێزێکی زۆر گەورە بۆخۆی دادەنێت! هەروەك حەزیشی لەوەیە کە پێی بڵێن: دوورە لەخۆپەرستی و (من من)و خۆ ئەوینی!!.

ئەگەر دەتەوێت ڕەوشتی خەڵکی بگۆڕیت، پێویستە لەسەرت هەموو هۆکارێکی پاك و دروست بگریتەبەر تا کار لەدەروونیان بکەیت، ئایا تۆ وا دەزانیت ئەمە شتێکی نارەحەتەو لەژیانی ڕۆژانەدا جێبەجێ ناکرێت؟ فەرموو با ببینین:

خاوەنی کۆمپانیای (فاریل مەشتل) لە (جلنولدن)ی ولایەتی (بنسلفانیا) ناوی (هاملتون فاریل) بوو.. ئەم پیاوە کرێچییەکی زۆر لاوی هەبوو، کە بەینە نا بەینێ( فاریلی ) بەوە دەتۆقاند کە خانووەکە چۆڵ دەکەم و (عقد)ەکەش هەڵئەوەشێنمەوە!

ئەوەبوو ڕۆژێکیان فاریلی ئاگادار کردەوە کە نیازی چۆڵ کردنی خانووەکەی هەیەو عەقدەکەش کە چوار مانگی مابوو تەواو ببێت هەڵی ئەوەشێنێتەوە!.

مستر (فاریل) بەسەرهاتەکەی لەبەردەمی پۆلدا گێڕایەوە بۆ قوتابیەکانم و ووتی: (ئەم کرێچییەم لەوەرزی زستانی تەڕو توشدا کە خانوو دەست ناکەوێت خانووەکەی چۆڵ نەکردم و تیایدا مایەوە. وە من لام ڕوون بوو کە ئەگەر چۆڵی بکات تا زستانی داهاتوو یەك کەس نایەتە ناوی و ئەشم هێنایە خەیاڵی خۆم کە خانوەکەم چۆڵ دەبێت (١٢٠) ڕیاڵم لەدەست دەردەچێت و با دەیبات بۆیە بەرچاوم ڕەش بوو و غەمبار دەبووم.. و خێرا خۆم دەگەیاند پێی و بەگاڵتە پێ کردنەوە ئامۆژگاریم دەکرد (عەقدەکەم) جوان بخوێنێتەوە و ئەگەر ناوت هەیە خانوەکەم چۆڵ بکەیت دەبێت پارەی ئەو ماوەیەشم بۆ سەرف کەیت کە ماوە!.

بۆیە پاش ئەوە بڕیارم دا ئەم شێوازە بگۆڕم، کەوتمە ڕێ بەرەو ماڵی ئەو کەللە ڕەقەو بەم جۆرە دەستم کرد بەقسەکردن لەگەڵیدا:

مستر (دوو) گوێم بۆ بەسەرهاتەکەت گرت و گوێم بۆ شل کردیت.. بەڵام من ئێستاش بەگومانم لەوەی کەتۆ بتەوێت خانووەکەم چۆڵ بکەیت!. ئەم چەند ساڵەی کە ئەم خانوەم بەچەندان ماڵ بەکرێ داوە ئەوەی فێر کردووم کە لەسروشتی بناسم! وە هەر لەسەرەتاوە ئەوەم لەتۆدا بەدی کرد کە پیاوێکی ڕاساڵیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەرو تا ئێستاش هەر گومانی چاکەت پێ دەبەم!

بۆیە من پێشنیارت بۆ دەکەم کە پەلە نەکەیت و تا سەری مانگ ئەم کارە مەکەو ئەگەر لەسەری مانگدا هاتیت و هەر لەسەر ئەم بڕیارەت سوور بوویت.. ئەوا بەڵێن دەدەم پێت کە لەهەموو مافێکی خۆم خۆش ببم.. ئەوکاتە بۆم دەردەکەوێت کە بەهەڵە ئەو گومانە چاکانەم پێ بردوویت! هەرچەندە تا ئەم ساتەش هەر گومانی ئەوەت پێ دەبەم کە بەڵێنی خۆت ناشکێنی و دەیبەیتە سەر).

هەموو کەسێ لەبەردەم ئەم دەستەواژە پاکانەدا یان مرۆڤە یان مەیمون! وە مرۆڤ بەدەست خۆشیەتی کامەیان بێت.. هەر کە مانگی داهاتوو هات کابرا هات و کرێ

خانووەکـەی دایـە دەسـتم و پێـی ووتم کـە خـۆی و ژنەکـەی لـەم مەسـەلەیان کۆڵیوەنەتەوەو بڕیاریان داوە بەڵێنی خۆیان بەرنە سەر)!.

یەکێ لە ڕۆژنامەکان وێنەی (لورد نورسکلیف)ی بلاو کردەوە، بەلام لورد زۆری پێ ناخۆش بوو، بۆیە بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەکەی نووسی: تکایە جارێکی تر وێنەی من بلاو مەکەنەوە چونکە دایکم زۆر پێی ناخۆشە!). مەبەستی ئەو پیاوە ئەوەبوو کە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێ بۆ یەك شت کە خۆشەویستی دایکە)!.

کاتێك (جۆن روکفلر)ی کوڕ ویستی نەهێڵێ کەس وێنەی کوڕەکانی بگرێتن بۆ ئەم مەبەستە هۆکارێکی جوان و ماقوڵی گرتەبەر ئەویش ئەوە بوو پێی گووتن: (ئێوە چاك دەزانن ئەمە منداڵانێك هان دەدات و لەخۆیان بایی دەبن کاتێ دەبینن ناویان دەردەکەوێت و پڕپاکەندە بۆ دەکرێت!).

(سیروس کیرتس)ی ڕۆژنامەنووس لەسەرەتای ژیانییەوە زۆر هەژارو نەدار بووە، کەچی لەدوا ڕۆژدا بوو بەخاوەنی هەردوو ڕۆژنامەی ناودار (ستردای ئیڤن بۆس) و (لیدیز هوم جورناڵ).

کاتێك دەستی دایە ڕۆژنامەگەری نەیدەتوانی وەك ڕۆژنامەکانی تر پارەی سەرنووسەرو دەستەی نووسەران بدات! نەیدەتوانی نووسەرە پلە یەکەکان ڕابکێشێ بۆ نووسین لەڕۆژنامەکەیدان چونکە بێ پارە و پولیی سەری لێ دابوو!.

بەلام ئەم پیاوە هەستا بەبەکارهێنانی چەند هۆکارێکی جوان و شیاو بۆ ڕاکێشانی کەڵە نووسەرانی بەناوبانگ وەك (لویزا مای الکوت)ی شورەت بەرزی وا لێ کرد کە لەڕۆژنامەکەیدا بنووسێت ئەمەش بەوەی کە (١٠٠) ڕیاڵی بەخشی بەو ڕێکخراوە خێرخوازیەی (لویزا) سەر پەرشتی دەکرد!.

لەوانەیە خوێنەرێك بڵێت: (لەوە دەچێت ئەمە زۆر مەحاڵ نەبێت لەچاو (نور شکلیف، و روکفلر و ڕۆمان نووسی هەست بزوێنی وەك (لویزا)، ئای کە ئاواتەخوازم بمبینیایە کە چۆن -هەمان ڕێگا- کاریش دەکاتە سەر پیاوە دڵڕەقەکان، ئەوانەی مانگانە من کرێیان لێ وەردەگرم؟).

ئەویش ڕاست ئەکات! هەموو ڕێگایەك لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەمان سوودی نییە! ئەگەر ڕازی بیت لەو وەزعەی تۆی لەسەری لەمەسەلەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکی ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر ڕازی نیت و سودی نییە بۆچی ڕێگایەکی تر بەکار ناهێنی؟ دەی با پێکەوە گوێبگرین بۆ (جیمس تۆماس) کە یەکێکە لەقوتابییە زیرەکەکانم با بەسەرهاتە خۆشەکەی خۆیمان بۆ بگێڕێتەوە:

شەش کەس لەوانەی کە بڕیاربوو ئۆتۆمبیل بکڕن لە کۆمپانیایەك و بێگومان کڕییان، بەڵام ئەیانوویست پارەکەی نەدەن بەبیانووی ئەوەی کە گوایا کۆمپانیا کەیەکێ لەبەڵێنەکانی خۆی نەبردۆتە سەر! لەگەڵ ئەوەشدا کە هەریەکەیان ئەوەیان ئیمزا کردبوو کە هەموو مافێکی خۆیان بەتەواوی وەرگرتووە!.. کۆمپانیا چاك دەیزانی ئەمانە لەسەر هەڵەن و خۆی ڕاست ئەکات، بەڵام تاکە هەڵەی ئەوەبوو کە ڕووبەڕوو، ڕاستەوخۆ پێی ووتن ئێوە لەسەر هەڵەن!!.

فەرموون سەیری ئەو هەنگاوانە بکەن کە پیاوانی بەشی ژمێریاری گرتیانە بەر بۆ دەستکەوتنی ئەو بڕە پارەیە:

١-چوونە لای هەریەکەیان و پێیان ووت: هاتوین ئەو بڕە پارەیەتان بەنێ کە خۆتان دەزانن ماوەیەکیشی بەسەردا چووە!

٢-بۆیان ڕوون دەکردەوە کە ئێوە لەسەر هەڵەن و حەق لەلای کۆمپانیایە!

٣-وە پێیان ووتن -ڕووبەڕوو- کە ئەوەندەی کۆمپانیا لەمەسەلە ئۆتۆمبیلدا زانایە ئێوە هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان ناگەنە ئەو ئاستە کەواتە سەرکەشی و لووت بەرزی بۆ؟!

٤-ئەنجامەکەی گەشتە کوێ؟ بێگومان هەر شەشیان دەستیان کردە دەمەقاڵەو بەرگری کردن لەخۆیان و کۆمپانیا مەبەستی خۆی نەپێکا.

ئەوەبوو وای لێهات خەریك بوو سەرۆکی بەشی ژمێریاری مەسەلەکە بەرێتە دادگاو شکات بکات بۆ ناوبژی نێوانیان، بەڵام باش بوو نەگەشتە ئەو وەزعەو فریای مەسەلەکە کەوت! سەیر بکەن:

بەڕێوەبەری کۆمپانیا لەسەر مەسەلەکە ورد بوویەوە سەیر دەکات ئەم شەش کەسە کە کڕیارە هەرە باشەکانی کۆمپانیان و ڕۆژێ لەڕۆژان ئابەو جۆرە پارەیان دوا نەخستووە لێرەدا بۆی دەرکەوت کە مەسەلەکە شتێکی تێدایە! بۆبۆیە بەڕێوەبەر بانگی کردم و داوای لێ کردم کە هەرچۆنێکت کردووە ئەو بڕە پارەیەمان بۆ دەست بخەرەوە.

جیمس ئەم هەنگاوانەی خوارەوەی نا:

١-دەڵێ: سەرمدا لەهەریەکەیان-بەجیاجیا- بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەو مەسەلەیەم نەکردەوە کە بۆی هاتبووم! بەڵکو پێم دەگوت من بەمەبەستی خۆشکردنەوەی نێوان ئێوەو کۆمپانیاکەمان هاتووم بۆ سەردانتان!

٢-لەکاتێکدا گوێم شل کردبوو بۆ بەسەرهاتی ئەم کڕیارانە، جار بەجار دەمووت: من هیچ قسەیەکم نییە لەم بارەیەوە پێتان بڵێم، و کۆمپانیاش وا نابینێت کەداواکاریەکانتان هیچ و پوچ و بێ نرخن!

٣-پاشان تێم گەیاند کە ئەو ئۆتۆمبیلەی ئەو کڕیویەتی لێمان لەباشترین جۆرەکانی کۆمپانیاکەمانەو خۆیشت چاك دەزانیت چونکە لەلای خۆتە.

٤-وازم لێ دەهێنا تا بەئارەزووی خۆی قسە بکات و زۆر بەجوانی و گرنگییەوە گوێم بۆ شل کردبوو و بەسۆزو میهرەبانیەوە دەمڕوانییە بۆچوونەکانی.

٥-لەکۆتاییدا دەمبینی کاتی گفتوگۆی هێمنانە هاتووە بۆیە پەنام دەبردە بەر هۆکارە جوان و شیاوەکان کە لەڕێگەیانەوە دەگەشتمە دەروونی، دەم ووت: ئەو بەهەڵە تێ گەیشتنەی لەنێوان تۆو کۆمپانیادا ڕوویداوە جێگای داخ و نیگەرانییە، هەق نەبوو ڕووی بدایە.. پاشان دەستم پێش دەخەم و لەباتی کۆمپانیا داوای لێبوردنت لێ دەکەم.. پاشان دەم ووت:

وە من بەئەمەکی و سنگ فراوانیەکی وات تێدا بەدی دەکەم کە چاوەڕوانی ئەوەت لێ دەکەین کە چاکەیەکمان لەگەڵ بکەیت و جارێکی تر سەیری -عقدی حسابات-ەکە بکەیتەوەو پاشان وەك بەڕێوەبەری کۆمپانیا خۆت بێیت و حوکم بدەو منیش ڕازی دەبم بەهەر حوکمێك دەری بکەیت.

ئایا لەو باوەڕەدای -خوێنەری بەڕێز- کە حسابەکەی لەسەریەتی دابێتی؟
بێگومان بەڵێ! بەوشێوەیە هەرشەشیان چیان لەسەر بوو پێیان داین جگە لەیەکێکیان نەبێت شتێکی کەمی گلدایەوە، دوو ساڵی بەسەردا ڕانەبورد ئەو شەش کەسە هاتنەوە بۆ چەند ئۆتۆمبیلێکی نوێ.
پوختەی ئەم باسە لەوەدایە کە: خەڵکی بەگشتی دەست پاك و دڵسۆزن و ئەوانەی وانین زۆر کەمن، ئەو پیاوەی کە تۆ وادەزانی شەڕانیەکی سەرکەشە یەکسەر دەگۆڕێت بۆ کوڕێکی چاکی بەئەمەك ئەگەر تۆ وا مامەڵەت لەگەڵ کرد کە بەئەمەکێکی دڵسۆزە نەك سەرکەشێك..
کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بۆلای بۆچوونەکانت بهێنی ئەوا بڕگەی ژمارە (١٠) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:
(**پەنا بەرە بۆ هۆکاری جوان و شیاو**).

## پاشکۆی ڕێگای دەیەم:
## (هەمیشە ئەمە پێش بخە)

لەبەرنامەی ئیسلامدا موسڵمان دەبێت هەموو هۆکارێکی شەرعی و ڕەوا بگرێتە بەر بۆ ڕاکێشانی خەڵکی بەرەو قورئانی پیرۆز و لەزانایانی (عیلمی ئوصول) دەڵێن: (الغاية لاتبرر الوسيلة) واتە: بۆ مەبەستی چاك هۆکاری خراپ ((حەڵاڵ نابێت.))

(پێغەمبەر)ی خوا ﷺ ئەم ڕێگا جوانەی لەدونیای بانگەوازدا بەرکارهێناوە، کاتێ موسڵمانەکان لەمەکەدا دەچەوسێنرانەوە و سزای سەخت دەدران. بۆیە ڕێگای دان تا کۆچ بکەن بۆ حەبەشەو هۆکاری پیاهەڵدان و (مەدح) کردنی پاشای حەبەشەی بەکارهێناو پێی فەرموون بڕۆن بۆ حەبەشە چونکە پاشاکەی (دادپەروەرەو کەس لەدیوەخانیدا زوڵمی لێ ناکرێت)! بەڵێ پاشای حەبەشە دیندارو نەرم و نیان بوو بەڵام بەبیستنی ئەم وەصفە پاکە جوانە (پێغەمبەر)مان ﷺ زیاتر هەڵوێستی دادپەروەرانەی نواند لەگەڵ کۆچەریاندا و نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لە ئاکامیشدا موسڵمان بوو!..

تەنانەت قورئانی پیرۆزیش هۆکاری دنیایی و مادی بەکاردەهێنێت بۆ نزیك کردنەوەی خەڵك لەبەر نامە شیرینەکەی ئیسلام ئایەتی ﴿وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ﴾ (التوبه ٦٠) واتە بەخشینی هەندێ لەزەکات بەو کەسانەی تازە موسڵمان دەبن..

جارێکیان (پێغەمبەر)مان ﷺ لەگەڵ پیاوێکی ناوداری هۆزی هۆزان بەسەر بەرزاییەکەوە سەیری ئەو دۆڵەیان دەکرد کە مەڕوماڵاتێکی زۆری (غەنیمەی) تێدابوو.. (پێغەمبەر)مان پێی فەرموو: ئەو مەڕوماڵات و حوشترانە هەمووی بۆ تۆ؟!

کابرا زۆر دڵخۆش بوو سوپاسی (پێغەمبەر)ی کردو بەو دەست کەوتە زۆرەوە گەڕایەوە ناو هۆزەکەی‌و کۆی کردنەوەو پێی ووتن: ئەی هۆزەکەم وەرن موسڵمان بین و شوێن کەسێك بکەون کە لەهەژاری ناترسێت و پارەو پول لە لای نرخی نییەوبێ حساب دەبەخشێت!..

سەیری ئەم نموونە جوانە بکە.. بەکارهێنانی هۆکاری جوان و شیاو ژیرانە زۆر شت دەکات بۆ موسڵمان.. (علی کوڕی ابو طالب) خوای لێ ڕازی بێت، کوڕی هەبوویەکەمیان حسین بوو کە لە فاطمەی زەهرابوو , دوەمیان محمدی ناو بوو کوڕی (حەنەفیە)بوو.

ئەم دووبرایە ناکۆکییەك دەکەوێتە نێوانیان و دەنگ لەیەك وەردەگرن. هەردووکیان دڵیان بۆ ئاشت بوونەوە لێی دەدا.. بەڵام کەسیان قسەی خۆیان نەدەشکان و دەست پێشخەریان نەدەکرد..

ئەوەبوو (محمد)نووسی بۆ حسین ی برای: پاش سوپاسی خواو صەلات و سەلام لەسەر (پێغەمبەر) ﷺ أما بعد: برای خۆم شتێك کەزۆر بێنرخە نێوان من و تۆی تێك داوەو دەبێت ئاشت ببینەوە، بەڵام من هەست دەکەم ئێوە شایانی ئەم دەست پێشخەریەن و تۆ من ئاشت کەرەوە! تۆ لە من بەڕێزتری! دایکیشت لەدایکی من بەڕێزترەو باوکی دایکیشت لەباوکی دایکی من زۆ بەڕێزترە! من کوڕی (حنیفە)م بەڵام تۆ کوڕی فاطمة الزهرای و کچی رسول الله ﷺ ئیتر من واهەست دەکەم کە ئەو فەزڵە دەنوێنیت و ئێوەش ئەهلی فەزڵن. والسلام. براتان محمد الحنیفە.

هەرکە نامەکە گەشتە ئیمام حسین –خوالێی ڕازیبێت– خێرای خۆی کۆکردەوەو بەرەو ماڵی محمدی برای کەوتەڕێ و ئاشتی کردەوەو دەستیان کردە ملی یەکتر و دەستیان کرد بەگریان بەسەریەکدا!!..

سەیرکە –محمد– چی مەبەست بوو بەم نامەیە بۆی هاتەی دی خۆی تەنەزولی نەکرد واشی کرد لەبەرامبەرەکەی تەنەزولی بۆ بکات! بەڕاستی ئەمە هونەرەو هەمووکەس نایزانێت!.

## بەشی یازدەهەم:
## (سینەما چی دەکات تۆش هەر بەو چەشنە بکە)

چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژنامەی (فیلادلفیا ئیفینج بولتین) کەوتەبەر لافاوێکی ڕەخنەو توانج ی کوێرانە لەهەموولایەکەوە. ئەم پروپاگەندەو توانجانە بەناو وڵاتدا بڵاوبویەوە وەك چۆن ئاگر لە پوش بەربدەیت بڵاودەبێتەوە..

کورتەی ئەو توانجانە ئەوەبوو: ئەم ڕۆژنامەیە تایبەت بووە بە (دیعایە)و پروپاگەندەی ئەم و ئەو بڵاو دەکاتەوەو بەتەواوەتی خاڵی بووە لەهەواڵ و باسە گرنگەکان!.. هەر ڕۆژنامەیەك ئا بەوجۆرە بێت دواڕۆژی بەرەو نەمان دەچێت و وای ایێهات پێویستی دەکرد بەوەی سنورێك بۆ ئەم ڕێز شکاندەی ڕۆژنامەکەیان دابنێن تازیاتر تەشەنە نەکات ئەمەیان چۆن کرد؟:

بەرپرسانی ڕۆژنامەکە هەستان بەکارێکی بێدەنگ و سود بەخشن ئەویش ئەوەبوو هەواڵی چەند ژمارەیەکی پێشووی کۆکردەوەو کتێبێکی لێ پێك هێنا لەژێر ناوی (یەك ڕۆژا)(١) و لە (٣٠٠)لاپەڕە پێك هاتبوو شایانی (دوو)ریاڵ بوو بەڵام ئەمان دایان بە (٢) قروش..

هەر بەبڵاوبوونەوە ئەم کتێبە لەناو کتێبخانەکاندا یەکسەر هەموو شتێك گەڕایەوە شوێنی خۆی بەبێ قسەو دەمەقاڵەو دەمە دەمە دەری خست بۆ گشت لایەك کە ئەوە ڕەخنەیەکی بێ جێ‌و بوختانێك بووە بۆ ڕۆژنامەکە کراوە وەگەرنا پڕیەتی لەهەواڵ و باس و خوساتی پرسود!.. کتێبەکە بەشێوازێکی نواندن داڕژرابوو دوور بوو لەدەمەقاڵەو (موجادەلەیەك) کە ئەگەر بیرکاری‌و منطق یش پاڵپشتی بوایە . سەیرکە کتێبی (هونەری پیشاندان) (١) لەنووسینی (کنیت جودی‌و زین کوقمان) بخوێنەرەوە چەندان نموونەی کاریگەرت دەست دەکەوێت کەچەندان کەس بەهۆی پیشاندانی شت و مەکیانەوە پارەو ناوبانگێکی زۆریان دەست کەوتووە.

لەو کتێبەدا دەبینی کەچۆن (الکترولکس) دیعایە بۆ پانکەکانی دەکات بەوەی کە لەنزیك گوێی کڕیارەکەوە شقارتەیەك دادەگیرسێنێت! کەبەڵگەیە لەسەر بێدەنگی بانکەکانی!.. وەچۆن (سیزر رویك) شەبقەیەك ئەدان بە (٢) ریاڵ! چونکە ئیمزای ئەکتەرەی سینەمایی (ئان سوزرن) پێوەیە!

وەچۆن (میکی ماوس) پاش ئەوەی گەشتە سینەما خۆی گەیاندە دەزگای زانیاری وە چۆن بوونی ناوی ئەو بەیەکێ لەیارییەکانی منداڵانەوە یەك کارگەی گەورەی لەتیاچوون ڕزگارکرد! وە چۆن کۆمپانیای (ئیسترن)ی هێڵی ئاسمانی ڕێبواران ڕادەکێشێ بۆخۆی بەوەی کە بەشوشەی نووسینگەکەوە چەند وێنەیەکی بچوك کراوەی فڕۆکەی (دوگلاس)ی هەڵواسیبوو!

وەچۆن (هاری الکسندر) کڕیاری بەرەو خۆی دەهێنا لەڕێگای یاریەکی مولاکەمەی خەیاڵی یەوە لەنێوان شتەکانی خۆی‌و شتەکانی بەرامبەرێکی‌دا! وەچۆن (کرازار) فیلێکی زل ئەخاتە سەر ئوتومبیلەکەی تابتەوی و تۆکمەیی ئۆتۆمبیلەکەی بسەلمێنێ!.

ئائەمەیە زمانی پیشاندان، ئەمەیە سەردەمی نواندن، بەتەنها باس کردنی ڕاستییەکان بەس نییە" ئەبێت بخرێتە قاڵبێکی تەمسیلی تازیاتر کار لەسەر دڵی خەڵکی بکات. بەڵێ تۆش بۆت هەیە وەك سینەماو تەلەفزیۆنەکان سود لەهونەری پیشاندان وەربگریت!

(جیمس یونیتون) لەلایەن کۆمپانیایەکەوە داوای لێکرا ڕاپۆرتێك بنوسێت دەربارەی نرخی بەرهەمی (الکولدکریم) کە چاکترین جۆرییەتی. بۆئەم مەبەستەدەبوایە ڕاوێژی بەپیاوێك بکردایە کە پسپۆڕ بوو لەمەسەلەی نرخ داناندا، بەلام یەکەمجار سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا چونکە یەکی ڕایەکی جیاوازیان هەبوو.

مستر (بوینتون) دەڵێت: (منت وادەبینی کە خۆم گیف کردبوویەوە و بەدەمەقاڵەی نەزوکم دەکرد بۆ سەلماندنی ڕاستی بۆ چوونەکەم چونکە

ئەوپێیووتبووم تۆ نازانیت و من ڕاست دەکەم و پێکاومە!.. ئەوەبوو لەئاکامدا لێم بردەوە! بەڵام دانیشتنەکە تەواوبوو بەبێ ئەوەی بگەینە هیچ ئامانجێك!..

بۆجاری داهاتوو نەژمارە و نەنرخ و نە ڕاستیم بۆ باس نەکرد بەڵکو نیازم کرد برۆمەلای و ڕاستییەکان لەقاڵبی تەمسیلیدا بخەمەڕوو!

کاتێ چوومە ژوورەوە بۆ نوسینگەکەی سەیردەکەم خەریکی تەلەفوون کردنە ئەمەم بەهەل زانی بۆیە جانتا چەرمینەکەم کردەوەو سیو دوو دانە لەکرێمی (الكـود)م دەرهێناو لەسەر مێزەکەم ڕیزم کرد. لەسەر هەموو کریمێك ڕوونکردنەوەیەکی کورتی لەسەر نوسرابوو دەربارەی دروست کردن و تێچوون و نرخەکانیو نرخی فرۆشتنیشی!

چیڕوویدا؟ (هیچ پێویستم بە دەمەقاڵە نەما.. کابرا دانەی یەکەمی هەڵگرت و پاشان دووەم.. چەند پرسیارێك و چەند وتووێژێکی هێمنانە لەنێوانماندا ڕوویدا خۆ لەم سەردانەم دا هەر ئەوڕاستیانە جاری پێشووم پێبوو بەڵام ئەمجارە بەدەمەقاڵەو شەڕە قسە نەبوو بەڵکو بەهونەری پیشاندان! جا سەیربکە چ جیاوازیەك لەنێوان ئەم دوانەدا بەدی دەکەیت؟..

ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بەرەو بۆچوونەکانت ڕابکێشی ئەوەبڕگەی ژمارە (١١) جێبەجێ کە دەڵێت:بۆچوونەکانت لەقاڵبێکی تەمسیلیدا بخەرە ڕوو)

# پاشکۆی ڕێگای یازدەیەم

## (باووتەکانمان بەکردەوە ئاوبدەین)

لەبەرنامەی خوای گەورەدا هیچ شتێك بەووتەی ڕووت و بێ کردەوە بایەخی نییەو بێکەڵکە و تەنانەت هەڕەشەیش لەوانە دەکرێت کەتەنها ووتەیان هەیەو کردەوەیان دیارنییە قورئان دەفەرموێت: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ (١) (الصف ٣).

(پێغەمبەر)ی خوا ﷺ ئەم بانگەوازە پیرۆزەی لەڕێگای کردەوەجوانەکانیەوە گەیاندوویەتی و ئەوەندەی بەکردەوە فیکرەکەی گەیاندوە ئەوەندە بەقسەی نەی گەیاندوە! تەنانەت بێباوەڕو دوژمنانیش لەبەردەم کردەوەی جواندا دەسەوسانن و ناتوانن هیچ بڵێن، ئەوەتا قورەیش کەچەندێ ڕقیەتی لە محمد کەچی پێیان دەووت: محمدی دەستپاك!

ئیسلام زیاتر (١٤٠٠)ساڵە بەردەوام شوێن کەوتوانی ڕاهێناوە لەسەر ئەوەی کە بەکردەوە گەورەیی و شیاوی ئەم دینە بگەیەنن بەدونیاو تەنها وتاری بەهێز و نوسینی بەپێزو وتەی کاریگەر بەس نییە بۆگەیاندنی ئیسلام بەڵکو بەکردەوە بەرجەستەی بکەن بۆخەڵکی تاشیاوی و جوانی دەرکەوێت..

ئەگەر قسەی ڕووت دەوری هەبوایە فەلسەفەکانی دیدەبای هیندو ماوڵسی چین و سقراط و ئەفلاطونی یونان هەموو جیهانیان دەگۆڕی چونکە هەموو دنیایان خەریك کرد بە خۆیانەوە ئیسلام سروشتی مرۆڤەکان دەزانێت کە چەند جار بەقسەپێی بڵێ فلان شت بکە زۆر گرنگە نایکات بەڵام بینینی بەبەرچاویەوە کرا زۆر ئاساییە دووبارەی کاتەوە وەك منداڵ وایە یەك ساڵ بڵێ ئەوبزمارەم بۆ دابکوتە بەودیوارەدا نایکات بۆت! بەڵام یەك جار بینی تۆ تەقە تەق دەکەیت ئەویش بزمارێکت لێ دەبات و چاوت لێدەکات و دایدەکوتێت!.

لەئاشتی نامەی حودەیبیەدا موسڵمانەکان زۆر پەست و خەمباربوون بەو بەندانەی کە قورەیش داینابوو کەهەمووی لەزیانی موسڵمانەکان بوو بەرواڵەت!

هەموو لەداخا پیشیان دەخواردەوە بەڵام جگە لە (عمر) کەس دەری نەبڕی.. بۆیە کاتێ (پێغەمبەر) فەرمووی پێیان موی سەرتان کورت بکەنەوە؟ یەك صحابی لەشوێنی خۆی نەجولا. (پێغەمبەر) زۆر ناڕەحەت بوو. نەیدەزانی چی بکات.. بۆیەبەبێ دەنگ ڕۆشتەوە چادرەکەی خۆی!.

دەستی نەکرد بە دەمەقاڵەو قسەپێوتنیان بەڵکو راوێژی کرد بە (ام سلمە)ی خێزانی و ئەویش ووتی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا خۆت بەکردەوە بەبەرچاویانەوە قوربانییەکەت سەربڕەو سەری خۆیشت کورت بکەرەوە ئەوکاتە هەموویان چاوت لێ دەکەن!

(پێغەمبەر) وای کرد! سبحان الله هەرهەموو هاوەڵان بەربوونە قژی یەکترو دەستیان کرد بە سەرتاشین تەنانەت لەداخا خەریك بوو سەری یەکتری بریندداربکەن!!..

(پێغەمبەر)ی خۆشەویستمان چەندان فەرموودەی جوانی هەیە لەسەر گەورەیی جیهاد و غەزا لەڕێی خوادا.. بەڵام بەکردەوە دەیسەلماند کە جیهاد کردن فەرزە لەسەر موسڵمانان بۆیە هەمیشە لەپێشی بەرەکانی جەنگەوەبوو! تا هاوەڵان زیاتر گیانیان ببەخشن بەم ئیسلامە بێگەردە!

بیهێنە خەیاڵی خۆت ئەگەر محمد ﷺ وەك هەندێ سەرکردەی ئەمڕۆ ئایەتی جیهاد و خەباتی گیانبازیو وانەی فیداکاری باس بکردایە بۆپێشمەرگەکانی و بەڵام لەگەرمەی شەرەکاندا ئەم لەناومالْ و منداڵیدا خەوتبێت یان لەسەر سنور خەمی ماڵ و منداڵەکانی بێت کەچۆن دوریان بخاتەوە! ئایا ئەم بەرنامە ناوازەی ئیسلام هەر لەوشکە دۆڵی مەککەدا نەدەمایەوەو بستێك دەردەچوو بەرەو وڵاتانی دونیا؟!.

قورئان نمونەیەکی بەرجەستەمان بۆ دەگێڕێتەوە کەجێگای خۆیەتی بانگخوازانی ئیسلام لێی ورد ببنەوەو سودی لێوەربگرن لەکاتی گەیاندنی بەرنامەکەیاندا:

باسی (ابراهیم)-علیه الصلاة والسلام- دەکات کەچۆن بەدەمی زۆر بانگی گەلەکەی کردوە بۆ یەکتاپەرستی وازهێنان لەپەرستنی ئەو بتە بێ گیان و بێ زیان و بێ قازانجانە!..

بەڵام کەس بەقسەی نەدەکردو بتەکانیان لەبەرچاو نەدەکەوت بۆیە هەستا تا بەشێوەیەکی (نواندن) نالەباری و دەستەوەستانی بتەکان ئاشکرا بکات.. ئەوەبوو لەفرسەتێکدا هەموویانی تێك شکاند جگە لەبتە گەورەکەیان نەبێت..

بۆئەوەی هاتنەوە بپرسن کێ ئەمەی کردووەو ئیبراهیمیش بڵێت: سەرگەورەکەیان لێیان زویر بووەو هەموویانی وردو خاش کردوە..

بەڵێ وابوو.. ئەوانیش وتیان: ئەی ئیبراهیم ئەم بتانە توانای شکاندنی یەکترو جموجوڵیان نییە؟! ابراهیم ئالێرەدا بۆچوونەکانی خۆی پێگەیاندن و فەرمووی: دەی بۆچی سوژدە بۆ داروبەردێك دەبەن کە هیچ ناکەن و هیچ نابیسن و هیچ نابینن؟!!.. کەمێ بەخۆیانا هاتنەوەو بەیەکتریان ووت ئەزانن ابراهیم ڕاستەکات!!..
بەبێ دەمەقاڵە دانیان بەگێلی و گومڕایی خۆیاندا نا!!..

## بەشی دوازدەهەم:
## (ئەگەر هیچ ڕێگایەك کەڵکی نەبوو ئەم ڕێگایە تاقی بکەرەوە)

کاتێك کە (تشارس شواب) سەری لەیەکێك لەکارگەکانی دەدا، سەرنجیدا کرێکارەکان بەشێوەی پێویست کاریان ئەنجام نەداوە، بەڕێوەبەری کارگەکەی بانگ کردو پێی ووت: (نازانم چۆن لەگەڵ لێهاتوویی و زیرەکیتدا کەچی نەت توانیوە داوا لەکرێکارەکان بکەیت بەرهەمێکی زیاتر و چاکتر بەدەست بهێنن؟!.

بەڕێوەبەر لەوەڵامدا ووتی: (لەڕاستیدا تیاماوم! هەموو ڕێگاکانم گرتۆتە بەر بەنەرمی، بەهەڵنانیان، تەنانەت بەترساندن و ئاگادارکردنەوەیان بەڵام هەر بێهودە بوو! ئەمانە ئەوەیان دەوێت بەرهەم زیاد نەکەن و بەس!).

ئەم سەردانە لەکاتێکدا بوو کەکرێکارەکانی شفتی ڕۆژ لەڕۆشتنەوەدا بوون و دەیان دایە دەست کرێکارانی شفتی شەو، شواب بەبەڕێوەبەری ووت: زۆر چاکە، پارچەیەك تەباشیرم بۆ بێنە! پاشان لای کردەوە بەلای کرێکارەکەی لای چەپیدا و لێی پرسی ئەمڕۆ چەند پارچەتان تەواوکردووە؟ کرێکارەکە ووتی: (٦)پارچە.

شواب دانەویەوە بۆ زەویەکە بەتەباشیر ژمارە (٦)نووسی! بەخەتێکی جوان و گەورە، کاتێ کرێکارەکانی شەو هاتن بۆ دەوام دەبینن بەگەورەیی لەسەر کاشیەکان نووسراوە (٦)! پرسیاریان کرد بەهۆی ئەم نووسراوە. کرێکارەکانی وتیان ئەمڕۆ سەرۆکی کارگە سەردانی کردین و لێی پرسین چەندێ کارتان کردووە؟ ئێمە ووتمان (٦)پارچە، ئەویش نووسی (٦)پارچە.

لەڕۆژی ئایندەدا شواب هاتەوە بۆ کارگە سەیردەکات کرێکارەکانی شەو شەشەکەیان کوژاندۆتەوەو ژمارە حەوتێکیان بەگەورەیی نووسیوە لەجێگاکەیدا!

کاتێ کرێکارانی ڕۆژ هاتنەوە دەبینن نووسراوە (٧) بۆیە وتیان یانی چی؟ کرێکارانی شەو خۆیان لەئێمە بەزیرەك ترو لێهاتووتر دەزانن؟!. مەرجبێت دەرسێکی و ایان دابدەین هەرگیز لەیادیان نەچێت؟ زۆر بەگوڕوتینەوە دەستیان دایە کار لەکاتی ڕۆشتنەوەدا بەگەورەیی ژمارە (١٠)دەیان لەزەویەکە نووسی!..

تائەوەنـدەت زانـی ئـەوکارە کـەم بەرهـەم بـووە بـوو بەبەرهەمـدارترین کارگـەی کۆمپانیاکە! ئەم ڕێگایە کامەیە والێرەدا بەکارهات؟. با شواب بەشێوازی تایبەتی خـۆی بۆمـان دابڕێـژێت: دەڵێـت: هیـچ شـتێك نییـە ئەوەنـدەی مونافەسـەو کارکردن لەرقی یەکتر ڕۆڵی هەبێت لەبەرەوپێش بردنی و زۆر کردنـی بەرهـەم. مەبەستم لـە – منافسە– مانـا بێ‌واتاکـەی نییـە کەمەبەسـتی گیرفان پڕکـردن و خۆهـەڵبڕین و لـوت بەرزی بێت، بەڵکو مەبەستی من (حەز کردنە لەسەرکەوتن)!.

حەزکردن لەسەرکەوتن! واتە هاوێشتنی دەستکێش بۆ دەم و چاو! ئەم ڕێگایـە زۆر بەسـودە بـۆ کەسـانێك کـەگیانی پـەلاماردانیان تێدایـەو بـێ هیوانـابن لەبـەکار هێنانی.

بـەبێ ئـەم ململانـێ و بەرامبەرکێیـە چـۆن –ڤیـدو ڕۆوزفلـت– ئـەیتوانی ببێتـە سـەرۆك کۆمـاری وڵاتـە یـەك گرتووەکـان! ئـەم پیـاوە کـە ناوبـانگی (سـوارە سـەر کەشـەکە)ی لێنرابـوو لـەکوباوە دەم و دەسـت خـۆی گەیانـدە نیویـورك و کرابـە پارێزگاری نیویورك! بەڵام ئـەو هـەژارە هـەر ئەوەنـدەی زانـی ناحـەز و نـەیارانی لێـی ڕاست بوونەوەو هێرشی کوێرانەیان دەکردە سەری و بەگشت بەڵگەیـەکی قانوونی دەیان ووت بەهەڵەو ناشایستانە خراوەتە ئەو جێگا گرنگە!خەریك بوو ترس و بیم وابکات لە (روزفلت) دەست لەکاری پارێزگاری هەڵگرێت بەڵام هاوڕێیـەکی بەناوی (توماس کولیریلات) غیرەتی خستەوە باری و پێی گوت: ئایا پاڵـەوانی (سان جوان هل) ئێستا گۆڕاوەو بووە بە ترسنۆك؟!.ئەوەبوو رۆزفلت لەبەردەم نەیارانیدا خۆی گـرت و ئـەم ململانـێ و خۆگرتنـەی نـەك هـەر مێـژووی ڕۆزفلـت بـەڵکو مێژووی یـەك گەلی گۆڕی!

(تشارلس شواب) و( بلات) و( آل سمس ) نرخی ململانێ و منافەسـەیان زانیـوە، ئـەوەبوو کـاتێ (ئـال سمـیس) پارێزگـاری نیویـورك بـوو.. دەنـگ و بـاس کەوتـە نـاو خـەڵك کـە گوایـە زیندانیـەکانی –سنجسنج– لەدورگـەی شـەیتان لێیـان ڕادەکـات و هەڵدێن بەهۆی نەبوونی بەڕێوەبەرەوە بۆ زیندانەکە!.

(ئـال سمـس) بیری کـردەوە کەسێکی شـیاوی ئـازای بەجـەرگ دیـاری بکـات بـۆ سەروکاری ئەم زیندانە. ناردی بەدوای (لویس لویس) لە (نیوهامبتون)و پێی ووت:

ڕات چۆنە ببیتە بەڕێوەبەری زیندانی سنج سنج؟ چونکە زۆر پێویستیان بەبەڕێوەبەرێکی لێهاتوو دنیادیدە هەیە؟.لویس لەوێدا وشك بوو! چونکە چاك دەیزانی ئەم کارە پڕیەتی لە مەترسی گەورە گەورە، ئیتر با ئەوەش بوەستێ کە ئەم جێگایە پەیوەندی هەیە بەگۆڕانکاری سیاسەتی وولاتەوە! هەرکە (سمس) بینی وا (لویس) لەجێی خۆیدا وشك بووەو نازانێ بڵێ چی، شانی دادایە سەرکورسیەکەی و پالی لێ دایەوەو بەزەردە خەنەوە پێی گوت من سەرزەنشتت ناکەم ئەی لاو، لەسەر ئەوترس و بیمەی بۆت دروست بوو! چونکە کارێکی زۆر ترسناکە و پیاوێکی بەهێزو لێهاتووی دەوێت قەیناکا دەگەرێم بۆ ئەو پیاوەو پەیدای دەکەم!

ئالێرەدا سمس ململانێ و مونافەسەی دروست کرد، لویس هەر لەوێدا ئەو فەرمانەی قبوڵ کردوو بوویە ناودارترین بەڕێوەبەر لەناو هەموو زیندانەکانی جیهاندا!؟.

تەنانەت کتێبێکی نووسی بەناوی (بیست هەزار ساڵ لەزیندانی سنج سنج)(١)و سەدان هەزار دانەی لێ فرۆشراو ژیانی سەختی لەگەڵ زیندانیەکاندا وای کرد لە دەیان دەرهێنەری سینەمایی کە دەست بدەنە کارو بیکەنە مادەی فیلمەکانیان لە ڕێگای هەوڵە بەردەوامەکانییەوە بۆ گۆڕینی زیندانییەکان لەتاوانبارو خوێنڕێژیەوە بۆ هاولاتی یەکی چاك و بێ وەی!! کەبەڕاستی موعجیزەبوو!.

(هارڤی فایرستون) دامەزرێنەری کۆمپانیای (فایرستون)ی گەورەی( پلاستیك) دەڵێت: من وانازانم کە تەنها پارەو ماڵ دەتوانن پیاوە لێهاتووچاکەکان کۆبکەنەوەو بیانهێڵنەوە بەڵکو گیانی ململانێ -المنافسة- ئەم کارەی پێ دەکرێت و بەس)!

ئەوەی کەپیاوی سەرکەوتوو دەیەوێت: ململانی (منافسە) بواردەرەخسێنێ تاتیایدا سەرکەوتنی خۆی بسەلمێنێ، هەلی ڕەخساو بۆدەرخستنی تواناکان!.ئەگەر ویستت خەڵکانی خاوەن گیانی ململانێو پەلاماردان بەرەو بۆچوونەکانت بهێنێ ئەوا برگەی ژمارە (١٢) جێبەجێ بکە کە دەڵێت: (مەسەلەکە بخەرە مەیدانی ململانێو (منافسە)وە)

# پاشكۆی ڕێگای دوازدەیەم
# پێش بڕكێ لە چاكەدا

ئیسلام زۆر زۆر پێخۆشحاڵە بەوەی كە شوێنكەوتوانی هەردەم شان لەیەك توند بكەن و پێش بڕكێ بكەن لەكاری چاكەو خزمەتكردندا! ئەوەتا قورئان كاتێ مەدحی (پێغەمبەر)ەكانی پێشوو دەكات –علیهم وعلى نبینا الصلاه والسلام– دەفەرموێت: لەكاری چاكەو پێشبڕكێ یان دەكرد وەك دەفەرموێت ﴿كَانُوا۟ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ (١)(الانبیاء ٩٠).

تەنانەت پەروەردگار بەهەشتی كردوە بە (پلە)و هەركەسەو بەپێی لێبڕان و خۆ ماندووكردن پلەیەكی تایبەتی پێ دەبەخشێت . بۆنموونە (فردوس) بەرزترین پلەی بەهەشتەو موسڵمان دەبێت شەو و ڕۆژ كاربكات تا دەستی دێنێ!.

سەیری (پێغەمبەر)ی سەردارمان بكەن كەچۆن مەسەلەكان دەخاتە ناوبازنەی ململانێی حەڵاڵ و (منافسه)كردن تا هەركەسەو زیاتر هەوڵ و كۆشش بنوێنێ و زیاتر بانگەواز پەرە پێبدات.. وەك لەفەرموودەیەكدا دەفەرموێت (ان احبكم الی واقربكم منی مجلسا یوم القیامە احاسنكم اخلاقاً)(رواة الترمذي حسنة الالباني) واتە خۆشەویست ترین و نزیكترینتان لەمنەوە لەڕۆژی قیامەتدا ئەوانەتانن هەڵسوكەوتیان لەهەموو كەس جوانترە!

بڕوانە چۆن بنەمای –منافسه– لەمحمدی دەروونناسەوە گەشتۆتە گەلانی دونیا.. وردبەرەوە لەفەرموودەكە چۆن نەیفەرموو ڕەوشتان جوان كەن ئەگینا لەقیامەتدا لێتان ناپرسمەوە.. بەڵكو (احب واقرب)ی بەكارهێناوە كە (اسم التفضیل)ن و بۆ باشترین و چاكترین بەكار دەهێنرێن.

(پێغەمبەر)مان ئەم ڕێگایەی بەكارهێناوە تا جیهاد و فتوحاتی ئیسلامی هەر بەردەوام بێت و مەسەلەی خستووتە بازاڕی ململانێ و پێشبڕكێ (منافسه)وە وەك ئەوفەرموودە صەحیحەی كە مەدحی ئەو سوپایە دەكات كە شاری (قسطنطینیة) ڕزگار دەكات و مەدحی ئەمیرەكەشی دەكات (نعم الجیش ونعم الامیر امیرها).

ئـەم فەرموودەیـە شۆڕشـێکی مونافەسـەی دروسـت کـرد لـەناو خەلیفـەکانی ئیـسلامداو لەهـەموو سـەردەمێکداو هـەموو خەلیفـەکان ویـستوویانە خۆیـان و سوپاکەی خۆیان بەر ئەو مژدە گەورەیە بکەوێت..

نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵکو موسـڵمانانیش هـەوڵیان دەدا خۆیـان بگەیەننـە ئـەو سوپایەو بەرئەو مژدەیە بکەون.. تا ئەوەبوو لەسەردەمی عوسمانیەکاندا ئەم ئاواتـە هاتەدی.

ئەوەتـە روسـیای شـیوعی گیـانی پێـشبڕکێ و منافـسەی ئـابوری لـەناو گەلـدا کوشت و کەس بەگەرم و گوڕی لێنەنەوی تاخۆی دەوڵەمەند بکات. بابای دەوڵەمەند ئـەیووت (ناهەقیـشی نـەبوو) (جـامن بـۆ ژیـان لـەخۆم تـاڵ بکـەم و پـارەو پـول بنـێم بەیەکـەوە خـۆ هـەموو یەکـسانین..) هـەر ئـەوەش بـوو روسـیاو بۆچوونەکەشـی لەعالەمدا پفی ایکراو بلۆکی شەرقی داڕما..

بەڵام پرۆگرامی ئیسلام هـانی خەڵکی دەدات تا لەهـەژاری و لاتـی خۆیـان ڕزگـار بکـەن و دەوڵەمەنـدبن وەك مـەدحی دەسـتی ڕاسـت و بەخـشندە دەکـات و دەفەرموێت: (یدالعلیا خیر من الید السفلی)(١)

زانایانی سیرە بۆمان دەگێڕنەوە کە هاوەڵەکانی (پێغەمبەر)مان خوایـان لێ ڕازی بێ پێشبڕکێ و مونافەسەی یەکتریان کـردووە لـەکاری خێرداو هەریەکـەو هـەوڵی داوە خۆی ئەو کارە بکات و نەهێڵێت کەسی تـرپێش ئەو بیکات!.. وەك ئـەو پێش بڕکێیـەی لـەنێوان عمـرو ابـوبکردا ڕوویـدا لەسـەر خزمـەتکردنی پیرەژنێکـی پەککەوتەی ناو شاری مەدینە کە -عمر- لەکۆتاییدا دان بەوەدا دەنێت کە هەرگیز پێشت نادەمەوە ئەی -ابوبکر-!!..

هـەروەها لـەکاروبارو بانگـەوازی ئیـسلامیدا بـانگخوازان ئـەتوانن ئـەم ڕێگایـە بەکاربهێنن بۆبـەرەوپێش بردنـی بانگـەوازی ئیـسلامیو زیـاتر بەجەماوەری کردنـی کۆمەڵگاکەیان.. ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین ئیسلامییەکانی گۆڕەپانی کوردستانی عێـراق لەسـاڵی (٩٩١ تـا ٩٩٥).. کاریـان ڕۆژ بـەڕۆژ گـەورەترو گەشـەدار تردەبـوو چونکە جۆرە (منافسە)یەك هەبوو لەکارو چالاکی نواندندا بۆیە دەبینی لەوماوەیەدا

زیاتر لە (١٠٠) شانۆگەری نمایش کراوەو زیاتر لە (١٥٠)کاسێتی سرود تۆمار کراوەو سەدان کۆروسیمیناری جیا جیا دەگیرا بەڵام لەو ساڵانە بەدوا (منافسە) نەماو هەموو لایەنێك خوا خوای بوو کەمتر چالاکی بنوێنێت تا مەسروفی کەمتری تێ بچێت..

لەکۆتاییدا حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە کێ بەرکێ (منافسە)ی شەرعی بەم شێوەیەی پێشووەکە باسمان کرد بەڵام منافسەی حەرام ئەوەیە لەسەر زەم کردنی خەڵکی شکاندنیو کەسایەتیان پێش برکێ بکەن! یان پاشقول لەیەك گرتنو پاشەملە باسی یەکتر کردن و کۆسپ و تەگەرە خستنە ڕێگای یەکتری حەرامەو خوا پێی ناخۆشە با مەبەستیشی خێرو چاکەبێت..

## بەشی دووەم:

## ((٩) ڕێگا بۆئەوەی ڕەشۆی خەڵکی بگریتە دەست بەبێ ئەوەی ئازاریان بدەیت یان توڕەیان بکەیت)

١-مەدح و سەناو ڕێزلێنانێکی دڵسۆزانە بخەرەپێش داواکاریەکانت.

٢-بەشێوەیەکی پەنهانی و ناراستەوخۆ هەڵەی خەڵکی راست کەرەوە.

٣-لەبارەی هەڵەی خۆتەوە بدوێ پاشان هەڵەی بەرامبەر باس بکە.

٤-ڕاستەوخۆ فەرمان دەرمەکە بەڵکو پێشنیاری ژیرانە دەربڕە.

٥-هەوڵ بدە ئاوی دەم و چاوی بەرامبەرەکەت نەتکێ.

٦-چاکەی خەڵکی گەورە بکەو ڕۆبچۆ لە (مەدح)کردنیاندا.

٧-بەرامبەرەکەت بەچاکە ناوبەرە، هەوڵ دەدات خۆی چاکی بکات.

٨-ئەوکارەی دەتەوێت ڕاستی بکەیتەوە وادەربخە کە ئەو ڕاست کردنەوەی ئاسانە.

٩-ئەوکارەی دەتەوێت بۆت بکەن جوان و خۆشەویستی بکە لەلایان..

## ڕێگای یەکەم:

## ( مەدح و سەناو ڕێزلێنانێکی دڵسۆزانە بخەرەپێش داواکاریەکانت )

جارێکیان هاوڕێیەکم لەکۆشکی سپی میوان دەبێت لەسەردەمی (کالفن کولرج)دا، لەکاتێکدا بەرەو نوسینگەی سەرۆك بەرێ کەوتبوو گوێی لێبوو (کولرج) بەیەکێ لە خانمە سکرتێرەکانی خۆی دەووت: بەراستی ئە م جلانەی لەبەرتدایە زۆر جوانن و کەشخەو سەرنج ڕاکێشن!!.

وادەزانم ئەمە یەکەمین مەدحێکە (کالەبێدەنگ) لە ژیانیدا پێشکەشی سکرتێرێکی خۆی کردبێت! ئەم مەدحە شتێکی ئاسایی و چاوەڕوان کراو نەبوو، تەنانەت ئەو خانمە لەخۆشیاندا شانە لەرەی پێکەوت و لەخۆشیدا نەیزانی چ وەڵامێکی بداتەوە!!. کولرج بەردەوام بوو پێی ووت: وشك مەبە بەم جۆرە! ئەوەم بۆیە ووت کەمێ خۆشی بخەمە دەرونتەوەو تکام وایە لەم ڕۆبەدواوە ئاگات لەکاتەکانی کاربێت!.

وابزانم هیچ کەسێك لەئێمە نارەحەت نابێت وپێی ناخۆش نییە کاتێ ناتەواوی یان هەڵەیەکی خۆی پێ دەڵێیت بەمەرجێك لەپێشەوە پیاهەڵدان (مدح)ێکی بکەیت ئیتر باکەمیش بێت..

کاتێ (ماکنلی) پاڵێورا بۆ سەرۆك کۆماری بێ کەم و زیاد ئەم ڕێگایەی بەکارهێنا لەگەڵ ئەو گەنجە خوێنگەرمەی سەربەحیزبەکەی کە وتارێکی نووسی، ئەم گەنجە باوەڕی وابوو ئەم ووتارەی لەنووسینەکانی (شیشرون) و (باتریك هنری) (دانیل و بستر) بەهێزترو بەلاغی ترن!.

پاشان ئەم لاوە هەستا بەخوێندنەوەی وتارەکەی لەبەردەمی (ماکنلی)دا بەشێوازێکی حەماسی، ڕاستە ئەم ووتارە هەندێ بەپێزی و جوانی تێدابوو.. بەڵام زۆر سادەبوو ئەگەر بهاتاو لەناو جەماوەردا بیخوێندایەتەوە یەك گەردەلولی ڕەخنەی دەهێنایە سەر خۆی و حیزبەکەشی!. ماکنلی نەیوویست هەستی ئەم لاوە

برینـدار بکـات و نەشـی وویـست ئـەم گـوڕو تینـەی تیـا بکوژێـت.. ئـەی چـۆن چارەسەری ئەم کۆسپە بکات؟

ماکنلی بەلاوەکەی ووت: (کوڕی خۆم، ووتارەکەت بەڕاستی جوانەو باوەڕناکەم هـەموو کەسـێ وتـاری وای بۆبێـت) زۆر جێگـا هەیـە پێویـستە ئـەم ووتـارەی تێـدا بخوێنرێتەوە؟!

بەڵام ئایا تۆ وادەزانیت کە ئەم ووتارەت بۆ ئەو جەماوەرە گەورەیە دەشێت کە بەسـەریاندا بخوێنرێتـەوە!؟. مـن ڕێـزی بیروبۆچوونی تـۆ دەگـرم.. بـەڵام خۆدەبێـت ڕێزیش لەبیروبۆچوونی حیزب بگرین، خۆزگە کوڕی خـۆم لەماڵـەوە جارێکیتر دای بڕێژیتـەوە بەوشـێوازەی مـن پێـشنیارت بـۆ دەکـەم و لەپاشـدا بـۆت بناردمایـە تاسـەیرێکم بکردایـە؟ گەنجەکـە بـەم کـارە هەسـتا، مـاکنلیس قەڵەمـە شـینەکەی خستەکارو خەتی دەهێنا بەژێریاندا داوای لێدەکردەوە جارێکیتریش دەستکاری بکاتــەوە، ئەوەنــدە ئــەولاوەی هێنــاو بــردی تاووتارەکــەی بــۆ والــێ کــرد کــە سەرکەوتووترین و جوانترین ووتاری ئاهەنگەکە دەرچوو!..

هـا ئـەوە دووەمـین نامـە بەناوبانگەکـەی (ئیراهـام لنکـولن)ە نامـەی یەکەمیـشی بۆ(مستر بکنسی) نووسی کەتیایدا داخ پەژارەی خۆی دەربڕیبوو بەبۆنەی کوژرانی هەر پێنج کوڕەکەی لە گۆڕەپانی جەنگ!.

لەوانەیە لنکولن نامەکەی لەماوەی (٥) دەقیقەدا نووسبێ بەڵام لەساڵی (١٩٢٦) دا لەمەزادێکی ئاشکرادا فرۆشرا بە (١٢) هەزار ریاڵ! کە ئەمـەش پارەیەکە لنکولن شەو ڕۆژ ئیشی بکردایە بە (٥٠)ساڵ بۆی کۆنەدەکرایەوە!.

(لنکـولن) ئـەم نامەیـەی لـە (٢٦)ی نیـسانی (١٨٣٦)دا نووسـی کـە بـەتاڵترین و تاریك ترین سەردەمی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا ناوزەد دەکرێت! (١).

(سوپای یەکێتی)(٢) لەتێك شکانێکەوە بەرەو تێك شکانێکیتر سەرسمتی دەداو لەجەنگێکی خۆترێنەوە بەرەو جەنگێکی ناهەموارتر ملی دەنا!

هـەموو خـەڵکی واقی وڕمـابوو کـاتێ دەیـانبینی ڕۆڵـەکانیان بـەرەو مـردن ڕاپێچ دەکرێت و هـەزاران سەرباز لەسـەربازی هـەڵهاتوون، هـەمووی (جمهوری)یـەکان کـە

ئەنـدام بـوون لـەكۆنگرەی پیرانـی ئەمەریکیـدا تـوڕە بوبـوون و داوای لادانـی (لنكولن)یان دەكرد لەكۆشكی سپی!

ئالەم كاتە ناهەموارەدا لنكولن نامەكەی نووسی كەتیایدا دەڵێت:

(من واهەست دەكەم لەكەناری لەناوچوونێكی یەكجاری داین كۆمەك و یارمەتی خوایی دوژمنایەتیمان دەكات من لەم شەوەزەنگەدا یەك تروسكی روناكی بەدی ناكەم)!

لەم باسەدا ئەم نامەیە دەخەمە ڕوو تا دەربكەوێت بۆ خوێنەران كە لنكولن چۆن توانی عەقڵیەتی سەركردەیەكی خراپ بگۆڕێت بەرەو چاكی كە پاشەڕۆژی یەك میللەت بەسترابوو بەغیرەت و جوامێری ئەوەوە.

لەوانەیە ئەم نامەیە ڕەق ترین نامەی لنكولن بووبێت لەماوەی سەرەك كۆماریدا، كەچی بە (مەدح) و پیاهەڵدانی جنراڵ (هوگر) دەست پێ دەكات و پاشان داواكاری و ووتەڕەقەكانی بەدوایدا دێنێت..

بەڵێ، هەڵەی هوگر زۆر زل و ناقولاو ترسناك بوو.. بەلام لنكولن بەهیچ شێوەیەك لەم بارەوە قسەی نەكرد، جا فەرموون لەگەڵ سەرەتای نامەكە:

بێگومان كاتێ من تۆم هەڵبژارد بۆ سەركردەیی سوپاكەم دڵنیابوو كە تۆ شایانی ئەو شوێنەیت. لەگەڵ ئەوەشدا وام پێ چاكە لەبارەی هەندێ مەسەلەوە قسە بكەم بۆت كە بەتەواوی لەو شتاندا لەگەڵتدا نیم!

باوەڕی تەواوم هەیە بەكارزانی و ئازایەتی و لێهاتوویت و شایانی ئەو پلەو پایەیت و هەرگیز لەمەدا گومان ڕووم تێ ناكات! جگە لەمەش لەبەرهۆیەكی تریش من تۆم خۆش دەوێت چونكە سنوری كاری سیاسی و كاری سەربازی تێكەڵ ناكەیت كە تۆ لەمەشدا بە تەواوەتی پێكاوتە!.

تۆ زۆر بەتەماحی! تەماحیش ئەگەر لەسنوری خۆی دەرنەچێت ڕەوشتێكی سودبەخشەو ماقوڵ و ژیرانەیە، بەڵام من وا گومانت پێ دەبەم ئەو توڕەبوونەت لە جنراڵ (برنسید) بێ هودەو لەخۆتەوە كەنار گیرت كرد و ئەم كارەت لەبەرتەماحی

شەخصی خۆت بوو.. ئەمەش خۆت باش دەزانیت هەڵەیەکی گەورەیە بەرامبەر برایەکی هاوسەنگەرت و بەڵکو بەرامبەر وڵاتەکەت بەگشتی!.

لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوەبیستوومە ناشتوانم باوەڕی پێ نەکەم کە تۆ گوایە وتووتە سوپاو حکومەت پێویستیان بە دکتاتورێك هەیە؟! وە من بۆ ئەوە تۆم نەکردۆتە سەرکردەی سوپا!؟ بەڵکو بۆ ئەوە تۆم کردوە کەبەبێ قسە دەستی خۆتی بخەیت! چونکە سەرکردە سەرکەوتووەکان مافی ئەوەیان هەیە ببنە فەرمانڕەوای تەواو موتڵەق ئەوا ڤیروسیا من دەستەڵاتی تەواو دەبەخشم پێت بەڵام بەومەرجەی سەرکەوتنمان بۆ بەدەست بهێنیت!.

ئەوەش بزانە دەوڵەت ئەوپەڕی پشتگیریت لێوەدەکات، وەك چۆن سەرکردەکانی تری پشتگیری کردووە! و ئەوەی من نیگەران دەکات ئەوەیە کە ترسم ماوە لەوەی دیسان ئەو گیانی ڕقە بەرایەتییەی تۆ لەناوسەربازەکاندا دروستت کرد بەجۆرێ کەسیان باوەڕیان بەسەرکردەکەیان نەما جارێکیتر لەناو سوپادا گەشە بکاتەوە!.

لەوەش دەچێت نابلیون ئێستا زیندوو بوویایە ئەویش نەیدەتوانی سەربازەکانی توندو تۆڵ بکاتەوە لەڕێگای ئەوکارەی تۆ ڕقەبەرایەتیت لەناو سەربازگەدا دروست کردوە!

ئاگات لەتێڕمان و هەڵەشەیی بێت، بەشێوەیەك بڕۆ پێشەوە نەوین و تێك شکان بە سەرتدا نەیەت بۆ پێشەوە و هێرش بەرەو سەرکەوتنمان بۆ تۆمار بکە.

خوێنەری بەڕێز تۆ نە (کولوج) و نە (ماکنلی) و نە (لتکولن) ی، ئایا دەتەوێت ڕێگایەکت پیشان بدەم تا لەژیانی ڕۆژانەتدا ئەم فەلسەفەیە بەکار بهێنیت؟.

زۆرچاکە، نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە:

بەسەرهاتی مستر (جو) وەربگرە کە هاوڵاتییەکی سادەی وەك من و تۆ بوو خۆی لەبەردەم پۆلدا ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە:

کۆمپانیای (دارك) بۆ دروست کردنی بیناو خانوو, من تیایدا کار دەکەم بەڵێنی تەواو کردنی بینایەکی گەورەی گرتە دەست بۆیەکێ لەدەزگاکانی فیلادلفیا تەرخان کرابوو بەڵێنەکەش ماوەی دیاری کراوی بۆ دانرا، بینا لەتەواوبووندا بوو تەنها

رازاندنەوەو جوانکردنی بەردەمەکەی مابوو ئالێرەدا بەڵێنـدەری جوانکـاری -مقـاول الزخارف- بلاوی کردەوە گوایە لەو ماوە دیاری کراوەدا ناتوانێت تەواوی بکات و بیداتەوە دەستمان!!..

تەلەفون و تەلەفون کاری هاتە ئاراوە، دەمەقاڵەو هەرەشەو توڕەبوون پەرەی سەند، بەڵام هیچ کەڵك و سودی نەبوو!..

پاش ئەوەی کۆمپانیـامنی دەستنیـشان کـرد تـا بـڕۆم بـۆ نیویـورك و (شێری برۆنز)ببینم و قسەی لەگەڵدابکەم!.. هەرکە چوومە ژوورەوە بۆ نووسینگەکەی پێم ووت: ئـەم بەیانییـە کـاتێ لەشـەمەندەفەرەکە دابـەزیم گـەڕام بـەدوای ناونیـشانی بەڕێزتاندا لەدەفتەری ژمارە تەلەفونەکاندا دۆزیمەوە سەیر دەکەم تۆ ناوشۆرەتێکت هەڵگرتووە هەرگیز کەسم نەبینیوە ئاوا ناوشۆرەتی جوانی وای بووبێت!.

ناوچاوی بازرگانی گەورە وەك شەبەقە گوڵ گەش بوویەوە و لەخۆشیاندا ووتی: بەڕاستە؟ ئەو نـاوە نـاوێکی سـادە نییـە! بەڵکو ئـەم خێزانـەی ئێمـە دوو سـەد سـاڵ لەمەوبـەر لەهۆڵەنـدەوە هـاتوون و لێـرە جێگیربـوون! پاشـان دەسـتی کـرد بـە بـاس کردنـی مێـژووی خێـزان و باوبـاپیرانی.. پاشـان لێبوویـەوە.. سەرسـامی خـۆمم دەربـڕی بەرامبـەر گـەورەیی و شـکۆداری کۆمپانیاکـەی و بـەراوردم دەکـرد لەگـەڵ هەنـدێ کۆمپانیـای تـردا کـە دیبووم! ئـەویش ووتـی: هـەموو عـومرم خستە پێنـاو دامەزراندنی ئەم کۆمپانیایە، و شانازی پێوە دەکەم! ئەگـەر پێت خۆشە باگـەڕانێك بـەناو کارگەکـەدا بکـەین؟ لـەکاتی گەڕانەکەمانـدا، هـەر شـتێکم دەکەوتـە بەرچـاو سەرسـامی و ڕێـزی خـۆمم بەرامبـەری دەردەبـڕی، کـاتێ لەجەولـە کەبووینـەوە بەریوەبەر زۆر داوای لێکردم کە نیوەڕۆ لەماڵیان بمێنمەوەو دەعوەت بم!! پاش نان خـواردن پێـی ووتم: ئێـستا بـا دەسـت بکەینـەوە بـەکار بێگومـان بـۆم دەرکـەوتووە بۆچـی هاتوویـت، بەڕاسـتی گومـانم نـەدەبرد ئـەم سـەردانەت ئەوەنـدە بـەتام و بەچێژبێت؟!

ئێـستا دەتوانیـت بگەڕێیتــەوە بــۆ فیلادلفیــاو بــەڵێنت پێــدەدەم لــەکاتی دیاریکراودا هەموو شتێك دەگاتە ئەویو تـەواوی دەکـەین هەرچەندە ئەمـە دەبێتـە هۆی دواخستنی هەندێ کاری ترمان!.

بینا تەواوبوو تەسلیم کرا! ئایا ئەمە بەئاسانی ڕوویدەدا ئەگەر مستر (جو) ئەم ڕێگا کاریگەرەی بەکارنەهێنایە؟

کەواتـە بۆئـەوەی جڵـەوی خـەڵکی بگریتـە دەسـت و بیـانجوڵێنی بـەبێ ئـەوەی زیانیان لێ بدەیت یان توڕەیان بکەیت بڕگەی ژمارە (١) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

(مەدح و سەناو ڕێز لێنانێکی دڵسۆزانە بخەرە پێش داواکاریەکانت)

# پاشکۆی ڕێگای یەکەم
# بەهەڵە هەڵە چاك مەکە

ئیسلام واڕامان دەهێنێت کە پێش ئەوەی هەڵەیەك ڕاست بکەینەوە یان فەرمانێك دەربکەین جوانتر وایە ووشەیەکی جوان و دڵخۆشکەر پێش بخەین وەك کلیل وابێت و دڵی بکاتەوە بۆ وەرگرتنی فەرمانەکەمان!.

(پێغەمبەر) ﷺ ویستی شتێك فێری مەعازی کوڕی جەبەل بکات، بەڵام یەکسەر پێی ناڵێت بەڵکو لەسەرەتاوە ووتەیەکی مزری دڵخۆش کەری پێ دەڵێ و پاشان فەرمانەکەی پێدەڵێت!.. بۆیە پێی دەفەرموێت (یا معاذ انی أحبك! فقل دبر كل صلاة اللهم اعني على ذكرك وشكرك و حسن عبادتك) واتەی ئەی مەعاز من تۆم زۆر خۆش دەوێت!! لەپاش هەموو نوێژەکان ئەم دوعایە بخوێنە (اللهم..)!

بۆیە هەمووکاتێك مەعاز ئەم دوعایەی نەخوێندایە خێرا ئەو قسە خۆشەکەی دەکەوتەوە بیر کە (پێغەمبەر) پێی فەرموو بوو: (مەعاز من تۆم زۆر خۆش دەوێت)و ئیتر دوعاکەی دەخوێند!.

زۆربەی باوکان کاتێ هەڵەی منداڵەکانیان ڕاست دەکەنەوە ئەم شێوازە جوانەی قورئان بەکارناهێنن.. بۆنموونە: باوکەکە دەڵێت بەکوڕەکەی: کوڕم نوێژەکانت نەفەوتێنیت ئەگینا لێت دەدەم! یان تۆ نوێژ ناکەی کافری موتڵەق بوویت!

یان: جارێکی تر ببینم جگەرە بەریت بۆ لێوت لێوت دەبڕم تێگەیشتی؟!.

یان: سبەینێ بەڕۆژوونەبیت دەرت دەکەم! یان گوێیەکت دەبڕم و دەیخەمە مشتت!..

ئەم ئامۆژگاریە لارانە لەکوێ و ئەو ئامۆژگاریە هەنگوینی و شیرینە لەکوێ کە مرۆڤ حەز دەکات گوێی بۆ بگرێت و گوێڕایەڵی بێت ! بۆنموونە: باوکت دەڵێت: کوڕی خۆم ئەی پارچەیەك لەجگەرم.. ئەزانی من زۆر تۆم خۆش دەوێت ساتێ بەبێ تۆ هەڵناکەم و شێت دەبم، ئەترسم لەودنیا یەك نەبینینەوە چونکە تۆ نوێژەکانت کەم کەم دەفەوتێنیت!!..

عمری کوری عبدالعزیز.. خوا لێی ڕازی بێت ئەم ڕێگایەی بەکارهێنا لەگەڵ خەوارج و باغیو لەهەق لادەران و توانیویەتی تەوبەیان پێ بکات و بیانهێنێتەوە ڕیزی موسڵمانان. ئەمەی چۆن بۆ دەچوە سەر ؟.. لەم نمونەیە سەرنج بدە :

کاتێ هەردوو نوێنەری خەوارج –شوذب و عاصم– هاتن بۆلای عمرو چەند قسەیەکی لەگەڵ کردن دەبینێ قسەبێسودە لەگەڵیان زۆر کەللە ڕەقن و لەدین لایان داوە بۆیە دەبینێ شایانی بەزەیین ئەم ووشە بەسۆزو میهرەبانیانەی لەگەڵ بەکارهێنان و ووتی پێیان:

(من دەزانم ئێوە لەم بۆچوونەتاندا نیەتتان پاکەو مەبەستتان ڕەزامەندی خوایەو قیامەتتان لەپێش چاوگرتووە بۆتەماحی دنیاو ناوشۆرەت ئەم ڕێگایەتان هەڵنەبژاردووە! ئەوەندە هەیە حەزدەکەم دابنیشین و پێکەوە بکۆڵینەوە تا لایەکمان بگەینە ئەنجام و هەردوولامان وەری بگرین چونکە من وادەبینم ئەگەر ئێوەش ڕاستیتان بۆ دەرکەوت یەکسەر بەبێ پێچ و پەنا و تەئویل دەچنە سەری کە ئەوەش ڕەوشتی هەق ناسانە!

ئەوەبوو (پاش لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانەو پڕ لەڕێزو میهرەبانی هاتنەسەر قسەکانی (عمر)و وازیان لەخەوارجەکان هێناو هاتنەوە سەر ڕێگای ڕوونی قورئانو سوننەت!.

ئایا دەزانن (شوذب و عاصم) کێ بوون؟ ئەمانە کەسانێك بوون کەسەرجەم هاوەڵانیان بەکافر زانیوە پەنا بەخوا! ئیمامی عەلی یان بەبێ باوەڕ لەقەڵەم داوەو مرۆڤیش بەگوناە کردن کافر دەکەن و ئەگەر نەگەڕێتەوە بەهەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوە!!.

ئایا لەخۆتت پرسیوە ئامادەییم تیایە ئەگەر کەسێکی ئاوا هاتنە لام بەشێوەیەکی جوان و لەسەرخۆ لەگەڵیان دابنیشم و قسە بکەم؟ دەی ئایا بۆچی لەگەڵ برا موسڵمانەکەتدا لێکۆڵینەوەی بەسۆزو میهرەبانی ناکەیت؟ خۆ ئەوان هەرگیز لەخوارج خراپترنین!

من لەوکاتەدا کە خولیای ئەوەبووم کەبزانم چۆن هەڵس و کەوت بکەم لەگەڵ خەڵکی و لەسەرخۆ بەرەو گوڵزاری ئیسلام بیانهێنمەوە بەبێ ئەوەی زۆر کردن یان تووڕەکردنی لەدوابێت و ساڵەکانی (٩٣-٩٤) بوو خەریکی وەرگێڕانی ئەم نووسراوەی دیل کارینجی بووم. چاوم دەخشاند بە گۆڤارە ئیسلامییەکانی لەمەر خۆماندا تا بزانم تا چ رادەیەك حساب بۆ دەروونی خەڵکی دەکەن دەبینم زۆر داماوون لەمەسەلەی هاوڕێگرتندا و زۆر لیهاتوون لەمەسەلەی هاوڕێ لەدەستداندا!!.

لەگۆشەی وەڵامی خوێنەراندا دەینووسی: بۆ فلان کەس لەفلان شوێن ئەو بابەتەی بۆت ناردوین زۆر کۆنە و لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆدا ناگونجێت!!

یان ئەو هۆنراوەیەی بۆت ناردووین زۆر لاوازە! و وادیارە تازە شاعیریت و بەم هۆنراوەیەت ویستووتەلەپڕێ ببیتە کوڕێ!! قەڵای شاعیران سەختەو بەئاسانی نایگەیتێ!!

یان دەڵێ: ئەوباسەی تۆ نووسیوتە زۆر کورتەو ئەو مەسەلەیە ئاوی زۆری دەوێت و کەسی خۆی دەوێت بەتێروتەسەلی لەسەری بنووسێت!!.

ئەمانە هەموو دڵ ڕەنجێنەرن و هاوڕێ لەدەست دەرن و زۆر نووسەریان لەنووسین خستووەو قەڵای ئاواتەکانیان ڕوخاندوە! کەچی لەبەرامبەردا هەندێ لەگۆڤارەجیهانییەکان هەزاران دۆلار تەرخان دەکەن بۆ نزیك کردنەوەی جەماوەر لەگۆڤارەکانیان ئەمەش بەهێنانی کەسانی ژیرو قسەزان و دەم هەنگوینی! ئەم جۆرە کەسانە گۆڤارەکان شەڕیانە لەسەریان!

کەواتە لەمەوبەرقەیناکا بەڵام لەمەولا ئەگەر هەڵەت لەیەکێ گرت یان ویستت کارێکی خراپەی لێ دوورخەیتەوە یان کارێکی چاکەی پێ بکەیت با لەپێشەوە وتەیەکی جوان و دڵڕفێن بەکار بهێنیت! ئەوجا چیت دەوێت لێی بۆت دەکات.

## ڕێگای دووەم:

## (چۆن ڕەخنە لەخەڵکی دەگریت و ڕقیشیان لێت هەڵنەسێت؟)

ڕۆژێ لەڕۆژان کاتی نیوەڕۆبوو (تشارلس شواب) دەگەڕا بەناو کارگەیەکیدا کە خۆی سەرپەرشتی دەکرد چاوی هەڵتەقی بەهەندێ کرێکاردا جگەرەیان دەکێشا! کەچی بە ڕاسەریشیانەوە بەخەتێکی گەورە نووسرابوو (جگەرەکێشان قەدەغەیە)!!..

ئایا شواب توڕەبوو لەکرێکارەکان و بڵێت: ئەوە نەخوێندەوارن؟ ئەوە کوێرن ئەو تابلۆیە نابینن؟! نەخێر شواب لەو کەسانە نییە کاری وابکات! بەڵکو چووە ناویان و یەکی جگەرەیەکی کەشخە و گرانبەهای دابەدەمیانەوە و پێی ووتن: (هاوڕێیان ڕێزی ماندوو بوونتان دەگرم ئەگەر بفەرموون لە هۆڵەکەی دەرەوە جگەرەکانتان بکێشن)!

هەر لەوێدا کریکارەکان بۆیان دەرکەوت مەبەستی چییە، زۆر مەزن بوو لە لایان کەوەك هەندێ کەس ڕێگای تۆڵە و سەرزەنشتی بەکار نەهێناوە کە بۆیشی هەبوبیکات ئایا چارەیەکی ترت هەیە جگەلە خۆشویستن و گوێرایەڵی کردن بۆ وێنەی ئەم پیاوە؟! (جۆن دانامایکۆ) هەمان شێوازی شوابی لەگەڵ کریکارە کانیدا بەکارهێناوە، هەموو بەیانی یەك کردبووی بەعادەت سەری دەدا لەبازاڕە بازرگانی گەورەکەی و پاشان دەڕوشت بەدەم کاری تریەوە. بەیانی یەکیان سەیری کرد کڕیارێك وەستاوە وشمەکی دەوێت کەس نییە بچێت شتەکەی پێ بفرۆشێت! سەیری ئەم و لاو لای خۆی کرد دەبینێ لە تەنیشت دوکانەکەیەوە هەموو کارمەندەکان دانیشتوون وقسەی خۆشی لێ دەکەن!

(داناMایکۆ) یەك قسەی لەگەڵ نەکردن و لێیان توڕە نەبوو... بەڵکو لەدیوارەکەوە خۆی هەڵدایە ئەو دیوەوەو فەرمووی لە کڕیارەکە کرد و شتەکانی پێ فرۆشت بەڵام دای بە یەکێ لەو کرێکارانە تابۆی بخاتە زەرفەوە!. ئەمەی کرد و بەبێ دەنگی بەجێ هێشتن!!.

لەهەشتی مایۆی ساڵی (١٨٨٧)دا گەورەترین و لیهاتوو ترین ووتاربێژ (هنری واردبێتشر) داوای لە (لیمان ئابوت)کرد کەڕۆژی یەك شەممە لەباتی ئەو وتار بخوێنێت.

لیمان شڵەژاو ئاگری تێ بەربوو، بەهەڵە دەوان هەوڵی دەدا خوتبەیەکی سەرکەوتوو بدات.. جارێك نووسییەوە! ئەوەشی گۆڕی و سەرلە نوێ نووسی یەوە! ئەوەندەی پێ کرا ووتارەکەی ڕازاندەوەو جوانکاری تێدا کرد، پاشان لەبەردەمی خێزانەکەیدا خوێندیەوە بەڵام ووتارەکەی وەك هەموو ووتارێکی سەر وەرەقە لاواز و ناتەواو بوو!! بەڵام خێزانەکەی ئەگەر لەو ئافرەتە کەم زەوق و بێ هەستانە بوایە یەکسەرپێی دەگوت (لیمان) ئەمە چییە؟ ئەمە حەیابەرەیە! تۆ بەم ووتارەت دڵنیا بە هەموو خەڵکەکە دەکەیتە خەو! تۆ ئەو هەموو ماوەیە خەریکی بوویت دەبوایە وتارێکی زۆر جوانتر بوایە! تو خوا پێم بڵێ بۆ وەك مرۆڤی ئاسایی قسە ناکەیت؟ چۆنت بۆ دێ وا دابڕێژەو یەکسەر بیڵێ؟ تۆ خراپ ترین زیان لە خۆت دەدەیت ئەگەر بێت و ئەم ووتارە بدەیت!.

نەخێر ئەمەی نەووت، خۆ ئەگەر ئەم قسانەی بووتایە چاك دەیزانی چی ڕووی دەدا! بۆیە لەم تێ بینی یە زیاتر هیچی تری نەووت: بەڕای من، وام پێ چاکە ئەم وتارە بنێرێت بۆ گۆڤاری (نورس ئەمەریکا ریفیو)و مەقالەیەکی زۆر گونجاوو شیاوە!.

واتە: بەئاشکراو ڕواڵەت مەدحێکی ووتارەکەی کرد بەڵام لەژێرەوەو و بەناڕاستەو خۆ تێکی شکاند بەبێ ئەوەی هاوسەرەکەی بەخۆی بزانێت وەك ئەوەی پێی بڵێت: (بۆ وتارنشێت)! لیمان هەرلەویدا تێگەیشت و ووتارەکەی شڕو پڕ کردو کەزادەی بیرو هۆشی چەند ڕۆژێکی بوو فڕێی دا!.

هەستاو بەدەمی ووتارێکی خوێندەوەو ئەو ووتارەشی بووبە نموونەی ووتاری جوان و ڕەوانبێژی!

بۆ ئەوەی جڵەوی خەڵکی بگرێتە دەست بەبێ ئەوەی زیانیان پێ بگەیەنێت بەشێوەیەکی پەنهانی و ناڕاستەو خۆ هەڵەی خەڵکی ڕاست بکەرەوە.

## پاشکۆی ڕێگای دووەم:
## (ڕەخنە لە پشتی پەردەوە)

خوای گەورە لە جەنگی (حونەین)دا موسڵمانەکانی لەسەرتای شەڕەکەوە شپرزە کرد و شکاندنی, چونکە بە زۆری ژمارەی خۆیاندا دەیان نازی و بەتەمای شکان نەبوون.. ئەوە بوو لە بەرزاییەکانەوە کافرەکان بەڕم و تیر موسڵمانەکانیان پەرتە وازە وشڵە ژاو کرد، کەس بەکەسەوە نەماو موسڵمانەکان پشتاو پشت بۆ دواوە هەڵدەهاتن..

لەم کاتەدا (پێغەمبەر)ی خوا ﷺ و چەند هاوەڵێکی دڵسۆز لە شوێنی خۆیان نە جووڵان وشەڕی سەروماڵیان دەکرد و لەدەوری (پێغەمبەر) دەگەڕان نەوەك برینداربێت.. (پێغەمبەر) پێی فەرموون (بانگیان بکەنەوە و خۆیشی بەدەنگی بەرز هاواری لێ دەکردن دەیفەرموو (انا النبی لاکذب انا ابن عبدالمطلب) کاتێ هاوەڵان لایان کردەوە و محمدیان بینی وەك چیادامەزراوە لە ڕووی دوژمناندا و هەڵنەهاتووە.. خێرا شەرم گرتنی و غیرەت گرتنی و هاتنەوە بەگەرمی لەدوای سەرکردە کەیانەوە جەنگان تا سەرکەو تنیان بەدیاری پێ بەخشرا ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ سورەتی (الانفال) ئایەتی (١٠).

هەندێ ناسراوم هەبوو دەمبینی لە بازاڕدا و بەڕۆشتنەوە شتیان دەخوارد منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو ...

وەك زانایانی علوم الحدیث دەڵێن لە عەدالەتی موسڵمان کەم دەبێتەوە و کەسایەتی لاواز دەبێت لەناو خەڵکدا.. منیش نەمدەویست ڕاستەو خۆ وەك هەندێ کەس پێیان بڵێم: کاك فلان لەبازاڕا گوڵەبەڕۆژە خواردن عەیبە! لەمەولا مەیخۆ زۆر ناشیرینە.. تۆلای خۆی ئەهلی مزگەوتی!

دەمزانی وام بگووتایە وازیان نەدەهێنا بەڵکو لوت بەرزی و گەورەیی یان نەیدەهێشت بە گوێی هاوتە مەنێکی خۆیان بکەن و لەوانەشە لێم عاجز ببونایە و بیانووتایە خۆی کردۆتە مامۆستا بەسەرمانەوە!.

بۆیە کاتی فەرمووی گوڵەبە ڕۆژە شیان لەمن دەکرد تامنیش وەك ئەوان بیخۆم! منیش لەوێدا تەریقم نەدەکردنەوە وبڵێم: دەی منیش وەك خۆتان لێ بکەن وبمکەن بە چەورەی بازاڕ! من شت ناخۆم بەڕێگاوە)! بەڵکو بەسوپاسەوە لێم وەردەگرتن! بەڵام یەکسەر دەمکردە باخەڵم و نەمدە خوارد و پاشان دەگەڕامەوە بۆ ماڵ دەستم دەکرد بە خواردنی! هەندی جاریش بەبەرچاویانەوە گوڵەبەڕۆژەم دەکڕی و فەرمووشم لەوان دەکرد بەڵام نەمدە خوارد لەبازاڕدا..

یەکێ لەوانە پاش چەند مانگێك پێی گوتم زۆر سوپاست دەکەین! بەڕاستی وانەیەکی بێدەنگت دادایین و زۆر سودمان لێ وەرگرت و ئێمەش ووتمان مادەم ئە و بەعیبی دەزانیت بە خوا عەیبە بۆ ئێمەش ئەی ئێمە چیمان لە ئەو کەمترە؟!..

کەواتە (دیوار بە تۆمە و پاسار گوێت لێ بێت) زۆر بەسوودە..

## ڕێگای سێیەم:
## (یەکەم جار بیرێك لەهەڵەکانی خۆت بکەرەوە)

بۆ چەند ساڵێك دەڕوات کچەکەی مامم (دوزفین)لە (کانساس)ەوە بەرەوە نیویورك کەوتەڕێ تاببێتە سکرتێری من، تەمەنی (١٩)ساڵان بوو.. بۆ سێ ساڵ دەرۆشت خوێندنی تەواو کردبوو، سەلیقەو ژیری و وردەکاری لەهیچ باشتربوو! کەچی ئەمڕۆ بووەبە یەکێ لە سکرتێرە سەرکەوتووەکانی ئەمەریکا..

جارێکیان تازە هاتبوو ویستم ڕەخنەی لێ بگرم لەسەر بۆ چونێکی بەڵام کتوپڕ بێدەنگ بووم و بەخۆمم ووت: ساتێك بەیارمەتیت ئەی دیل! تەنها یەك سات! تەمەنی تۆ دووبەرامبەری تەمەنی دۆزفینە، سەلیقە و ژیری و تاقیکردنە وەکانی ژیانی تۆ چەند جارەی ژیانی ئەو گەنجەیە! ئیتر چۆن دەتەوێت ئەو هەژارە بێ کەمو زیاد لە حوکمدان و هەڵس و کەوتدا وەك تۆ بیر بکاتەوە؟! خۆ هەر چۆنی ببێ ئەوەی هەیە زۆر بێ فیزە! لە حزەیەك بە یارمەتیت ئەی‌دیل! ئەگەر تۆ لەتەمەنی (١٩)ساڵیدا بوویتایە چیت دەکرد! ئایا ئەوگشت هەڵە حەیا بەرانە خۆتت لەبیر چوو؟ یان ئەو هەموو گەو جێتیانەت لەبیر چوو کە دووبارەشت دەکردنەوە؟ ئەوسا تانەت لەبیرە کەفلأن کار وفیسار کارت تێدا کرد و خەجاڵەتیش بوویت؟!. کاتێ کە بێ لایەنانەو دور لە خۆپەرستی مەسەلەکەم ئەم دیو دیو دەکرد دەگەشتمە ئەو باوەڕەی کە جۆزفین لە (١٩)ساڵیدا بۆ چوونە کانی باشترو ڕاستترە لە بۆ چوونەکانی تەمەنی (١٩)ساڵی من! بەڵام داخەکەم ئەمەم دەرنە بڕی لە لایدا تاخۆشی یەك بخەمە دڵی جۆزفین!! لەو جارە بەدوا وام لێهاتبوو ئەگەر بموویستایە جۆزفین لە هەڵەیەکی ئاگادار بکەمەوە پێم دەووت: (جۆزفین لەم کارەتدا باشت نەکرد و بەهەڵەدا چویت، بەڵام خوا ئاگادارە ئەم هەڵەیەت دوو ئەوەندەی تریش زل بوایە نەدەگەیشتە ئەو هەڵە زەبەلاحانەی کاتی خۆی لەتەمەنی تۆدا کردوومن! تۆ لەگەڵ لەدایك بووتندا زانایی و دانایی و ژیریت نەهێناوە بەڵکو بەرەبەرە لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی ژیاندا فێردەبێت و بەس! تۆ زۆر باشتری لەمن کاتی لەتەمەنی

تۆدا بووم، من لەماوەی ژیانمدا کۆمەڵێك گەوجێتی و گیلێتی زەبەلاحم کردوە، تاوام لێهاتووە بچوکترین حەزم لەوە نەماوە ڕەخنە و لۆمەکاری تۆو غەیری تۆش بکەم ئایا جۆزفین تۆش وانابینی کە جوانتر ڕاستروا بووئەگەر ئەوکارەت ئاواو ئاوا بکردایە؟

باوەڕ بکە هیچ لات گران نابێت و ناڕەحەت نابیت و بەوردی گوێ دەگریت بۆ کەسێك پێش ئەوەی ڕەخنەت لێ بگرێت هەڵە و ناتەواویەکانی خۆیت بۆ ڕیز بکات! ئەو جا بیەوێت تۆ ڕاست بکاتەوە! لەسەرتاوە وا دەرئەخات خۆی بێ تاوان وبێ لەکەیە!..

سەرۆکی ئەڵمانیا (فون بولو) لەساڵی (١٩٠٩)دا ئەم ڕاستی یەی بۆ دەرکەوتبوو لەسەردەمی ئیمپراتۆری لوت بەرز و کەللە ڕەق (غەلیومی دوەم)کە زۆر سوربوو لەسەر ئەوەی کە یەك سوپای قایمی دەریایی وا دروست بکات کە جیهان شتی وای بەخۆیەوە نەدیبێت! پاشان شتێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزین ڕووی دا کە هەموو کیشوەری ئەورووپای هێنا بەلەرزە چەندان قەیرانی وای دروست کرد کە هەریەکیان بوون بە دێوەزمە یەك بەسەر سنگی جیهانەوە ئەویش ئەوەبوو ئیمراتۆر هەندێ وشەی لەدەم دەرچوو لە کاتی لێدوانێك دا لە ئینگلترا میوان بوو!.

لەهەمووی ناخوشتر لە کاتێکدا ئەم قسانەی کرد لە ئینگلترا میوان بوو هەروەها خۆیشی ڕێگای ڕۆژنامەی( دیلی تلگرافی) دا کە ئەم لیدوانانە بڵاو بکاتەوە! لەوتەکەیدا هاتبوو (لەهەموو ئەڵمانیادا ئەم تاکە کەسێکە هەست بەخۆشەویستی وسۆز دەکات بەرامبەر ئنگلیز! ئەشیەوێت سوپایەکی دەریایی وابنیات بنێت کە بەرەنگاری یابانی پێ بکات! وەتەنها ئەمیش بوو گەشتە فریای ئینگلیز و نەیهێشت لەسەردەستی فەرەنساو ڕوسیا تێك بشکێت! وەهەر ئەمیش بوو نەخشەی داڕشت بۆ (لورد و برتس) تا هێرش بکاتە سەر (ألبوير) و شکستی پێ بهێنێ لەخواروی ئەفریقیا! بۆیەکەم جاربوو لەکاتی ئاشتی دا لێدوانی ئاوا بێ تام لەزمانی پاشایەکی ئەورووپیەوە دەربچێت، سەرجەم وولاتە ئەورووپی یەکان ئاگری توڕەبوونیان تێ بەربوو، ئینگلترایش وەك شەپۆلی دەریا جموجوڵ و جمەجمی تێ

کەوت،تەنانەت سیاسەت مەدارەکانی ئەمان دەستیان بەسنگیانەوە دەگرت نەبادا دڵیان بوەستێت !!.

لەنێوان گێژەڵوکەی ئەم بارە ناهەموارەدا کەئەم قەیرانە تەنگی بەئیمپراتۆر هەڵچنیبوو، وەك پێشنیارێك بەسەرۆك فۆن بۆلی ووت: (چۆنە بەرەسمی بلاّوی بکەیتەوە و بڵێیت کەئەم وتانەی ئیمپراتۆر بۆچوونی منەو منیش وام لێکرد ئەم لێدوانانە بدات و منیش لێیان بەرپرسیارم)!..

بەلاّم (فۆن بۆلۆ) هاواری ایٚهەستا ووتی: (بەلاّم گەورەم.. نە ئەڵمانیا و نە ئینگلترایش کەس باوەڕناکات من شتیوا بێت بە دەممداو ئەوەندە سادەبم ئامۆژگاری بەڕێزتان بکەم بەشتی ئاوا)!..

(فون بولو) لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانیدا یەکسەر هەستی کرد هەڵەیەکی زۆر زەبەلاحی کرد! بۆیە ئیمپراتۆر هاواری ایٚهەستاو وەك هەورە بروسکە قیڕاندی بەسەریداو پێی ووت: کەواتە جەنابت! تۆ من بەگوێدرێژ دەزانیت و وادەزانیت من هەندێ هەڵە دەکەم هەرگیز لەتۆ ناوەشێتەوە؟!..

لەوێدا –فون بولو– هەستیکرد دەبێت پێش هەموو ڕەخنەگرتنێك مەدح و پیاهەڵدانێك پێش کەش بکرێت! هەرچەند کارلەکار ترازابوو بەلاّم شتێکی زۆر باشی کرد لەوکاتەدا کە بەدوای ڕەخنەگرتنەکەیدا مەدح و پیاهەڵدانی کرد!

بەجۆرێك وەلاّمی ئیمپراتۆری دایەوە کەپڕبوو لەسۆزو میهرەو خۆشکاندن ووتی: (من زۆر لەوەوە دورم کە ئاوا بیربکەمەوە، ئێوەی سەروەرمان لەزۆر شت و لەزۆر لایەندا لەمن لێهاتوو ترو شیاوترن! نەك هەر لەدەریاوانیو سەربازیدا بەڵکو لەزانیاریە سروشتییەکانیشدا!

زۆرجار بەسەرسامییەوە گوێم شل کردوە بۆ بەڕێزتان کاتێ باسی ئامێری پەستانی هەواتان کردوە (بارۆمەتر)! و باسی تەلەگرافی بێتەل و تیشکی (رونتجن) تان کردوە بۆم! و من زۆر بەشێوازێکی ناشرین بێئاگام گەورەم لەهەموو لقەکانی زانستە سروشتییەکان تەنانەت تەپ ناپێکم لەکیمیاو زانستە

سروشـــتییەکان! و مـــن دەستەوســـانم لـــە ڕوونکردنـــەوەی ســـادەترین دیـــاردە سروشتییەکاندا!!..

(فون بولـو) پاش کـەمێ بێدەنگی ووتـی: (بـەڵام بـۆ قـەرەبووی ئـەم زانیاریانـەی باسم کرد چەند زانیاریەکم دەربارەی مێژوو پەیدا کردووە، لەگەڵ هەندێ ڕەوشت و خودا کەلە مەیدانی سیاسەتدا بەکارم دێن بەتایبەت بۆ لایەنی دبلوماسی).

جـارێکیتر ئیمپراتـۆر ڕووی گـەش بوویـەوە ئـیێ ئـەوەبوو (فـون بولـو) مـەدحێکی باشـی کـرد بردیـە ڕیـزی زانـاو دانـا هـەرە بـەرزەکان! وەخـۆی دابەزانـد بـۆ هـەرە نزمەکان!

قەیسەری ئەڵمانیا جگە لە لێبوردن هیچ چارێکی تـری نـەما لەبـەردەم ئـەم ووشـە جوانانـەی (فـون بولـو)دا بۆیـە بەگـەرمی هـاواری کـرد:- ئایـا چـەندان جـار پـێم نـەوتوویت: (ئێمـە یـەکتر تەواوکـەرین)؟ و پێویـستە هەمیـشە پـشتی یـەکتری بەرنەدەین و بەتوندی بیگرین!) پاشان نەك جارێ بەڵکو چەند جارێك دەستی (فون بولـو)ی گوشـیو ئـەو ڕۆژە تـا ئێـوارە بـەردەوام ئەوگوڕوتینـەی هـەبوو.. بەهـەموو دەنگی هاواری دەکردو بەدەستی ئاماژەی بۆ هەواکە دەکرد و دەیقیڕاند:

(هەرکەسێ یەك ووشە بەفون بولو بڵێت یەك بۆکز دەکێشم بە لوتیدا)

ئایا ئەگەر بەکارهێنانی هەندێ ووشە کە شکاندن و نزم کردنـەوەی نەفسی تێدا دەربخـەیت و بەهەنـدێ (مـەدح) و پیاهەڵـدان بەرامبەرەکـەت بەرزبکەیتـەوە، بتوانێت ئیمپراتۆرێکی توڕەی دڵگەرم بگۆری بۆ هاوڕێیەکی دڵسۆز!. دەی بیهێنـە خـەیاڵی خـۆت کـە شـکاندنی خـۆت و پیاهەڵـدانی بەرامبەرەکـەت لـەژیانی ڕۆژانەمانـدا چ کارێکی سەر سوڕهێنەر دەکەن!..

دەی بۆ ئەوەی جڵەوی خەڵکی بگریتە دەست بەبێ ئەوەی زیانیان لێ بـدەیت یـان توڕەیان بکەیت ئەوا بڕگەی ژمارە (٢) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

(لەبارەی هەڵەی خۆتەوە بدوێ پاشان هەڵەی بەرامبەرەکەت)

## پاشکۆی ڕێگای سێیەم:
## ( پێش شکاندنی خەڵك خۆت بشکێنە )

ئیسلام زۆر هانی موسڵمانان دەدات تا نەفسی خۆیان زۆر بە بەرزو زیرەك و لێهاتوو نەزانن.. بەڵکو قورئان زەمی نەفس دەکات و نەفس فەرمانی خراپەمان لەلا جوان دەکات و حەزی لەکاری خێر نییە وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ﴾(١)(یوسف ٥٣).

بۆیە زۆر شیاوەو جێگایەی خۆیەتی کە نەفس بشکێنرێت و مەشقی زۆری دەوێت تا وامان لێدێت نەفسی خۆمان بەئاسانی بشکێنین یەکێ لەپیاوچاکان لەبازاڕەو کۆڵێکی گەورەی نابوو بەسەر شانییەوەو بۆماڵی دەبردەوە! هاوڕێکانی لێیان پرسی قوربان بۆچی خۆت هەڵی دەگریت؟ لەوەڵامدا وتی: ئەی بەچی ئەم نەفسە بەدکارە بشکێنم؟ ئادەم –علیه السلام– هەڵەیەکی کردو لەو درەختەی خوارد کە خوای گەورە حەرامی کردبوو لەسەریان.. ئەوەبوو پاش ئەوەی تاوانەکەیان ئەنجامدا. پەشیمان بوونەوە ویستیان پێکەوە داوا لەخوای گەورە بکەن کە لێیان خۆش بێت بەڵام یەکسەر داواکەیان نەکرد، بەڵکو زەلیلی و سەرشۆڕیو خۆشکاندنیان بەکار هێناو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا پێکەوە وتیان: ﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾(١) (الاعراف ٢٣).

واتە: ئەی خوای ئێمە ستەممان لەنەفسی خۆمان کرد، خەتامان کرد، ئێمە هەڵەبووین ئەگەر تۆلێمان خۆش نەبیت لەخەسارۆمەندانین!..

کەواتە لەم چیرۆکە قورئانییە مێژووییەدا وانەیەکی دەروونناسی گەورەی لێ وەردەگرین، کە (موفەسیرانی قورئان) ئاماژەیان بۆ نەکردوە مەگەر بەکەمی، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێت فریای هەڵەو غەڵەتی خۆی بکەوێت و سنوری بۆ دابنێت، هەر لەوێدا و لەبەردەمی بەرامبەردا هەڵەو نەزانی و گێلی خۆی ئاشکرا بکات

گەورەیی و زانایی و بەڕێزی ئەویش ئاشکرا بکات و جا ئەوکاتە چاوەڕوانی هەموو ئەنجامێکی باشی لێ بکات !

ماموستایەك لەکاتی وانە وتنەوەدا کەوتە هەڵەیەکی زمانەوانییەوە، زۆرێ لەقوتابیەکان هەستیان پێکرد بەڵام نەیان ویست لەبەردەمی پۆلدا ماموستاکەیان بشکێنن و بیخەنەوە بەدرۆدا!!.

بەڵام قوتابیەکی بێ سەلیقەو بێ زەوق وەك فیشەکە شێتە بێ پەردەو بەشێوازێکی بێتام بەماموستا دەڵێت: ماموستا غەڵەتت کردو ڕاستییەکەی ئەمەیە کە من لەسەر تەختە دەینووسم!!

ماموستا لەوێدا سوپاسی نەکرد چونکە بێشەرمی و بێئەدەبی نواندوەو شێوازی هەڵس و کەوتی شێواندوەو لەبەردەمی قوتابیەکاندا لەڕێزی ماموستای کەم کردۆتەوە! پێی ووت: بەڕای تۆ من تەمەڵم و هیچ نازانم و جەنابت فێرم دەکەیت ها؟ بڕۆرەوە تا باوکت نەهێنیت نەیەیتەوە!.

لێرەدا قوتابیەکی زیرەك و ژیر ئەگاتە فریای وەزعەکەو هەڵەی هاوڕێکەی ڕاست دەکاتەوە بۆیە بەئەدەبێکی جوانەوە هەستایەسەر پێو بەماموستی گوت: ماموستاگیان بەیارمەتی خۆت ئەم هاوڕێ یەمان مەبەستی ئەوەنەبوو کەتۆ زیرەك نیت و پسپۆڕنیت لەمادەکەی خۆتدا، نەخێر بەڵکو کاتێ تۆ زانابوویت و زانستت وەرگرتووە ئێمە منداڵ بووین لەبێشکەدابووین! تۆقورسایی هەموو قوتابیەکان عیلمت کۆکردۆتەوە لەسنگی خۆتدا، ئێمە هەموو گوێ لەتۆ دەگرین و عیلم لەتۆوە وەردەگرین و ئەوە ڕای خۆیەتی و ئێمە لەسەرمان نی یە لەقوتابیەوە هیچ وەربگرین، پاشان ئەم قوتابیە زۆر بێ ئاگایە لەجیاوازی زانایان و لەوانەیە چەندان مانایان دانابێت بۆ ووشەیەك کەتۆ بەدوور درێژی لەزانکۆدا خوێندووتە و ئێمە هەرنەشمان بیستوون! بۆیە لەوانەیە بۆچوونی هەردووکتان ڕێی تێ بچێت..

لێرەدا ماموستا وەك شەبەقە گوڵ گەش بوویەوەو ڕوی کردە قوتابیەکان ووتی: ئەم قوتابییە ڕاست دەکات و وایە!! بەهەرحاڵ من سوپاسی هەمووتان دەکەم لەسەر پێش کەش کردنی سەرنج و پێشنیارەکانتان لەسەر وانەکە!..

دەبا من و تۆش سبەینێ دەڕۆینە ناو کۆمەڵگاوە ئەم ڕێگایە ئیش پێبکەین و نەڵێین: نەیخوات تاڵە من لەبەردەمیدا تەنەزول بکەم و خۆم بشکێنمەوە بەسەریدا وەك چۆن بەدەمەشۆفلێ ئوتومبیلە کۆنەکان دەقوپێنن!..

ئەم ڕێگایە بۆ فریاکەوتنی هەڵەیەکە لێتەوە دەردەچێت و بتەوێت پاشەڕۆژ لەسەرت نەکەوێت و دڵی بەرامبەریش ڕاگیربکەیت وەك رومانەیەك وایە تەلەکەیت دەرهێنابێت و لەوەدایە خۆت و دەوروبەرەکەشت وردوخاش بکات بەڵام تۆ توند لەمشتدا دەیگریت تا تەلەکەی پێوە دەکەیتەوە یان هەڵی دەدەیتە چۆڵەوانیەکەوەو خۆت و دەوروبەری لێ ڕزگاردەکەیت!.

## ڕێگای چوارەم:
## (کەس حەزناکات ئەمری بەسەردابکرێت)

لــەم دواییانــەدا شــادمان بــووم بــەبینینی خــاتوو (ئیــداتریل) ڕاگــری (نووســەرانی ژیاننامــەی ئەمەریکییــەکان) (١) لــەنان خــواردنێکی ئێــوارەدا کۆبووینەوەو پێم ووت: من خەریکی دانانی ئەم کتێبەم (٢)، و دەستمان کرد بەلێدوان سەبارەت بە هاوڕێگرتن!..

ئەوخانمە ووتی: کاتێـك دەربـارەی (ئـەوین یـونج) زانیـاریم کـۆدەکردەوە گەشتم بەپیاوێك کە سێ ساڵ لەگەڵ مستر یونج دا ژیابوو، ئەوپیاوە پێی ووتم: (لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا لێم نەبیستووە بەزەقی فەرمان دەربکات بەڵکو هەموو داواکاریەکانی لەشێوەی پێشنیاردا دەخستە بەردەستی خەڵك!.

یونج هەرگیز نەیووتووە: (ئەمە بکەو ئەوە بکە) یان (ئەمە بکەیت و ئەو نەکەیت) بەڵکو هەمیشە دەیووت: (ئایا بۆت هەیە ئەم کارە بکەیت؟) (ئایا وادەزانیت باش وایە فلانە کار بکەیت؟)

زۆر جــار نامەیــەکی بنووســیایە بەســکرتێرەکەی دەووت: ڕات چــۆنە بەرامبەری؟ ئەگەر چاوی بەنووسراوی کەسێکی تردا بخشاندایە بەخاوەنەکەی دەووت: (لەوانەیە ئەگەر ئەو ڕستەمان بۆ زیاد بکردایە باشتر دەبوو..)! واتە هەردەم بوارێکی بۆ بەرامبەرەکەی دەهێشتەوە تا بەئارەزووی خۆی کەمێك هەڵس و کەوت بکات!)..

شێوازێکی ئابەم جۆرە، لەهەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکی، وادەکات لەبەرامبەرەکـەت کـە بەئاســانی هەڵـەکانی ڕاســت بکاتــەوە، بــەکارهێنانی شـێوازێکی ئالـەم چەشـنە والەبەرامبەرەکـەت دەکـات هەسـت بەکەسـایەتی و گەورەیی و نرخی خۆی بکات وە دەیکاتە دونیایەك لەهەست بەخۆکردن.کاری

دەگریتە دەست و دەیبەیت بەرەو یارمەتیدان نەك هانی بدەیت بۆ شۆرش و سەرکەشی!

دەی بۆئەوەی جڵەوی خەڵکی بگریتە دەست بێئەوەی زیانیان لێبدەیت یان تورەیان بکەیت ئەوا برگەی ژمارە (٤) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

**(ڕاستەوخۆ فەرمان دەرمەکە بەڵکو پێشنیاری ژیرانە دەربڕە!)**

## پاشکۆی ڕێگای چوارەم:
## (ئەمەت بۆ کرد؟)

لەبەرئـەوەی ئیـسلام پرۆگـرام و داڕێـژراوی پـەروەردگارەو پـەروەردگاریش دەروون و نـاخی مرۆڤـەکان دەخوێنێتـەوەو دەزانێـت بەچـی قـاس و زویـر دەبـن! وەبەچیش کەیف خۆش و ئاسودە و دڵخۆش دەبن!.

فەرمان دەرکردن زۆر خۆشەو مـرۆڤ بۆخۆهەڵنانیش بێت حەزی لێدەکا! بەڵام جێبەجێ کردنی زۆر ستەمەو ناڕەحەتەو هەڵدێرێکە کەم مرۆڤ لەژێریدا بەسەلامەتی دەردەچێت بۆیـە خـوای گـەورە لـەم بارەیەوەدەفـەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ (سـورەتی التغـابن١٦ ) واتـە لـەخوا بترسـن بـەڵام بـەپێی توانـا! وردبـەرەوە قورئـان بوارێکی ئەگەر تەسکیش بێت بۆ ئادەمیزاد بەجێ هێشتووە کە لەوانەیە نەتوانێت هەندێ کات لەخوابترسێت؟!.

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: بۆماوی (١٠)ساڵ لەخزمەت (رسـول الله) دا بـووم (ﷺ) لـەماوەی ئـەم دەسـاڵەدا نەمـدی ڕۆژێـك پـێم بڵـێ ئـای ئەنـەس ئەمـەت بۆکرد؟ یان ئەوەت بۆ نەکرد؟ جارێکیترشتی وانەکەیت؟ هەرگیز لەکەسـی نـەداوە و قسەشی بەکەس نەووتووە،! بەڵکو هەموو فەرمانێکی بە (کنایە)و ناڕاسـتەوخۆبوو! منیش لەسەرزمانی ئەنەسەوە ئەم شیعرەم داناوەو لەکۆڕێکمدا لە هەڵەبجەیشەهید لەسـاڵی (١٩٩٤) لـەهۆڵی ئەحمـەد موختارجـاف بـەئاوازەوە ووتـراوە کەئەمـە بەشێکییەتی:

ئەنەس دەفەرموێت بۆماوەی دەساڵ
لەخزمەتیابووم لەدەر و لەماڵ
نەقسەی پێی وتووم نەلێشی داووم
بەفیدای ئەوبێ هێزو هەناووم

زۆربەی کاتەکان بەناڕاستەوخۆ فەرمانی دەرکردوە وەك ووتوویـەتی: ڕەحمـەتی خوا لەوکەسـەی فلان شت دەکا! یان بەهاوەڵانی دەووت: کامتـان فلان کارمـان بۆ

دەکات! یان کێ نایەت لەگەڵمان! (پێغەمبەر) مان ( ﷺ) ئارەزوو حەزی خەڵکی بەلاوە زۆر گرنگ بووە، تەنانەت هاوەڵان دەڵێن: ئەگەر بیزانیایە تاقەتی گوێگرتنی ووتارمان نییە! ئەوکاتە ووتاری نەدەخوێندو دەیخستە ڕەغبەتی خۆمان!!.

با بانگەوازکاران ئەم ڕستانەیان لەبیر نەچێت و بەردەوام بەکاریان بهێنن و تاقیان بکەنەوە وەك (چۆنە لەلات پێکەوە تا سلێمانی بڕۆین؟) (پێم خۆش بوو فلان کەسم بۆ ببینی؟ یان بوارت هەیە بابەتێکم بۆ وەربگێڕی؟ یان: چەند بەختەوەردەبووم ئەوکارەت نەکردایە؟ یان وای بەباش دەزانم وابیرنەکەیتەوە؟ یان خۆشم دەوێت تکایە ئەوکارە تاسەرەنجام بەرە؟ (پێتان چۆنە نقلتان بکەم بۆ هەولێر؟ یان لەتۆم دەوێت دڵم نەشکێنی فلان کتێبم بۆ بخوێنەرەوە یان فلان ئایەت یان فەرموودەم بۆ لەبەر بکە زۆر سوپاست دەکەم)!

ئەزانیت بۆچی یەك سەرباز هەڵناکەوێت حەزی لەسەربازی بێت و هەمیشە ڕقی لەپۆستاڵ و ئەفسەرو مەشقە؟ چونکە زەڕەیەك ئیختیار لەدەستی خۆیدا نامێنێت!..

فەرمان دەرکردن لەڕێگای پێشنیاری جوان و ژیرانەوە سودێکی گەورەی دیکەی هەیە کە مامۆستاو فەرمانڕەواکان غەم دایان ناگرێت و بڵێن: کەس بە قسەمان ناکات دیارە ئەم قوتابیانە یان ئەم ئەندامانە هیچیان تیا بەسەرنییەو (سمع وطاعە)یان لەژێرسفرەوەیە!

بەڵکو پاشان دەڵێت خۆم پێشنیارم کرد بەڵام ئەو وای بەچاك زانی کە کار بەپێشنیارەکەم نەکات، هەروەك خۆیشی ڕێزو بەهای ناشکێ و سامی لەدڵدا دەرناچێت.. بۆیە ووتوویانە (ئەگەر دەتەوێت لەبەرچاوی خەڵك بکەویت، ئەوا داواکاری و فەرمانی زۆر بدە، بەسەریاندا)!.

بۆیە واجوانە هەڵگرانی بانگی ئیسلام: کتوپڕی فەرمان دەرنەکەن چونکە دڵنیاشبن یەکسەر و کتوپڕ دەشکێت! برایەك هاتەلام ووتی مامۆستا عمر سبەینێ دەبێت بڕۆی بۆ سیدصادق؟!. ئێ خوایە خۆ هیچ بواری بۆنەهێشتمەوەو قسەی نەهێشتم منیش نەمزانی چی بڵێم چونکە هەرچیم بگووتایە ئەترسام بەسەرکەش و

بیٚ( سمع و طاعه) لەسەرەوە ناوم بەرێت!! بۆیە هیچم نەووت، ووتی: چییە ئەڵێی پێت ناخۆشە؟ ووتم نەخێر بەڵام بەیانی دوو (موعد)م هەیە!! خۆزگە بیگووتایە پێت دەکرێت سبەینیٚ تا( سیدصادق) بڕۆیت؟ ئەوبرایە لەوێدا ئەبڵەق بوو!..

هەی یاران، ئەگەر بەوشێوە پێی بگووتمایە! منیش دەمووت: بەسەرچاو بەڵام ئەی دوو (موعد)ەکەم چی لیٚبکەم؟ ئەویش دەیووت: دەی تۆ بڕۆ خۆم بۆت جێبەجیٚ دەکەم!.

عائیشە دەفەرموێت: ئەگەر قورئان یەکسەر بەیەکجار بەعەرەبی بگووتایە عەرەق حەرامەو نابێت بیخۆنەوە؟! ئەوانیش دەیانووت: بۆ مان تەرك نادریٚ هەر دەیخۆینەوەو بۆمان تەرك نادرێت؟! بەڵام قورئان بەسیٚ قۆناغ پێشنیاری دەکرد کە باش وایە عەرەق نەخۆنەوە ئەوجا ئەمری قەدەغەکردنەکەی دەرکرد!! (فلیتذکر اولوا الالباب)!

## بەشی پێنجەم:
## (واز لەبەرامبەرەکەت بهێنە باناوی دەم و چاوی نەتکێت)

چەند ساڵێك لەمەوبەر (کۆمپانیای ژنراڵ ألکتریك) ڕووبەڕووی کارێکی زۆر وردو ناڕەحەت بوویەوە! ئەویش ئەوەبوو کەپێویستی دەکرد کە سەرۆکی یەکێ لە بەشەکان لابەرن کەناوی (تشارلس)بوو!..

(تشارلس) زۆرلێهاتوو بوو لەئیش و کاری کارەباییدا بەڵام هەرکە کرا بەسەرۆکی بەشی ژمێریاری کۆمپانیا یەکسەر کزی و شکستی پێوەدەرکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپانیا نەیدەوێرا ڕەخنەی لێبگرێت یان زیانی پێ بگەیەنێت! و بەبێ ئەویش نەیاندەکرا، ئەم پیاوە خاوەنی هەستێکی ناسك بوو، زۆر شت کاری لەدەروونی دەکردو زویر دەبوو.. ئاخۆ دەبێت ئەم کۆسپەیان چۆن چارەسەر کردبێت؟

زۆر بەئاسانی، هەستان لەقەبێکی گەورەیان بۆ هەڵبژارد کردیان بە ئەندازیاری سەرپەرشتیاری کۆمپانیا و کەسێکی تریان هێناو کردیان بە سەرۆکی بەشەکەی،

تشارلس زۆر دڵخۆش بوو بەم نازناوە نوێیەی، هەروەك بەڕێوەبەرەکانی تریش شادمان بوون.. چونکە کۆسپێکی ئاوا وردو حەساسیان چارەسەرکرد. بەبێ هیچ جۆرە بۆڵەبۆڵ و ناڕەزایی یەك!.

بەڵام ئێمە بەئەنقەست زۆرجار هەوڵی بریندارکردنی هەستی خەڵکی دەدەین.. ڕەخنە لەکوڕو کچەکانمان دەگرین لەبەردەمی خزم و بێگانەشدا، بەبێ ئەوەی هەست بەو برینە سۆیە بکەین کە کارلە هەستی گەورەیی و گرنگیان دەکەوێت!

لەگەڵ ئەوەدا ئەتوانین بە ووشەیەکی ناسك، دوو وشەی ژیرانە، هەست کردن بەبیربۆچوونی بەرامبەر، نەهێڵین ئەوبرینە بکەوێتە جەستەی ئەو دۆستەمان!.

دەی وازبێنە بالەجاری داهاتوودا ئەم ڕێگایە سەرکەوتووە بەکار بهێنین ئەگەر ڕۆژی ناچاربووین کەسێك لەشوێنێك لابەرین یان کارێك بەمنداڵێك تەرك بدەین یان خزمەتکارێك بگۆڕین.

مستر (دوایت مورد) توانایەکی بێ سنوری هەبوو لە ئاشت کردنەوەی دوکەسدا کە خەریك بوو قورگی یەکتر دەربهێنن!. چۆن؟

ئەم پیاوە بەحیکمەت و ژیری هەوڵی دەدا بگاتە ئەو خاڵانەی هەردووکیان لەسەری یەکن، و دووپاتی دەکردنەوە و پاشان زیاتر گەورەی دەکردن و ڕۆشنی دەکردەوە ئیتر هەرچییەکی کردووە نەیدەهێشت لایەکیان لەسەر هەقی بمێنێتەوەو ئەولاکەیان لەسەر ناهەقەکەی خۆی!..

پاش چەندان ساڵ بەسەر دوژمنایەتییە سەختەکەی نێوان تورکیاو یۆنان بۆ دواجار (١٩٢٢)دا تورکیا ویستی بەیەکجاری یونان لەسەر خاکەکەی وەدەرنێ، (مصطفی کمال ئەتاتورك) سەربازەکانی خۆی کۆکردەوەو هەمان قسەی ناپلیۆنی بۆ کردنەوە و پێووتن: تائەو شوێنەی مەبەستتانە بیگرن کە دەریای سپی ناوەڕاستە!).

لەیەکێ لەجەنگ ناهەموارو پڕلە تاڵاوەکانی سەردەمدا تورکیا سەرکەوت بەسەر یۆناندا. لەوکاتەی هەردوو سەرکردەی یۆنانی (تریکوبس و دیونس) بەرەوکۆشکی کمال ئەتاتورك بەڕێوەبوون بۆ خۆدان بەدەستەوە، هەموو گەلی تورکی وەك باران نەفرینیان لەدوژمنی تێك شکاوی چەندان ساڵەیان دەکرد!

بەڵام کمال زۆر خۆشحاڵ نەبوو بەتام و چێژی ئەوسەرکەوتنە دەگمەنە! تەوقەی ل گەڵیاندا کرد و پێی ووتن: (فەرموون دانیشتن وا دیارە زۆر

ماندوون!) پاشان بەئەوپەڕی توانا و لێهاتووی خۆی ویستی ئێش و ئازاری تێك شکانە سەربازوییە یەکەیان لەسەر سوك بکات بۆیە ڕووی تێ کردن و پێی ووتن: (لەوانەیە لەم جەنگەدا حاڵی سەرکەو توو باشتر نەبێت لەحاڵی دۆڕاو!) لەو پەڕی خۆشی و سەفای سەرکەوتندا ئەم ئەتاتورکە ئەوەی لەبیر نەچووکە ئاوی دەم و چاوی بەرامبەرەکەی نەتکێنێت)!.

ئەم ڕێگایە جێ بە جێ بکە کە ژمارە (٥)ەو دەڵێت:

(واز بێنە لەبەرامبەرەکەت با ئاوی دەمو چاوی نەتکێت)

## پاشكۆی ڕێگای پێنجەم:

لـە جـەنگی (مۆتـە)ی سـاڵی (٩)ی كۆچـیدا، سـوپای ئیـسلام بـە سـەرۆكایەتی شمشێری خودا خالیدی كوڕی وەلید( خوالێی ڕازی بێت )لەسەرخاكی سوریا دا لـە جـەنگێكی نا بەرامبـەردا بەرامبەر سوپای ڕۆم وەستا كە سوپای كوفر لـە (٢٢٠) هەزار زیاتر بوو لەبەرامبەردا سوپای ئیسلام لـە (٨)هـەزار تێپـەڕی نـە دەكرد! بۆیـە خالید بیری كردەوە كە بەشێوازێكی هونـەری جـەنگی سـوپاكەی لـەگورگانخواردوی ڕزگـار بكـات ئـەوە بـوو تـوانی پاشـە كـشەیان پـێ بكاتـەوە بـە زیـانێكی كەمـەوە گەیانـدنی یـەوە مەدینـەی پڕلـە نـور ئەمـەش زاراوەی سـەربازیدا جۆرێكـە لەسـەر كەوتن!.

ئەوە بوو خێزان و منداڵ و كەس و كاری موجاهیدەكان دەرگایان لێ نەكردنـەوەو پێیـان دووتـن (لاچـن هـەی هـەڵاتوەكان) ترسـنۆكە كـان! سـەربازەكانی ئیـسلام لـە داخاندا نەیاندەزانیێ چی بكەن چونكە ئەو خەڵكە لەسوریا نـەبووە نازانی وەزعەكە خوێناوی بووە، بۆیـە زۆر نارەحـەت بوون كە ئاوا پێشوازیان لێ دەكرێت!.خـەڵكی بەخالیدیان دەووت:

(خالیـد شـێرەكەی قـوڕەیش! پاڵەوانەكـەی ئوحـود! ئێـستا سـوپای ئیـسلامی بەتێكشكاوی هێنایەوە )! لەمەش خراپتریان پێ دەگوترا!!.

بەڵام سەرداری دەروننـاسـان (پێغەمبـەر)مان ﷺ بەڕوویەكی خۆشـەوە پێشوازی لێ كردن و هەواڵی جەنگەكەی لێ پرسین و بـەوردی گوێی لەوەڵامـەكانیان دەگرت و پاشـان لـەناو جـەماوەری موسـوڵمانی پایتـەختی ئیـسلامدا دەری بـڕی كـە (ئێـوە هەڵهاتوو ترسنۆك نین بەڵكو ئێوە هێرش بەرو هێرش بـەرەوەن) فـەرموی: (بل انتم عكارون ولستم فرارون!)..

ئای لەو خۆشیەی خالید و سوپاكەی دەستیان كـەوت لـەو پێشوازیە گەورەیـەی سەرداری مرۆڤایەتی لێی كردن..

خۆزگە ئێمەی قوتابیانی ئەو (پێغەمبەر)ە ئا بەو چەشنە مان بکردایە لەگەڵ ئەوکەسانەدا و کە لەکارێکدا سەرکەوتوو نابن یان تێك دەشکێن نەك چەپڵەمان لێ بکوتینایە و لەناو خەڵیدا ئابڕوویان ببرایە و ئاوی دەم و چاویان بتکایە !.

لە مانگی (١٢/١٩٩٣)دا لەو نەکسەیەی بەسەر بزوتنەوەدا هات و بۆ ئەوەی زیاتر کورد کوژی پەرەنسەنێت بەرەو چیاکان پاشەکشەی کرد و شارەکانی دابە دەستەوە، تەنها لەشاری هەڵەبجەدا سەرکەوتوو بوون بەڵام بەبێ دەنگی بەر پرسی ئەو شارە شارەکەشی دابە دەستەوە و هێزەکانی بەرەو چیاکان کشاندەوە!

گەورەو بچوکی خەڵکی لەو سەرکردەیە تۆڕەبوون و قسەیان پێ دەگوت! منیش بە پێچەوانەوە بۆ مەسەلەکەم دەروانی دەم وت بالە دورەو حوکم نەدەین، ئەگەر وەك ئەو فەرماندەیە لە ناو خوێن و تە پوتۆزی شەڕە نابەرابەرەکەدا بوونیایە و بمانزانیایە لەچ حاڵێکی نائاسایی دایە ئەو رایەی ئەومان دەبوو!.

پاشانیش دەرکەوت ئەو کەسە کەسێکی سیاسەتمەدارو سەرکەوتووە چونکە چەند (٢٥٠ ) موجاهدێکی نەدا بەدەم ئاگری شەڕێکی نابەرابەرەوە و پاشان ئەگەر ئەو پۆختەیەی نەکشاندایەوە بۆ چیاکان و لەوێ نەیکردنایەتەوە بە مەڵبەندی کۆکردنە وەی موجاهدی شارەشکست خواردوەکان ئێستا بەدڵنیایی یەوە دەڵێم باس و خواستی بزوتنەوە نەدەما !.

تانەت موسوڵمان پێشی خۆش نییە کافریش ئابڕوی بچێ و ئاوی دەم و چاوی بتکێ، سەرکردەی کوردی موسڵمان (صلاح الدين الأيوبي-خوالێ ڕازی بێت- پاش ئەوەی بەتەواوەتی خاکی ئیسلامی پاك کردەوە لە داگیر کەرە خاچ پەرستەکان و خاچ پەرستانی بەشکاوی بەرو وڵاتەکانی خۆیان ناردەوەو لەو کاتەدا کەپێ ی گوتن بڕۆنەوە و هەرگیز بیر لە داگیر کردنی خاکی پیرۆزی ئیسلام نەکەنەوە ئەوانیش ڕیز ڕیز ئەیاندا بەلای چادرەکەی صلاح الدين داو (صلاح الدين)یش پێی خۆش نە بووکەس بە شکستی ببینێ بۆیە ڕۆشتە ناو چادرەکەیەوە.. پاشان لێ یان پرسی قوربان ئەوە بۆچی سەیرت نەدەکردن کاتێ دوژمنانی خوا بەلوت شکاوی (سوپاس بۆ خوا) بۆ وڵاتە کانیان دەگەڕانەوە؟

لە وەڵامدا صلاح الدين ووتی: پێم خۆش نیە بیانبینم بە شکاوی و تەریق ببنەوە حەزناکەم ئاوی دەم و چاوی کەس بتکێت.. ئەمە ڕای سەرکردەیەکی موسڵمانە کە چی داخەکەم هەندێ موسڵمان خۆشحاڵ و بەکەیف دەبن کاتێ لەدەمەقاڵە و گفتو و گۆدا براکەیان دەبەزێنن!!.

لەسەردەمی کۆندا سەردەمی عەباسییەکان و دوای ئەوانیش دەگێڕنەوە ئەم گیانە لە ناو ڕاوچی یەموسڵمانەکاندا بەدی کراوە ڕاوچییەکانی ناوچەی دیمەشق کە دەچون بۆ ڕاو بێگومان هەندێکیان نێچیری باشی دەبوو، هەندێکی تریان هیچی نەدەکوشت ئەوانەی زۆریان کوشتبوو، بەو کەسانەیان دەگوت کە هیچیان نە کوشتووە ها تۆش ئەم نیچیرە بە ماینەکەتدا شۆر کەرەوە تا کاتی خۆمان کردەوە بەناوشاردا کەس گاڵتە تان پێ ناکات! ئەوانیش پاش گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بۆیان دەناردنەوە.. ئیمامی عەلی( خوای لێ ڕازی بێت) سەرکەوت بەسەر سوپاکەی (حرب کوڕی شەرحەپێل)دا لەجەنگی سەفین دا، کاتێ ئیمامی عەلی ڕۆشتە ناویان بۆ دڵنەوایی کردنیان لەگەڕانەوەیدا (حرب) ڕەوانەی کردەوە بە پیادەیی و عەلیش بەسواری بوو علی ووتی: ئەی حەرب بگەڕێرەوە (تۆ بەپێ و من بەسواری) بۆ من فیزو گەورەیی یە و بۆتۆش زەلیلی و سەرشۆڕیە و پێم خۆش نییە!.

لە ئێران لەم نیزامی جمهوری ئیسلامی یەدا شتێکی جوانم بەدی کردوە تیایاندا ئەمیش ئەویە کە سەروك کۆمار ڕەفسنجانی پاش تەواو بوونی ماوەی سەرۆك کۆماری یەکەی.. پێویستی دەکرد جێگایەکی وا دیاری بکرێت بۆی کەتیایدا شەخصیەتی پارێزاو بێت.. بۆیە لەقەبێکی گەورەو دەزگایەکیان خستە ئەستۆی و ناویان نا ئەنجومەنی دیاری کردنی بەرژەوەندیەکانی نیزامی جمهوری اسلامی ایران)!! خۆیشی دڵی پێ ی خۆش دەبێت و گەلی ئێرانیش لەبەهرەمەندی و لێهاتووی ئەو سەرکردەیە بێ بەش نابن!...

## ڕێگای شەشەم:
## (چۆن بتەوێت خەڵکی بەرەو سەرکەوتن بەریت)

(بیت بارلو) هەموو ژیانی لەگەڕان بەناو وولاَتەکاندا بەسەربردوە بەمەبەستی یاری (سێرك) بەهاوڕێیەتی ئەسپەکەی و سەگەکەی لەم شار بۆ ئەو شار یاریە هەزەلی یەکانی پێش کەشی جەماوەر دەکرد، وەمن زۆر حەزم بەوە دەکرد کە سەیری دیمەنی (بیت)بکەم کاتێك پرۆڤەی بەسەگێکی تازە دەکرد بۆ فێر بوونی یاریەکان! یەك شت زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەویش ئەوە بوو کاتیٚ کەسەگەکەی یاریەکی تازە فێردەبوو با فێر بوونێکی کەمیش بێت خۆی بۆدەخست بەپشتاو ئافەرینی لیٚ دەکرد و پارچە گوشتێکیشی بۆ هەڵدەدا! ئەم تۆزە فێربوونەی لەبەر چاو دەکردبە شتێکی زۆر گەورەو مەمنوونی دەبوو!

من سەرم سوڕدەمێنیٚ ئاخۆ ئێمەی مرۆڤ ئەم ڕێگایە بۆچی لەگەڵ خەڵکی بەکارنەهێنین؟

بۆچی لەباتی قامچی گۆشت بەکارنەهێنین؟! یان لەباتی ڕەخنە و لۆمە کاری، پیا هەڵدان بەکاربهێنین؟! بۆچی لەسەر کەمترین چاکە مەدحی خەڵك نەکەین؟! کە بێگومان ئەمانەشە خەڵکی بەرەو بەردەوام بوون و چۆکدانەدان دەبات.

(لویس لویس)لە ڕێگای تاقیکردنەوە وە بۆی دەرکەوت کەمەدح کردنی خەڵك لەسەر کەمترین چاکەیان زۆر بەسودو بەکەڵکە تەنانەت لەگەڵ تاوانبارانی زیندانی (سنج سنج)لەم کاتەی کە ئەم فەسڵەم دەنووسی نامەیەکی ئەوم گەشتە دەست کەتیایدا دەیووت: بۆم دەرکەوتوە کە کەمترین ڕێزلێنانی ئەو هەولاَنەی زیندانی یەکانی سنج سنج لە پێناو چاکبوونی خۆیاندا دەیدەن ئەنجامێکی هەر فرەباشی هەیە و هەنگاویان پیٚ دەنێت بەرەو

باش بوون و گۆڕان! زۆر کاریگەر ترە لە ڕەخنە گرتن و لومە کردنیان و گەڕان بەدوای هەڵە کانیاندا!...

من خۆم هەرگیز زیندانی کراوی و (سنج سنجم) نەدیوە! بەڵام ئەگەر سەیری ڕابوردووی خۆم بکەم ئەتوانم بڵێم هاندان و پیا هەڵدان بازۆر کەمیش بووبن بوونەتە هۆی گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانم ئایا تۆش لە لایەن خۆتەوە بێ کەمو زیاد ئەمە نالێی سەبارەت بە ژیانی خۆت؟

مێژوو پڕیەتی لە بەڵگەی گەورە لەسەر ئەوەی کە ڕێزلێنان لەبەرامبەرەکەت کاری وادەکات وەك موعجیزەیە:

نزیکەی نیو سەدە لەمەو بەر منداڵێکی تەمەن (٥) ساڵان لەشاری (نابۆلی) ئیتالیا کاری دەکرد، ئەم کوڕە لەژیاندا تاقە ئاواتێکی هەبوو ئەویش ئەوەبوو ببێتە (گۆرانی بێژ) بەڵام مامۆستاکەی یەکەمجاری بێ هیوای دەکرد و پێی دەووت: (کوڕی خۆم تۆ هەرگیز بەتەما مەبە ببیتە گۆرانی بێژ چونکە دەنگت لە گفە گفی بادەچێت!!).

بەڵام دایکی هەرچەندە ژنە جوتیارێکی هەژار بوو، بەڵام بەتوندی دەیگوشی بەخۆیەوەو مەدحی دەنگەکەی دەکرد و پێی دەگووت: تۆ توانایەکی باشی گۆرانی وتنت تێدایە!.

بەپێی پەتی و بەردەوام کاری سەختی دەکرد تا پارەپەیدا بکات و سەرفی بکات لە پێناو کوڕەکەیدا تا فێری موسیقا ژەنی ببێت، بینیت کە چۆن (مەدح) کردن و پیاهەڵدانی ئەم جوتیارە سادەیە بوو بەهۆی گوڕینی ڕەوتی ژیانی منداڵەکەی! لەوەش دەچێت ناوی ئەو هونەرمەندەت بیستبێت ناوی (کاروزو)ە!.

کوڕێکی تر لە (لندن) ئاواتی ئەوە بوو ببێتە نووسەر، بەڵام وا دیار بوو قەدەری خوا پێچەوانەی ئەم حەزەی بوو! ئەوە بوو چوار ساڵی نەبرد،

ئەوەندەی زانی باوکیان بەرەو زیندان ڕاپێچ کرد بەهۆی ئەوەی کە نەیتوانیوە قەرزەکانی بداتەوە! تا ئەم منداڵە ناچار بوو بۆ بژێوی ژیانی دەستیدایە ئیشێکی زۆر هیچ کە وەرەقەی دەنووساند بە قوو تووتی بۆیەوە!.

ئەم کاسپییەشی لە شوێنێکدا بوو کۆنە خەزێنەیەکی چۆڵ و هۆڵ کەمشك تیایدا سێ بازی دەکرد! ژورێکی بچوکی لەسەربان گرتبوو لەگەڵ دوو منداڵی تری سەرگەردانی لەندن پێکەوە دەخەوتن! زۆر بەکەمی باوەڕی بەتواناى و نووسەریی خۆی هەبوو تەنانەت لەترسی ئەوەی نەوەك گاڵتەی پێ بکەن تا هاوڕێکانی نەخەوتنایە هیچی نە دەنووسی، هەرچی چیرۆکی دەنووسی و دەینارد بۆ گۆڤارەکان لەبەر لاوازی بڵاویان نەدەکردەوە! پاشان ئەو ڕۆژەی ئەو بەخەیاڵیدا نەدەهات وا هاتە پێش یەکێ لە گۆڤارەکان چیرۆکەکەی بۆ بڵاو کردەوە!

بەڵێ خۆ فلسێکی پێ نەدرا لەسەری بەڵام ڕۆژنامە نوسەکە پیاهەڵدان و مەدحێکی باشی کردبوو کە بەتوانایە لە بواری چیرۆك نووسیندا، ئەوە بوو ئەو ڕۆژە خۆشە هاتا ئێوارە بەجادە و کۆڵانە کاندا دەسوڕایەوە و فرمێسکی شادی لە چاوەکانی دەباری و بەسەر کۆڵیدا لافاوی دەکرد، ئەمەش بە هۆی ئەو ڕێزلێنان و پیاهەڵدانەی ڕۆژنامە کەوە بۆی!

ئەزانی ئەگەر ئەو پیاهەڵدان و (مەدح) کردن و ڕێز لێنانە نەبوایە جیهان بە گشتی بێ بەش دەبوو لە ئەدەبێکی گەورەی وا کە کتێبخانەی ئەورووپی دەوڵەمەندکرد لە ڕێگای چیرۆکە جوان و قەشەنگەکانییەوە.. ئایا بیستۆتە ئەو پیاوە کێیە؟ ناوی (تشارلس دیکنز)ە!

نیو سەدە لەمەوبەر منداڵێکی تر لە (لندن) کاتبێکی بێ هەمیەت بوو لە دوکانێکی بچوك دا، لەکاژمێر (٥) بەیانی لە خەو هەڵدەستاو دوکانەکەی گسك

دەداو ڕێك و پێکی دەکرد و پاشان ماوەی (١٤)کاژمێری تەواو لوتی داژەندبوو بەسەر قەڵەم و دەفتەردا و کاری دەکرد:

ئەم لاوە ڕقی هەستا لەم کارەی و لەبەرچاوی کەوت، پاش دوو ساڵ بەسەر ئەوك کارەیدا تاقەتی لێ بڕاو بەیانی یەکیان هەستاو بەڕاکردن (١٥)میلی بڕی بەڵێ تاگەیشتە دایکی کەلەماڵە دەوڵەمەندێکدا کاری دەکرد و لێی پارایەوە کە بادەست لەو کارە هەڵبگرێت و سوێندی بۆ خوارد ئەگەر زۆری لێ بکات بۆگەڕانەوە بۆ سەرئیشەکەی خۆی دەکوژێت!!.

پاش ئەوە هەستا بەنووسینی نامەیەکی دور و درێژی بۆ مامۆستای قوتابخانەکەی پێشووی کەتیایدا باسی چارەڕەشی خۆی کردبوو لە ژیاندا!. مامۆستاکەشی ڕێزێکی زۆری لێنا و دڵنیای کرد کە تۆلاوێکی تەواویت و لێهاتوو زیرەکیت! پاشان کردی بەمامۆستا لە قوتابخانەکەیدا.ئەم ڕێز لێنانە پاشە ڕۆژی ئەم لاوەی بە تەواوەتی گۆڕی و کارێکی واگەورەو ئاشکرای کردە سەر ئەدەبی ئینگلیزی نوێ، ئەم منداڵە لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ زیاتر لە (٧٠)کتێبی نووسیوە بەهۆی نوکی قەڵەمە کەیەوە زیاتر لە (٢)ملیون ریاڵی دەست کەوتووە!! لەوانەیە هەموومان ناوی (هـ.ج.وێل.) مان بیستبێت؟!.

ئایا دەتەوێت حاڵی خەڵکی بەرەو باشی بەریت؟ ئەتەوێت کەسانێك چاك بکەیت؟ ئەگەر ئێمە من و تۆ هانیان بدەین بۆ ئەوەی هەست بەو بەهرە شاراوانە بکەن لە تیایاندا دانراوە، ئەوکاتە نەك هەر ئەوەندە بەڵکو زیاتریش لە چاککردنیان، بەڵکو سەر لەنوێ دروستیان دەکەیتەوە! ئەترسم واگومان بەریت ئەمە زیادە ڕەوییە؟!..

دەی کەواتە گوێ بگرە بۆ ووشە پرشنگدارەکەی (ولیَم جیمس) کە هەموو مێژووی ئەمەریکی زانایەکی دەروونناسی تری وەك (جیمس)ی بە خۆیەوە نەدیوە، دەڵێت: (ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەم حاڵەتەی ئیستامان و

ئەو حاڵەتەی کە دەبێت پێ ی بگەین، بۆمان دەردەکەوێت کە ئێمە نیوە زیندووین و نێونە فەرین! وە ئێمە بەشێکی زۆر کەمی توانای لەش و مێشکمان بەکار دەهێنین! یان بەشێوەیەکی تر: هەموو کەسێك لە ئێمە لەو سنورە تەسکەدا دەژی کەخۆی بۆ خۆی سازاندوە! لەهەمان کاتدا ئەو خاوەنی هێزو توانایەکی زۆر و جۆراو جۆرە بەلام وەك عادەتی مرۆڤ خۆی لا دەدات لە بەرکار هێنانیان).

بەڵێ تۆ ئەی خوێنەری بەڕێز خاوەنی چەندان هێزو توانای جیا جیا و جۆراو جۆریت بەلام تۆ لەبەکارهێنانیان خۆت دەدزیتەوە! یەکێ لەو توانایانە: توانینی مەدح کردن و پیاهەڵدانی خەڵکییە، دروست کردنی گیانی هیوایە لە دەروونیاندا ئەمەش لە ڕێگەی ئاگادار کردنەوەیانەوە دەبێت لەو بەهرە شاراوانەی ناوە وەیان.بۆ ئەوەی جڵەوی خەڵکی بگریتە دەست بەبێ ئەوەی ئازاریان بدەیت یان توڕەیان بکەیت برگەی ژمارە (٦)جێ بە جێ بکە کە دەڵێت:(کەمترین چاکەی خەڵك باس بکە و ڕۆبچۆ لە ڕێزلێنانیاندا).

## پاشکۆی شەشەم:
## ( مەدح کردنی خەڵك لە قوتابخانەی ئیسلامدا )

خوای گەورە تواناو بەهرەی لەسەر جەم کەسەکاندا دروست کردوە، بەڵام هەندێ خەڵکی هەلی بۆ دەرخسێ و و دەوروبەرەکەی لەگەڵیدا دەگونجێت ئەوە تواناو بەهرەکانی سەرهەڵدەدات تیایاندا و بەهۆیەوە ناودەردەکەن و هەڵدەکەون! بەڵام هەندێکی تر بەهەر هۆیەکە وە هەبێت تواناو بەهرەکان دەبن بە ژێرەوەو ناوی دیار نابێت و کەس نایناسێت).

چونکە خوای گەورە لەسورەتی (الرحمن)دا دەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ٤﴾ (سورەتی الرحمن ١-٤ )واتە لەگەڵ دروست کردنیدا داهێنان و زانیاری و تاقیکاری تێدا دروست کردوە.

بەڵام ئەگەر کەسانێك هەبن خەڵکی هان بدەن بیان جوڵێنن و باوەڕیان تێدا دروست بکەن بەلێهاتوی خۆیان ئەوکاتە بەهرەکان گەشە دەکەن و دەپشکوێن.. بۆ نمونە شیعر بەهرەیەکی ئەدەبییە... مامۆستا ڕێبوار حمە سلیم لە دیدارێکدا گۆڤاری ڕابەر لەگەڵیدا سازی کردبوو ئەم لێدوانەیدا: (شعر بەهرەیە، ئەوبەهرەیەش لەهەمووکەسێکدا هەیە)! بەڵام هەندێ کەس بەهاندان و مەدح کردنی خەڵکی بۆیان بەهرە شاعیریەکەیان تێدا گەورە دەبێت و ناودەردەکەن بەڵام هەندێکیتر لەڕێگەی لاقرتێو پێکەنین و بەسوك سەیرکردنی شیعرەکەیەوە لەشیعر نووسین ساردی دەکەنەوە!.

لەپۆلی چواری ئامادەیی بووم تازە بەتازە کزەبای شیعر سەری لێدەدام و شیعرێکم لەژێرناوی (ئێمە) نووسی بۆ هاوڕێکانم خوێندمەوە، قوتابیەکی زیرەکی پۆل پێی ووتم: شیعر کاری گێل و بێ ئیشییە.

(پێغەمبەر)مان ﷺ لەگەڵ ئەبوبکر الصدیق دا کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لەڕێگا گەشتن بە شوانێکی منداڵ ناوی (عبداللە ی کوڕی مەسعود)بوو ماوەیەك لەلای مانەوەو (پێغەمبەر)مان هەندێ دوعای خوێند بە گوانی بزنێکی بێ شیردا و هاتە

شیرو تێریان خواردەوە.. عبدالله زۆر حەزی کرد ئەو دوعایە فێرببێت بۆیە داوای کرد لە (پێغەمبەر) ئەو دوعایەی فێربکات.. بەڵام (پێغەمبەر) پێکەنی و دەستی هێنا بەسەریداو فەرمووی: (ئێستا نا، بەڵام وادیارە تۆ کەسێکیت زوو شت فێردەبیت)! کێ دەڵێ لەوانەنییە ئەم مەدحە جوانە وای لە عبدالله کرد پاش موسڵمان بوون، ئەوەندە گرنگی دەدا بەزانستی قورئان و فەرمووده کەبوو بەخاوەن (مدرسە)یەکی (علوم حدیث)ی (ابن مسعودی) لەکوفە!!..

یان ئەوسەردەمەی (پێغەمبەر) پەیماننامەی (حدیبیە)ی ئیمزاکرد. یەکێ لەخاڵەکانی ئەوەبوو هەرموسڵمانێك بڕواتەوە بۆ مەکە نەیگێڕنەوە بەڵام هەرکافرێکی قورەیش موسڵمان ببێت دەبێ بدرێتە دەستی قورەیش!!. (ئەبو بصیر) موسڵمانبوو.. هات بۆ مەدینە بەڵام (محمد) لەسەر وەعدی خۆی ناردیەوە بۆ قورەیش.. لەڕێگا فرسەتی هێناو یەکێکیانی کوشت و هەڵهات لەدەستیان کاتێ (پێغەمبەر) ﷺ هەواڵەکەی بیست زۆر دڵخۆش بوو فەرمووی: ( ویل امە، محش حرب لوکان معە رجال) ! واتە: ئای کە شەرانیو سوارچاکە ئەگەر پاڵپشت و پیاوی لەپشت بوایە! هەرئەم پیاهەڵدان و مەدح کردنە وای لێ دەکات لەگەڵ هەندێ پیاویتری وەك خۆی لەقورەیش هەڵهاتوودا یەك مەترسی گەورە لەسەر بازرگانی قورەیش دروست دەکەن.. تا قورەیش هاواری لێ هەستاو لە (محمد)ﷺ پارانەوە کەوەریان بگرێتەوەو ئەو خاڵە بسڕێتەوە لە (صلح حدیبیە)دا!!..

هەموو لێهاتوو و کارزانێك لەهەربوارێکدا ببێت دڵنیابە هاندان و پاڵپشتی دڵسۆزانەی کەسانێك گەیاندوونییە ئەو ئاستە.

من لەساڵی (١٩٨٣) دا لەپۆلی سێیەمی ناوەندی بووم لە (دواناوەندی دراساتی ئیسلامی لە هەڵەبجە) (ڕێبوار احمد)ی خۆشنوس لەمزگەوتی م. مەلا صاڵح ی گەورە پێی ووتم خەتی وردت خۆشە بۆ هەوڵ نادەیت ببیتە (خطاط)؟ لەوڕۆژە بەدوا هەڵدەوان هەرچی کوراسەی خۆشنوسی خۆشنوسە گەورەکان هەبوو پەیدام کردو خۆم کرد بە (خطاط)!.

لەوکاتەدا کە پرۆڤەم دەکرد.. بەڕاستی خۆیشم دانی پێادا دەنێم بەمرەکەب و قامیش و ماجیك ماڵی باوکمم هەراسان کردبوو! بۆیە هەندێ جار تورە دەبوون و هونەرەکەیان لەلا سوك دەکردم.. منیش لەوەدابوو وازی لێبهێنم.. بەڵام هاندانی دووکەس وایان لێکردم بەردەوام بم تا بووم بە سێیەمین خطاط لەشاری هەڵەبجەدا پاش (صالح أمین عزیزو جلال نجم الدین)!!

یەکەم هاندەر (انور توفیق)ی برام بوو کە هەرکاتێ لەبەرەکانی جەنگی عێراق/ئێران دەگەڕایەوە کۆمەڵێ ماجیك و کوراسەی خەتی بۆ دەهێنامەوەو پێ دەگوتم: (دەی زیاتر هەوڵ بدە! بەڕاستی لەوجار باشتربوویت کە هاتمەوە بە ئیجازە!!..

دووەمیان (خوالێی خۆش بێت) (مامۆستا محمد عبدالله) بوو کە خاڵم بوو پێی ووتم: قەد وازی لێنەهێنی ئەمە هەروەك ناوت دەردەکات و مەشهور دەبیت ژیانی خۆیشت مادیەن مسۆگەر دەکات!

هەست دەکەم ئەم دێوەزمەی (حەسودی)یە ئێسك تاڵە ناهێڵێ لەو دڵەوە مەدحی کەمترین چاکەی ئەوخەڵکە بکەین و زیاتر سوریان بکەین لەسەر بەردەوامی و کۆڵنەدان!.تا جاری واش هەیە هەوڵ دەدەین ساردیان بکەینەوە قایش پانکەی گوڕوتینیان خاوکەینەوە.کاك رێناس علی موسیقاژەنی بەتوانا سکاڵای دەکرد و دەیووت: من نیازم وایە بەم هونەرە خزمەتی ئیسلامی عەزیز بکەم و لەم رێیەدا زۆر ماندوودەبم و جاریواهەیە تانیوەی شەو بەردەوام خەریکی پرۆڤەکردنم: کەچی دەمبەتاڵێك بەرد ناخاتە سەر بەردو گورج دەخەوێت! لەباتی هەموو هاندان و مەدح کردنێك پێم دەڵێ: ئەرێ هەموو شەوێك ئەم جیك ووڕەت لەچییە بۆناهێڵی خەڵك بخەوێت بەقوربان!! ئەها میللەتی ئێمە لەهونەری خەڵك ساردکردنەوەدا چەند لێهاتوون!.

# بەشی حەوتەم:
## (ناوێکی جوان بۆ سەگەکەشت هەڵبژێرە)

کچێکی خزمم ناوی (أرنست جنت)و خزمەتکارێکی تری گرت تا لەگەڵ خزمەتکارەکانی تردا کاری ناوماڵی بۆ ڕاپەڕێنن، و پێی ووت لەڕۆژی دووشەممەی داهاتووەوە دەست بەکاربە؟!.

لەم کاتەدا (جنت) پەیوەندی کرد بە ئەو ماڵەی کە ئەو خزمەتکارە پێشتر کاری لێکردوەو دەربارەی ئەم خزمەتکارە زۆر پرسیاری لێ کردو بۆی ڕوون بوویەوە کەچەند عەیب و ناتەواویەکی تێدایە کە ناکرێت مرۆڤ لێی بێ دەنگ بێت!

لەدووشەممەدا خزمەتکارەکە ئامادەبوو،( مستر جنت) پێی ووت: (نیلی)خان باش گوێم لێ بگرە، دوێنێ تەلەفوونم کرد بۆ ئەو خانمە تۆ لەماڵی ئەواندا کارت کردووەو دەربارە ی تۆ پرسیاری زۆرم لێکردوە. باسی لێهاتووی و دەست پاکی و زیرەکی لەهونەری چێشت لێنانی تۆی بۆ کردم بەڵام تێبینی ئەوەی لەسەرت هەبوو کە زۆر گرنگی بەپاك و خاوێنی نادەیت بەڵام من واهەست دەکەم ئەمە زیادە ڕەویەو وانییە! چونکە دەبینم جل و بەرگت زۆر ڕێك و پێك و پاك و تەمیزە، دەی من لەوباوەڕەدام هەربەو چەشنەش گرنگی بەپاك و تەمیزی ماڵ دەدەیت!..

ئابەم چەشنە –نیلی– گومانی چاکەی پێ برا لەلایەن گەورەکەیەوە.. تاوای لەخۆی کرد هەردەم ماڵەکەی واڵ دەکرد بریقەی دەدایەوەو نەك هەر ئەوەش بەڵکو چەند سەعاتێکی زیادەش کاری دەکرد تا گەورەکەی هیوابڕاو نەبێت لێی و ئەو گومانە چاکەی بەزایە نەدات!.

(صحرئیل فولکین) بەڕێوەبەری کۆمپانیای شەمەندەفەر جارێکیان پێی ووتم: (هەموو کەسێك ئامادەیی تەواوی هەیە کەچی تۆبێت و لەقسەت دەرنەچێت.. بەمەرجێك بۆی دەربکەوێت کە تۆ ڕێزی تەواوت لەلێهاتوویی و توانای گرتوە ئیتر با لەیەك تواناو لێهاتوویش بێت ئەگەر ویستت سود لە یەك لێهاتووی کەسێك

وەربگریت، یەك شتی گرنگت بۆ هەیە، ئەویش ئەوەیە بۆی دووپات کەرەوەو تێی بگەیەنە و پێی بڵێ (ئەم لایەنەت لەهەموولایەنەکانی‌ترت بەتواناترە؟!).

شکسپیر دەڵێت: (ئەگەر چاکەت تێدانەبوو.. واخۆت پیشان بدە کە تێتدایەو باش وایە هەمیشە وادەربخەیت کە بەرامبەرەکەت ئەو چاکانەی تێدایە کە پێویستە تیایدابێت)!

تۆناوبانگی باشی بۆ پەیدابکە.. ئەویش ناچار دەبێت هەڵسێت بەڕاگیرکردن و پارێزگاری کردن لەوناوبانگە چاکەی، هەموو هەوڵی دەخاتە کار تا ئەو گومانەی پێی براوە بەهەدەر نەڕوات و بێ هیوانەبن لێی!.

خاتوو (جورجیت لوبلان) خاوەنی کتێبی (ژیانم لەگەڵ مستر لنگ دا) وەصفی ئەوگۆڕانکاریەمان بۆ دەکات کەبەسەر ئافرەتێکی گێلی بەلجیکی داهات و بووبە جێگای سەرسوڕمان و دەڵێت: کچێك خزمەتکاربوو لەئوتێلێکی ئەم نزیکانەداو هەموو ژەمەکانی خواردنی بۆ ئامادە دەکردم ناویان نابوو (حاجەت شۆر) چونکە یەکەم جار بەحاجەت شۆر دامەزرابوو، ئەم کچە زۆر ناشرین بوو رەش بوو، چاوی لاربوو، قاچی گێڕبوو!

ڕۆژێکیان من برسیم بوو، یەك قاپ ماکەرۆنی بۆ هێنام منیش بەڕوویەکی خۆشەوە پێم ووت: ماری، تۆ بەخۆت نازانیت کە چ کەنزێك لەتۆدا شاراوەیە؟!.

زۆر ئاسایی دەستی گرت بەسەر سۆزی خۆیداو چەند ساتێك لەجێی خۆی ووشك وەستا و جوڵەی لەخۆی بڕی.. پاشان قاپەکەی بەئەسپایی لەسەر مێزەکە داناو یەك هەناسەی خۆشی هەڵکێشاو ووتی: ئەوە بەڕاستتە؟ گەورەم من هەرگیز لەو باوەڕەدانەبووم!.

هیچ گومانێکی تێدا دروست نەبوو، پرسیاریشی نەکرد، بەڵکو زۆر بەئەسپایی بەرەو چێشتخانەکە گەڕایەوەو قسەکانی منی چەند جار لەدڵی خۆیدا دووبارە کردۆتەوە، پاشان ئەوەندە متمانەی بۆ دروست بوو بەرامبەر بەخۆی تاوای لەخۆی کرد کەدەوروبەر شەرمی لێبکەن و بەهیچ شێوەیەك گاڵتەی پێنەکەن!. بەڵکو گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی بەسەر دەروونیدا هات و هەستی کرد کە ڕاستە کەنزیکی

شاراوەیە، بۆیە دەستی کرد بەجوانکردنی خۆی و جل و بەرگ و لەش ولاری تاوای لێهات دەتگووت گەنجێکە و سەرلەنوێ گەشبۆتەوە!

پاش دوومانگ من ویستم شتەکانم کۆبکەمەوەو بەرەو ئەوجێیە بڕۆم، ئەوکچە هات بۆلام و ئاگاداری کردم کەبوومەتە دەستگیرانی ئامۆزایەکی سەرۆکی چێشتلێنەرەکانی ئوتێل! ووتی: لەم ماوەیەدا دەمگوێزنەوەو دەبمە کەیبانووی مالّ!!

بینیتان ئابەم چەشنە ڕستەیەکی گچکە چۆن ڕێڕەوی ژیانی ئافرەتێکی گۆڕی؟ پەندێکی کۆنی هەیە دەڵێت: (هەرکاتێ ناوێکی ناخۆش و بێ تامت لەسەگەکەت نا پاش ئەوە زۆر ئاسانە هەرکاتێ بتەوێت دەیخنکێنی)! بەڵام ناوێکی جوانی لێ بنێ و پاشان بزانە چی ڕوودەدات؟!..

(لویس لویس) بەڕێوەبەری زیندانی (سنج سنج) دەڵێت: (تاکە ڕێگایەك بۆ ئەوەی لایەنێکی چاکە لەتاوانبارێکدا بروێنێت ئەوەیە: بەجۆرێ هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکە وەك بلێی مرۆڤێکی بەرزو پاکە ئەویش یەکسەر بەدەم ئەم داواکاریەتەوە دێت)!.

ئەگەر ویستت کاربکەیتەسەر ڕەوشتی کەسێك و بەبێ تووڕەکردن یان زیان پێگەیاندن ئەوا برگەی ژمارە (٧)جێبەجێ بکە: کە دەڵێت:

(بەپیاوباش ناوی بەرامبەرەکەت بەرە.. هەوڵ دەدات پیاوباش بێت).

## پاشكۆی ڕێگای حەوتەم:
## ( لەبراكەتدا ئەمەل بچێنە )

پیاوێك ئەمەلی دەوڵەمەندبوونی نەمابوو.. وای دەزانی لە (لوح المحفوظ)دا بەهەژاری ناوزەد كراوەو تازە جگە لەسواڵ كردن هیچ چارەیەكی تری نییە! بەڵام (پێغەمبەر)ی خوا ﷺ هیوای كردەوە بەبەریداو بۆی سەلماند كەڕێگای دەوڵەمەندبوون و گوزەران خۆشی لەكەس دانەخراوە پیاوەكە داوای یارمەتییەكی لە(پێغەمبەر) كرد!!

(پێغەمبەر) ﷺ سەیرێكی كرد دەیبینێ پیاوی سواڵ نییە.. پێی فەرموو:لەماڵی دونیا چیت هەیە؟ ووتی: جامێك و بەڕەشڕەیەك ! فەرمووی: بۆم بهێنە با بیفرۆشم بۆت! پیاوەكە هێنایەو (پێغەمبەر) بۆیدا بە (دوودرهەم) و فەرمووی: بەدرهەمێكیان خواردن بكڕە بەودرهەمەشیان گوریسێك بكڕەو بڕۆ داربهێنە بۆ فرۆشتن! پیاوەكە وای كردو پاش ماوەیەك هاتەوەو وتی: ئەی (پێغەمبەر)ی خوا پارەی باشم دەست كەوت و ژیانم باش بوو! (پێغەمبەر) (د.خ)فەرمووی: ئائەمە باشە یان دەست پانكردنەوە لەخەڵك بیدەنێ یان نا؟!..

سەیركە، پرس بەوەی هیوای كردەوە بەبەریداو تێی گەیاند كە لەتوانایدا هەیە دەوڵەمەند بێت و لەسواڵكەری ڕزگاری ببێت..

لەژیانی دەعوەو بانگەوازدا ئەم مەسەلەیە سەرتاپاخێرو چاكەیە بۆ برای بانگخوازو بانگ كراویش: كەدەگەیت بەكەسێك نوێژ ناكات پێی بڵێ: من واهەست دەكەم تۆ زۆر خواو (پێغەمبەر)ت خۆش دەوێت و ئەم نوێژ كردنەشت وادیارە لەبەر تەمبەلیە ئەگینا من هەرچی سەیری تۆ دەكەم دواڕۆژێكی خواناسی چاوەڕوانت دەكات!.

من بەخوشكێكم ووت: من وائەزانم خواو (پێغەمبەر)ت خۆش دەوێت و حەزیش ناكەیت سەرپێچی فەرمانیان بكەیت و هیواداریشم حیجابی ئیسلامی

بپۆشیت! من کاتێ ئەوەم پێ وت زۆر لەئیسلام و حیجاب و نوێژ دوربوو بەڵام کێ دەڵێ بیری لەو وشانە نەکردبێتەوە کەئێستا پۆشتەو ڕوولەخوایەو خەریکی کاری بانگەوازیشە؟!.

یان قوتابییەکم زیرەك نەبووەو سەعی نەکردووە لەچەند وانەیەکدا کەوتبوو مامۆستاکان زۆر ڕقیان لێی بوو، زەمیان دەکرد! بەلام من بەپێچەوانەوە لەگەڵیدا جولامەوەو پێم ووت: تۆ زۆر زیرەك و لێهاتوویت بەڵام ئای بواری سەعی کردنت هەبوایە لەزۆرێ لەقوتابیەکان زیرەکتردەبوویت! من ئاوا بۆت ئەڕوانم ئیتر نازانم بەهەڵەدا چووم یان نا؟ ئەوقوتابییە لەوڕۆژەوە فەرقی کردو گۆڕا بەرەو چاکی!!..

یان بەقوتابیەکی زیرەکم ووت: هەرچی سەیرت دەکەم تۆ ئەگەر مەجالی سەعیت هەبێت و کاتی خوێندنەوەت بۆ بڕەخسێت لەوباوەڕەدام یەکەم نەبێت دووەمی پۆل دەبیت!!

ئەم چەند ووشەیە کەمە بۆ تۆ فلسی تێناچێت! بەڵام بۆ ئەو قوتابییە ڕێڕەوی ژیانی دەگۆڕێو قوتابی یە تەمەڵە پیس و پۆخڵەکە دەبێتە زاناو داهێنەری وەك ئەدیسۆن!..

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز -خوالێی ڕازیبێت- هەمان ڕێگای بەکارهێنا لەگەڵ خەوارجەکان و پێی وتن: (هەرچی ورد دەبمەوە لێتان هەست دەکەم لەبەر ڕەزامەندی خواو گەشتن بەحەق و دادپەروەریدا چوونەتە دەرەوە و ئەگەر راستیشتان بۆ دەربکەوێت وانازانم شوێنی ناکەون واز لە ناهەق ناهێنن؟!

دەی ئەزانی ئەم قسانەی لەگەڵ کێداکرد؟ لەگەڵ عاصم و شوذب دوو سەرکردەی سەرکەش کە هاوەڵی بەرێزیان بەکافردەزانی( پەنابەخوا) کەچی عمر زۆربەیانی گەڕاندەوە وئەهلی (سوونەو جماعە)!!.

## ڕێگای هەشتەم:
## (وا پیشان بدە ئەوهەڵەیە چارەسەرەکەی ئاسانە)

ماوەیەك لەمەوبەر هاوڕێیەکم داوای کچێکی کردو شووی پێکرد.. لەکاتی دەزگیرانداریدا.. ئەو خانمە داوای لێکرد کە حەزدەکەم خۆت فێری هەڵپەڕکێ(١)بکەیت.. ئەمیش بەقسەی کردو هەوڵی فێربوونەوەیدا.. خۆی بۆی گێڕامەوەووتی: (من زۆر پێویستم بەوە هەبوو فێری ئەو هونەرەببمەوە چونکە بیست ساڵ لەوەوبەر فێربووبووم و لەبیرم چووبوویەوە، ڕۆشتم بۆلای مامۆستاکەی یەکەمم پێی ووتم: تۆ لەسەر هەڵەیەکی زەقیت و پێویستە لەسەرم هەرچی لەمەوبەر فێری بووم لەبیری خۆمی بەرمەوەو سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە! بەلام ئەم کارە زۆر قورس بوو لەسەرم بۆیە وازم هێنا لەفێربوونی ئەوهونەرە بەلام مامۆستایەکی ترم بینی پێی ووتم: هونەرەکەت هەندێ کاتی پێویستە تا هەنگاوە تازەکان بخوێنیت، تۆ زۆر زوو فێردەبیت چونکە کاتی خۆی بنەماکانیت خوێندووە وەلامی ئەو ماۆستایەی دووەمم پێخۆش بوو.. دەستم دایە فێربوونی هونەرەکە!.

کاتێ فەرمانبەرێك یا منداڵێك یان ژنێك یان مێردێك ئیشێك دەکات پێی بڵێی گەوجیت کرد! یان تۆ گێلی! و ناتوانی ئەو کارە بەجوانی بکەیت!! ئەوا لەسەر هەڵەی خۆی بەردەوام دەبێت و ئەوهۆیانە پێشێل دەکات کەبەرەو باشی و چاکی ببات! بەلام وابکە لەبەرامبەرەکەت کە هەست بکات تۆ باوەڕت بە ئاوەزی هەیە، و دان بەتواناو لێهاتوویی‌دا دەنێیت! و بەهرەی تێدایە بەلام وەك پێویست پەرەی پێنەداوە دەبینی ئەوەندە پرۆڤە دەکات تاسەردەکەوێت و دەردەکەوێت!.پڕاوپڕ (لویل توماس) ئەم ڕێگایەی بەکار هێنا:باوەڕم پێ بکە هونەرێکی داهێنەرە لەبواری پەیوەندیو تێکەڵی کردنی

خەڵکی، سەر لەنوێ بنیات دەنێتەوەو باوەڕ بەخۆکردنت تێدا دروست دەکاتەوو ئازایەتی و باوەڕت تیادەچێنێتەوە!

پشووی کۆتایی هەفتەیەکم لەگەڵ (لویل توماس) و خێزانەکەی بەسەربرد، لەوێ داوای لێکردم سێقۆڵی یاری بریج بکەین، ووتم: ئاخر من هیچ لەم یارییە نازانم و بەلامەوە وەك مەتەڵ وایە؟!

پێی ووتم: چۆن؟ هیچ هونەرێك نارەحەتی تێدانییە! هیچی ناوێ جگە لەبەکارهێنانی کەمێ ژیری و حوکم دەرکردن نەبێت! تۆ لەبارەی ژیرییەوە بابەتێکت نووسیوەو ئێ خۆ ئەم یارییە لەگەڵ بەهرەی تۆدا دەگونجێت!..دەبینی پێش دەست پێکردنی یاریەکە لەسەرمێزەکەی بریدج دانیشتم، ئەم یارییەی والێ کرد زۆر سوك و ئاسان بوو لەبەرچاوم، لەبەرهیچ نا! بەس لەبەر ئەوەی کەپێ ی ووتم تۆ تواناو ئامادەیی ئەم یاریەت تێدایە!قسەکردن لەبارەی یاری بریدجەوە یەکسەر دەبێت باسی یاری زانی بەناوبانگ (ئیلی کلبرستون) بکەیت کەوێنەی لەهەموو ماڵێکدا کە بریدجی تێدابێت هەیەو کتێبەکەش لەبارەی بریدجەوە نووسیبووی وەرگێڕاوە بۆ (١٢)زمان و نزیکەی یەك ملیۆنی لێ فرۆشراوە! لەگەڵ ئەمەشدا خۆی پێی ووتم:

ئەگەر یەکەم جار ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و جوان بانگی نەکردمایە بۆ ئەم یاریە هەرگیز بریدجم نەدەکردە پیشەو پێوەی خەریك نەدەبووم!

ئەم پیاوە لەساڵی (١٩٤٢)دا هات بۆ ئەمەریکا بەمەبەستی ئەوەی ببێتە مامۆستای فەلسەفەو کۆمەڵناسی بەڵام سەرنەکەوت! پاشان دەستی دایە کڕین و فرۆشتنی خەڵوزو لەوێشدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا! دەستیدایە فرۆشتنی ماست و لەوێشدا تێك شکاو سەرنەکەوت! لەوڕۆژانەدا نەك هەر یاریزانی وەرەق نەبوو بەڵکو زۆر تووڕەو گیریش بوو بەجۆرێك کەس ڕازی

نەبوو یاریشی لەگەڵدابکات.پاش ئەوەی گەشت بەئافرەتێکی جوان و شۆخ و شەنگ کەناوی (جۆزفین دیلون)بوو مامۆستای یاری بریدج بوو، داوای کرد و مارەی کرد! ئەوخانمە سەرنجی هاوسەرەکەی دەدا دەبینێ زۆر وردە لەچاودێری وەرەقەکانی بەرامبەردا.. بۆیە پێی ووت: تۆزۆر عەبقەری و هەڵکەوتوویت لەم یاریەدا!!.

کلبرستون پێی ووتم: تەنها ئەم هاندانە بوونەهۆی ئەوەی ئەوپیاوە دەست بداتە ئەو یارییە! کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی گەردن کەچی بۆچوونەکانت بکەیت بەبێ ئەوەی ئازاریان بدەیت یان توڕەیان بکەیت.. بڕگەی ژمارە (٨)جێبەجێ بکە کەدەڵێت: (واپیشان بدە کەهەڵەکەی چارەسەری زۆر ئاسانە)

## پاشکۆی ڕێگای هەشتەم:
## (براکەم، چارەسەری هەڵەکەت ئاسانە)

(پێغەمبەر)ی ئیسلام ﷺ بەسەرهاتی ئەو پیاوەمان بۆ باس دەکات کە (٩٩)کەسی کوشتوو لەپێش ئیسلامدا و پاشان هەستی بەهەڵەی خۆی کرد ونیازی تەوبەی کرد! ڕۆشتەلای زانایەك ووتی تەوبەم بۆهەیە؟ من (٩٩)کەسم بەبێ تاوان کوشتووە؟ وئێستا پەشیمان بومەتەوە ....

پیاوەکە ووتی تۆ خوێنڕێژیت و تەوبە سوودت پێناگەیەنێت!! ئەوپیاوەش لەڕقاندا ووتی دەی سوێندم بەخوا دەبێ بەتۆوە بیکەم بە سەد!

بەڵام بەدەم خەفەت و پەشیمانییەوە چووبۆلای زانایەکی ترو بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوەو ئەویش ووتی: زۆر ئاسانە و گوناهی لەوەش گەورەتر هەبێت مادەم بەدڵ پەشیمانی، خوای گەورە لێت وەردەگرێت پیاوەکە زۆر دڵخۆش بوو!.

زانایان ئەم بەسەرهاتە لە (بابی) تەوبەدا باس دەکەن بەڵام من وادەزانم بەڵگەیەکی گەورە یە لەزانستی دەروونناسیدا چونکە مامۆستای یەکەم کارەکەی لەسەرقورس کرد! بەڵام مامۆستای دووەم کارەکەی بۆ ئاسان کردو ڕزگاری کرد لەخوێنڕشتن و کورە خۆیشی ڕزگار کرد لەکوشتن کە نزیك بوو بیکا بە (١٠١)!..

تەنانەت منداڵێك کاتێك شوێنێکی زامار دەبێت دەست دەکات بەگریان، بەڵام ئەگەر پێی بڵێین: هیچ نییە! یەك تۆزە! وام زانی برینەکەت گەورەیە کەچی زوو بچوکە هەر هیچ نییە! نەك منداڵ گەورەش خۆشی بۆدێ نەخۆشییەکەی لەسەر سوك بکەیت..

بۆیە سوننەتی (پێغەمبەر)مانە ﷺ هەرکاتێ چووین بۆلای نەخۆشێك پێی بڵێین: (طهور انشاء الله) واتە هیچ نییەو انشاءالله چاك دەبیتەوە..

ئایا جێبەجێکردنی ئەم ڕێگایە لەکاری بانگەوازدا بەسوودە؟

بەڵێ، ئەی بەسەرهاتی ئەوزانا ئیسلامییەت بیستووە کە بەنەزانی و هەڵەشەیی ئیسلامی لەسەر پاشا قورس کردو پاشان وای لێکرد ببێتە گاور ئەمە چۆن بوو؟:

پاشایەك بڕیاریدا ئاینێك هەڵبژێرێت ئیسلام یان گاوریەت؟!

بۆیە ووتی زانایەکی موسڵمان و زانایەکی گاورم بۆ بانگ بکەن بزانم کام ئاینەکان جوانەو ئاسانەو بەدڵمە؟

زانای ئیسلامی بەدووروودرێژی باسی ئیسلامی بۆکرد نزیکەی (٢)سەعات هەر لەسیواکەوە تا ئەوپەڕی ئیسلامی بۆباس کرد ووتی ئەوەی وانەکات خەسارۆمەندی هەردوو دنیایە!!.

پاشا ووتی: لایبەن ئیسلامم بەدڵ نییە! زۆر قورس و دوور و درێژە! ئادەی کابرای گاورم بۆ بانگ بکەن بزانم دینی ئەو چۆنە؟

بەڵێ زانا قەشە زیرانەو لێزانانە دەستی پێکرد ووتی: قوربان، گاوری ئاینێکی ئاسان، کورت، تەنها دوونوێژەو ئامادەبوونی یەك شەممان و هەندێ دوعاو شتیتریشە. ئەم بڕەکردەوەیە وات لێدەکات خوای گەورە لێت ڕازی بێت!

پاشا ووتی: ئائەمە ئایینە ئاسان و خۆش و کورت و بەدڵمانووسا! ئەوپاشایە لەگەڵ گەلە بت پەرستەکەی لەناوچەکانی ئەفریقیابوو بەگاور ئۆپاڵی بەئەستۆی ئەو زانایەی یەکەم کەشێوازی دەروونناسی و ڕێگای ئاسان نمایش کردنی بۆچوونەکانی فەرامۆش کرد!.

هەندێ لەهەڵگرانی بانگەوازی ئیسلام، بەداخەوە بەنەزانی شێوازی زۆر خراپ دەگرنەبەر و ئایین لەبەرچاوی گەل دەخەن و قوتابیو ئەندامانیان زۆر بێتاقەت دەکەن! بەچی؟

جارێکیان بەکوڕێکی زیرو وریام ووت: باپێکەوە دەرسێکی قورئان بخوێنین بزانم لەقورئان خوێندندا چۆنی؟ لەوەلامدا کوڕەکە وەك نیمچە رووگیریەك ووتی باشە!

کاتێ گوێم گرت بۆ قورئان خوێندنەکەی دەبینم زۆر باش قورئان ناخوێنێتەوەو لەتەجویدیشدا وێرانە بەلام من ئەمەم پێنەوت! بەڵکو.. یەك هەڵەم لێنەگرت! کاتێ لێبوویەوە: دەستخۆشیم لێکرد و پێم ووت: تەنها هەندێ وردە هەڵەت هەبوو

ئـەویش گـرنگ نییـە بـەمروری زەمـەن ڕاسـتیان دەکەیتـەوە منـیش لەسـەرەتاوە لەوهەڵانەی تۆ زۆر گەورەترو ناقۆڵاتریشم کردووە!.

هەرلەوێدا زیاتر ئیسلامەکەو دەرسەکەم لەلاخۆش کرد و پێم ووت: تۆ لـەزووەوە (جوزئی عم) دەخوێنی واگومان دەبەم بتبەمە جوزئی تبارەك!

ئەوکوڕە وەك گوڵ دەمی کردەوەو ووتی:

ماۆستاگیان من هەر لای تۆ دەرس دەخوێنم و بەڕاستی ورەت بەرزکردمەوە، مـن چوار ساڵە لەلای مامۆستایەکم هەر لە (جوزئی عم) دا دەمهێڵێتـەوەو دەڵـێ: هێـشتا ماوتە جوان نـایزانی.. خـەریك بـوو شـێت دەبووم بۆ جـوزئی تـەبارەك خواپاداشـتی خێری تۆ بداتەوە!!.

## ڕێگای نۆیەم:
## (چۆن کارێك لەلای بەرامبەرەکەت خۆشەویست دەکەیت؟)

لەساڵی (١٩١٥)دا هەموو وڵاتانی جیهان بەشێوازێکی دڕندانە هێرشیان بۆ یەکتری دەکردو پەلاماری وڵاتانی دراوسێیان دەدا بەجۆرێ کەلە مێژوودا وێنەی نەبوو!

بەسەرسوڕمانەوە پرسیارێك بەسەر لێوی گەورەو بچووکەوەبوو: ئایا تۆبڵێی ئاشتی جارێکی تر بێتەوە؟!

یەك کەس نەیدەزانی! بەڵام (ولسون) زۆر سووربوو لەسەر بەدەست هێنانی ئاشتی، بۆیە نوێنەرێکی تایبەتی خۆی نارد بۆ ئەوروپا تاقسەو ڕاوێژ بکات لەگەڵ سەرکردە بەشەڕهاتووەکان!

(ولیَم خبجزیان) وەزیری دەرەوەی وڵات بوو پێی خۆش بوو ئەو بنێرن بەنوێنەری وڵات، چونکە دەیزانی هەلێکی ڕەخساوە تا گەورەترین خزمەت بە گرۆی سەرزەمین بکات و ناوی لەمێژوودا بمێنێتەوە!

بەڵام (ولسۆن) هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆی هەبوو. ئەوی هەڵبژارد بۆ ئەو مەسەلەیە کەناوی (الکولونیل هاوس)بوو وەداواشی لێکرد کە هەواڵی ئەم گەشتەی بە (ولیم) بگەیەنێت!!.

هاوس لەیاداشتەکانیدا دەڵێت: شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە (ولیم) توشی بێ هیوای دەبوو ئەگەر بیبیستایە نەکراوە بەنوێنەری وڵاتەکەی بۆ ئەوکارە! بەڵام من وام پێنەووت! بەڵکو پێم ووت: (سەرۆك وای بەچاك زانیوە کە ئەوکەسەی دەیکاتە نوێنەری ئاشتی لەئەوروپا کارێکی ڕەسمی لەدەوڵەتدا

نەبێت تا نەبێتە جێگای سەرنجی خەڵکی و قسەو ووتی دروست نەبێت لەسەری!).

دەبینی چۆن مەدحێکی ڕازی کەرە و (ولیم) هەرلەوێدا قەناعەتی بەمەسەلەکە کرد..

(کولونیل هاوس)ە لەگەڵ لێزانیو ژیریدا شوێنکەوتەی ڕێگایەکی بەسود بوو لەهونەری هاوڕێگرتندا ئەویش خۆشەویست کردنی ئەو کارەی دەیدەی بەسەر بەرامبەرەکەتدا و قەناعەتی پیٚ بکەی.

خاتوو (مسس جنت) پێشتر ناوم هێنا زۆر زویرو ناڕەحەتی دەردەبڕی لەدەستی ئەو منداڵە بەرچاوازی گرانەی لەلای ماڵەکەی ئەودا یاریان دەکرد ڕووەك و گوڵەکانی بەردەرگاکەیان پان و پلیچ کردەوە.

خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: زۆر لۆمەو سەرزەنشت و توندوتیژیم دەنواند لەگەڵیاندا کەچی بێهودەو بێکەڵك بوو! بەڵام پاشتر بیرم لەوە کردەوە کە لەناو خۆیاندا منداڵێکی عەجولی ئازاو قسە ڕۆشتو هەڵبژێرم و بیکەم بەنوێنەری خۆم بەسەریانەوە تا باخچەکەم بپارێزێت لەدەستی هاوڕێکان!

بەڵێ منداڵەکە زۆر خۆشحاڵ بوو بە پلەوپایەی پێم داو لەخۆم باشتر باخچەکەی بۆ دەپاراستم تەنانەت لەپشتی ماڵەکەمانەوە ئاگرێکی کردەوەو ئاسنێکی سور کردەوەو ووتی: هەرکەسێ لەوباخچەیە نزیك ببێتەوە بەم ئاسنە داخی دەکەم!!.

سروشتی ئادەمیزدا هەروایە!

کەواتــە ئەگــەر دەتــەوێت جڵــەوی خــەڵکی بگریتــە دەســت بــەبێ زیــان پێگەیاندن و تورە کردنیان بەرەو بۆچوونەکانت بیانهێنیت:

برگەی ژمارە (٩) جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

(ئـەوکارەی دەیـدەیت بەسـەری بەرامبەرەکەتـدا جـوان و خۆشەویـستی بکـە لەلای).

## پاشکۆی ڕێگای نۆیەم:
## (کاربکە بە بەرامبەرەکەت بەقەناعەتی خۆیەوە)

ئیسلام هەدی و ڕێنموونی زۆر جوانی هێناوە تا بەلێزانانە فەرمان بەسەر خەڵکیدا بدەین و بەجۆرێك نەبێت کە بەنابەدڵی و دڵڕەنجاوی بەقسەمان بکەن..

خەلیفەی یەکەمی ئیسلام ئەبوبکری صدیق وای بەچاك زانی (ابوعبیدە بن الجراح) لەسەرکردایەتی سوپا لاببات و (خالیدی کوڕی وەلید) لەشوێنیدا دابنێت! بەڵام ئاخۆ تۆ بڵێی پرژێکی لەهونەری دەروونناسی (پێغەمبەر)ی سەروەرمان وەرنەگرتبێت؟!.

دەماودەست نامەیەك بۆ ئەبو عوبەیدە دەنووسێت و تیایدا دەڵێت: (بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان لەعەبدوڵڵای کوڕی عتیق بۆ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح سەلامی خوای گەورەت لێ بێت!. ئەمەوێت خالیدی کوڕی وەلید لەباتی تۆدا بکەم بەسەرکردەی سوپای ئیسلام! و تۆش لەقسەی دەرمەچۆ، لەکاتێکدا من ئەو دەکەمە سەرکردە چاك دڵنیام تۆ لەو باشتریت! بەڵام واگومان دەبەم کە خالید لەنەخشەو هونەری جەنگدا باشتر بێت!! خوای گەورە ڕێگای ڕاست بەئێمەش و ئێوەش نیشان بدات)!.

چەند نامەیەکی جوانە، پڕیەتی لەسۆزو بەزەیی و دڵ ڕاگیرکردن وسینە سافی! ڕێز ی هەست و گرنگی بەرامبەری تێدایە! موسڵمانە پێشینەکان شکاندنی دڵی برایەکیان وەك گوناهی گەورە سەیر کردووە!..

خوێنەری بەڕێز ورد بەرەوە! ئەم نامەیەی بەو شێوە پڕ لەسۆزو لەسەرخۆیی یەی پێی وتووە! خۆ دڵنیاش بووە کە (ئەبو عوبەیدە) باوەشی بەکورسیدا نەکردووە و نەخۆشی پلەو پایە لێی نەداوە! (وەك زۆر لەسەرکردەکانی ئەمڕۆ) بەڵکو لابردنی لەو ئەرکە گەورەیە -دڵخۆشی دەکات-و مژدەش بەوە دەدات کە هەواڵی بردنی بۆ دێنی!.

کەچی داخەکەم ئەمڕۆ سەرانی کاری ئیسلامیی بەو چەشنە نین لەگەڵ خەڵکیدا -مەگەر بەدەگمەن- کە ئەمڕۆ دڵنیاشن باوەڕە بتەوەکەی (ئەبو عوبەیدە) نەماوە خەڵکی زویر دەبن و شت زوو کاریان تێ دەکات: (گوێنادەنە دڵ و دەرونی خەڵکی بەبێ هیچ پێشەکی و دڵدانەوەیەك بەئەندامەکانیان دەڵێن: (فلان کارمان لێ سەندیتەوە!!) یان (تۆ لێی نازانی)! یان (دامان بەکەسێکی شیاو!) یان (ئەو کارە بۆتۆ نەئەشیا!).

کەم جار هەڵئەکەوێت لەگەڵ ئەم ڕستە بێ تامانەی سەرەوەدا دوو سێ وشەی هەنگوینی و دڵسافکەرەوە بخاتە پێشی وەك: (توخوا لێمان ببورە! یان (کارێکی بۆ داناویت! یان کارەکە وا دەخوازێت ئەگینا تۆ شیاویت! یان: خۆزگە ئەوە ڕووی نەدایە!!..).

سەیری نامەکەی خالید بکە کە چۆن بۆ (ئەبو عوبەیدە)ی سەرکردەی دەنووسێت پاش ئەوەی بەفەرمانی خەلیفە کرا بەسەرکردەی نوێی سوپای ئیسلام:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، لەخالیدی کوڕی وەلید بۆ (ئەبو عوبەیدە)ی کوڕی جەڕاح سەلامی خوات لەسەر، پاشان، نامەی گەورەی ئیمان دارانم پێ گەیشت کە منی کردۆتە سەرکردەی سوپاو دەبێت بەرەو شام بیانبەم، سوێندم بەپەروەردگار ئەم فەرمانەم لەسەر حەزو داواکاری خۆم نە بووە! و نەشم ویستوە بمکەن! بەڕێزیشتان لەسەر ئەو حاڵەتەی خۆتان دەمێننەوە! هەرگیز سەرپێچیت ناکەین! بەبێ تۆ هیچ بڕیارێك نادەین! تۆ سەرداری سوپای ئیسلامیتو ئینکاری چاکی و بەڕێزی تۆ ناکرێت و ئێمەش بەبێ ڕاوبۆچوونی بەڕێزتان نامانکرێت!..

ئایا بەم نامەیە سەرۆك کۆماریشی پێ لانابرێت لەسەر حوکم بەبێ توڕەبوون و بۆڵە بۆڵ کردن؟ یان ئایا ئەمە گەورەترین بەڵگە نییە لەسەر بوونی قوتابخانەیەکی سەربەخۆی دەروونناسی ئیسلامیی؟!بێ گومان بەڵێ..

ڕستەی (بەڕێزتان لەسەر ئەو حاڵەی خۆتان دەمێننەوە..! واتە ڕێزدانان بۆ ژیری و گرنگی و لێهاتوویی یەکەی!

بەڵام داخەکەم ئەمڕۆ لەناو موسوڵمانانندا ئەم ڕێگایە فەرامۆش کراوە و بگرە لەگەڵ لابردنی کەسێکیشدا کەمێ ختوکەی دڵی دەدەن و پێی دەگووترێت: (فەرمانی سەرەوەمانە تۆ لەو کارە لابراویت و خۆم! خراومەتە جێگات و بووم بەفەرماندەی گشتی !.. ئیتر بە بێ من بۆت نییە هەناسەش بدەیت و تۆ لەمەولا سەربازێکی سادەیت!..

برایەك –گێڕایەوە ووتی: پاش دروست بوونی (یەکبوونی ئیسلامی) من کارەکەی خۆمم لێ سەنرایەوەو درا بەفلان کەس بەبێ هیچ هۆیەکی شەرعی!

منیش ووتم بەو کەسەی کارەکەی منی وەرگرتبوو: چۆن قبوڵت کرد ئەو کارەی من وەربگریت؟ ئەی نەتگوت فلان کەس پێی ناخۆشە و دەڕۆم بۆلای یان نامەیەکی بۆ دەنووسم و دەڵێم: (برای بەڕێزم خوا ئاگادارە ئەو کارە لەجەنابتان دێت و دەستێکی باڵات هەیە تیایدا زۆر لەمن زیاتر! بەڵام سەرەوەمان ئەم تەکلیفەیان لێ کردووم! ئەگەر تۆ پێت خۆش نەبێت و دڵت شتێك بکات من ئامادەم داوای لێ بوردن لەسەرەوە بکەم و ئەو کارە وەرنەگرم!!). لەوەڵامدا ووتی: وەڵلا هەرگیز شتی واناکەم.. من سەرەوەم! پێم بڵێ لەهەرکوێدا کار بکەم ئامادەم بەقسەی بکەم و بچمە جێگای هەموو کەسێك!!ئەمەیە هونەری بەچۆکدا هاتن و تێك شکان و دوورکەوتنەوە لەڕێنموونییە دەروونناسیەکانی (پێغەمبەر)ی خۆشەویستمان ﷺ ئەمەیە لێهاتوویی لەمەیدانی چۆن خەڵکی دەکەیتە دوژمنی خۆت!..تەنانەت ئەو کەسانەشی کە خۆیان داوای ئیشوکارو پلەو پایەشیان لە(پێغەمبەر) کردبێت هەرگیز هاوەڵانی تەریق نەکردووەتەوەو ئابڕووی سیاسی نەبردوون! و پێی بڵێ:

ئەمیری بۆتۆ نییە! هەرکەسێ خۆی داوای کات ئەوە نیازی خراپە! و لەبەر خوا نییە! ئەوە بۆ (منصب) موسڵمان بوویت مونافیق!!..

نەخێر بەڵکو بەسۆزێکی باوکانەوە دەستی دەخستە سەرشانی (عبد الرحمن) و بەشێوازێکی جوان پێی دەووت: یا عبد الرحمن! لاتسأل الأمارة ! .

فأنها ندامة یوم القیامة؟! عبد الرحمن گیان داوای ئەمیری مەکە چونکە لێ پرسینەوەی زۆر و پەشیمانی لەدوایە لەقیامەتدا!.

خۆزگە هەڵگرانی پەیامی ئیسلامەتی هەستیان بەمە دەکردو نرخ و ڕێزیان بۆ دڵی ئەندامەکانیان دادەنا چونکە ڕۆژانە لابردن و دامەزراندن دێتە ڕێگایان بەتایبەت پاش کۆنگرەکان و گۆڕانکاریە جەزەریەکان).

(الحمد لله أولاً وآخراً)

# بەشی سێهەم

## بسم لله الرحمن الرحيم

## پیشەکی بەرگی سێهەم

ئەم بەرهەمەی کە لە بەردەستتایە یەکێکە لە شاکارەکانی نوسەری بەناوبانگی ئەمریکی (دیلکارینجی ) منیش وەك خوی وەرم گێڕایە سەر زمانە شیرینەکەی کوردی و بۆ هەر فەسڵێك پاشکۆیەکی (علم النفس) ی ئیسلامیم بۆ زیاد کرد ,بۆ زیاتر سود وەرگرتنی خوینەرانی موسڵمان و تا بۆ هەموو لایەکیش دەرکەوێت کە ئیسلام لە میدانی دەرون ناسیدا دەستێکی بالآی هەیە و لە پێش هەمو زاناکانی ئەوروپا کاری پیٚ کردووە ...

لە بەر ئەوەی کە باسەکانی ئەم کتێبە زۆر پێویستە وهەموو کەسێك حەز دەکات کامەران وبەختیار بێت و هەموو کەس خوشی بوێت , بۆیە ئەم کتێبە وەرگێراوە بۆ (٦١)یەك زمانی جیا جیا لە جیهاندا و کاتی کە (عبد المنعم الزیادی) کردی بە عەرەبی (١٨) جار لە چاپی دایەوە ,هەر لە بازاردا نەما !! .ئەمە گرنگ نیە چونکە (دیل کارینجی )خوی دەڵیت (ئەم نوسینەم بۆ قوتابیەکانی خۆم بوو لە پەیمانگەکەمدا و هەرگیز نەهاتووە بە خەیاڵمدا کە ئاوا لە ئەمریکا تەشەنە بکات. کە پەیتا پەیتا بە نامەو تەلەفون داوای ئەوەیان دەکرد چاپی بکەمەوە ) تا (٣) ملیۆن دانەی لیٚ چاپ کرا

منیش لە ساڵی( ١٩٩٤ ) ئەم کتیبەم کرد بە کوردی و لە بەردەست کورتی نەبوونی بە چاپ نەگەیەنرا ,کە کردومە بە سیٚ بەشەوە, ئەم بەشەم لە بەر زەرورەتی بۆ خێزانەکان ئامادەم کرد .

هیوادارم جێگای سوود بێت بۆ هەموو خوینەرانی و خوای گەورەش لە نامەی چاکەکانماندا توماری کردبێت.

***وەرگێڕ :عمر توفيق الخطاط***

## شەش ڕێگا بۆ ئەوەی
## ژیانی هاوسەریەتی بەختەوەر بێت :

ڕێگای یەکەم :

ئاژاوەو ماڵ وێرانی بەرپا مەکە !

ڕێگای دووەم :

واز لە خۆشەویستی بێنە بابۆ خۆی گەشە بکات

ڕێگای سێیەم :

نزیکترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە تەلاق .

ڕێگای چوارەم :

بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەختەوەر بکەیت .

ڕێگای پێنجەم :

ئەم خاڵە لە لای ئافرەتان زور گەورەیە.

ڕێگای شەشەم :

هەڵس وکەوتی جوان داوایەکی سەرەکییە

## رێگای یەکەم :
## ئاژاوەو ماڵ وێرانی بەرپا مەکە !

پەنجاو پێنج ساڵ لە مەوبەر ئیمپراتۆری فەرنسا (ناپلیۆنی سێیەم ) کە ئامۆزای ناپلیۆن بۆناپارت بوو, کەوتە داوای ئەوینی (ماری ئۆجینی ئیجناس ئۆجیستین) کە شەبەقە گوڵی (تیبا) و جوانترین ئافرەتی دونیا بوو لەو سەردەمەدا .ئەم ئەوین دارییە تاجی خوشەویستی و مارە بڕینی لە سەر نرا.

هەرچەندە دەست و پەیوەند و ئامۆژگار کارانی زۆر هەوڵیان دا کە نەهێڵن ئەم مارە بڕینە سەر بگرێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەمە کچی (گونت)ی ئەسپانی یە کەس نای ناسیت، وبەلام ئەم هەر لە سەر رای خۆی سوور بوو بەرابەر یەك گەلی تەواو وەستاو لەوتاری عەرشدا ئەم وتانەی دەربڕی :( من ئافرەتیکم هەڵبژاردوە کە خوشم دەوێ و رێزی زۆر زیاترە لە لام لە ئافرەتی کە پێم نامۆ بێ و خوشم نەوێت)!..

هەموو کەرەسەکانی بەختەوەریی وەك – تەندروستی ,پایەداری ,جوانی , خوشەویستی، لە بەردەستی هەردوکیاندا تەشەنەی دەکرد .. بەلام ئەو خوشەویستییەی نێوانیان ئەوەندەی پێ نەچو کلۆکۆی دامردەوو بۆ بەتۆزو گەردو چو بەگێژی حەوادا ... بێگومان ناپلیون لە گەڵ ئەوەدا کە ئوجینی لە سەر عەرشی دڵی دانابو هەروەها لە سەر عەرشی فەرنساش دایناببوو.... بەلام نە سەرەوەی عەرش نە هێزی خوشەویستی نەیان توانی کە نەهێڵن ئەو خانمە نەکە دوژیان تێکدان دروست بکات !... شەیتانی غیرەت نواندن نەیدەهێشت ئەم ناپلیونە، بەستەزمانە، ساتێك لێ ی دوربکەوێتەوە، زۆر خۆی دەکرد بە نوسینگەکەیدا نەیدەهیشت ئیش وکارەکانی ڕاپەڕێنێت کە ئیش وکاری دەوڵەت بوو ... وازی لی نەدەهێنا لە ترسی ئەوەی نەبادا ئافرەتیکی تر خۆشی بوێت! .. ئوجینی چون هەستی بەمە کرد ؟ فەرموون لە گەڵ

وەڵامەکەی کەلە کتێبی (ا. رینهارت )لە ژێر ناوی (ناپلیون ئوجینی کارەساتی هەزەلی لە مێژووی ئیمپراتوریەت دا ) ئەمە کورتەکەیەتی : (ناپلیون) زۆرجار لە دەرگای پشتەوەی کۆشك خۆی دەدزیەوە بە تاریکی شەو کلاوە پانەکەی دەهێنایە سەر چاوی ولە گەڵ پیاوێکدا بەرەو ماڵی ئافرەتیك دەکەوتە ڕێ !! لە ریگای ناپاکی یەوە!! ئائەمە بو ژیان تێکدەر کە ئوجینی تێی کەوتبو و ! ڕاستە ئەو خانمە لە سەر عەرشی فەرنسا چوار مەشقی دابوو هەر وەك جوان ترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بوو .. بەڵام نەزێڕو نە جوانی نەیانتوانی ئەو خوشەویستیە بهێڵێتەوە لە ناوەندی ئەو کەشتیە ژەهراوییەی کە لە کشتیەکی لێڵدا ئوقرەی گرتبوو !.. بەڵێ ماڵوێرانکەر, (النكد) , تازەترین داهێنانی جەهەنەمییە ,کە ئافرەتان دوچاری بوون وەدەستیان هەیە لە داهێنانی دا بۆ ڕمانی قەڵای کامەرانی خێزان ... کە گەورەترین تیکدەرەو وەك کوێرەمارواییە کە پێوەیدا ئامانی نییە . ! خیزانی (الكونت تولستوی) پەی بەم ڕاستیە برد بەڵام پاش کار لە کار ترازان ؟کە لە پاڵ هەردوو کچەکەیدا دەری بڕی , کە من باوکتانم کوشت !کچەکانی هیچ وەڵامیان نەدایەوە چونکە دڵنیا بوون لە ڕاستی قسەکەی !(توڵستۆی) بە هەڵکەوتو ترین چیرۆك نوس دادەنرێت لە هەموو مێژوودا .. هەردەم دوان لە شاکارە ئەدەبییەکانی (جەنگ وئاشتی)و (منم کار نینا) لە ناو هەموو شاکارە ئەدەبییەکانی دنیا وەك ئەستێرەی گەش دەدرەوشێتەوە .. هەمیشە قوتابی وئەدەب دۆستان لە دوایەوەبوون چ وشەیەك لە زاری دەرچوایە دەیان نوسی تەنانەت ئەگەر بیوتایە( وا دەزانم کاتی ئەوەم هاتووە کە بەرەو جیگای نوستن بەڕێ بکەوم ) حکومەتی روسی خۆی ئامادە کردبوو بۆ چاپ کردنی بەرهەمەکانی کە لە سەد(مجلد) دا جێگای دەبویەوە !! لە گەڵ ئەم شۆرەت وناوبانگەیدا .. خۆی وخێزانی بەختێکی چاکیان هەبوو لە دەوڵەمەندی وکوڕو کچ داری وشوێنەواری

کۆمەلأیـەتی کـە شـایەنی بـوو بگەنـە ئـەو پـەڕی بەختـەوەری وشـادی .. کـە گەشتیـشن پێـی لـە سـەرەتای ژن مێردییانـەوە و تەنانـەت لـە خۆشـی یـەکتری سوژدەیان بۆ پەروەردگار دەبرد و لێـی دە پاڕانـەوە کـە ئـەم بەختیارییـەیان بـۆ بهێڵێت. پاشـان شـتیکی زۆر سـەیر ڕوویـدا . تۆڵـستۆی گـۆڕا تـا وای لێهـات تەواو گۆڕاوبووبە کەسێکی تر .. وای لێهات بێ نرخانە سـەیری نوسـراوەکانی خۆی دەکردو دەستی لە دونیا شۆرد وپلە وپایەی خستە پشت گوێ وویستی لە مەولا ژیانی تەرخان بکات بۆ نوسینێ کە تیایدا هانی خەڵکی بدات لـە سـەر ئاشتی و نەهێشتنی شەڕ ( دیوزمەی ژەهراوی) لـە جیهانـدا .. تـا وای لێهـات و ئـەو تولـستویەی کـە لـە کـاتی لاوی دا تـاوان نـەبوو نـەی کـات تەنانـەت کوشـتنیش!.. وای لێهـات کـە ڕێنماییـەکانی دینـی جێبـەجێ دەکـرد وازی لـە هـەموو زەوی و زارە کـانی هێنـا و ژیـانی سـادەو زبـری هەڵبـژارد دەسـتی دایـە زەوی کێلأن وداربڕین، خۆی پێلأوی بۆ خـۆی دەچـنی وژورەکـەی گسك دەداو لەکاشیەکی دارینـدا نـان وئـاوی دەخـوارد !!. بـەلأم ژنەکـەی حـەزی لـە ژیـانی ڕابواردن بـوو کـە تولـستۆی بێـزی لێ دەکـردەوە ! حـەزی لـە و مـاڵ وسـەروەت و پلە وپایە دەکرد کە ئەو ڕقی لێی بوو هەناسە بڕکەی بـوو بـە دوای (شـورەت)و پلە وپایەداکە تۆڵستۆی لە بەر چاوی کەوتبوو! پـاش ئـەوە بەردەوام خـەریکی مـاڵ کـاول کـەربوو لـە گەڵیـدا ژیـانی لێ تـاڵ کردبـوو ڕاو بـۆ چونەکـانی پوچـەڵ دەکردەوە .. قیرە قیر نەفرین کردنی بوو بەسەریدا لەکاتنیدا کە ئەو دەیویـست بە خۆڕایی کتێبە کانی بلأو بکاتەوە بەرزی وناو دەرکردنی نەوێت !..

لە گەڵ ئەم هەمووەدا نەی تـوانی مێردەکـەی لـە وبیرەی لابـدات بۆیـە خـۆی تۆشـی هەسـتریا کـرد , کـە ئـەم ژنـە لـە زەوی دا خـۆی دەگەوزانـدو پەرداخـە ژەهری دەخستە سەر لێوی و سوێندی دەخوارد کە بیخواتەوە ئەگـەر ئـەم چـی دەوێت بـۆی جـێ بـەجێ نـەکات .. پێشتر باسـی ئـەوەمان کـرد ئـەم ژن ومێـردە

ماوەیەکی زۆر ژیانێکی خۆشیان بەسەر برد لە باوەشی نازو نیعمەت و کامەرانیدا خەریك بوو نیو سەدە بەسەر بەرن کەچی تۆلستۆی وای لێهات حەزی بە چارەی ژنەکەی نە دەکرد ئێوارەیەکیان ئەم ئافرەتە بە هەڵە دەوان خۆی گەیاندە لای- کە تینوێتی خۆشەویستی و سۆز هێنا بووی بەچۆکەدا - لە سەر ئەژنۆ لە بەردەمیدا کەوت و داوای لێ کرد کە ئەو هونراوە فۆلکلۆریانەی بۆ بخوێنێتەوە کە لە کاتی دەزگیرانیدا بۆی نوسیبوو . لە کاتی خوێندنەوەی ئەو نامە یادگاریانەدا هەر دوکیان دەستیان دەکرد بە گریان زۆر بە کوڵ دەگریان بۆ ئەو ژیانەی جارانیان ،رۆژانی کامەرانی وشادی کەچی ئەم ژیانە ناخۆش وزبرەی ئیستا کڵپەی گڕی دەیانسوتێنێ . (تۆلستۆی) کە تەمەنی گەیشتە (٨٨) ساڵی ,,ئیتر توانای ژیانی نەما لە ناو ئاژاوەو نەگبەتیدا لە گەڵ خێزانی نەگونجاودا . بۆیە ئەوەی پێ کرا کە لە شەوێکی تەڕو تووش وباران ولێزمەدا شەوی (ئوکتۆبر) ساڵی ١٩١٠ لە ماڵ دەرچوو هەڵهات سەرما زۆری بۆ هێنا وتاریکی شەو لولی کرد ورێگای دەبڕی و خۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێ دەچێت . ئەوە بوو پاش (١١) رۆژ دوای ئەوە بەهۆی سوتانەوەی (التهاب) ی سی یەکانیەوە کۆچی دوای کرد . کە لاشەکەیان لە یەکێ لە مەحەتەکانی شەمەنەفەردا دۆزیەوە کەوتبوو. وەسیەتەکەی کە پێش مردنی کردبووی تیایدا نوسیبوو (رێگا نەدرێت بە ژنەکەم بێتە سەر تەرمەکەم و بمبینێ )! ئائەمە بو نرخی ئەو ماڵ وێران کارییە وژیان لێڵ کردنەی کە ئەو ئافرەتە بە سەر خۆی و تۆلستۆی هێنای بە سکالاو هێستریا کردنی ژنە کەی کە خۆی دروستی کردبوون! لە وەدەچێت خوێنەر هەست بە هەندێ شت بکات لە ژیانی تۆلستۆیدا کە پێویست بەوماڵ وێران کاریە بکات بەلام ئەمە دەرچونە لە باسەکەمان .پرسیارێك دەکەم :ئایا ئەو ماڵ وێران کاری وژیان تێك دانەی ئەو ژنە توانی تۆلستۆی بگۆرێت ؟ یاخود بینیت کە

چۆن کارەکەی لە خراپەوە بۆ خراپە دەبرد؟!. (ژن هێنانی ) ئیبراهام لنکۆلن نا بلکو (کوشتنی ) خۆی بۆخۆی کارەساتێکی دەڵتەزینو بە ئێش بوو .. ئەم ژنەی لنکۆلن هەمیشە دەم بە رەخنەو سکالأو گلەیی بوو .. تە نانەت لاشەو لۆری لنکۆلن لە رەخنەی ئەم ژنە بێ وەی نەبوو .بەڕای جەنابی خانم ( شان داتە کاو. روشتنی شلوشۆڵ . دوگوێی زل .لوت لار .لچ زل .دەست وقاچی لە مەیمون دەچێت !بەم چەشنە وەسفی میردەکی دەکرد. نەك لە لای خۆی دا بەڵکو لە بەردەمی میوان ودۆست وناسیاواندا !! (ئیبراهام لنکۆڵن و خاتوو ماریکی ) زۆر پێچەوانەی یەکتر بوون لە یەکەوە دووربوون لە ئاستی خوێندن دەورو بەروو رەوشت و زەوق و ڕۆشنبیری .( ویلبیرد بفریدچ ) کە ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکییە بە گەورەترین سەرچاوە دادەنرێت لە مێژووی ژیانی لنکۆلن دا . جارێکیان ووتی .دەنگی زلی ناسازی خانمەکەی لنکولن لە سەر جادە گشتیەکەوە دەبیسترا .هەر تورە بونەکانی خۆی بۆ خۆی شتێکی بەد بوو ئیتر باقسەو جنێو دانی وبێشەرمی لە رادە بەدەری بوەستێت . نمونەیەك لە سەر ئەمە . ماوەیەك پاش هاوسەریان لە ماڵی (جاکوپ ئارلی )بۆ رابواردن ژیانیان بردە سەر (جاکوب) بێوژنی یەکێ لە دوکتۆرەکانی (سفرنج فیلد) بوو هەژاری ودەست کورتی ناچاری کردبوو کە لایەکی ماڵە کەی بە کرێ بدات . بەیانییەکیان لە کاتی بەرچاییدا (لنکولن) هەڵە یەکی زۆر بچوکی لێ وەشایەوە .تەنانەت لە بچوکی وبێ نرخیدا کەس بیری نایە ئەو هەڵە یە چی بوو ؟ بەلأم ئەو بەرپەرچەی کە ژنەکەی دایەوە مێژوو تۆماری کردو لە بەر پیسی و شازی و گەورەییەکەی . تە نانەت ئەم ژنە هەستا پیاڵە چای کرد بەسەردەم و چاویدا بەدەم جنێوو بۆڵەو نەفرینەوە!! (لنکولن) سەری داخستوو هیچی نەوت بەڵکو بە کزۆڵیەکەوە وەك منداڵێکی بچکۆلە لە جێی خۆی نەجولاً . خێرا خاتوو (ئیرلی) پەرۆیەکی هێناو دەموو چاوو جلە کانی

سری ! بەڵێ خانمی لنكولن گێل وبێ عەقڵییەكەی لە رادە بەدەربوو . تەنانەت پاش تیپەربوونی (٧٥) ساڵ بەسەریدا بەبیستنی هەناسەت تن دەبێت ولە سەر سامیدا سنگت دێتە یەك هەرچەندە پاشانیش شێت بوو . كەمترین وەصفی كارەكانی ئەتوانین بڵێین شێتانەیە .

ئایا ئەم ژیان تاڵ كردن و ناكۆكی و دەمدەمەیەی (ماریتوو )(لنكولن )ی گۆڕی ؟بەڵێ هەڵ ویستی خۆی لەم ژنە گۆڕی. تاوای لێ هاتبوو بێزاری لە وبەختە كلۆڵەی دردەبڕی كە ئەم بەستەزمانەی گەیاندۆتە نێوان كەڵبەی ئەم خانمە.تا گەشتە ئەو رادەیەی كە حەزی بە چارەشی نەما !

لە ( سبر نجفید) دا (١٢) پارێزەر هەبوو لە بەر ئەوەی موچەكەیان بەشی نەدەكردن ناچار وەرزنگی ئەسپیان لێ دەدا و بەهەموو لایەكدا بە دوای قازی (دافید دیفین) ەوە بوون كە سەروكی قازیەكانی ئەو ویلایەتە بوو بۆ هەر كوێ بچوایە دوای دەكەوتن . هەموو پارێزەرانی هاورێی لە كۆتایی هەفتە دا بەرەو ماڵەوەیان دەگەڕانەوە تەنها ئەم لنكۆڵنە فەقیرە نەبێ . كە تۆقا بوو لە ماڵ , حەزی نە دەكرد لە گەڕانەوە بەڵكو لە ئوتێلە پیسە كاندا شەوی بە سەر دەبر !! ئائەمە بوو دەست كەوتی خانمی لنكۆلن وشاژن ئوجینی كونیتسۆی لە ئەنجامی بەرپاكردنی ماڵ وێرانی وژیان تاڵ كردن هیچ یان بە دەست نەهێنا بۆ ژیانی خۆیان جگە لە دەردی سەری وخەم وخەفەت وئێش وئازار!

قازی ( بس هامبورجر )كە یازدەساڵ لە دادگای ( پەیوندییە كەسییەكانی) نیویۆرك قازی بوو ,هەزارەها حاڵەتی تەلاق جیا بوونەوە هاتوەتە بەردەست ودەڵێت: هۆی سەرەكی بەجێ هیشتنی ماڵ و سەر هەڵ گرتنی پیاوان دەگەرێتەوە بۆ ژنەكانیان كە یەك پارچە ماڵە كانیان كردۆتە (نەكەد) وژیان تاڵ كردن ). رۆژنامەی (بۆستن بۆست) جارێك ئەمەی نوسی ( زۆرێ لە ئافرتان كەم كەم دەست دەكەن بە هەڵ كەندنی قەبری بەختیاری ژن و مێر

دایەتی بەهۆی زنجیرەیەك چاڵی بچکۆلانەوە کە لە سەرتاوە گوێی پێ نەداوە وشایەنی باس نەبوو ) ! کەواتە - ئەی خانمەکان - ئەگەر دەتانەوی ژیانی هاوسەریتان لەگەڵ بەختیاری وکامەرانی دەست لە مل بن، ئەوە بڕگەی ژمارە یەك جیبەجێ بکەن :

**﴿ ماڵ ویرانی بەرپا مەکە ﴾**

## پاشکۆی یەکەم

## ( خنکاندنی خێزان زۆر جار بەدەست ئافرەتە )

یاسای خێزان لە ئیسلام دا ورترین وخەتەرناك ترین مەسەلە یە کە گرنگی پێدرابێت چۆنکە بەتێك چونی خێزانەکان شیرازەی کۆمەڵگە تێك دەچیت وەك چۆن تەزبیح تێك دەچێت بە پچرانی دەزوەکەی بۆیە هەرلە سەرەتای دروست کردنی خێزانەوە ئیسلام زۆر گرنگی بەوە داوە کە کوڕ یاخود کچ بە پەلە هاوسەری ژیان دیاری نەکات بەڵکو لە سەرتاوە بە هەموو مەرجیکی یەکتر رازی بن وبە ووردی لە یەکتر بکۆڵنەوە تا دوای پەشیمانی دەرنەبڕن وکاڵەك بە ئەژنۆ نەشکێنن !! تە نانەت سەیرکردنی رواڵەت وجوانیش دەبێ پێشتر بێت نەوەك پاشان کورەکە بڵێ بە ئارەزوی خۆم بەدڵی خۆم ژنم نەهێناوە یان کچەکە بیڵێ . ئەوە بوو (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بەو کەسەی کە نیازی ژن هێنانی بوو پێ گوت!جوان سەیری بکە چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بەردەوامی خوشەویستی نێوانتان ) زۆر جار ژیان تاڵی و ماڵ وێرانی (نەکد) لە وەوە بەرپا دەبێت کە پیاوە کە یان ژنە کە خۆی بە بەرزتر بزانی لە وی تر بۆیە ئیسلام وای بە باش زانیوە کە هەردوکیان لە یەك ئاستا بن لە پلە وپایەو نەژاد ..هید. کە ئەمەش لە فیقهدا لە باسی (الاکفاء )دا . بە درێژی باسی لێ کراوە هەرچەندە ئەگەر هاوتایش نەبن قیدی نیەو نیکاحەکە دەروستە بەڵام زۆر بەی (نکد) ولە وەوە دروست دەبێت .. بۆ نمونە ئافرەتی جوان وبەژن وباڵا بەرز بە خۆی دا دەنازێت بە تایبەتی ئەگەر مێردەکە ی جوان و پێکەوتە نەبێت.. بە فەرمانی ئەو ناکات بەڵکو خۆی پیاو دەبێ ودوابڕیارهەمیشە بە دەست ئەمە ! یاخود ئەگەر یەکێکیان لەوی کەیان بەرزتر بوو لە نەژاددا یاخود لە خۆیندندا .. ئیتر ئەگەی تر بە بۆرە پیاو سەیری دەکات و بە خزمەت کار سەیری دەکات و ئەگەر نەخویندەوار بوو ئەوا بە (عوام) وهیچ نەزان سەیری دەکات ئەوکاتە رێزی تەواو بۆ یەکتری دانانێن . جارێکیان بۆم دەرکەوت کە هاورێیەکی مامۆستام زۆر رێزی ژنەکەی نەدەگرت و رەخنەی لێ هەبوو ئەمەش لە بەر ئەوە بوو کە خۆی بە

خوێنەوار وڕۆشنبیر دەزانی بەڵام ژنە نەخوێنەوارەکەی بە نەزان وکەڕە جاف دادەنا! بۆیە هەردەم بە گلەیی وبۆڵە بوون لە یەکتری ,خوا بەوە ڕەحمی کرد کە مندڵ لە بەینا هەبوو ئەگینا یەك سات بەیەکەوە نەدەژیان .! ئیسلامی بێ گەرد زۆر مەبەستیەتی کە هاوسەرێك هەڵبژێرێت کە لە سەرەتاوە بەو ژیانە ڕازی بێت کە هاوسەرەکەی لە سەریەتی . بۆیە دبێت ئافرەتی یان پیاوی پەروەردە کراوی قورئان هەڵبژێرێت ئەگەر وانەبێت پەیوەندی هاوسەریان باش نابێت یان بەختیاری بە خۆیەوە نابینیت . وادەبێ پیاو دنیا لە لای زۆر بێ نرخە و تەماح باز نیە , بەڵکو بە ژیانیکی مامناوەندی و پۆشتەی و تێری بە ولاوە بەتەمای هیچی تر نی یە . نەگبەتی ماڵ کاولی ئەم پیاوە لە وخاڵەوە دەست پێ دەکات کە لە خۆیەوە بە پەلەو بێ ورد بوونەوە ژن دەهێنێت ! چونکە کەم جارێك دەکەوێت لە هاوسەرێکی وەك خۆی سادەی دەست کەوێت کە بەو جۆرە بروانێتە ژیانی دونیاو بەڵکو مەبەستی سەرەکی ڕەزامەندی خواو ئاخیرەت بێت . مەگەر اللهم ئافرەتێك بێت کە بە پەروەردەیەکی قورئانی جوان کرا بێت . هەر بۆ ئەم مەبەستە بوو کە (پێغەمبەر)مان (ﷺ) کاتێك زانی خوای گەورە کارێکی قورسی خستوەتە سەر شانی.کە( هیدایەت دانی بەندەکانییەتی) وای دانا کەخۆی لە ژێری دەردەچێت بەڵام لە وانەیە خیزانە کانم توانای هەڵگرتنیان نەبێت و لە بەر دەم نەفس وشەیتاندا چوك دابدەن . بۆ یە کۆیان دەکاتەوەو ئایەتی خوایان بە سەردا دەخوێنێ کە دەفەرموویێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾(الاحذاب ٢٨) واتە : ئەی خیزانەکانی (پێغەمبەر) (ﷺ) ئەگەر ژیانی دونیاتان دەوێ فەرموون بە جوان ترین شێوە تەلاقتان دەدەم وبە ئارەزوی خۆتان لە کوێ ئەو ژیانەتان دەست دەکەوێت بگەن پێی) . ئەزانن بۆ ئەمەی کرد ؟ چونکە لە بەر چاوی بوو کە دەمە قاڵەو هەرا دروست دەکەن و ژیانی هاوسەری تاڵ دەکەن چونکە ڕانە هاتوون لە سەری ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە دەبوونە بەر بەستو عەرقەلە لە ڕێگای بانگەوازدا بۆیە (تۆڵستۆی )ئەگەر موسڵمان بوایە وەك

(پێغەمبەر)ی نازداری بکردایە کەی ئا بەو چەشنە دوچاری ئەو ژیانە پڕ نەهامەتیە دەبوو؟

سەر ئەنجامیش لە سکەی شەمەنە فەرێکدا بمرێت وکەسی لە لا نەبێت ؟! .
عمری کوری عبد العزیز کاتێك کە کرا بە گەورەی موسڵمانان هاتەوە بۆ ماڵ بە فاطمە ی خیزانی وت : خیزانە خۆشەویستەکەم لە مەو بەر رامان بواردووە بە خۆشی دەژیان بەڵام دڵنیابە لەم ڕۆ بەدوا ئیتر لە وژیانە خۆشە دەبین. دوچاری نەبوونی وهەژاری دەبین . لە پێناو خەڵکی هەژاروو نەدارو داماوان دا خۆمان و سەروەتمان دەکەینە قوربانی . جا ئەگەر لە لات نارەحەتە ئەوا من زۆرت لێ ناکەم و سەربەست بە یان من هەڵبژێرە یان ژیانی دونیاو رابواردن .( عمر )بۆیە ئەمەی خستە بەردەستی خێزانی چونکە موسڵمانان چەندان سەدە پێش ئەوروپا زانیویانە کە ئەگەر گونجان ولەیەك حاڵی بوون لە نێوان ژن و مێردا نەبێت ئەوا – نکد– ماڵ وێرانی بەرپا دەبێت .. بۆیە فاطمە ی پەروەردەی قورئان وقوتابخانەکەی (پێغەمبەر) (ﷺ) بەو پەڕی ئامادەیی وگیان فیداییەوە ووتی :سویندم بەخوا هیچ شتێك بە سەر تۆو ژیانی ئاخیرەتدا هەڵنابژێرم !. ئەگەر ورد بینەوە لە زۆر بەی هۆیەکانی –تەلاق– بۆمان دەردەکەوێ سێ لەسەر چواری چارەسەری کیشەکە بە دەست ئەوە بۆ نمونە پیاوەکەی دەست کورتەو نیەتی باق وبریق بۆ خیزانەکەی بکڕێت . کەچی ئەم ئافرەتە سەر دەکاتە جەرگی و بەبۆڵە بۆڵەو زۆر کاری داوای لێ دەکات کە مۆدیلەو هەر دەمەوێت . من ئەمە نازانم بڕۆ پەیدای بکە !! یاخود دەبینیێ پیاوەکەی خەریکی خزمەت کردنی ئیسلامە وخەمی بانگەوازەکەی دەخوات و زۆر بەی کاتە کانی دەرس وئامۆژگاری خەڵکی دەکات . لەم کارەیدا ئەگەر خیزانەکەی پاڵ پشتی بێ و خۆشحاڵی یارمەتی بدات ئەوە نەك ماڵ وێرانیو ژیان تاڵی دروست نابێت بەڵکو هاندان و کۆمەکی یە بۆ پیاوەکەی و بەشداری پاداشتەکەیەتی . کەچی هەندێ لە خوشکان –بەداخەوە – بەم ژیانە رازی نابن و هەزار و یەك قسەی تاڵ ودەمە دەمە لەگەڵ پیاوەکەی بەرپا دەکات ودەڵێ:ئەمە چییە ؟ئیسلام بەس تۆی هەیە ؟ ئەی ئەم ماڵە؟ چۆن بژین ؟ بۆ وامان لێ

دەکەی ؟ئیسلام خوا خاوەنیەتی تۆش نەبێ هەر نافەوتێ !! یاخود لایەنی ترس و بیم والهم ئافرەتە دەکات کە ژیانی تاڵ بکات و –نکد– بەرپا بکات . وەك ئەوە حەز ناکات پیاوەکەی دەست تێکەڵ بکات لە گەڵ لایەنی ئیسلامی دا !! ئیتر پەنا بەخوا یان لە بەر ئەوەیە کە خۆی کەس وکاری حزبێکی عەلمانین !! یاخود ئەو خوشکە مێردەکەی خۆش دەوێت حەز ناکات توشی دەربەدەری ودەردی سەری و کوشتن وبرین ببێت و یان لە کارو پیشەی فەسڵ بکرێت بێگومان ئەمەش پەنا بەخوا باوەڕ لاوازی ئەو خوشکە دەگەیێنێت چونکە دەبێت خواو (پێغەمبەر)ی لا خۆشەویستر بیت و باوەڕیشی بە قەزاو قەدەر قایم بێت .یان هەندێکی تر لە خوشکان بەختیاری خیزان سەر دەبڕن بەچی ؟ بەوە کە هەموو سڕو نهێنی بە بوون و نەبوونی پیاوەکەی بە دوور ودرێژ دەباتە دەرەوە لای دۆست ونەناس باسی دەکات یان لە هەمووی خراپتر ئەوە یە کە بچوکترین قسەوکردار و خواردن و هەڵسان و دانیشتنی خۆی و مێردەکەی هەیە راستەو خۆ –مایکرو– ئاسا دەیگەیەنێتە ماڵی باوکی کە ئەمەش حەرامە لە ئیسلام دا . کە ئەمەش بێگومان هۆی سەرەکی تێکدانی نێوان پیاو ماڵی خەزورەیەتی و بەدوایدا تۆران پاشان (چیای) دوور نییە کە روو بدات . یاخود هەندێ ئافرەت بەوە بەختیاری دەکوژن کە بەو جۆرە ناژی کە مێردەکەی پێی خۆشە . بۆ نمونە مێردەکەی پێی دەڵێت : دەمەوێت ڕوو خۆش وکراوە بێت و مۆن وکەم نوتق نەبێت لە گەڵ کەسدا بەتایبەتی ماڵی باوکم .کەچی ئافرەتەکە دەڵێت : من هەروام وناگۆرێم تێگەیشتی ! ئەی ئەوان بۆ وانین لە گەڵ من دا ؟!!. یان لە هەموو ئەمانە ناخۆشتر ئەوەیە کە لە ناو خەڵکدا مێردەکەی تەریق دەکاتەوە وبە درۆی دەخاتەوە . لە سەر وتەیەك کەوا نیەو بە هەڵە هاتووە بەسەر زمانیدا .ژنەکەی دەڵێ :وانییە!! تۆ نازانی باسی بکەی من باسی دەکەم !!! یاخۆد دروست بوونی مێردە زمەی ماڵ کاولکەر –خانە گومانی –ئایا دەزانی خوشکی بەرێز داخستنی ئەو دەرگایە بەدەست تۆیە؟. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ : ﴿ اتقوا مواطن التهم ﴾ خۆتان لە وشوێنانە بپاریزن کە بەهۆیەوە تاوان بار دەبن . ئایا خوشکی بەرێز ئەگەر تۆ لە بەردەرگا نەوەستیت و بەتەنها وبێ پرس لە ماڵ

دەرنەچیت و لە گەڵ بێگانەو نامەحرەمدا زۆر قسەی پێکەنین نەکەیت . من مژدەی ئەوەت دەدەمێ کە زەڕەیەك تۆوی خانە گومانی لە دڵی مێردەکەت وکەسی تر دانامێنیّ !. من لێرەدا نەهاتووم هەموو تاوانی ئاژاوەی خێزان بدەمە پاڵ ئافرەتان و پیاوانی لێ بەری بکەم . خۆ وادەبێت هەموو خەتاکە لەلای پیاو بێت بەلاّم کلیلی چارەسەری لەلای ئافرەت دەست دەکەوێت . وە ئەو هۆکارە ناراستانەی لەوەو پێش باسمان کرد کە خوشکان بە هەڵە بەکاری دەهێنن – چارەسەری نیە بەڵکو زیاتر وەیشومەی ماڵ کاولی وئاژاوە سەر هەڵدەدا .. کەواتە ریگای سەرکەوتن و بەختیاری خیزان بەدەست تویە تۆش خۆت وخوای خۆت ئەو لانەیە تێك مەدە.

## ڕێگای دووەم
## واز لە خۆشەویستی بێنە با بۆخۆی گەشە بکات

ڕۆژێکیان دەرازیلی وتی : لە ژیانمدا گەوجێتیم زۆر کردووە بەلاّم هەرگیز ئەو گەوجێتییە ناکەم کە بە دڵداری ژن بهێنم.! درازیلی ئەم پەیمانەی خۆی بردەسەر ! تا تەمەنی (٣٥) ساڵی ژنی نەهێناوە پاشان بێوەژنێکی دەوڵەمەندی هێنا کە شازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. کە پرچەکانی سپی کرد بوو بەهۆی (٥١) زستان کە بەسەریدا تێ پەڕی بوو ! ئایا خۆشەویستی بوو ,هۆی ئەم ژن هێنانەی ؟ بێگومان نەخێر ئەم بێوەژنە چاك دەی زانی کە ئەو خۆشی ناوێ و تەنها لەبەر سەروەتەکەی مارەی کردووەو بەس . وادیار بوو ئەم ژن هێنانە لە مامەڵەیەکی بازرگانی دەچوو . بەلاّم لەگەڵ ئەوەش دا بەسەرکەوتووترین (شایی )دادەنرێت لە مێژووی هاوسەریدا !! ئەم بێوەژنەی کە درازیلی هەڵی بژارد بوو جوان نەبوو . گەنج نەبوو ,نەخێر زۆر لە مانەوە دوور بوو ! تەنانەت قسەکانی بۆ پێکەنین باش بوو ئەوەندە هەڵەی زمانەوانی مێژووی بێ تامی کردبووی بۆ نمونە نەیدەزانی ڕۆمان کۆنتربووە یان یۆنان ! وەزەوقی شپرز بوو لە هەڵبژاردنی جل و بەرگ دا و لە ماڵداریشدا هەر بۆ پیکەنین وسەرسامی باش بوو ! بەلاّم لەیك شتی زۆر پێویست و بنەرەتیدا عەبقەری و هەڵکەوتوو بوو کە ئەویش هونەری مامەڵە کردن لەگەڵ پیاودا !کە ئەمە زۆر پێویست بوو بۆ ژیانی هاوسەرێتی .هەرگیز نەبووەتە ڕێگر لە بەردەم مێردەکەیدا . هەر کاتی درازیلی بە ماندوویی وبێ تاقەتی ولە هۆڵی پەرلەمانی پڕلە گێرەو کێشەوبێنەوبگرەدا بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە دەیبینی وا (ماری ئان) ماندوو بوونەکەی لەبیر دەباتەوە و دەیخستە ناو ژیانی پڕلە ئارامی وحەوانە . لە خۆشیدا وای هەست دەکرد کە ماڵەکەی بووەتە جیگای حەوانەوەی میشکە شەکەتەکەی . دڵ ئارامی رووی تێ دەکرد ئەمەش بەهۆی ئەو هەموو ڕێزو سەرمامییەی کە (ماری ئان) بە لێشاوپێی دەدا بەختەوەرترین ڕۆژانی ژیانی ئەو ڕۆژانە بوو کە لە گەڵ ئەو پیرەژنەدا بە سەری دەبەرد..تەنانەت هەمیشە هەڵپەی

ئەوەی بوو کە زوو بگەڕێتەوە ماڵ . کاتێ کە لە (ئەنجومەنی گشتی) دەردەچوو . تاگشت ڕووداوو هەواڵەکانی ئەو ڕۆژە هەبوو لە نوکەوە هەمووی بگێڕێتەوە بۆ خانمەکەی . لە گەڵ ئەوەدا کە (درازیلی ) خاوەنی ئەرك ونارەحەتی و پڕمەترسی بوو . کە ئەمە مەبەستەمەمانە -ماری ئان- زۆر بە ئاسانی لە وباوەڕەدابوو کە درازیلی نا ئومێدی نابێت لە ژیانی هاوسەری لە گەڵ ئەمدا لە ڕاستیدا ماری ئان لە پیناوی ئەوەدا ژیاو(٣١) ساڵی ژیانی خۆی وسامانی تەرخان کرد تا ژیانێکی پڕ لە ئاسودە وکامەرانی بێنێتە کایەوە . درازیلیش ئەمەی لە بەرچاو بوو بۆیە ئەو خانمەی کردە پاڵەوان .هەرچەندە لە ژیاندا لە قەبی (ئیرل) پێدرا بەلاّم ئەوەندە هەوڵ وکوششی بەردەوامی دا لە لای شاژن (فیکۆریا) تائەوە بوو پێی بردە ریزی - نەجیب زادەکان - لە ساڵی ١٩٦٨ لە قەبی - کونتیسە بیکونز فیلد- ی پێ بەخشی ! لە گەڵ ئەوەدا کە خاتوو ماری زۆر سادەو ساکار بوو لە بەر چاوی خەڵك.. بەلاّم درازیل هەرگیز لاقرتێ بازی پێ نەکردووە . بە یەك ووشە لۆمەی نەکردووەو ئەگەر کەسێ بیوێرایە گاڵتەی پێ بکات ئەم هەر لایەنی ژنەکەی دەگرت و پڕ بەدڵ بە گەرمی بەر گری لێ دەکرد.جارجار قسەی خوش دەکەوتە نێوانیان درازیلی بۆ خۆشی پێی دەوت: دەزانی من تۆم بەس لە بەر سەروەتەکەت هێناوە ؟! ئەویش بەدەم پێکەنینەوە دەیوەت ئەمە ڕاستە بەلاّم ئەی ئەگەر جارێکی تر منت بخوازیایەتەوە ئایا ئەم جارەیان لە بەر خۆشەویستی نەبووئەویش دەی گوت بەڵێ.. بێگومان! نەخێر خۆ ماری ئان لە هەموو لایەکەوە تەواو نەبوو بەلاّم چونکە درازیلی ژیرو حکمەت دار بوو وای لە ماری کردەبوو کە خۆی چۆنە وا بژی لە هونەری هاوڕێ گرتندا یەکەم شتێ کە زۆر پێویستە (! (هنری جیمس) دەڵێ فیری ببیت ئەوەیە :ئەو ڕێگایانە لە خەڵکی مەگرە کەڵێ یەوە بەختیاری خۆیان دەست دەخەن , مە گەر کاتێ ئەو بە زۆر ڕێگا لە تۆ بگرێت ) کەواتە ئەگەر دەتەوێت خێزانت لە بەختیاری بەردەوامدا بژی, ئەو ئاگاداری ئەم بڕگەیە بکە( ٢)

واز لە هاوسەرەکەت بێنە با لە سەر شێوازی خۆی بڕوات ...

## پاشکۆی دووەم :

## خۆت مەکێشە بە دیواری حەزی هاوسەرەکەت دا

لە ڕاستیدا – نەك ژن و مێرد – بەڵکو هەموو دوو کەسێك کە بەیەکەوە بن ئیتر چ لە ماڵ دا وەك ( تۆ ) یاخود لە دوکان و فەرمانگە وقوتابخانەدا بن , بۆ ئەوەی ناکۆکی ورق وکینەو لە یەك خوێندن (دروست نەبێت پێویستە ئەم خاڵە ڕەچاو بکرێت: ( ئەو حەز وئارەزوانەی کە هاوڕێکەت لە سەری ڕا هاتووە و بە ئاسانی بۆی تەرك نادرێت و بگرە بە جوانیشی دەزانێت تۆ ڕاستەوخۆ لە دوورەوە بە لارو قەڵب و بێ بایە خیان دامەنێ لە لایدا ) چونکە ئەمە سەرەتای هەموو ڕق وکینە یەکە، دەبێت کەس ئاگادار نەبێت ژن ومێرد ئاگادارین .. چونکە هەمیشە پێکەوەن و لە زۆر شتدا لە یەك جیان لە شێوازی بیر کردنەوە وبۆ چوون .تا پێکەنین و قسە کردن وهەڵسان ودانیشتن وخەوتن و هتد .. بۆیە هەردەم زانایان ئەمە دوپات دەکەنەوە کە (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ ئەگەر دروست بوایە سوجدە بۆ غەیری خوا ببرێت، ئەوا من ئەمرم بە ئافرەتان دەکرد کە سوجدە بۆ مێردەکانیان بەرن ﴾ . چونکە هەتا زیاتر گرنگیان پێ بدەن ودڵیان ڕاگرن هیشتا هەر کەمە ! لە وانەیە خوشکێك پێم بڵێت :جا ئەمە بە کێ دەکری ولە پێناوی چیدا بێت و ئەی مێرد بۆ وانە کات !؟. مێرد بۆ واناکات ؟بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە (١٠٠) لاپەڕە زیاترم نوسیوە (١) بۆ ئەوەی کە جێبەجێی ناکات خۆی زەرەر دەکات و بەس! بەڵام تۆ ئەمە بکە لە پێناو بەرژەوەندی ژیانتا بۆ ئەوەی هاوسەرەکەت دڵی لەلای تۆ بێت و بەس !!. لەلایەکی ترەوە ئەگەر مێرد بەقسەت نەکات ودڵت ڕاگیر نەکات بەڵێ بەختیاری وکامەرانی نامێنێت بەڵام زنجیرەی هاوسەریەتیان ناپچڕێت و بەردەوام دەبێت . بەڵام بەو جورە نەبێت کە ئەو حەز دەکات کێشەو ماڵ وێرانی لە وێوە دەست پێ دەکات !.ئافرەت ئەگەر خویەکی نامۆی لە

مێردەکەیدا بە دی کرد . با بەحیکمەت ولە سەر خۆوە بەو جۆرە کە ئیسلام دایناوە لە یاسای خراپە گۆڕیندا . هەڵسو کەوت بکات چونکە ئەگەر زانی مێردەکەی چاك نابێت یان بەو کارە خراپ تر دەبێت .. ئەو کاتە بێدەنگ بوون باشترە بۆ ئەو خوشکە لە ئاڵۆسکاندنی شانەی زەردەواڵە ..! جارێکیان بە ئافرەتیکیان وت : بۆ بێدەنگی لە مێردەکەت کە ئەوەندەفرە ڕێس وقسە زۆر کەرە ؟ لە وەڵام دا ووتی لە بەر دوو هۆ پێی ناڵیم : یەکەم /خۆی دەزانێ و زۆر کەس پێی وتووە, بەڵام بێ سوود بووەو بۆی تەرك نادرێت ,ئیتر بۆچی دڵی لە دەست بدەم و بێسوود ووشەیەك بەخەرج بدەم ؟ دووەم / لەوانەیە ئەو ئەم قسەکردنەوەی بەلاوە باش بێ و گلەیشی لە دەم مردووەکان هەبێت و بۆشی هەیە خۆیشی و خەڵکیش حەز بەو قسانە بکەن و بۆ گەرم کردنی ( مجلس ) حەیاتە!!. بۆیە تا بۆت ئەکرێ دڵی لە خۆت مەئێشێنە , هەندێ لە پیاوان حەزیان بە چارەی ژنەکانیان نی یە لە بەر چی یە ؟ تەنها لە بەر ئەوەیە خیزانەکانیان بوونەتە کۆسپ و تەگەرە لەڕێی حەز وئارەزوەکانیاندا .خۆ مەرج نیە ژن وپیاو لە هەموو شتێکی یەکتر رازی بن بۆیە پێکەوە دەژین ! بەڵکو هۆی سەرەکی پێکەوە ژیانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەردووکیان بە هەندێ رەوشتی یەکتر رازین و چاو پۆشین دەکەن لە ورەوشتانە کە بە یەك ناخۆن ئەمەش لە پێناو بەردەوام بوونی کاروانی هاوسەری وبەختیاری و دوور لە ئاژاوە ومالْ وێرانی. هەندێ لە ئافرەتان مێردەکانیان هەندێ نهێنی وشتیان هەیە کە پێویست دەکات بیان پۆشێ و لە هیچ کوێ باسی نەکات بە تایبەتی لە لای باوك ودایکی ئەوانیش دەیپۆشن وەك نەبوونی وگیروگرفت و ئەگەر نان نەبێ لەماڵدا ئەو هەر دەڵی سوپاس بۆ خوا وەزعمان باشە !!. دەڵێن یەکێ لە وئافرەتە ژیرانە لە دوای مردنی مێردەکەی دوکتۆر پێی دەڵێت هێشتا کچیت !!ئەویش لە وەڵام دا دەڵێت ئەمە بۆ سێ ساڵ دەروات کە

مێردەکەم نەخۆشی جنسی لە گەڵدایە بەڵام من ئەوەندەم خۆش ویستوە لە هیچ کوێ باسم نەکردووە !! *

□ کەواتە ئافرەت بەزانست بە بڕوانامە ونەژادو جوانی و دەوڵەمەندی ناچێتە دڵی هاوسەرەکەی ئەوەندە کە بە رەوشتی بەرزو ڕووی خۆش و کۆمەکی کردنیان لە پیناوی هێنانە دی حەز وئارەزوەکانیان ...

## ڕێگای سێهەم :نزیکترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە تەلاق

( جلادستون) لە هەموو کەس زیاتر مونافەسە و بەرامبەرکێی (درازیلی) دەکردو زۆر جار دەمەقاڵە تینی سەندووە لە نێوانیاندا تا گەشتوەتە ئاستی پێکادان ، لەگەڵ ئەمانەدا لە شتێکدا لە یەکیان کردوە ، هەردووکیان لە ژیانی هاوسەریەتیاندا بەختەوەر بوون .

( ولیم) و (کاترین جلادستون) ماوەی (٥٩) ساڵ ژیانیان پێکەوە بەسەر برد بە جۆرێ کە خۆشەویستی و بە ئەمەکی و دڵسۆزی باڵی کێشابوو بەسەریاندا ئای کە دڵشاد دەبم کاتێ کە ( جلادستون ) دێنمە بەرچاوی خۆم کە دەستی خێزانەکەی گرتووە ولە لای سۆپاکەدا پێکەوە هەڵدەپەڕن!.. (جلادستون ) بەدەم هەڵپەڕکێی نەرمە گۆرانی دەووت :پیاوێکی جل شڕ ژنێکی دەم شڕ بە گۆرانی و زەوق وپێکەنین ڕێگا پێچاو پێچەکانی ژیان دەبڕن ئەم (جلاستون)ە ئادەمیزادێکی زۆر کەللە ڕەق بوو. بەڵام لە ماڵدا بەهیچ کلۆجێ وانە بوو . بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەسا خۆی دەکرد بە چێشتخانەی کۆشکدا و سەیر دەکات ماڵەوە هەموو نوستوون بە شێوازێکی خۆش و بەتام هەڵی دەستانن . دەستی دەکرد بە هاوارو هاوارێکی هەزەلی ئەیووت : دەهەستن ئەی نازانن مەشغوڵ ترین کەسی ئیمپراتۆریەت کەمنم چاوەڕوانی بەر چای دەکات بگەنە فریای گەدەی !!.بەڵێ لەماڵدا زۆر سیاسی ولێزان بوو.. هەرگیز پەنای نەدەبردە بەر ڕەخنەو کەسی ڕاستەو خۆ سەرزەنشت نەدەکردا. هەر لە جۆری ئەو ( کاترینی مەزن ) ئیمپرۆاتۆری ئینگلتەرا , لە گەڵ ئەوەدا کە ژیان ومردنی ملیونەها کەسی ولآتە کەی لە ژێردەستی ئەودابوو . لە گەڵ ئەوەدا لەلایەنی سیاسەتەوە سەرکەشێکی پیاو کوژ بوو .. شەرەنگێز بوو هەردەم لە ڕەمی کردنی دوژمنانی دا بوو .. لە گەڵ ئەمانەدا لە ماڵە وە وانەبوو تە نانەت جارێك خزمەت کارەکەی گۆشتەکەی قەڵب لێ نابوو

زۆر نـاخۆش بـوو خـاتوو كـاترین بـە زەردەخەنەیەكـەوە سـەیرێكی كـردوو هیچیو پیٚ نەگوت!.. بەم هۆیـە كە لـە (١٠٠) شـایی پـەنجایان لـە نـاو دادگـادا وردخاش دەبن و دەگەنە تەلاٌق ! لـە بەر رەخنـەو سەرزەنشتی بیٚتـام و نـەزۆك كە دڵـەكان دەشـكێنیٚ و دەرونـەكان زەلیـل وشـەكەت دەكـات !.. گـەر دەتـەوێت ژیانی هاوسەریت بەختـەوەر بێـت ئـەوا رەچاوی ئـەم بڕگەیـە بكـە : (( **رەخنـە مەگرە** ))

## پاشکۆی سێیەم :
## ڕەخنە لە ناو خێزانە مسوڵمانەکاندا

لە ئیسلامی بێگەرددا تێڕوانینێکی تایبەت هەیە بۆخێزان ومەبەست لە دروست کردنی خیزان. خێزان لە روانگەی قورئانەوە بۆ تێربوونی غەریزەی جنسی نییەو بەس . بەڵکو بۆ ئەوە یە چ پیاو وچ ژن لە چوار چێوەی ( خێزان ) دا هەست بە هێمنی و کامەرانی وسەربەستی تەواو بکەن وەك خوای گەورەدەفەرموویێت :﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ (الـــروم ٢١) کەواتە پیاو زۆر گرنگ ییە ئەگەر لە دەرەوە زۆر توند وتیژ وتووڕەو شپرز بێت لە گەڵ هەڵویستدا .. چونکە ئەو پەری هاوڕێ یەتیان لە دەست دەدات .. بەڵام نابێت ئەو شیوازە لە ماڵەوە بەکار بهێنێت چونکە نەگبەتی وماڵ وێرانی ئەوەیە کە لە ماڵەوە ژیان تاڵ بێت وپچرانی شیرازەی خیزان و سەرگەردان بوونی منداڵەکانی لە دوایە !.ئەم راستیە لە ژیانی (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) بەدی دەکەین کە ئەوە بوو لەدەرەوە لە سەنگەری ژیاندا بوو لە گەڵ کافر ومنافق وجولە کە و گاوەران بەڵام کە دەگەڕایەوە ماڵ دەم بە خەندەو سوعبەتکردن بوو لە گەڵ خێزانە کانیدا و تەنانەت پێش برکێ ی لە گەڵ عائیشە دەکرد .. خۆی ئیشی ماڵی ڕادەپەڕاند !! وەك بڵێ لە بەرەکانی جەنگ هیچ رووی نەدابێ !.. لە مێژووی ئیسلامدا کافران وناحەزان درۆیەکی گەورەیان دایە پاڵ عائیشە (رەزای خوای لە سەر بێت) کە گوایە پیاوێك لێ نزێك بووەتەوە و بوبە مەسەلە یەکی گەورەولە هەموو ماڵێکی مەدینەدا باسیان دەکرد !! بێگومان (پێغەمبەر)مان(ﷺ) زۆر نارەحەت و مشەوەش بوو . بەرچاوی رەش بوو ئەگەر پیاوێکی ئەمڕۆ بوایە یەکسەر بێ لێکۆڵینەوە (تەلاق )ی دەدا یان وەك هەندی کەس یەکسەر دەیکوشت بەڵام (پێغەمبەر)مان (ﷺ) حەکیمانە و لە سەر خۆیانە بە دایکی ئیماندارانی فەرموو ( بێ خەم بە من گومانی چاکە نەبێت هیچگۆمانیکی ترت پێ نابەم ) !.. تا ئەوە بوو پڕو پاگەندەی مونافقان مەسەلە کەی گەورەتر کرد خەریك بوو –پەنا بەخوا – بیکەنە مەسەلە

یەکی بەڵگە نەویست !!.لێرەشدا هەر بەئاسانی و لە سەر خۆی و بە ئارامی پێم ووت : عائیشە ئەگەر پاك بێت بێخەم بە (خوا) پاکیت دەردەخات .. و ئەگەر شەیتانیش کارێکی وای پێ کردوی ئەوە (تەو بە) بکەو پەشیمان بەرەوە !.. کەچی سەیری ژن ومێردی ئەمڕۆ بکە کە ئەگەر شتێکی بچوکی وەك نۆکێك لە هاوسەرەکەی دەکاتە گایەك و عەشرەتی لێ حاڵی دەکات کە دەبوایە (پێغەمبەر) ئاسا بیگۆتایە باوەر ناکم ..! مامۆستا ( مەلا صالح )ی گەورەلە هەڵەبجە خزمەتێکی گەورەی بە ئیسلام گەیاندووە قوتابی وفەقێیەکی زۆر لە سەر دەستی ئەو پێگەیشتن .. مامۆستا (بەهەشت جیگای بێت ) هەزاران مەسەلەی تەلاق ونیکاحی هاتبویە بەردەستی و لە ومەسەلانەدا زۆر بە ئاگا بوو.. رۆژێ چومە خزمەتی و لێم پرسی هۆی سەرەکی خێزان وتەلاقی ئەم ناوچەیەی کوردەوارییە چییە ؟ مامۆستا لە وەلأم دا ووتی وەلأمی زۆرە .. بەلأم ئەوەی لە هەمووی گرنگ تروترسناك تر ئەوەیە کە ژن وپیاو تەقیە لە یەکتر ناکەن قسە لە یەك ناخۆنەوە !! هەر وەك رەخنە گرتن ویەکتر شکاندنەوە زۆر ئاسانە لایان !!. خۆ ئەم قسانە پیاویش دەگرێتەوە – بەلأم خوشکی بەرێز – پیاو هیچ زیانێك ناکات پاش چەند رۆژێکی تر ژنێکی تر دەهێنی .! بەلأم ئەی‌تۆ ؟ تۆ کومەڵگای نەفامی بە چاوێکی تر سەیرت دەکەن ! کەواتە تابۆت دەکرێت خۆت بکە بە زەوی بۆ هاوسەرەکەت ئەویش خۆی دەکاتەئاسمانی تۆ ..

# ڕێگای چوارەم

## بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەختەوەر بکەین

دکتـور ( بـول بوبینـو) بەڕێوبـەری پـەیمانگای پەیوەندییە خێزانییـەکان لـە لـوس ئەنجلوس دەڵێت : زۆر بەی ئەو گەنجانەی کە دەیانەوێ ژن بهێنن گرنگ نییـە لـە لایان کە ئەو ژنە یەکەم ماڵدار بێت لە ئیش وکاری ماڵدا بەڵکو ئەوەیە حەز وئاواتی بهێنێتە دی و وای لێ بکات کە هەست بکات کە ڕێزدار وگرنگە ..! لە وانەیە هەر ئەم هۆیەش بێت کە ئافرەتـە زانـاو ڕۆشنبیرەکان شوو ناکەن یـان شـویان بـۆ نابێـت ! کەچی ئافرەتە نیمچە خوینـەوار وئاسـت نزمـەکان شـوو دەکـەن ودادەمـەزرێن !. بۆ نمونـە بـە ئافرەتێکی ئاسـت بـەرز بڵێـی دەمـەوێ بتهێـنم ! یەکسـەر ڕەفـزت دەکـات چونکە تۆ لە ئاستیدا نیت بەڵام داوای ئافرەتێکی فەرمان بەر یان بێکار بکە خێرا دێ بەدەمتەوە ودەڵێ : باشە بەڵام باسێکی خۆتم بۆ بکە !! تـۆش لـە خۆشـیدا (٣) سەعات باسی خۆتی بۆ دەکەیت و پاشان دەڵێت خۆ لە جوانی و ئاسـتی خوێنـدندا نزمـە بـەڵام بەراسـتی گرنگـی بـە خـەڵك دەدات !!. ئەمـە دەربـارەی ئافرەتـان و نەخوێنـدەوارەکانیان ئـەی دەر بـارەی پیـاوان چـی دەڵێـت : تـۆ پیاوێـك نـابینی – مەگەر بە دەگمەن – کە نـرخ دابنـی بـۆ ئـەو مانـدوو بۆنـەی کە خێـزان لـە پێنـاو خـۆ ڕازاندەنەوەو جوان کردنی خۆیاندا سەرفی دەکەن !.. زۆر بەی پیاوان بـێ ئاگـان لـە وەی کە ئافرەتان شێتی جل و بەرگن ! زۆر بـەی گرنگیـان بـە دیمەنـە ! ئایـا سـەیری ئافرەتێکتان نەکردووە کاتێ ئافرەتێکی تـر دەدات بە پاڵی دا چۆن وورد دەبێتـەوە لە جل وبەرگەکەی ؟!! دە ئیتر خوایە بۆچی پیاوان بە ئاگا نایەنـەوە کە ئیتر بـە ئاشکرا نرخ وڕێز دابنێن بۆ دیمەنـە سـەرنج ڕاکێشەکەی کە زۆر نارەحـەت بـووە تـا خۆی ڕازاندووەتەوە بۆ مێردەکەی تا بە دڵی بێت ! پێش چەند ساڵێك لـە مـەو بـەر دایکـی دایکـم مـرد لـە تەمـەنی (٩٨) سـاڵیدا .. ماوەیـەك پـێش مردنـی وێنەیـەکی خۆیمان پـێ نیشان دا کە (٢٥) ساڵ لـە وەوبـەر گرتبووی چاوەکانی کز بوو بۆیە سەیری نەکرد بەڵکو پرسیارێکی کرد کە تا مردن لە بیرم ناچێت .. بزەیەکی سوکی

خستە سەر لێوەکانی و هەناسەیەکی هەڵکیشاو ووتی : (خۆزگە چ جۆرە جلێکم لە بەردا بوو !! بیهێنە خەیاڵی خۆت ! پیرەژنێك لە کۆتایی دیسەمبری زستانی تەمەنیدا توانای بە پێوە وەستانی نەماوە بیرو هۆشی کز بووە و تەنانەت کچ و کچە زاکانی ناناسێتەوە لە گەڵ ئەوەش دا هەر گرنگی بە دیمەن وجل وبەرگی پێش چارە کە سەدەیەك دەدات ؟.! یەك کەس لە پیاوان –خۆێنەرانی ئەم بەشە – نا بینی کە لە بیری بێت پێش (٥) ساڵ لەمەو بەر چ کراسێك یان چ چاکەتێکی لە بەر کردووە ؟! بەلاًم ئافرەتان زۆر جیاوازن لە پیاوان و زۆر پێویستە کە پیاوان بە باشی هەست بەم راستییە بکەن .! لە وچیرۆکە فۆلکلۆریانەی کە بوونەتە پەندی سەرزار ,دەڵێن ئافرەتێکی لادێ نشین جارێکیان هەندێ ئاڵفی ئاژەڵی هێناو لە باتی چێشت لە سەر سفرە لە بەردەمی هۆزەکەیدا داینا و فەرمووی خواردنی لێ کردن!!. پیاوەکان زۆر تووڕە بوون و وایان زانی شێت بووە ! ئەویش پێ ووتن : ( من نەم زانی ئیوە ئاوا فەرقی ئالف وخواردن دەکەن!! من ماوەی بیست ساڵە چێشتیان بۆ لێ دەنێم تا ئێستا لێم نەبیستوون کە شتێك بڵێن کە دڵنیام بکەن بەوەی کە ئێوە فەرق دەکەن لە نێوان خواردنی باش وئاڵفی ئاژەڵ )!! چینە بەرزەکان ( طبقات راقیة ) لە سەردەمی روسیای قەیسەری دا .. ئەگەر خواردنێکی باش و خۆش لێ بنرایە بۆیان ..ئەوە پێیان لە بەر دادەگرت کە دەبێ چێشلێنەرە کە ببینن تا بە لێشاو سوپاسی خۆیان ببارێنن بە سەریدا .!! دەی ئایا هاوسەرەکەت لە چێشت لێنەرێکی روسی شایان تر نییە کە لە سەر چاکەیەك سوپاس وپێزانینی پێش کەش بکەی ؟ ئەمجارە ئەگەر خێزانەکەت مریشکێکی سورەکراوی هێنایە بەردەستت . تۆش سەر سوڕمانی خۆت دەربڕە دەربارەی ئەو شێوە لێنانەی .. وای لێ بکە هەست بکات کە تۆ جیاوازیی دەکەیت لە نێوان چێشتی خۆش وئالفی ئاژەڵ.! چەند رۆژێك لە مەوبەر لە یەکێك لە گوڤارەکاندا قسەیەکی جوانی ئەستێرەی سینەماییم ( ئەدی کانتوور ) خویندەوە کە دەی ووت : ( من لەو دونیا لە هەموو کەس زیاتر قەرزاری ژنەکەمم . چونکە زۆر یارمەتی داوم بۆ بڕینی رێگاکانی ژیانم . پول بە پول چی کۆ بکردایەتەوە بۆی کۆ دەکرد مەوەتا بۆی کردم

بە سامانێکی گەورە بۆ ڕۆژانی ڕەش ! (٥) منداڵی بە جوانی بۆ گۆش کردم و ماڵە کەمی کردەبوویە یەك پارچە بەهەشت .. ئەگەر من لە ژیاندا وام لێ هاتبێ کە شایانی باس بم .. ئەوە هەموو ئازایەتیەکەی بۆ خێزانەکەم دەگەڕێتەوە !.. کەواتە ئەگەر دەتەوێت ژیانی هاوسەریت بەختەوەر بێت .. ئەوا ئەم بڕگەیە لە یاد مەکە (٤) (ڕێزی پوخت بە چوار دەورەت ببەخشە .. )

## چوارەم :

## سوپاسی خەڵکی نەکەیت سوپاسی خواش ناکەیت

لە بەرنامەی ئیسلام دا . سەرکەوتوو ترین (شایی) ئەوەیە کە ژن وپیاو لە بەر هیچ شتێکی دەرەکی یەکتریان هەڵنەبژاردبێت . وەك جوانی و ناوداری و ماڵ وە فەرموو دەکانی (پێغەمبەر) (ﷺ) موسڵمان هان دەدەن ( دیندار ) هەڵبژێریت واتە لە خوا ترس و رەوشت بەرز ﴿ فأظفر بذات الدين تربت يداك ﴾ .. کە ئەو کەسە بە راستی موسڵمان بوو .. پابەندە بە فەرمودە و کرداری (پێغەمبەر) (ص) لەبەر ئەوە دڵنیابە کە جوانترین سوپاس گوزارو رێز بەخشترین کەس دەبێت .. (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) کاتێ کە بویە (پێغەمبەر) وبانگی خەڵکی کرد بۆ سەر رێگای ئیسلام .. خەڵکی باوەریان پێ نەدەهێنا و بگرە گاڵتەو گەمەشیان پێئەکرد مە گەر کەمێك نەبێت کە باوەریان پێهێنا .. لەم کاتە نارەحەتە لە ماڵەوە ( خدیجەی خێزانی ئیمانی پێ هینا و دڵنەوایی و کۆمەکی دەکرد و سەروەتەکەی خستە پێناو بانگەوازی بەرزی ئیسلام جا وورد بەرەوە لە (پێغەمبەر)مان (ﷺ) کە چۆن ئەمەی لە بەرچاو بوو تا لە ژیان مابوو هەرچەندە داپیرەیەك کەچی (پێغەمبەر)ی خوا (ص) ژنی بە سەردا نەهێنا هەتا مرد !! پاش کۆچی دوایشی هەردەم (پێغەمبەر)مان لە ناو خێزانە کانیدا باسی دەکرد و بەردەوام وەسفی دەکرد .! تا ئەوە بوو عائیشە ووتی : پیرەژنێك بو خوا گۆڕیی بۆ ئافرەتانی باشتر .!! ئەوە بوو (پێغەمبەر) (ﷺ) دڵگران بوو بۆیە ووتی ( نەخێر وەڵلاهی خوای گەورە خێزانی لە وە باشتری پێ نەبەخشیوم .کاتێ خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە ئەو باوەری پێهێنام سەروەتەکەی لە پێناو ئەم بانگەوازەدا سەرف کرد کەچی خەڵکی نەیان دەدامێ. خەڵکی دەری دەکردم کەچی ئەو دڵنەوایی دەکردم !!. ) کەواتە پیاوان با ماندوو بوونی خێزانە کانیان لە بەرچاو بێ و ئەگەر نانی نیوەرۆی خستە بەردەست با یەکسەر دەست نەکات بەخواردن و پاشان بچێتە دواوە و بە بێ دەنگی.! بەڵکو با ئەوەی لە یاد بێت کە ئەو هەژارە دووکاژمێر خەریك بوو تا ئەو

خوردنەی بۆ ئامادە کردووە لە کاتێکدا جەنابت لە پیاسەو گەڕان وکاری خۆت بوویت دەی توخوا شایەنی دەست خۆشی ومەدح کردن نییە ؟!. دەی کەواتە بۆ پێم نالێی بۆ واناکەی ؟. یان کاتێك گۆیرەویەکانت بۆ ئەدوریتەوە یان کراسەکەت ئوتودەکات یان سەمونی گەرمت بۆ ئامادە دەکات تۆ لە خەودایت ! بۆ پێی نالێیت: دەك ئەو دەستانەت خۆش بێت . بەراستی تۆ ناڕەحەت دەبیت خۆزگە هەموو ژنێك وەك تۆ چاکە بۆ مێردەکەی ؟ بە راستی مەگەر خوا پاداشتت بداتەوە !! ئەوە بوو ئەم ووشە هەنگویانیانە لە گەڵ ئەم وە ئەودا بەکاری دینی ؟ کەچی زمانت ناهێنێ لە گەڵ هاوسەرەکەی ژیانتا بەکاری بێنی ؟!. خوشکی موسڵمان چەند خوشە خواحافیزی کردن و بەخێر هاتنەوە کردن لە مێردەکەت لە کاتی دەرچوون وگەڕانەوەیدا. یان کاتێ لە بازار دەگەڕێتەوە بە گەرمی و رووی خۆشەوە بڕۆ بە پێش وازییەوە و شتەکانی لێ وەرگرە بڵی : خوای گەورە تومان بۆ بهێڵێ و دەستت خۆش بێت . یان لە وەش زیاتر پیاو زۆر پێخۆشحاڵ دەبێت کە خێزانە کەی هەر لە ویدا عەلاگەکانی بکاتەوە بڵێ :دەستت خۆش بێت زۆر پیویستمان بەمە بوو .بە خوا باش بوو ئەمەت هێنا ماشاالله زۆر وردی لە پێویستی دەر کردنی ماڵەکەدا !!. ئەم قسانە بە ڕواڵەت بچوکن ! بەڵام لە راستیدا زۆر پێویستن بۆ بەردەوام بوونی سۆز وخۆشەویستی وەك (پێغەمبەر)ی خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات ) !.دەی کەواتە بۆچی خۆمان رانەهێنین بە سوپاس کردنی خەڵکی بەتایبەتی هاوسەرەکەی ژیانت !. بەڵام باکەس لە ئافرەتان و پیاوان – نەڵێن :شوکرو سوپاسی خوای بۆچی یە ! واجبی سەر شانیەتی بم ژێنی وکاسپیم بۆ بکات !.یان بڵێ :کەی ئازایەتی وپیاوەتیی یە کە چایەك یان شۆربایەکم بۆ لێبنێ ! بە سوپاس نەبێت کاتێك کە من لە دەرەوە ئیش دەکەم وە پارەی بۆ دێنمەوە ، دە فەرموون با گوێ بگرین بۆ (پێغەمبەر)ی سەردارمان کە چۆن سوپاس و دوعای خێری دەکرد بۆ هاوەڵان کە کاتێ شتێکی چاکیان بکردایە ( ابن اوفى) دەگێڕێتەوەو دەڵێت هەرکەسێ زەکاتی ماڵە کەی بهێنایە بۆ (پێغەمبەر)یخوا ، (پێغەمبەر) (ﷺ) دوعای خێر و سوپاسی دەکرد ،

بۆیە کاتیكٚ باوکم زەکاتەکەی بۆ هێنا و داینا (پێغەمبەر) (ﷺ) فەرمووی ﴿ اللهم صلی علی ال اوفی ﴾ .

خوێنەری خۆشەویست ورد بەرەوەو سەیر بکە کە (پێغەمبەر) (ص) نەیفەرموو : دوعا و سوپاس و سلاٚواتی بۆچییە واجبی سەرشانیەتی هەر دەبێ دەری بکات ، بۆیە بۆ بەردەوامی خۆشەویستی و بەختیاری نێوان خێزان، دەبێت چاکەی بچوکی نێوان یەکتر گەورە بکەن و باسی بکەن و وە سوپاسی لەسەر بکەن .

## پێنجەم

## ئەم خاڵە لە لای ئافرەتان زۆر گەورەیە

خەڵکی بەگشتی لەسەر ئەوەن کە گوڵ زمانی حاڵی خۆشەویستییە ، گوڵ لەگەڵ ئەو بێدنگیەدا زۆر لە دەنگ دار مەزنترە ، لەگەڵ ئەمەشدا زۆری تێناچێت . وە هەرزانە و لە هەموو کوچە و بازاڕە کاندا بە چەپك دەیفرۆشن ، زۆر هەرزانە ، بەڵام کە دەبینی زۆری: لە پیاوان چەپکە گوڵ ناکەنە دیاری بۆ خێزانەکەیان ، دێنە ئەو باوەڕەی کە لەوانەیە زۆر گران بێت وە لەوانەیە دەست نەکەوێت . بۆ خاتری خوا ئەوە بۆ چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت کە هاوسەرەکەت بکەوێتە . خەستەخانە ئەنجا گوڵێ بۆ بەریت ؟

ئەی بۆچی جاری گوڵێکی بۆ ناهێنیتەوە کە بەرەو ماڵ دەگەڕێیتەوە خێزانت ساغ و سەلیمە و بۆنیشی دەکات ، ( جۆرج کوهان) مەشغوڵترین کەس بوو لە شاری ( برودوای ) کەچی بەردەوام ڕۆژی دوو جار تەلەفونی دەکرد بۆ دایکی ، ئایا وادەزانی هەموو جاری شتی تازەی بۆ باس دەکرد ، نەخێر بەڵکو بەم کارەی دەیویست سەرنجی دایکی ڕاکێشێت . بۆ ئەوەی ئەم هەردەم بیری لە لایەتی وە حەز بە خۆشی و سەلامەتی دەکات و وە دڵی لە لایەتی .

ئافرەتان بەگشتی حەزیان لە یادی ڕۆژی شوکردن وە هۆیە گرنگەکانی لەو بارەوە هەیە ، ئەمە بۆ ؟ ئەوە لە نهێنیە نەزانراوەکانی دایکە گەورەمان (حەوا) یە..

قازی ( جۆزیف ساباس) کە نزیکەی (٤٠) هەزار مەسائیلی ناکۆکی ناو ژن و پیاوانی خستوە بە لایەکدا ، وە لە (٢٠٠٠) یاندا گەیاندونیەوە بە یەك ، دەڵێ زۆر جار ڕوو دەدات چەند شتێکی بێ نرخ و کەم بایەخ وەهیچ بۆتە هۆی نەگبەتی و بەدبەختی خێزان ، بۆ نمونە وشەی ( خوات لەگەڵ) ئەگەر ئافرەت بەکاری نەهێنی وە بەس دەستی بەرز کاتەوە لە کاتی لەماڵ دەرچوونی مێردەکەیدا ئەمە شتێکی بچوکە و هیچ تیابەسەرە ، بەڵام زۆر جار دەبێتە هۆی (تەلاق) و جیابونەوە .

بەڵێ ژیانی هاوسەرێتی بریتیە لە کۆمەڵە هیچ و بێ بایەخێك ، دەی ( وەیل) بۆ ئەو پیاوەی لەم راستیە خۆی گێل دەکات ، بەڵکو ( ئەدناشت فنسنت میلای) کاری هیچەکان لەبەدبەختکردنی خێزانەکاندا لە دێڕە شیعرێکدا کۆی کردوەتەوە .

دڵ گران نیم بــــــەوەی خۆشەویستم ڕۆ بەڵکو بەوە دڵ گرانم کە ڕۆی لەبەر هیچترین هۆ

لە شاری ڕینۆ دادگاکان لە هەموو (١٠) دەقیقەیەکدا ژن و پیاوێ: لەیەکتری جیا دەکەنـەوە ، تـۆ وادەزانـی چـەندێکیان بـەهۆی کارەساتی ڕاستەقینەوە بەتـەڵاق گەیشتون ، ئەگەر بە وردی گوێ شل بکەیت بۆ ئەو ژن و پیاوە نەگبەتانەی کەلە دادگـای رینـۆ دا سـکاڵای دڵیـان دەردەبـڕن بـۆت دەردەکەوێـت خۆشەویـستی و بەختیاری خێزان لەبار براوە بەهۆی چەند شتێکی بێ بایەخ و هیچەوە ئەم دێڕەی کەلە خـوارەوە بـۆم هێنـاوی لێـی ورد بـەرەوە بەسـەر ئاوێنەکەتـەوە هـەڵی واسـە تـا هەموو بەیانیەك ببینی و کاری پێبکەیت ، ( ئەمڕۆ کەمن تیایدام ئێـوارە دەڕوات و هەرگیز بۆم ناگەڕێتەوە لەبەر ئەوە کام دەستی یارمەتی درێژ بکەم وە کام بەزەیم تا بتـوانم مرۆڤێکـی داماوی پـێ ڕزگـار بکـەم ، با خێرابکـەم لێـێ لانـەدەم و ڕاڕا نـەبم و چـۆك دانـەدەم ، چـونکە بـەس یـەك جـار بـەم ڕۆژەدا تێدەپـەڕم . کەواتـە لـە پێنـاو پاراستنی بەختیاری دا ئاگات لە شتە سادە و بێ نرخەکان بێـت ، چونکە لـە ژیـانی هاوسەریەتیدا زۆر ترسناکە ) .

## پاشکۆی پێنجەم

﴿وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾ ( **سورەتی النور ئایەتی ١٥** )

هەر لە شتی بچوك و بێ نرخەوە شتانی گەورە و ترسناك دروست دەبێت ، سەیركە (پێغەمبەر)ی خوا(د.خ) لە فەرمودەیەكدا دەفەرموێت ( هەندێ كردەوەی خراپ و بێ نرخ هەیە ، كە ئێوە حسابی بۆ ناكەن ، كەچی حەفتا پایز ئەتانبات بەناخی دۆزەخدا ، وە هەندێ كردەوەی چاكەی بچوك هەیە كە مسوڵمان گوێی پێنادات كەچی خاوەنەكەی حەفتا ساڵ دەبات بەناخی بەهەشتدا ، لە حەدیسدا هاتوە كە ژنێك پشیلەیەكی بەند كرد و خواردنی پێ نەدا ، خوای گەورەش خستیە ناو ئاگرەوە، وە هەر وەك خوای گەورە پیاوێكی خستە بەهەشتەوە لەبەر ئەوەی كە سەگێكی لە تینویەتی ڕزگار كرد، هەر لە دونیاشدا وە لەناو خێزانەكاندا چەند شتێكی بچوك و بێ بایەخ دەبێتە هۆی خۆشكردن یان تێكچونی شیرازەی خێزان ..

من دەپرسم ئایا لە دەرەوە خۆشەویستی؟ ئەگەر دەڵێی بەڵێ ، ئەوە بەچەند شتێكی بچوك دەستت كەوتوە، وەك سەلام و ڕوو خۆشی و هەواڵ پرسین و سەردان و بەدەمەوە بونیان وە فیز و لوت بەرزی نەنواندن بەسەریاندا و بەس ، بێگومان هەر بەم شتە بچوكە بێ بایەخە خۆڕایانە دڵیانت ڕاكێشاوە ، ئەگینا خۆ قاتە جل و ئۆتۆمبیل و باخت بۆ نەكڕیون، یاخود كوڕە كەیانت لە فەرمانگە دانەمەزراندوە، وەئەگەر دەڵێیت كەس خۆشی ناوێت، بەهۆی چەندشتێكی بچوك و بێبایەخەوە دڵەكانت دوڕاندوەو خۆشیان ناوێییت .

من خۆم ماوەیەك لەمەو بەر لەسەرەتای مامۆستاییمەوە لەبەر ماندویەتی و شەكەتیم لە قوتابخانە بە ئاوات بووم زوو بگەڕێمەوە ماڵەوەو كەمێك بحەوێمەوە ، بۆیە بەپەلە دەگەڕامەوەو لە هیچ كوێ لام نەدەدا، من هەستم بەوە نەكردبو كە زۆر كەسم لێ زویر بوە بەو بۆنەیەوە ، چۆن بەمەم زانی؟

جارێك لام دا لای هاوڕێیەكم كەلەسەر ڕێگەكەمدا دوكانی هەبوو ، پاش كەمێك ڕوی تێ كرد م و وتی بەراستی بێ ڕەحم بون و هەواڵمان ناپرسن وە گەورە بوون

گوناهە ئەگەر دەقەیەك لابەنە لامان و كەمێك دانیشن ، منیش لەو ساتەوە پەنجەم گەست و هەستم كرد بەو كارەم كە شكست بەلایەنی كۆمەڵایەتی دەهێنێ ، وە خەڵك خۆشی ناوێم ، بۆیە بڕیارم دا لەو ڕۆژە بە دواوە پێ لە كەس نەبڕم و بۆ چركەیەكیش بێت پێ لە سەردان نەبڕم ، برایەكی مسوڵمان خۆی وا ڕاهێنابوو هەرچەندە لەماڵ دەربچوایە وە بگەڕابایاتەوە یەكسەر یەكەم كاری ئەو بوو دەستی دایكی ماچ دەكرد تا ببە خۆشەویستی دایكی .

ژیانی خێزانی بەتایبەت خێزانە ئیسلامیەكان دەبێت زۆر ورد ئاگاداری بەختیاریان بكەن ، وە بەچەند شتێكی بێ بایەخ لەدەستی دەر نەكەن وەك ئەوەی شتێ پێویستی ماڵی بیر بچێت ، وە یان خواحافیزی و سلام كردن گوێی پێ نەدات و لەگەڵ خێزانی كاتێ دەرچوون و هاتنەوە، یان بێ پرس و ڕاوێژی هاوسەرەكەی سەربەخۆ چەندان ئیش و كار بكات . یاخود نابینی جارێ چەپكێ نێرگز یان باقلاویەك .نامیلكەیەكی بەسودی هەدیە بكات، یاخود دەنگوباسی تازەی بۆ ناگێڕێتەوە، یاخود ناڵێ با پێكەوە سەردانێك بكەین ، ئیتر هەی یاران پێم ناڵێن بەختیاری خێزان لە چیدایە . تەنانەت (پێغەمبەر)ی خوا لەبەردڵی خەدیجە كەس و كاری خەدیجەی خێزانی زۆر خۆشەویست، تا پاش مردنیشی هەر هەواڵی هاوڕێكانی دەپرسی، جارێكان گەشت بە پیرەژنێك و ماوەیەك لەگەڵێ وەستا و قسەیان دەكرد ، عائیشە پرسی لە (پێغەمبەر) كە ئەم پیرەژنە كێ بوو؟ (پێغەمبەر) (ﷺ) فەرمووی ئەوە یەكێك بوو لە هاوڕێكانی خەدیجە كە وەختی خۆی سەری لێ دەدایین .

پرسیارت لە خۆت كردوە كە ئایا (پێغەمبەر) (ﷺ) لەگەڵ هاوڕێكانی خەدیجەدا ئاوا دڵسۆزی نواندبێ ئەی دەبێ چۆن بەختیاری خێزان بەدەست بهێنی ، كە تۆ هێشتا بە تەواوەتی خزمەكانی خێزانەكەت ناناسی .

بە نیسبەت خوشكانەوە ئەگەر چەندشتێكی بچوك و بێبایەخ هەیە بیانكات من زامنی دەكەم كە هەرگیز مێردەكەی بیر لە جیابونەوە و ژن هێنان ناكاتەوە ، وەك چی ؟؟

بەڕویدا هەڵنەشاخیٚ و بەرپەرچی نەداتەوە ، لەناو خەڵکدا گاڵـتەی پـیٚ نـەکات و بـەدرۆی نەخاتـەوەو بۆچـونەکانی پـف لیٚ نـەکات ، بـیٚ گـوێی نـەکات ، ئـەو شـتانە نەکات کە ئەو پێی ناخۆشە لە بون و نەبونـدا هـەر ڕوو خـۆش بێـت ، ڕێـزی تـەواوی خزمەکانی بگرێـت ، بەتایبەتی دایکی ، هەر شتێکی لەبازاڕ بۆ هێنایەتەوە ، مەڵیٚ ئا ئەمـە چیە کـیٚ ئەمـە دەخـوات ، دەڵێـت جارێـك پاشـایەك خـەیارێك دەخـوات ، لـە ناویاندا خـەیارێکی تـاڵ دەکەوێتـە بـەردەمی خێـرا بـە خزمەتکارەکـەی دەڵـیٚ ئـا ئـەم خـەیارە بخۆ ، ئەویش هەمووی دەخوات ، پاشا دەڵیٚ نەگبەت ئەوە تاڵ بـوو چـۆنت بۆ خورا ؟ خزمەتکارەکـە لـە وەڵامـدا وتـی قوربـان دەزانـم تـاڵ بـوو ، بەڵام مـادەم هـی دەسـتی تـۆ بـوەو زۆر بەلـەزت بـوو لـەلام ، بـەم هەڵوێـستەی پاشـای وا لیٚ کـرد کـە ئەوەندە خۆشەویست بووو یەکسەر ئازادی کرد .کەواتە چاوەڕوان مەکە کەی ببیتە دەوڵەمەندو دەسـەڵات دارێکـی گـەورە ئەوکاتـە بـە دیـاری وبەخششی گـەورە گـەورە دڵـی خـۆش بکـەیت نـەخێر بـە شـتی بـچوك ئەمـە دەکـەوێت وەك :مـاڵی باوکیـشیت خـۆش بوێـت .بیـانوی زۆری لیٚمـەگرە . بـەو ژیانـەی رازی بـە تیایـدایت لـە بەشـی خۆتی بۆ بچڕە لە هەموو جێیەك مەدحی بکە بە سوکی سەیری بۆ چونەکانی مەکـە جابزانە هەمووئافرەتانی جیهان (ملكه الجمال) بن دەیگۆڕێتەوە بە تۆ ؟

## ڕێگای شەشەم
## هەڵسوکەوتی جوان داوایەکی سەرەکییە

(مستر دامرداش ) کچی (جیمس ..ج.بلین)ەبوو ڕۆژانێك بوو خۆی بۆسەرۆك کۆماری پالأوتووە .ئەم کچە لە ژیاندا رێك وپێك ترین و گونجاوترین شوی کرد دەڵێ .(بەڕای من کە گرنگترین شت کە رەچاوی بکرێت لە هەڵبژاردنی هاوسەردا پاش گواستنەوە ئەوەیە کە سنوری هەڵس وکەوتی جوان بپارێزێ لە گەڵ یەکتردا وئەگەر هاوسەران لە گەڵ هاوسەرەکانیان بەو شێوەیە بوونایە کە لە گەڵ بێگانە دا هەڵس وکەوت دەکەن ئەو کاتە پیاوان زمانی خۆیان دەگەست کاتێ کە قسەیەکی نا بەجێیان لێ دەربچوایە بە رانبەر هاوسەرەکانیان )بەڵی قسەی نابەجێ وەك سەرەتان وایە. خۆشەویستی لە ناو دەبات وریشە کێشی دەکات لە گەڵ ئەوەدا کە ئەم راستییە بەڵگە نەویستە تەنانەت لە گەڵ دۆست وخزمەکانماندا هەرگیز ناوێرن قسەی بێگانەیەك بڕن بڵێن (ئاسمانەکە ئەوە دیسان چیرۆکە کۆنەکەم بۆ باس دەکەیتەوە خەڕەکە ) هەرگیز نایەت بە خەیاڵماندا نامەیەکی هاورێ یەکمان سەیر بکەین مەگەر پاش پرس پێ کردنیان .یان کەی ئەوێرین خۆمان هەڵقورتێنینە ناو کارو باری شەخسیانەوە بەلأم ئەمانەو خراپتریش دەکەین لە گەڵ نزیکترین کەس وخۆشەویستماندا لە بەیانی تا ئێوارە سوکایەتی ولۆمەکاریان دەکەین هەردەم بە دوای هەڵە کانیاندا دەگەرێن (هنری کلاری رزنز )دەڵی جوان هەڵسوکەوت کردن لە توانایدا هەیە کە بیچمە رزیو ژەنگەنەکان بشارێتەوە ولە بەرچاو ونی بکات گوڵە پشکوتو رازاوەکانی پشتەوە دەر بخات ! )

.(اولتفرونـدل هولمز ) کە لە قەبی (حاکمە خودکارەکە )ی لێ نرابوو کاتێ بگەرایەتەوە ماڵەوە تەواو دەگۆرا ئەو حاکمە خودکارەی دەرەوە نە دەما بەڵکو ئەم پیاوە ئەگەر خەم وپەژارەیەك ڕوی لێ بنایە بەهۆی کۆسپ وتەگەرەیەك ئەو

پەری هەوڵی دەدا کەماڵەوە بەو خەم وپەژارەی نەزانن ! وە وای بەچاك ئەزانی کە خۆی ببێتە هەڵگری ئەو خەمانە نەك لە گەڵ ماڵەوەیدا بەشی بکات ! (ئۆڵتیڤەر ) وای دەکرد ئەی باشە من وتۆ چۆن دەکەین ؟! کاتێ لە کارێکدا سەرکەوتو نەبین یان زەرەرێك بکەین یان خاوەن قەرز هەندێ قسەی ناخۆش بکات چەند خێرا بەراکردن خۆمان دەگەیینینە ماڵەوە تا کوڵە قورسەکەمان بخەین بەسەر خێزانەکەماندا بەشداری خەمی بکەین ! بۆ خاتری خوا ئەوە بۆ هەموو خەم وخەفەت وناسورییەکمان هەیە لە بەر دەرگا نەی بەینە ژورەوە، هەر وەك کابرای هۆڵندی پێش ئەوەی بڕواتە ماڵەوە نەعلە کانی دادەکەنێ !؟ ڕۆمان نوسی بەناو بانگی ڕوسی (تورجینیف ) لە گەڵ ئەوەی لە هەموو جیهانی شارستانیەت سەرسامن بەرامبەر بەرهەمەکانی ڕەزامەندییان دەر بڕیوە بەرامبەر بەرهەمە ئەدەبیەکانی لە گەڵ ئەمانەدا دەڵێت (من مادەم لە هەموو دڵێکمەوە هەرچی ناو شۆرەت وسەرکەوتنم هەیە دەستی لێ هەڵ بگرم بۆ (ئافرەتێك )کە قەلەق ونیگەرانی ڕوی تێ بکات ئەگەر کەمێ لە نان خواردنی ئێوارە دوا کەوتم ! چەندان هەوڵمان لە بەردەم دا هەیە بۆبەدیهێنانی بەختیاری خێزان دکتۆر (بول بوبتنو) دەڵێ لە بەردەمی پیاواندا زۆر هەلی سەرکەوتوو هەیە لە ژیانی هاوسەریدا زۆر لەو هەلانە زیاترە کە لە سەرکەوتنی کاری تردا هەیە سەر ژمێریی دەری خستووە کە لە٩٠٪ ئەوانەی خەریکی بازرگانین سەرکەوتوونابن بەلاّم بە پێچەوانەوە لە ٧٠٪ ئەوانەی کە ژنیان هێناوە لە مەیدانی هاوسەریدا سەرکەوتوو بوون )! خاتوو (تورۆتیدیکس ) دەڵێ لە دایك بوون شتێکی زۆر بێ بایەخە بە نیسبەت ژن هێنانەوە مردنیش هەروەها بێ بایەخە ! بۆ خاتری خوا ئەوە بۆ پیاوان خۆ ماندوو کردن و تێکوشانیان نەبێ لە پێناو بەختیاری خێزان دا ! و چۆن پشت هەڵدەدات لە هەوڵدان بۆ دەست خستنی شادی وکامەرانی خێزان کەچی لە

پیناو دەست کەوتنی (ملیۆنیٚ )ریاڵدا ناڕەحەت ترین ونالە بار ترین ریٚگا دەگریٚتە بەر ! دەی ئایا کامیان زیاتر بەختیاری دەدەن :پارە یان ژیانی پڕ لە شادی و کۆکی وگونجاوی بنیاد نانی هاوسەری ) پیاو هەرچی ڕوداوی گرنگ هەیە لە ژیانیدا لە گەڵی دا دەروات پشت گویٚی ناخات کەچی مەسەلەی (بەختیار بوون وبەدبەختی خیٚزانی) دەداتە دەستی بەخت وبەس یەك ئافرەت نیە کە هۆی ئەوە بزانیت کە بۆ چی پیاوەکەی شیٚوازی نەرم ونیان واز لیٚ دەهیٚنی وتوڕەی ومۆنی و زەبر وزەنگ بەکار دەهیٚنی لە گەڵی دا ؟!

□ هەموو پیاویٚك دەتوانی وا بکات لە خیٚزانەکەی کەچی بویٚ بۆی بکات ئەوەش بەوەی هەر بەینە نابەینی دیارییەکی سوکەی بۆ بکات پیٚشکەشی بکات لە پاداشتی ئەو ماڵدارییە جوانەو ئەو چیٚشتە خۆشە بەلەزەتانەی کە بۆی لیٚناوە خۆ هەموو پیاویٚ ئەوە ئەزانی کە ئەگەر بەخیٚزانە کەی بڵی :چەند جوان وکەشخە بوی بە جلەکانی پارتەوە بە راستی لیٚت دەهات )دە باوەڕ بکە ئەو جلە کۆنانەی پار ناگوریٚتەوە بە ئاخر مۆدیلی پاریس هەموو ژنیٚك ئەمە چاك دەزانیٚ کە میٚردەکەی ئەم راستیانە هەست پیٚدەکات بەلاٚم هەست ناکات کە شتیٚ بووە یان رەقە بەرایەتی میٚرد کردنە کە کاتی چیٚشتی باش لیٚ نانی یان ماکسی یەکی تازە دەکات پیاوە کە سەر دەکاتە جەرگی وشەڕی لە گەڵ دەکات ئایا باش تر نەبوو کە ئەم پیاوە شیٚوازی جوان و هەڵس وکەوت کردنی جوانی بە کار هیٚنابا وە نارەحەتیەکانی خیٚزانی تا دەگاتە ئامانجەکانی ؟! کەواتە ئەگەر بەختەوەربیت ئەویٚ لە ژیانی هاوسەری دا ئەوا ڕەچاوی ئەم بڕگەیە بکە (٦) :

پەنا بەرە بەر جوان هەڵس وکەوت کردن لە ژیانی هاوسەریدا

## شەشەم :

## الدين حسن الخلق

تاکە ئامانجی ئیسلام–لە دروست بوونی خێزان – ئەوەیە کە بەردەوام لە بەختەوەری وشادی دا بژین هەڵوەشانەوەی بە سەر دا نەیەت بۆیە لەو پێناوەدا فەرمان بە پیاوان دەکات بە جوانی لە گەڵ ئافرەتان بجوڵێنەوە وەك دەفەرمووێت لە قورئان دا : (وعاشرو هن بالمعروف) (النسا ء١٩) هەر وەك فەرمان بە سەر ئافرەتاندا دەکات بە جوان ترین شێوە لە گەڵ پیاوەکانیاندا هەڵس وکەوت بکەن (پێغەمبەر)ی خوا لە فەرمودەیەکدا دەفەرمووێ (حسن تبعلكن يعدل ذالك )واتەبە جوان هەڵس وکەوت کردن لەگەڵ مێردیان ئەجرو پاداشتی جیهاد وغەزایان دەست دەکەوێت) بۆیە پیاوان ڕا دەهێنێ لە سەر ئەوەی کە لە بەرچاویان بێت تێکۆشانی خێزانیان، سپڵە نەبن هەر بەوەی کە جارێك درەنگ چێشتەکەیان پێ بگات یان بیری چوبێت کراسەکەت ئوتو بکات ئەگەر فەرمانەکەی بەگوێ نەکردیت ئیتر تۆش دونیات لێ هێناوەتە یەك, ئەو هەموو خزمەت وماندوو بونەیت لە بەر چاو نەبێت . وەك بڵێی هەرگیز چاکەی لە گەڵ نەکردویت تەنانەت دەبێ لە روداوە گەورەکانیش دا تۆ هەر لای خێزانت بەر نەدەیت وهەڵس وکەوتت بێتام نەکەی بە پەلە حوکم نەکەی (پێغەمبەر)مان لە روداوی (بوختان کردن بۆ عائیشە) هیچ خۆی تێك نەداو بە رواڵەت ڕوە خۆشەکەی جارانی هەر بەردەوام بوو بەلام پاش ئەوەشی کە تەواوکەوتە زارێك ئەو کاتە (پێغەمبەر) (ﷺ) بە هێمنی یەکی پڕسۆزەوە پێ‌ووت (ئەگەر خوانە کردە هەڵە یەکی وات لێ وەشاوەتەوە ئەوە تەوبە بکەو پەشیمان بەرەوە ئەگەر واشت نەکردووە ئەوە خوا پاکیت دەر دەخات دەی ئیترتێ ناگەم بۆچی پیاوانی ئیسلام چاو لە پیشەواکەیان ناکەن, کەبۆچی لە سەر بچوك ترین شت هەڵە دەچن وئارامیان لێ دەبڕێ؟! لە مێژووی زێرینی ئیسلام دا زۆر نمونەمان دەست دەکەوێت لە سەر ئەوەی کە لە پێناوپاراستنی کامەرانی، بەختیاری خێزاندا چاویان لە زۆرشتی گەورە نوقاندووە

دەڵێن لەم سەر دەمەی خۆمان دا برایەك لە گەڵ خێزانیدا دەروات بۆ لای دکتۆر پاش فەحس کردنی پیاوەکە دکتۆرەکە دەڵێ چیتان لێ بشارمەوە کە تۆ توانای پیاوەتیت نیە هەر لە وێ دا ئەو خوشکە بە ئارامی یەکەوە بە دکتورەکەی ووت من (٩) ساڵە ئاگادارم ودەزانم .دکتور ووتی : ئەی باشە چی وای لێکردوی کە وازت لێ نەهێناوە ؟ خوشکەکە لە وەڵامدا وتی : لە پێناو بەردەوامی کامەرانی و بەختیاری نێوانمان .دەی کەواتە ژن و مێردەکانی ئەمڕۆ بۆچی چاو داناخەن لە شتە بچوك و بێ ئەهمیەتەکان و هێلانەی بەختیاری پێ دەشێوێنن .

## چەند پرسیارێك لە ئافرەتان

١- ئایا سەربەستی تەواوت بە مێردەکەت داوە لە ئیش و کارەکانیدا .

ئایا وازت لەوە هێناوە کە ڕەخنە لەزەوقی نەگریت وەکو جۆری جل و بەرگی ؟

ئایا کاتێك بۆ خۆی دانیشتبێت زنجیرەی خەیاڵیت بچراندوە ؟

٢- ئایا هەردەم لە خولیای ئەوەدایت کە ماڵەکەت ڕازاوەو جێگەی سەرنج بێت لە لای .

٣-ئایا جۆری خواردنەکانی بۆ دەگۆڕی ، بە جۆرێك کە هاتە سەر سفرە نەزانێت چیت بۆ لێناوە ؟

٤- ئایا زانیاری تەواوت هەیە سەبارەت بە ئیش و کاری مێردەکەت ، تا بۆت هەبێت . مناقەشە و موجادەلەی لەگەڵدا بکەیت ؟

٥- ئایا لە کاتی تەپینی ژێر خانی ئابوری مێردەکەتی نەبونی وکەم دەستی ئازایانە ئارامت گرتووە ، وە ڕەخنە و لۆمە بارانت نەکردووە ؟ یان بەراوردت نەکردوە لەگەڵ هاوڕێ دەوڵەمەندەکانیدا ؟

٦- ئایا لە ڕادە بەدەر هەوڵت داوە کە بەینت خۆش بکەیت لەگەڵ خوشك و دایك و خزمەکانیدا ؟

٧- ئایا حەزی مێردەکەت کار پێدەکەیت لە هەڵبژاردنی جۆری جل و بەرگدا ؟

٨- ئایا ناکۆکی و جیاوازی بچکۆلە دەخەیتە ئەو لاوە لە پێناو بەختیاری دا .

٩- ئایا هەوڵت داوە کە ئەو یاریانە فێرببیت کە مێردەکەت حەزی لێ یەتی تا لە کاتە بۆشەکاندا پێکەوە خەریکی ئەو یاریانە بن .

## چەند پرسیارێك لە پیاوان

١- ئایا لە بۆنە و جەژنەکاندا چەپکێك گوڵ یان هەر شتێکی تر پێشکەش بە خێزانت کردوە .؟

ئایا بە سەیرکردنی کراوەیی و دەم بە خەندەوە دڵیت خۆش کردووە ؟

٢- ئایا ئاگاداری ئەوە دەکەیت کە لە پاڵ خەڵکیدا ڕەخنەی لێ نەگریت ؟

٣- ئایا بێجگەلە پارەی مەسروفات هەندێ پارەت پێداوە تا بە ئارەزوی خۆی حەزی لە چی کرد بیکڕێت ؟

٤- ئایا گرنگیت بەوە داوە کەلە عەقڵی بگەیت ؟ ئایا لە کاتە ناهەموارەکاندا سۆز و بەزەیت پێ بەخشیوە ؟

ئایا لە کاتە ناڕەحەتیەکاندا کەمێك حەواندوتەتەوە .

٥- ئایا بەلایەنی کەمەوە نیوەی کاتە بۆشەکانت لەگەڵیدا دەمێنیتەوە؟

٦- ئایا گاڵتە ناکەیت بە چێشتلێنان و ماڵداریەکەی ، ئایا بەراوردی ناکەیت لەگەڵ دایك و خوشکت و ژنانی تر لەپاڵ خۆیدا ؟

٧- ئایا گرنگیت داوە بە ژیانی خێزانت و کوڕ و کۆمەڵ و سەردانەکانی ، یان بە خوێندنەوەو بۆ چونەکانی .

٨- ئایا ئاگاداری ئەوە دەکەیت کە هەردەم مەدحی بکەیت و سەر سوڕمانی خۆتی بە هەموو شتێکی بۆ دەر بخەیت .

٩- ئایا سوپاسی دەکەیت لەسەر ئەو کارانەی کەلە پێناوی تۆدا دەیکات ، وەك درومان کردن و شۆرینی گوێرەویەکانت و ئوتوکردنی جلەکانت .

و أخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين و الصلاة و السلام على سيدنا محمد و على أله و صحبه اجمعين

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پێشەكی چاپی هەشتەم | ٥ |
| پێشەكی و ڕێ خۆشكەر | ٧ |
| هۆی بڵاوبوونەوەی چی بوو؟ | ٨ |
| بۆچی ئەم كتێبەم كرد بەكوردی؟ | ١٣ |
| پێش چوونە ناو باسەكان: | ٢٢ |
| بەشی یەكەم: سێ بنەڕەتی هونەری لەهەڵس و كەوت دا | ٢٩ |
| پاشكۆی یەكەم: | ٤٢ |
| ١- هەموو ئادەمیزادێ هەڵە دەكات | ٤٢ |
| بەشی دووەم: بەشەش ڕێگا دەچیتە دڵی خەڵكیەوە | ٨٩ |
| یەكەم/ ئەمە بكە لە هەموو جێگایەك(پێش وازیت)دەكەن | ٨٩ |
| پاشكۆی یەكەم/ گرنگی دان بە براكانت | ١٠٠ |
| ڕێگای دووەم | ١٠٧ |
| پاشكۆی دووەم/ پێكەنین و ڕووی خۆشت بەدەم براكەتەوە خێر و چاكەیە بۆت | ١١٦ |
| سێیەم/ ئەگەر ئەمە ناكەیت چاوەڕوانی چەندان نارەحەتی بكە! | ١٢٢ |
| پاشكۆی سێیەم/ناوی هاوڕێكەت لەبیر مەكە | ١٣١ |
| چوارەم/ بۆنەوەی قسەزانێكی لێهاتووبیت | ١٣٩ |
| پاشكۆی چوارەم/ بواری براكەت بدە با قسەی خۆی بكات تۆش هێمنانە گوێی بۆ بگرە | ١٥٠ |
| ڕێگای دووەم | ١٥٥ |
| پێنجەم/ چی بكەیت خەڵكی بە بینینت دڵخۆش ببن؟ | ١٥٥ |
| پاشكۆی پێنجەم/ گوێ بەحەزی براكەت بدە گوێ بە حەزت دەدات! | ١٦٠ |
| شەشەم/ چی بكەیت كە خەڵكی هەر لەوێدا خۆشیان بوێیت؟ | ١٦٤ |
| شەشەم/ گرنگی بەحەزی براكەت بدە دەچیتە دڵییەوە | ١٨٠ |
| ڕێگای یەكەم: (دەمەقاڵە مەكە) | ١٨٩ |
| پاشكۆی یەكەم: (دەمەقاڵە (مراء) لەقوتابخانەی ئیسلامدا) | ١٩٥ |

ڕێگای دووەم: (پێناسەیەكی هونەری هاوڕێ لەدەست دان) ............ ١٩٩
پاشكۆی ڕێگای دووەم: (دیوار بەتۆمە پاسار گوێت لێ بێت) ............ ٢٠٥
ڕێگای سێیەم: (ئەگەر هەڵە بوویت دانی پیا بنێ) ............ ٢٠٨
پاشكۆی ڕێگای سێیەم: (دان نان بەهەڵەدا چاكەیە) ............ ٢١٤
بەشی چوارەم: (كورتترین ڕێگا بتگەیەنێتە دڵی كەسێك) ............ ٢١٨
پاشكۆی ڕێگای چوارەم: (نەرم و نیانی هەمووی چاكەیە) ............ ٢٢٦
ڕێگای پێنجەم: (نهێنییەكانی سەركەوتنی -سقراط-) ............ ٢٣٠
پاشكۆی ڕێگای بەشی پێنجەم: (لەسەرەتای وتووێژەوە براكەت تورە مەكە) ............ ٢٣٥
ڕێگای شەشەم: (چاكترین چارەیە بۆ كۆسپ و تەگەرەكان) ............ ٢٣٩
پاشكۆی ڕێگای شەشەم: (بێ دەنگی دەنبی صالحانە) ............ ٢٤٦
ڕێگای حەوتەم: (چی بكەین گیانی یارمەتی دانمان دەست كەوێت؟) ............ ٢٤٩
پاشكۆی ڕێگای حەوتەم: (شورا، واتە ڕێز لەبۆچوونەكان) ............ ٢٥٥
ڕێگای هەشتەم: (دەستەواژەیەك شتی زۆرسەرسوڕهێنەرت دەست دەخات) ............ ٢٥٨
پاشكۆی ڕێگای هەشتەم: (بیانوو بۆ كاری براكەت بدۆزەرەوە) ............ ٢٦٢
ڕێگای نۆیەم: (ئەو شتەی هەموو كەسێك دەیەوێت) ............ ٢٦٦
پاشكۆی ڕێگای نۆیەم: (نەفرین لەتاریكی مەكە بۆت كرا چرایەكی تیا هەڵكە) ............ ٢٧٢
ڕێگای دەیەم: (هاوارێك دەست دەگرێت بەسەر دڵی هەموو كەسێكدا) ............ ٢٧٧
پاشكۆی ڕێگای دەیەم: (هەمیشە ئەمە پێش بخە) ............ ٢٨٣
بەشی یازدەهەم: (سینەما چی دەكات تۆش هەر بەو چەشنە بكە) ............ ٢٨٥
پاشكۆی ڕێگای یازدەیەم: (باووتەكانمان بەكردەوە ئاوبدەین) ............ ٢٨٨
بەشی دوازدەهەم: (ئەگەر هیچ ڕێگایەك كەڵكی نەبوو ئەم ڕێگایە تاقی بكەرەوە) ............ ٢٩١
پاشكۆی ڕێگای دوازدەیەم: پێش بركێ لە چاكەدا ............ ٢٩٤
بەشی دووەم: ((٩) ڕێگا بۆئەوەی ڕەشۆی خەڵكی بگریتە دەست بەبێ ئەوەی ئازاریان بدەیت یان تورەیان بكەیت) ............ ٢٩٧
ڕێگای یەكەم: (مەدح و سەناو ڕێزلێنانێكی دڵسۆزانە بخەرەپێش داواكاریەكانت) ............ ٢٩٨
پاشكۆی ڕێگای یەكەم: بەهەڵە هەڵە چاك مەكە ............ ٣٠٤
ڕێگای دووەم: (چۆن ڕەخنە لەخەڵكی دەگریت و ڕقیشیان لێت هەڵنەسێت؟) ............ ٣٠٧

پاشکۆی ڕێگای دووەم: (ڕەخنە لە پشتی پەردەوە) ........................ ٣٠٩
ڕێگای سێیەم: (یەکەم جار بیرێك لەهەڵەکانی خۆت بکەرەوە)........................ ٣١١
پاشکۆی ڕێگای سێیەم: (پێش شکاندنی خەڵك خۆت بشکێنە) ........................ ٣١٥
ڕێگای چوارەم: (کەس حەزناکات ئەمری بەسەردابکرێت) ........................ ٣١٨
پاشکۆی ڕێگای چوارەم: (ئەممەت بۆ کرد؟) ........................ ٣٢٠
بەشی پێنجەم: (واز لەبەرامبەرەکەت بهێنە باناوی دەم و چاوی نەتکێت) ........................ ٣٢٣
پاشکۆی ڕێگای پێنجەم: ........................ ٣٢٦
ڕێگای شەشەم: (چۆن بتەوێت خەڵکی بەرەو سەرکەوتن بەریت) ........................ ٣٢٩
پاشکۆی شەشەم: (مەدح کردنی خەڵك لە قوتابخانەی ئیسلامدا) ........................ ٣٣٤
بەشی حەوتەم: (ناوێکی جوان بۆ سەگەکەشت هەڵبژێرە) ........................ ٣٣٧
پاشکۆی ڕێگای حەوتەم: (لەبراکەتدا ئەمەل بچێنە) ........................ ٣٤٠
ڕێگای هەشتەم: (واپیشان بدە ئەوهەڵەیە چارەسەرەکەی ئاسانە) ........................ ٣٤٢
پاشکۆی ڕێگای هەشتەم: (براکەم، چارەسەری هەڵەکەت ئاسانە) ........................ ٣٤٥
ڕێگای نۆیەم: (چۆن کارێك لەلای بەرامبەرەکەت خۆشەویست دەکەیت؟) ........................ ٣٤٨
پاشکۆی ڕێگای نۆیەم: (کاربکە بە بەرامبەرەکەت بەقەناعەتی خۆیەوە) ........................ ٣٥١
بەشی سێهەم پیشەکی بەرگی سێهەم ........................ ٣٥٥
شەش ڕێگا بۆ ئەوەی ژیانی هاوسەریەتی بەختەوەر بێت : ........................ ٣٥٦
ڕێگای یەکەم: ئاژاوەو ماڵ وێرانی بەرپا مەکە ! ........................ ٣٥٧
پاشکۆی یەکەم: ( خنکاندنی خیزان زۆر جار بەدەست ئافرەتە ) ........................ ٣٦٤
ڕێگای دووەم: واز لە خۆشەویستی بێنە با بۆخۆی گەشە بکات ........................ ٣٦٩
پاشکۆی دووەم: خۆت مەکیشە بە دیواری حەزی هاوسەرەکەت دا ........................ ٣٧١
ڕێگای سێهەم: نزیکترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە تەڵاق........................ ٣٧٤
پاشکۆی سێیەم: ڕەخنە لە ناو خیزانە مسوڵمانەکاندا ........................ ٣٧٦
ڕێگای چوارەم: بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەختەوەر بکەین ........................ ٣٧٨
چوارەم: سوپاسی خەڵکی نەکەیت سوپاسی خواش ناکەیت ........................ ٣٨١
پێنجەم: ئەم خاڵە لە لای ئافرەتان زۆر گەورەیە ........................ ٣٨٤

پاشکۆی پێنجەم: ( وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ) (سورەتی النور ئایەتی ١٥) ..................٣٨٦
ڕێگای شەشەم: هەڵسوکەوتی جوان داوایەکی سەرەکییە..................٣٨٩
شەشەم: الدین حسن الخلق..................٣٩٢
چەند پرسیارێك لە ئافرەتان..................٣٩٤
چەند پرسیارێك لە پیاوان..................٣٩٥
ناوەڕۆك..................٣٩٧



**وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا:**

**(بە پێنووسی بڵاوکار)**

ناوی عمر توفیق عبدالله یە ناسراوە بە الخطاط، لە هاوینی ساڵی ١٩٦٧ لە هەڵەبجەی ئاینپەروەر چاوی بە دونیای ڕووناك هەڵهێناوە. خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و دواناوەندی لە دیراساتی ئیسلامی تەواو کردووەو لەساڵی ١٩٨٦ لە کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی بەغداد وەردەگیرێت. پاش ساڵێك لەسەر مل نەدان بە حوکومەتی ئەو سەردەمە لە خوێندن فەصل دەکرێت‌و پاشان بەر بڕیاری لێبووردن دەکەوێت‌و دەستدەکاتەوە بە خوێندن‌و لەساڵی ١٩٩١دا بەپلەیەکی بەرز خوێندن تەواو دەکات. بەکاری مامۆستایەتی یەوە لەنێوان خوێندنگاکانی هەڵەبجەو دەوروبەریدا بەردەوام دەبێت. وەرگێڕ خاوەنی کۆمەڵێك نووسین‌و وەرگێڕانە کە زیاترن لە ٢٠ کتێب کە هەموویان زیاتر لە دووجار چاپ کراون، لەوانەش شاکاری زانای دەروونناسی ئەمریکی (دیل کارنیجی)یە کە ئەم بەرهەمەیەو کتێبی بگە بەکاروانی صالحان کە ئەم دوو کارەی وەرگێڕ وەك خۆی دەڵێت(ئەم دووانە بە دوو شاکاری خۆمیان دەزانم).


نارین

nareenpub.com